# مێژووی ئەدەبیاتی جیهان

## ئەدەبیاتی کۆن و سەدەکانی ناڤین

٢

بوکنەر ب. تراویك

وەرگێڕان: حەمەکەریم عارف

# مێژووی ئەدەبیاتی جیهان

## لە

## رۆژگاری رینیسانسەوە تا سەدەی بیستەم

## بەرگی دووەم

بوکنەر ب- تراویك

ت: عربعلي رضائي

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

حەمە کەریم عارف

هەولێر - ۲۰۰۸

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● **مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (بەرگی دووەم)**

● نووسینی: بوکنەر ب- تراویك

● وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف

● نەخشەسازی ناوەوە: طـه حسین

● بەرگ: هۆگر صدیق

● ژمارەی سپاردن: (١٨٤٠)

● نرخ: ١٠٠٠٠ دینار (دوو بەرگ)

● چاپی یەکەم : ٢٠٠٨

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٣١٠)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پـێـرسـت

**بەشی یەکەم**
**ئەدەبیاتی ئیتاڵیا**

| | |
|---|---|
| *١-رێنیسانس (١٣٢١- ١٦٠٠)* | ١ |
| پترارك | ٧ |
| بۆکاچۆ | ١٢ |
| داستانی رۆمانتیك | ٢١ |
| بەیتێن شوانکارەیی | ٢٧ |
| فەلسەفەی رامیاری | ٢٨ |
| ئەدەبیاتی ئەتەکێت | ٣٠ |
| ئوتوبیوگرافی | ٣١ |
| شانۆنامە | ٣٢ |
| تاسۆ | ٣٥ |
| *٢-ئەدەبیاتی ئیتاڵیا لە سەدەی هەڤدەیەمەوە تا سەدەی بیستەم* | ٤٥ |
| گولدونی | ٤٧ |
| ئالفیری | ٤٧ |
| مانزونی | ٤٩ |
| لیوپاردی | ٥١ |
| کاردۆچی | ٥٢ |
| دانونتسیۆ | ٥٤ |
| پیراندیلۆ | ٥٦ |

**بەشی دووەم**

**ئەدەبیاتی فەرەنسا**


*٣-رێنیسانس (١٤٩٤- ١٦٠٠)* ٦٥

رابلە (رابلێ) ٦٨

کالون ٧٢

پلیادان ٧٣

رونسار ٧٤

دوبلێ ٧٧

مونتنی ٧٧

شانۆنامە ٧٩

تراجیدیا ٨٠

*٤-سەدەی حەڤدەیەم* ٨٥

تراجیدیا ٨٩

کۆمیدیا ٩٧

فابیل ١٠٢

*٥-سەدەی هەژدەیەم، سەردەمی رۆشنگەری* ١٠٩

ڤۆلتێر ١١٥

رۆسۆ ١٢٠

*٦-سەردەمی رۆمانتیك (١٨٠٠- ١٨٤٢)* ١٢٧

رۆمان ١٣٠

رۆمانێن هەستۆکی (ئیحساساتی) ١٣٠

رۆمانی مێژوویی ١٣٨

هۆزان ١٣٨

شانۆنامە ١٥١

کورتە چیرۆکان ١٥٣

مێژوو ١٥٥

رەخنەی ئەدەبی ١٥٦

*٧- سەردەمی ریالیزم، ناتورالیزم و سیمبولیزم (١٨٤٢ - ١٩٠٠)* ١٦١
مێژوو ١٦٤
رەخنەی ئەدەبی ١٦٤
رۆمان ١٦٥
کورتە چیرۆك ١٨١
هۆزان ١٨٤
سیمبۆلستەکان ١٨٧
شانۆنامە ١٩٠
کۆمیدیای رەفتاران ١٩٠
کۆمیدیای سووکەڵە یان ڤودڤیل ١٩١
شانۆنامەی ناتورالیستی ١٩٢
شانۆنامەی سیمبولیستی ١٩٢
*٨- سەدەی بیستەم* ١٩٧
شانۆنامە ١٩٩
شانۆنامەی مەزهەبی ١٩٩
شانۆنامەی رەخنەیی- کۆمەڵایەتی ١٩٩
شانۆنامەی نەو رۆمانتیك ٢٠٠
رۆمان ٢٠١
رۆمانی سایکۆلۆژی ٢٠١
رۆمانی دەڤەرە دوورە دەستەکان ٢٠٤
رۆمانی تەنزنامێز ٢٠٥
رۆمانی ئایدیالیستی ٢٠٨
رۆمانی سوسیۆلۆجی و سیاسی ٢٠٩
سەربورنامە ٢١٢
هۆزان ٢١٣
هۆزانی سروشت ٢١٣
هۆزانی مەزهەبی ٢١٥
هۆزانی فەلسەفی ٢١٥

هۆزانی جەنگ ٢١٦
کامۆ و سارتەر ٢١٦


**بەشی سێیەم**
**ئەدەبیاتی ئەسپانیا**


*٩-رێنیسانس و سەردەمی زێڕین (١٤٦٩- ١٦٨١)* ٢٢٥
هۆزان ٢٢٨
چامە ٢٢٨
هۆزانی لیریکی ٢٢٨
داستان ٢٣٠
چیرۆکی پەخشانی ٢٣١
رۆمانس ٢٣١
رۆمان ٢٣٣
شانۆنامە ٢٤١
شانۆنامەنووسانی بەر لە لوپەدوگا ٢٤٣
*١٠- ئەدەبیاتی ئەسپانیا: سەدەی هەژدەیەم تا بیستەم* ٢٦١
رۆمان ٢٦٣
شانۆنامە ٢٦٤
هۆزان ٢٦٥


**بەشی چواردەم**
**ئەدەبیاتی ئەڵمان**


*١١- سەدەی شانزەیەم: رێنیسانس و ریفۆرمی ئایینی* ٢٦٩
ئیراسموس ٢٧١
مارتین لوتر ٢٧٤
هانس ساکس ٢٧٦
*١٢- سەدەی هەڤدەیەم* ٢٨١
هۆزان ٢٨٢

| | |
|---|---|
| شانۆنامە | ٢٨٣ |
| رۆمان | ٢٨٤ |
| ***١٣- سەدەی هەژدەیەم*** | ٢٨٧ |
| رۆمان | ٢٩٠ |
| رەخنەی ئەدەبی | ٢٩٣ |
| هۆزان | ٣٠٠ |
| شانۆنامە | ٣٠٢ |
| رۆمانەکانی | ٣٠٦ |
| ***١٤- سەدەی نۆزدەیەم*** | ٣٢٣ |
| رۆمانتیزم (١٧٩٨- ١٨٣٠) | ٣٢٨ |
| هۆزان | ٣٢٨ |
| شانۆنامە | ٣٣٤ |
| رۆمان | ٣٣٧ |
| ریالیزم و ناتورالیزم (١٨٣٠- ١٩٠٠) | ٣٣٨ |
| شانۆنامە | ٣٣٨ |
| رۆمان و چیرۆکی کورت | ٣٥٤ |
| ***١٥- سەدەی بیستەم*** | ٣٦١ |
| هۆزان | ٣٦٢ |
| شانۆنامە | ٣٦٤ |
| رۆمان | ٣٦٧ |


## بەشی پێنجەم
## ئەدەبیاتی روسیا


| | |
|---|---|
| ***١٦- سەردەمی زێڕین (١٨٢٠- ١٨٨٣)*** | ٣٧٩ |
| هۆزان | ٣٨٦ |
| شانۆنامە | ٣٨٩ |
| رۆمان | ٣٩٣ |
| ***١٧- قۆناغی سستی و لاوازی (١٨٨٣- ١٩١٧)*** | ٤٢١ |
| چیخۆف | ٤٢٣ |

گۆرکی
١٨ - ئەدەبیاتی سۆڤیەت ٤٢٦
هۆزان ٤٣٣
پەخشانە چیرۆك ٤٣٤
تەنز و نوکتەبازی ٤٣٥
٤٣٦

# بەشی یەکەم

## ئەدەبیاتی ئیتالیا

## ((١))

## لە سەردەمی ڕینیسانسدا Renaissance

## (١٣٢١- ١٦٠٠)

سەرەتایەکی مێژوویی:

مێژووی رامیاری ئیتالیای سەدەکانی ١٥،١٤و ١٦ تێکەڵ و پێکەڵ و ئاڵۆزە. لە ماوەی ئەم سێ سەد ساڵەدا ئەم نیمچە دورگەیە کەمتر رووی ئارامی بەخۆوە دیتووە و هەرگیز یەکێتیی بەخۆوە نەبینیوە، حکوومەتانی چکۆڵە، دەوڵەتی- شارانی بەهێز (کە بە زۆری لە ژێر دەسەڵاتی خانەدانانی بەناوبانگی وەکو مدیچی- Medici لە فلۆرانس، و ئستە- Este لە فیرارا[١] دا بوون) لەگەڵ شاهانی بێگانەدا بەردەوام لە شەڕ و پێکاداندا بوون. پاپاکانیش لە هەوڵ و تەقەلای قایم کردنی حکوومەتی دنیایی خۆیاندا بوون و وەکو پاداشتی ئەم هەوڵ و تەقەلایانە، لە ساڵی ١٣٠٩دا بارەگای پاپا بۆ ئاڤینیون[٢] گوازرایەوە و بە پشتیوانی پاشای فەرەنسا تا ساڵی ١٣٧٧ لەوێندەر مایەوە. دوای ئەوەی شارل[٣]ی یەکەمی پاشای ئەسپانیا لەشکرکێشییەکی سەرکەوتووانەی کردە سەر ئیتالیا و لە ساڵی ١٥٣٠دا بە ناوی شارلی پێنجەم-ی ئیمپراتۆری موقەدەسی رۆم تاجی لەسەرنا، ئیتالیا هەموو سەربەخۆییەکی خۆی لە دەستدا و لەوە بەدواوە، وەکو چۆن هەندێ لە شرۆڤەکارانیش ئاماژەیان بۆ کردووە، ئیتالیا تەنیا ناوەکەی ماوەتەوە.

زۆربەی ئەم بابەتانە بەلای ئارەزوومەندانی ئەدەبیاتەوە بایەخێکی ئەوتۆیان نییە، بەپێچەوانەوە ئەوەی بێ ئەندازە گرینگە ئەو گۆڕانکارییە شارستانی و رۆشنبیری و هزرییانەیە کە بە رینیسانس ناسراوە، کە لە دەوروبەری ساڵی ١٣٢١دا لە ئیتالیا دەستی پێکرد و تا ساڵی ١٦٠٠ درێژەی کێشا.

زاراوەی رینیسانس مانایەکی گەورەتر لەوەی هەبوو کە تەنیا شەوق و تاسەیەك یان جۆش و خرۆشێکی بە کوڵ و دڵ بێ بۆ ئەدەبیاتی کلاسیکی یۆنان و لاتین. جول میشلیە، کە بۆ یەکەمجار ئەم زاراوەیەی بەکار هێناوە "کەشفکردنی جیهان و ئادەمیزادی ناو دەنێ". جگە لەمە، بە مانای بێدارکردنەوەی هەستی تاکپەروەری و بایەخدان بە مەسەلە دنیاییەکانیش دێت.

هەمیشە ئەو بۆچوونە هەبووە کە هەندێك بزاڤ یان رووداوانی (وەکو داهێنانی تەلیسکۆپ) بە هۆکار یا ئەنجامی رینیسانس لە قەڵەم بدەن. لە حاڵێکا بەڕاستی ئەم رووداوانە بە خۆیان بەشێکن لە رەگەزە پێکهێنەرەکانی رینیسانس. وێڕای دژواری —و تەنانەت نالۆجیکی بوونی- ئەم جیا کردنەوە و دابڕاندن کاریانە، دەکرێ ئەم هۆکارانەی خوارەوە وەکو هەندێ رەگەزی بنچینەیی یان فاکتەری کاریگەر لە پەیدا بوون و سەرهەڵدانی رینیسانسدا لە قەڵەم بدرێن.

دۆزینەوە جوگرافیاییەکان:

دۆزینەوەکانی مارکوپولو، چەلیپاییەکان، دیاش یان "دیاز[٤]" کولەمب، ڤاسکودیگاما، ماجەلان، و دۆزەرەوەکانی دیکە، بوونە مایەی دوور کەوتنەوە لە تەعەسوب و وابەستەگی لەلایەك و جۆشدانی تاسە و ئارەزووی وەدەست هێنانی زانیاری و هوشیاری پتر، ئاسایش و خۆشگوزەرانی ساراسنەکان و میللەتانی بێگانەی دی کۆمەڵێك پێوەر و پێوانەی تازەیان بۆ ژیان خستەڕوو. چەق و مەڵبەندی جیهان لە میدیترانەوە بۆ ئەملا و ئەولا گواسترایەوە، ئەو نەخشانەی کە بە تلیموس لەمەڕ جیهان نیشانی دان پتر لە بیست ساڵ بوو مەحەکی کار بوون، ئێستا بووبوون بە ئەوزاری کایە و گەمەی بێ زەرەر و زیان.

دۆزینەوە زانستییەکان:

دۆزینەوەکانی پزیشکی، بیرکاری، فیزیا، و ئەستێران، تیۆرییەکانی نیوتن دەربارەی یاسای راکێشانی گشتی، و دۆزینەوەکانی گالیلە، کوپرنیکوس، و کەپلەر دەربارەی ئەستێرە و هەساران، هەر هەموویان تەسەور و بۆچوونەکانی سەدەکانی ناڤینیان دەربارەی نەخش و رۆڵی مرۆڤ لە جیهاندا، گۆڕی.

داهێنان و پەرەسەندنی چاپ:

یوهان گوتنبرگ-ی خەڵکی مانیتس "٥" (١٤٠٠-١٤٦٨) هەمووان بە داهێنەری پیتی چاپی قابیلی گوێزانەوە (لە ئەورووپا) (١٤٤٠- ١٤٥٠)دەزانن، ئەم داهێنانە کردیە کارێك کە کتێبان لە چاو جارانەوە ئاسانتر و هەرزانتر بکەونە دەستی خەڵکی، بەمەش رێژەی خوێنەران و کتێبخوێنان زۆر چووە سەرێ. فێر بوونی زانست ئەوەندەی دی کەڵکەڵە و ئارەزووی زانستپەروەریی لەلای خەڵکی زیاد کرد و بەجۆرە مەیلی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و پرسیاری زیاد کرد. چاپکردنی کتێبی موقەدەس بە زمانانی ناوچەیی و خۆماڵی کردییە کارێك کە خەڵکی بۆ ئامۆژگاری و زانیارییە ئایینییەکان پشت بەخۆ ببەستن و وەکو جاران پابەندی روحانییەکان نەبن، ئەمەش جورئەتی ئازاد ئەندێشی، لەمەڕ بابەتە مەزهەبییەکان، بە خەڵکی بەخشی، گشتاندنی خوێندنەوە و کتێب خوێندنەوە، گیانی ئازادیخوازی، لێبووردەیی ئایینی، و روو کردنە فەلسەفە و فەلسەفاندنی بە گەڵ خۆی خست.

کەوتنی قوستەنتەنیە:

کە قوستەنتەنیە لە ساڵی ١٤٥٣دا بە دەستی تورکانی عوسمانلی گیرا، گەلێك لە زانایانی یونانی بۆ ئیتالیا هەڵاتن، و لەوێندەر تاسە و خولیای خەڵکانێکیان سەبارەت بە بەرهەمێن کلاسیکی یۆنانی پەرەپێدا.

هۆمانیزم یا مرۆڤدۆستی:

هومانیزم زاراوەیەکە کە دەقاودەق بۆ بوژاندنەوە و جۆشدانی ئارەزووی گەڕانەوە بۆ ئەدەبیاتی کۆنی یۆنانی و لاتینی بەکار دەبرێ —لەوەیە لە بنچینەشدا هەر بۆ هەمان مەبەست بەکار هاتبێ. لە ناوەڕاستی سەدەی چواردەیەمدا پترارك و بوکاچۆ دەبن بە پێشەنگ و دامەزرێنەری ئەم گەڕانەوەیە، و کریزولوراس (١٣٥٥- ١٤١٥ی ز)ی زانای یۆنانی لە ساڵی ١٣٩٧دا ئەقلگەرایی، کە لە تایبەتمەندییەکانی گیانی یۆنانییە، لە ئیتالیادا بلاّودەکاتەوە. ئیدی هۆمانیزم دەبێ بەجۆرە یاخی بوونێك لە ریازەتگەری و چلەکێشی سەدەکانی ناڤین. لەم قۆناغ و سەر و بەندەدا بالاّترین نۆڕینی ئەخلاقی ئینکاری هەمیشەیی ویستەکانی کۆمەڵگە و پێداویستییە بەدەنییەکان بووە. مرۆڤ رەشبینانە نۆڕیویەتە ژیان و ژیانی بە کێشمانەکێشێکی ترسناکی نێوان خێر و شەڕی، زانیوە، و هەموو مەینەتی و بەختڕەشییەکانی جیهانی بەزادەی یەکەمین گوناح "٦" زانیوە. پێی وابووە مرۆڤ تەنیا لە دوای مەرگ دەگاتە کەماڵی مرۆڤانی خۆی و دەگاتە باغی بەهەشت، ئەوەشی تەنیا بۆ تاقمێك بە مومکین زانی مرۆڤی سەدەکانی

ناڤین کە مەرگی بە تاقە ڕێگەی هەلاّتن لە دنیای فانی زانیوە، جەختی لەسەر ئامادەکردنی تووێشوو بۆ ڕێگەی بەهەشت کردۆتەوە.

مرۆڤی ڕینیسانس، ئەم جەختە لەسەر دۆز و مەسەلەێن دی دەکاتەوە. کەشفکردن و دۆزینەوەی سەرزەمینانی نوێ، کەلکەڵەی نوێ و ئازادی تازەی کۆمەلاّیەتی، ڕامیاری و ئابووری، و ئاسۆێن هزری تازە، دڵبەندییەکی تازە بۆ مرۆڤ و ئەم جیهانە بەرانبەر بە خوا و جیهانی ئاخیرەت لەگەڵ خۆدا دێنێ. مرۆڤ وردە وردە بۆی دەردەکەوێ کە ئەم دنیا جوان و خۆشە، واقیعی و خوداداییە و وەعد و بەڵێنانی دنیای ئاخیرەت چەند بە ئیحتوباریش بێ. ئەوا خۆشی و شادییە سادەکانی مرۆڤ ئەم دیوی گۆڕ تاڕادەیەکی زۆر هەقی ڕەوای هەوڵ و خەبتینی مرۆڤە. هومانیزم دەکاتە باوەڕ بوونی تەواو بەم هەقە.

<u>کەشفکردنی ئەولەویەتی تاك(لە هۆمانیزمەوە نزیکە، ڕەنگە هەر بەشێك بێ لە هۆمانیزم):</u>

لە سەدەکانی ناڤیندا تاکپەروەری و ئەولەویەتی تاك لە بەین چووبوو. بە گوێرەی پرەنسیپ و بنچینەکانی کلێسا، مرۆڤ بوونەوەرێکی گوناحکار بوو و دەبوایە لە خۆپەرستی پاك ببێتەوە، و بە ڕێگای عیسا و قەدیسان و پیاوچاکاندا بڕوات و تەرکی نەفسی خۆی بکات. فیودالیزم-یش بانگەشەی بۆ هەمان دید و بۆچوون دەکرد.

میژووی ڕینیسانس میژووی ژیانەوەی هەقی مەوجودییەتی تاکە -لە زانستدا، لە داهێناندا، لە دۆزینەوەدا، لە هونەردا، لە ئەدەبیات و لە ئاییندا. ڕاز و نهێنی ڕینیسانس لەوەدایە کە هەقی مەوجودییەت بە تاك دەدات و، تاکپەروەری هێز و نێرویەکی فراوانی-لەواری هزری، ماددی و هونەریدا- بەرهەم دەهێنا و جەختی لەسەر مرۆڤانی مرۆڤ (مرۆڤی جیهانی) دەکردەوە، مرۆڤی زانا و لێهاتوو لە زۆر مەیدانی مرۆڤانی وەکو "دەرباری" کەسایەتییەکی پەند ئامێز بە هەمان ناوەوە لە نووسینی کاستیلیونە، یا لیوناردو دافینشی زانا، ئەندازیار، پەیکەرتاش و نیگارکێش.

<u>گیانی پرسیارگەری:</u>

مافی مەوجودییەتی تاك و تاکپەروەری، زێدەباری ئەوەی گوتمان، مرۆڤی هاندا ڕێچکە و ڕێباز و پێوەر و پێوانە قەراردادی و تەقلیدییەکان بخەنە بەردەم پرسیار و کۆت و زنجیری دەسەلاّت بپچڕن. مرۆڤ جارێکی دیکە جۆرئەتی پەیدا کردەوە کە پرسیار بکات و هەوڵبدات حەقیقەت و ڕاستی بۆ خۆی کەشف بکات. لەوە دەرچوو کوێرانە تیۆرییە کۆنەکان-تیۆری زانستی، هونەری، ئەخلاقی، یا ئایینی قەبووڵ بکات. گەشەی بەو ڕێچکە و میتۆدانە دا کە

لەسەر بناغەی دروستی بێ چەند و چوونی هزری رۆنرا بوون، کە باشترین نموونەی ئەمە رەفتاری گالیلەیە لە کاتی دادگایی کردنیا بە تۆمەتی گەندەڵی باوەڕ. گالیلە لە حزوری دە کاردینالٚ"٧" دا ناچار چۆك دادەدا و حاشا لە باوەڕەکەی خۆی -کە گۆی زەوی چەقی جێگیری جیهان نییە- دەکات، ئەوجا بەدەم هەستانەوە (ئامارژەیەك بۆ زەوی دەکات) و دەبۆڵێنێ: "لەگەڵ هەموو ئەم قسانەشدا، هەر دەسوڕێتەوە".

پەرچەکردارێن ئایینی:

تیۆری میتۆدی تازەی پرسیارگەری، گشتاندنی موتالاّ و کتێب خوێندنەوە (بەتایبەتی خوێندنەوەی کتێبی موقەدەس)، زانست و زانیاری تازە دەربارەی دنیا، هومانیزم، ئاگادار بوون لە زانیارییانی کوفرئامێز و نارەزایی لەگەندەڵی ناو کلێسا- هەر هەموو ئەمانە کردیانە کارێك کە زۆر کەس سەبارەت بە باوەڕی خۆی بە خوا و بە پەسلان بە خۆدا بچنەوە.

خەلکانێك لە مەسیحییەت، هەندێکیان دەچنە ریزی خوانەناسانەوە، چونکە خودایان موشریکان بە پارێزەری ناز و نیعمەت و خۆشییەکانی ژیان دەزانن، هەندێکیش تەنیا لە پرسە ئایینییەکان پشتگوێ دەخەن، تاقمێکی دیکەش کە هەست دەکەن هەر هەموو پێسوەرو پێوانەکان شێواون و پاداشت تەنیا ئەفسانەیە و بەس، بە ئاشکرا ئاوێتەی کەجرەوی ئەخلاقی دەبن، ئەمانە هیچ شتێك بە خراپ نازانن- نە توندرەوی سێکسی، نە حەساسییەت، و نە مرۆڤکوژی. گرووپێکی دیکە هەوڵ دەدەن (هەوڵی هەندێ جار ناکام) کە مەسیحییەت دەگەڵ رێباز و رێچکە تازەکەدا- لە وارێن هونەری، ئەخلاقی و ئایینیدا- بگونجێنن. تاقمی سێیەم لە بەرانبەر کوفر، لیبرالیزم و جەمسەرە توندڕەوەکانی رینیسانسدا یاخی دەبن و بەگژیدا دەچنەوە. لە لای ئەم تاقمە رێباز و رەوتی گەڕانەوە بۆ ویژدان پەیدا دەبێ. ئەمانە لە ئیتالیا، ئەسپانیا، و فەرەنسادا کۆمەڵە ریفۆرمێك لە چوارچێوەی کلێسادا ئەنجام دەدەن. لە ئەڵمانیا و سویسرا و هۆڵەندادا بەدرەفتاری ناو کلێسا لەگەڵ ئەخلاقدژی و شیریك هومانیستەکاندا، دەبنە فاکتەری سەرهەلّدانی ریفۆرمی ئایینی پروتستانی. کلێسای کاتولیك وەکو دەزگایەکی خوایی نکۆڵی لێدەکرێ و جەخت لەسەر ویژدانی تاك و تاکپەروەری، پەیوەندی راستەوخۆی مرۆڤ بە خواوە و ئەخلاقیاتی مەسیحی و دەکرێ.

گیانی رینیسانس لە ئیتالیادا زۆر زوو لە وار و مەیدانە جۆراوجۆرەکاندا خۆی ئاشکرا دەکات. لە مەیدانی زانستدا داڤینشی و گالیلە، لە هونەردا داڤینشی، مایکل"٨" ئانجیلو، روفائیل"٩"، دلسارتو"١٠"، کوردجۆ"١١"، و تینتورتو"١٢". لە حوکمڕانی و سیاسەتدا

میکاڤیلی، و لە فەلسەفەدا فیچینو"١٣"، پۆلیتسیانو"١٤"، ومیراندولا"١٥"، ئەمانە تەنیا نموونەیەکن لەو کەسانەی کە ئیتالیا بەهیمەتی ئەوان و لەسەر دەستی ئەوان جارێکی دیکە دەبێتەوە بە مەڵبەندی رۆشنبیری و شارستانییەتی جیهان... یەکێك لەو مەیدانانەی کە ئیتالیاییەکان رابەریتی دەکەن ئەدەبیاتە. لێ ئەم بابەتە شایستەی باسێکی سەربەخۆیە.

## نۆڕینێکی گشتی:

بێگومان لەپاش سەردەمی لاتینی کلاسیك، رینیسانس شکۆدارترین قۆناغ و سەردەمی ئەدەبییە لە ئیتاڵیادا. لەم سەردەمەدا نووسەرانی ئیتالیا لەوارە جۆراوجۆرەکانی ئەدەبدا گەییشتنە لوتکەی گەورەیی و شکۆداری.

بەرجەستەترین پیاوانی ئەدەب لە سەدەی چواردەیەمدا و (جگە لە دانتی، کە رەنگە زیاتر سەر بە سەدەکانی ناڤین بێ تا سەردەمی رینیسانس) پترارك و بوکاچو بوون، کە هەردووکیان بەلایەنگرانی پڕ جۆش و خرۆشی بەرهەمی کلاسیکی کۆن و هومانیزم دەژمێردران. شیعری لیریکی پترارك، کورتە چیرۆکە پەخشانی و چیرۆکە شیعرییە درێژەکانی بوکاچوو بوون بە سەرمەشقی شێوازێك لە سەرانسەری ئەورووپادا.

تەقریبەن پاش مردنی بوکاچو، تا ماوەی یەك سەد ساڵ هیچ بەرهەمێکی ئەدەبی مەزن لە ئیتالیادا پەیدا نەبوو. ئەوەبوو لە نیوەی دووەمی سەدەی پانزەیەمدا لورنتسودو مدیچی"١٦"، کۆمەڵێك زانا، فەیلەسووف، و شاعیری مەزنی لە دەوری خۆی خڕکردەوە و چالاکی ئەدەبی گیانی وەبەر هاتەوە و بوژایەوە. یەکێك لە شاعیرانی ئەم گرووپە لویجی پولچییە، کە رۆمانسی شیعری (مورگانتە ماجورە)ی نووسی، پاشان دوو بەیتی دیکە بە هەمان شێوە و فۆرم نووسران، یەکێکیان (ئورلاندوی ئاشق) بوو لەلایەن ماتیوبویاردو، و دووەمیان (ئورلاندوی تورە) بوو لەلایەن لودوویکوئاریو-ەوە.

یاکوپوساناتنسارو رۆمانسی شوانکارەیی "ئارکادیا"ی نووسی کە کارێکی زۆری کردە سەر ئەدەبیاتی ئەسپانیایی، فەرەنساوی و ئینگلیزی.

دیارترین بەرهەمی ئەدەبی سەدەی شانزەیەم بە پەخشانە و لە قالب و فۆرمی داستاندایە (مەلحەمە). نیکولای میکاڤیلی، (میر)ی نووسی کە لە مەیدانی زانستێن رامیاریدا بەڵگەنامەیەکی بەنرخە، بالدارە کاستیلیونە کتێبی (دەرباری) نووسی کە وێنەیەکە لەمەڕ ژیانی یوتوپیایی رینیسانس دەگەڵ هونەرە جوانەکاندا، بتونوتوچلینی، ئوتوبیوگرافییە بەناوبانگەکەی نووسی، و تورکواتوتاسو، داستانی رۆمانتیکی (ئورشەلیمی ئازاد)ی نووسی.

شایەنی باسە کە دوو جۆرە پەخشانی دیکەش لە سەردەمی رینیسانس-ی ئیتالیادا هاتە ئاراوە. جۆری یەکەمیان نۆڤێلا- novella، یان چیرۆکی کورتی پەخشانە. بوکاچو دیکامرون (دەوروبەری ١٣٥٣) نووسینی کورتە چیرۆکی دەست پێکرد، و پاشان چەندین کۆمەڵە چیرۆکی گرینگ و کاریگەر هاتنەنووسین لەوانە: گێلە (١٣٧٨- ١٣٨٠) لە نووسینی جوڤانی فیورنیتنو"١٧"، چیرۆکەکانی فرانکوساکیتی"١٨" (١٣٨٨- ١٣٩٥). (وردە چیرۆك) ١٤٧٦ لە نووسینی سالرنیتانوماسوچو، چیرۆکەکانی ماتیوباندولو"١٩" (١٥٥٤). (سەد چیرۆك- ١٥٦٥) لە نووسینی جیرالدی"٢٠" چینتیو، و زۆر چیرۆکێن دیکە.

جۆری دوەمیان شانۆنامە بوو. هەر چەند شانۆنامانی ئیتالیایی سەردەمی رینیسانس لە ئاستی شانۆنامانی ئینگلیستان و ئەسپانیادا نییە، بەڵام تراجیدیا، کۆمیدیا و شانۆنامانی شوانکارەیی لەخۆ گرتووە..

سەرمەشقی تراجیدیایەکان نموونەکانی سنکایە، و بەشێوەیەکی گشتی لاوازن، هەندێ لە کۆمیدیایەکان هاماج و کەش و هەوای بەرهەمەکانی پلاوتوس و ترنس-یان هەیە، بە ناوبانگترین نووسەرانی ئەم بوارەش ئاریوستو و ماکیاڤلی-ن.

شانۆنامەی شوانکارەیی، جۆرێکی تازە بوو کە تاسو و گوارینی نووسییان.. لە ئەنجامدا چوارەمین جۆرە شانۆنامە واتە (کۆمیدیا دل ئارتە) هاتە ئاراوە کە کۆمیدیایەکی نافەرمییە و ئەکتەران زیاتر خۆڕسکانە و بەشێوەی ئیرتیجالی دیمەنەکان دەخولقێنن.

## پترارك:

فرانسیس پترارك (فرانچسکو پترارکا، ١٣٠٤-١٣٧٤) ((یەکەمین مرۆڤی سەردەمی تازە))ی پێگوتراوە.لە ئاراتسو"٢١"، لە خێزانێکی فلورانسی نەفی کراو لە دایك بووە. ئەم خێزانە لە ساڵی ١٣١٢ دا بۆ ئاڤینیون"٢٢" - ی باشووری فەرەنسا کۆچ دەکات، و لەوێ فرانسیس-ی چکۆلە دەچێتە بەر خوێندنی سەرەتایی. پترارك لە ساڵی ١٣١٩دا دەست بە خوێندنی ماف دەکات، هەوەڵجار لە زانکۆی مون"٢٣" پلیە، و پاشان لە زانکۆی بولونیا"٢٤"(١٣٢٣-١٣٢٦) لە ساڵی ١٣٢٦دا باوکی دەمریت، و نادروستی دەستەی ئەمیندارانی بەڕێوەبەری موڵکان، پترارك دووچاری دەستکورتی دەکەن، و لە پێناوی ژیان و گوزەراندا دامەزراندنی ڕێورەسمی تەقدیسی کەشیشان هەڵدەبژێرێ. دوای ماوەیەکی کەم

قەوماوێك روو دەدا كە سەرانسەری ژیانی پترارك دەگۆڕێ. لە شەشەمی مانگی چواری ١٣٢٧دا لە كلێسای سانتا كلارای ئاڤینیوندا بۆ یەكەمجار چاوی بە خاتو لایورا دەكەوێ، و شەیدای سەروسیمای جوانی ئەو دەبێ. لایورا تاوەكو مردنیشی لە ١٣٤٨/٤/٦دا و تا دە ساڵ لەوە دواترش، هەر مایەی ستایشی شاعیر دەبێ و دەبێ بە سەرچاوەی بەرزترین سەرۆو ئیلهامی شاعیرانەی ئەو.

پترارك لە ساڵی ١٣٢٨دا پەیوەندی خۆی دەگەڵ جاكوموكولونادا، كە لە بۆلونیا ناسی بووی، تازە دەكاتەوە. كولونا-یەكان لە ماڵباتە بە دەسەڵات و دەست رۆیشتووەكانی روم بوون، و خودی جاكومو كەشیشباشی كلێسای گەورەی لومبە"٢٤" بوو. سەفەری پترارك لەگەڵ جاكومو بۆ تولوز لە ساڵی ١٣٣٠دا، دەبێتە مایەی ئاشنایی وی دەگەڵ تروبادورەكاندا، و ئەم ئاشنا بوونەش كار دەكاتە سەر شیعری پترارك.

ئەندامانی ماڵباتی كولونا پەنای ئەم شاعیرە لاوە دەدەن و دەسەڵاتی خۆیان بۆ پشتیوانی لە چالاكییە ئەدەبی و هونەرییەكانی وی دەخەنە گەڕ، پترارك بۆ ماوەیەك دەبێ بە ئەندامی ماڵباتی كاردینال جوڤانی كولونا-ی برای جاكومو.

پترارك پاش گەڕان و سەفەرێكی زۆر (بۆ پاریس، هوڵەندا، كولونی، ئاردن، روم، پراگ، و دەریای مانش)، لە ساڵانی ١٣٣٧- ١٣٥٣دا لە ڤوكلوز"٢٦" دەمێنێتەوە. لەم ساڵانەدا وەكو زانا، رەخنەگر، و شاعیر مورید و پەیڕەوانێكی زۆر پەیدا دەكات، و فەخر و شانازی فرە بەدەست دێنێ.

لە هەموویان گرنگتر پایەی میری شاعیرانی"٢٧" روم لە ساڵی ١٣٤١دا دەبێ پترارك لە چالاكییانی رامیاری جۆراوجۆریشدا بەشداری دەكات، و تەنانەت پشتیوانی لە چالاكییە ناكامەكانی كولادا رینسی"٢٨" (١٣٤٢- ١٣٤٨)ی كۆماریخوازیش دەكات. لە ساڵی ١٣٥٠دا دۆستایەتی پترارك و بوكاچو دەست پێدەكات و تا كۆتایی تەمەنی شاعیر بەردەوام دەبێ.

پترارك لە ساڵی ١٣٥٣دا لە ڤوكلوز بار دەكات و بۆ ئیتالیا دەگەڕێتەوە. لەمە بەدواوە لە شارانی جیاوازدا دەژی: میلان ١٣٥٧- ١٣٦٢، ڤینیسیا ١٣٦٢- ١٣٦٧، پادوا ١٣٦٧- ١٣٦٩، و ئاراكوا ١٣٦٩- ١٣٧٤. سەرەنجام، لە ١٣٧٤/٧/١٨دا پترارك لە كتێبخانەكەیدا بە مردوویەتی دەدۆزنەوە، كە سەری بەسەر كتێبێك دا شۆڕ بووبووەوە.

بەرهەمەکانی پترارك:

ناوبانگی پترارك وەکو دانەر دەگەڕێتەوە بۆ دەفتەرە شیعرییە ئیتالیاییەکانی، واتە بۆ (کتێبی گۆرانیان) ئەم کتێبە نزیکەی بیست یەکی کۆی دانراو و نووسراوەکانی پترارك-ی لەخۆ دەگرێ کە زۆربەی هەرە زۆری بە لاتینییە. پترارك بە خۆیشی بەرهەمە لاتینییەکانی خۆی زۆر پێ پەسند ترە، لە بەرهەمە ئیتالیاییەکانی- کە لە هەندێ وردە ئاماژاندا بە "وردەواڵە"و "گەوجە گەوجی لاوێتی" یان ناو دەبات. ئەمڕۆکە ژمارەیەکی زۆر کەم لە بەرهەمە لاتینییەکانی پترارك دەخوێنرێنەوە، کە ئەوانەش پتر ئوتوبیۆگرافی و بەرهەمی مێژووین.

بەرهەمە لاتینییەکانی پترارك:

((ئەفریقیا)):

لە ساڵی ١٣٣٧دا دەستی پێکردووە و لە دەوروبەری ساڵی ١٣٤٧دا تەواوی کردووە، بەیتێکی داستانی (مەلحەمی) درێژە دەربارەی شەڕ و قەرقەشەی نێوان روم و کار "٢٩" تاژەی کۆن. قارەمانی ئەم داستانە سکیپیو (سی پیون) ئافریکانوس "٣٠"-ە. ئەم داستانە رەنگدانەوەی دڵبەندی پترارك-ە بە رۆژگاری کۆن، و باوەڕی وی بە ئایندەی روم. پترارك ئەم (بەیتی ئەفریقیا)یە بە شاکاری خۆی دەژمێرێ، بەڵام زۆربەی خوێنەرانی بە بەرهەمێکی سارد و سڕ و تاقەتبەری دەزانن.

((نامەکان)):

ئەم بەرهەمە کۆمەڵە نامەیەکی یەجگار زۆرە کە —خودی شاعیر ٣٤٧ نامەیانی کۆکردۆتەوە و ١٣٦٥ نامەشیان لەلایەن کۆکەرەوان و ئامادەکارانی دواترەوە کۆ کراونەتەوە- کە وێنەیەکی وردە لەمەڕ پترارك و رۆژگار و سەردەمی وی. زۆربەی ئەم نامانە ئاراستەی گەورە پیاوان و پایەدارانی وەختە —وەکو پاپایان، ئیمپراتۆران، و کەشیشباشییان (اسقف)- رەنگە گرنگترین بەشی ئەم نامانە "نامە بۆ داهاتووان" بێ، کە نوتوبیوگرافییەکی تەواو نەکراوە، و تەسەوری پترارك- بۆ نەوەکانی ئایندە و داهاتوو —وەکو پترارك کە خۆی ویستوویەتی- نیشان دەدا.

"گریزلدا" (دەوروبەری ١٣٧٣):

ئەمە وەرگێڕانی چیرۆکی بەناوبانگی گریزلدای بە سەبرە، کە لە کۆمەڵەی دیکامیرۆنی بەرهەمی بوکاچوووەوە وەریگێڕاوە... ئەم وەرگێڕانەی پترارك کاری کردۆتە سەر چاسرو ئیلهام بەخشی (چیرۆکی فەرمانبەر) بووە.

بەرهەمە ئیتالیاییەکانی پترارك:

"کتێبی گۆرانیان" لە ماوەی ساڵانی ١٣٢٧- ١٣٧٣دا گوتراوە". دەستنووسی ئەم بەرهەمە لە ساڵی ١٣٧٣دا بۆ پاندولفو مالاتستا-ی لۆردی پسارو دەنێردرێ. بریتییە لە ٣٦٧ شیعر، ٣١٧ غەزەل "سۆناتە"، ٢٩ چامە، نۆ شیعری بەزمی (حەماسی)، حەوت گۆرانی، چوار شیعری لیریکی و، بەیتێك بەناوی "سەرکەوتنەکان"و... ئەم شیعرانە بە ئاشکرا کاریگەری و سێبەری شاعیرانی لاتینی کلاسیك، تروبادورەکان، شاعیرانی ئیتالیایی ئاخر و ئوخری سەدەکانی ناڤینی پێوە دیارە، بە تایبەتی هی دانتی و کاڤالکانتی.

سەرچاوەی هەر هەموو شیعرەکانی (کتێبی گۆرانیان) جگە لە ٣٥ غەزەل و پێنج قەسیدەی، دەگەڕێتەوە بۆ ڤیانی پترارك دەرهەق بەلایورا، ئامادەکارانی سەدەی شانزەیەم ئەم بەرهەمەیان بەسەر دوو بەشدا دابەش کردووە:

بەشی یەکەم کە ٢٦٦ هۆزانە، لە سەردەمی ژیانی لایورادا گوتراوە، و بەشی دووەم پاش مردنی لایورا گوتراوە. ئەو شیعرانە، کە باسی لایورا دەکەن، ناو ناوە ((کورتە ئەنسکلوپیدیایەکی هەست و سۆز)). ئەم شیعرانە دەچنە ناو ئاقاری سەرانسەری جیهانی هەست و سۆزی بابایەکی ئاشقەوە، لە لوتکەی ژیان و غرورەوە تا قوڵایی نائومیدییەکانی ئەو ئاشقە. لەم شیعرانەدا تەنیا یەك شت باس ناکرێ: ئەویش ویساڵی بەدەنییە، ئەستەمە کە بتوانرێ کاروانی ئەڤینی پترارك پەیگیری بکرێ- ئەو کاروانەی کە زناك و نیشانەی ئەو باڵابوونە بەردەوامەی هەستە. لە سەرەتاوە سکاڵا و گازاندە و بێتاقەتی ئاشقێکی بێ پەروا دەگاتە گوێ.

پاشان پاکی لایورا ئارامی بە شاعیر دەبەخشێت و دەکەوێتە ستایش و پەسندی وی، ئەوسا پەی بەوە دەبات کە ئەڤینی لایورا، بەرزی کردۆتەوە و هەوڵدەدا کە خۆی بکاتە شایستەی ئەشقی ئەو، لەو شیعرانەشدا کە پاش مەرگی لایورا گوتراون هەمان رێباز و رێچکە بەدی دەکرێت، لایورا، وەکو بیاتریچەی دانتی، رەمز و رێنوێنی ڤیانی خواییە، بەڵام ڤیانی دانتی بۆ بیاتریچە تا سەر هەر ئاسمانی و یوتوپیاییە، بەڵام هەست و سۆزی پترارك (بەتایبەتی لە شیعرەکانی هەوەڵیدا) هەندێ جار بە ئاشکرا بەدەنییە، و وێنەی لایورا زۆر مرۆڤانی ترە لە سیما و کەسایەتی بیاتریچە.

"کتێبی گۆرانیان" بە "بەیتی سەرکەوتنەکان" کۆتایی دێت، کە بریتییە لە کۆی شەش شیعری مەجازی لە قاڵبی ترزاریما "[٣١]"دا. لەم بەیتەدا، ئەڤین پەیتا پەیتا بەسەر پتراركدا سەر

دەکەویّ، پاکی و بێگەردی لایورا بەسەر ئەڤیندا، مەرگ بەسەر لایوردا، شۆرەت بەسەر مەرگدا، زەمان بەسەر شۆڕەتدا، و ئەبەدییەت بەسەر زەماندا.

سی و پێنج شیعری (کتێبی گۆرانیان) کە پەیوەندییان بە سەربوری ڤیانی پترارک-ەوە نییە، نێوەڕۆکی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرن، هەندێکیان شەخسییە، هەندێکیان خۆماڵی و ناوچەیی، و ژمارەیەکیان ئایینی و مەزهەبین، هەڵبەتە سێ شیعری ناو ئەم کۆ شیعرە لە هەر هەموو شیعرەکانی دی بەناوبانگترن کە بریتین لە: ١- "روحی هەڵبژاردە! کە جوولە دەخاتە بەر جەستەی مردوو" ئەمە سروودێکی نیشتیمانییە روو لە هەندێ رابەرانی بەرجەستەی سیاسییە، کە رەنگە یەکێك لەوانە ئەندامێکی ماڵباتی کولوناکان بێ یا بیوزونەدا گوبییو-ی سیناتۆری رومی بێ. ٢- "ئیتالیای من" کە ئەمەشیان سروودێکی نیشتیمانییە. ٣- "ئەی مریەمی موقەدەس"، کە بەڕای مکولی "رەنگە جوانترین سروودی پاڕانەوەی جیهان" بێ.

کورتەیەکی ئەو رەخنانەی لە پترارك گیراون:

جیهان لە دوو رووەوە قەرزارباری پترارکە: یەکەم پترارك-ی هومانیست، و دووەم، پترارك-ی شاعیر، و ئەستەمە بتوانرێ بگوترێ کە کام قەرزەیان قورسترە.

پترارك نەك هەر بە یەکەمین مرۆڤی سەردەمی تازە ناو دەبرێ، بەڵکو بە یەکەمین هومانیست، یەکەمین سوڵتانی باڵادەستی ئەدەبیاتی سەردەمی تازە، بە پێشەنگی بوژانەوەی رۆشنبیریی "کلاسیك" و بە دامەزرێنەری شارستانییەتی چەرخی تازەش دەژمێردرێ، جدییەتی و هەوڵی وی لە واری هونەردا، خەمخۆری و پەرۆشی و شەیدایی وی بۆ ئەدەبیاتی یۆنانی و لاتینی، و دڵبەندی وی بەزانستەوە کردیانە کارێك کە زۆربەی زانایان بەیەك دەنگ رایبگەیەنن کە پترارك لە هەر مرۆڤێکی دیکە پتر دەوری لە سەرهەڵدان و پەیدا بوونی رینیسانسدا دیتووە.

لێ پترارك لەواری هونەرمەندیشدا هەر نەمرە، گەلێك لە شیعرەکانی "کتێبی گۆرانیان" بوون بە زینەت و زینەتبەخشی دیوانە شیعرییە لیریکییە گەورەکانی جیهان. بێگومان شیعرەکانی پترارك کەم و کوڕی خۆیانیش هەیە. کێش و قافیەیان زۆر دووبارە دەبێتەوە، هەندێ جار بۆنەی وتنی غەزەلێك هێندە سواو پڕ درێژدادرییە لە تۆ وایە شاعیر لە بری ئەوەی ئیلهام لە ئەڤینەوە وەربگرێ، تەنیا شەیدا و هەڵوەدای رستە و دەستەواژە بازی وەستایانە بووە. وەکو یەکێك لە رەخنەگرەکان دەڵێت: "شیعرەکانی پترارك لەوپەڕی جوانیدان- یا بەلای کەمەوە جوانن- بەڵام زیاتر لە ئاستی قسەی ئاشق پیشەکانە نەك خودی ئەشق، و زۆرجار وشەبازی و نوکتەبێژییە.

"بە قەولی گابریل هارڤی" هیچ نییە جگە لە تەنز و سوعبەتی ڕێك و پێك و ناسکی رازاوە".

تۆژەرێکی دیکە دەڵێت: "هەر ئەم ناسکی و رازاوەییەیە کە لەگەڵ هەست و سۆزی واقیعیدا نەبان و ناتەبا دەنوێنێ".

رەخنەگرانی دیکە زیاتر ستایشکاری پترارك بوون، بەو رادەیەی کە کەسێکی وەکو ئورت دەڵێت: "پترارك مرۆڤێکی گەورەیە و شاعیرێکی گەورەیە کە بە باشترین شیعری دەبێ بە هاوسەنگ و هاوتای سوڵتانانی شیعر" و جوزیف نوسلندەر، کە یەکێکە لە وەرگێڕە هەرە باشەکانی پترارك، بە دڵنیاییەوە دەڵێت : "غەزەلەکانی پترارك دەربارەی ژیان و دەربارەی مەرگی لایورا وێنەیەکی بێ هاوتا لەڕووی کەماڵ و هەمە جۆرییەوە نیشاندەدەن، و بێگومان دەچنە ریزی شیعرە زیندووەکانی میژووی غەزەلخوانی جیهانەوە".

کاریگەریی پترارك:

پترارك، لە هەر هەموو ئەو شاعیرانەی کە بە زمانی ئیتالیایی شیعریان گوتووە، پتر کاری کردووەتە سەر ئەدەبیاتی قۆناغی دوای خۆی. ئەو داهێنەری سۆناتە (غەزەل) نییە بەلاّم دەیگەیەنێتە لوتکەی کەماڵ و لە نێو خەلکیدا بلاّوی دەکاتەوە، وەکو بەراورد کراوە تەنیا لە ئەوروپای رۆژئاوادا لە سەدەی شانزەیەمدا پتر لە سێ سەد هەزار غەزەل گوتراوە کە شایەتییەکی زیندووە بۆ کاریگەری ئەو بزاڤەی کە بە پترارك گەرایی ناسراوە. ئەم بزاڤە (لە ئیتالیا، پرتوغال، فەرەنسا، ئەسپانیا و ئینگلیستان)دا بە شێوەی پترارك-ی، دەکەوێتە ستایشی ئەڤینی مەیلەو ئەفلاتوونی، خواستن و رەگەزدۆزی بەکاردێنێ، تاسەو لەزەتی بەدەنی دەرهەق بە خانمانی داوێنپاك یان نارازی (ژنانی شوودار) رەفز دەکاتەوە. بوکاچۆ، رونسار، دوبلیە، چاسر، وایت، سوری، سیدنی، سپنسر و شەکسپیر لەو شاعیرانەن کە بە قولّی لە ژێر کاریگەری پتراركدا بوون.

## بۆکاچۆ

جوڤانی بوکاچۆ (١٣١٣- ١٣٧٥)ی گەورەترین چیرۆکبێژی جیهان، پێدەچێ لە پاریس هاتبێتە دنیاوە، بۆکاچۆ فەرزەنی حەرامزادەی بازرگانێکی مەیلەو دەوڵەمەندی خەلکی شارۆچکەی چرتالدۆ-ی نزیکی فلورانسایە، دایکی (بەڕای زۆربەی ژیاننامەنووسان) ژنێکی فەرەنساوییە بە نێوی جان. کاتێ جوڤانی دەگاتە دوانزە ساڵی، بابی بە مەبەستی فێربوونی کار

دەینێرێتە لای کابرایەکی بازرگان لە ناپولی. بۆکاچۆ پاش شەش ساڵ، ئەم کارە ناسازە لەگەڵ زەوقیدا تەرك دەکات و دەست بە خوێندنی قانون دەکات، کە ئەم کاردشی بەدڵ نابێ، بەلآم شەش ساڵێك درێژە بە خوێندن دەدات، ئەم دوازدە ساڵەی کە لە شاری پڕ جم وجۆڵی (شارویر "٣٢")دا بە سەری دەبات، رەنگە خۆشترین ساڵانی عومری بۆکاچۆ بووبێ. بۆکاچۆ لە چینی باڵای کۆمەڵگەدا دەگیرسێتەوە و لە ساڵی ١٣٣٣دا پەیوەندییەکی حەرام لەگەڵ ماریاداکینو-ی کیژی حەرامزادەی خودی شابیردا دەبەستێ، ماریا (کە بۆکاچۆ فیامیتا، یا شولەی بچووك-ی ناو دەنێ) وەکو بیاتریچەی دانتی و لایورا-ی پترارك، هاوسەری هەیە و دەبێتە مایە و سەرچاوەی گەلێك لەبەرهەمەکانی بۆکاچۆ. بۆکاچۆ بەخۆی دەیگێڕێتەوە کە پاش یەك ساڵ لە پەیوەندی دڵداری ئەم دووە، ماریا-ی هەوەسباز واز لە بۆکاچۆ دێنێ و حەز لە پیاوێکی دیکە دەکات.

بۆکاچۆ لە ساڵی ١٣٣٨دا بە هۆی هەندێ تەنگوچەڵەمەی دارایی باببیەوە، ناچار و بە نەبەدڵی بۆ چرتالدو دەگەڕێتەوە. لەم شارەدا خوو دەداتە ئەدەبیات، و ئەدەبیات و عەشقی فیامیتا دەبن بە هەوێنی ژیانی لە ناپولیدا. لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا کە لە ناپولی دەگوزەرێ، بۆکاچۆ دەبێ بە نووسەرێکی پڕ بەرهەم و زۆر زوو ناوی دەکەوێتە سەر زاران و هەموو کۆڕ و نەنجوومەنەکان دەعوەتی دەکەن. ئەکادیمیای فلۆرانسا بە بۆنەی دانی کورسی مامۆستایەتی بە پترارك (کە بۆکاچۆ ساڵی رابردوو ئاشنایەتی دەگەڵ پەیدا کردبوو) لە ساڵی ١٣٥١دا دەعوەتی دەکەن —هەڵبەتە پترارك-یش کورسییەکە قەبووڵ ناکات. دۆستایەتی ئەم جووتە شاعیرە تاکو مردنی پترارك (لە ساڵی ١٣٧٤دا) بەردەوام دەبێ.

بۆکاچۆ لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا گیرۆدەی دەستکورتی و داتەپینی جەستەیی، و نیگەرانی دەربارەی پرسە ئایینییەکان دەبێ. لە ساڵی١٣٦٢دا ئاگادارکردنەوەیەکی قەشەیەکی لەسەرە مەرگا، بوکاچۆ هان دەدا هەموو بەرهەمە نەمەزهەبییەکانی بسوتێنێ، لێ پترارك بەنامەیەك لەو کارەی ژێوان دەکاتەوە، بۆکاچۆ لە دوو ساڵی کۆتایی تەمەنیدا بۆ زانکۆی فلورانس دەعوەت دەکرێ تا محازەرە دەربارەی دانتی بڵێتەوە، و ئیدی تۆزێ دەبوژێتەوە. بۆکاچۆ لە جرتالدۆ کۆچی دوایی دەکات.

<u>بەرهەمەکانی بۆکاچۆ:</u>

وێڕای ئەم راستییەی کە دانتی و بۆکاچۆ لەرووی تەبع و تەبیعەت و میتۆد و رێبازی هزرییەوە رێك پێچەوانەی یەکتری بوون، بۆکاچۆ هەمیشە دانتی بە مامۆستای خۆی دەزانی، و

ڕێزی پترارك-یشی وەکو دانتی دەگرت، بۆکاچۆ لە ژێر کاریگەری سیسرون، ڤیرجیل، جوڤنال، ئاپۆلیوس، بنوادوسنت، مور، گوئید و دلاکولونا، و چیرۆك و ڕۆمانس و فابیلۆکانی سەدەکانی ناڤیندا بووە.

بۆکاچۆ، هەر چەندە بە چیرۆکبێژی ناسراوە، بەلام زۆر بەستەی شوانکارەیی، غەزەل، ڕۆمانسێن پەخشان و ڕۆمانسی شیعری، و یەك بەیتی داستانی، چەند ژیاننامەیەك و بەرهەمێکی تەنز ئامێزیشی نووسیوە. هەندێ لە بەرهەمەکانی بەزمانی ئیتالیایین و هەندێکیان بە زمانی لاتینییە.

## پەخشانی ئیتالیایی:

### ((فیلوکولویا فیلوکوپو)) (١٣٣٣):

ئەمە یەکەمین بەرهەمی بەرجەستەی بۆکاچۆیە کە بە گوتەی خۆی لەسەر داوای ماریا داکینو نووسیویەتی. ئەم ڕۆمانسە (چیرۆکی دلداری و سەرکێشی) درێژە (حەوت کتێبە) لەسەر بناغەی چیرۆکی شیعری "فلوروبلانشفلور" ڕۆنراوە کە بەیتێکی سەدەکانی ناڤینە، بۆکاچۆ ئەم چیرۆکە کۆنەی لە فۆرم و قالبێکی تازەدا، کە لەگەل سەلیقە و زەوقی ناپول-ی سەردەمی رینیسانسدا بگونجێت، داڕشتووەتەوە.

بۆکاچۆ هاتووە کۆمەلێك کاراکتەری نوێ، ڕووداوی تازە، و وەسفی تازەی بۆ چیرۆکی نێوبراو زیاد کردووە، کاراکتەرسازی چیرۆکەکە نالوژیکییە و شێوازەکەی دەستکرد و تاقەتبەرە و پڕە لە سنعەتی ڕەوانبێژی و جوانکاری. ئەم ڕۆمانسە (چیرۆك) بۆ خوێنەری ئاسایی ناکاتە هیچ، بەلام بەلای ئەهلی هونەرەوە، یەکەمین بەرهەمی جدیی بۆکاچۆیە کە بە پەخشانێکی سفت و ڕازاوە و پڕ لە هونەری جوانکاری داڕێژراوە. ئەم چیرۆکە کارێکی کردۆتە سەر چاسر.

### ((فیامیتا)) ١٣٤١:

بۆکاچۆ بەم چیرۆکە لە ڕۆمانسەوە بەرەو ڕۆمانی سایکۆلۆژی هەنگاو دەنێ. فیامیتا بە خۆی چیرۆك و سەربهوردی خۆی دەگێڕێتەوە: پانفیلو-ی ئاشقی فیامیتا، بە ویستی بابی، بە ناچاری دەست لە فیامیتا هەلدەگرێ.

فیامیتا بێهودە چاوەنۆڕی گەڕانەوەی دەکات و تەنانەت بیر لە خۆکوژی دەکاتەوە. مێردەکەی فیامیتا ماوەیەك دەیباتە سەفەر و گەڕان، بەلام سوودی نابێ، فیامیتا دەگەڕێتەوە و هەر دلی تەنگە، تا لە سەرەنجامدا دەگاتە قەناعەت کە ئەو تاقە ژنێك نییە کە ئەم جۆرە جەفایە دەکێشێت، و ئەم بیرە سوکنایی دەداتێ.

((چیرۆکی شوانکارەیی ئامیتو)) (١٣٤٣):

پەخشانە چیرۆکێکی مەجازییە کە بە شیعر رازاوەتەوە، لیبیا-ی پەری دەریایی، ئاشقە راوچییەکەی خۆی بە دەستەیەك پەرییانی دەریایی دەناسێنێ، و هەر کەسەو بە نۆرە سەربهوردی ئاشقێنی خۆی دەگێڕێتەوە. هەنگێ دەردەکەوێ کە پەرییان رەمزی پاکداوێنیین و مێرد و ئاشقانی وان رەمزی نزمین، ئەم بەرهەمە هەولێکی ناکامە لەواری لێکدان و تێهەلکێش کردنی چیرۆکی شوانکارەیی و مەجازی، ئەفسانەی کوفرئامێز و ئەخلاقی مەسیحی کە پێکڤە هەلناکەن. بە هەر حاڵ ئامیتو لەلایەنی هونەرییەوە سەرکەوتوو نییە، بەلام لەرووی مێژووییەوە وەکو یەکەمین رۆمانسی شوانکارەیی نوێ، وەکو هەنگاوێك بەرەو فۆرم و قالبی چیرۆکبێژی سەرکەوتووی دکامیرون بایەخی خۆی هەیە. ئەم چیرۆکە کاری کردووەتە سەر سانتسارو و گوارینی.

"دکامیرون" (١٣٤٨- ١٣٥٣):

شاکاری بۆکاچۆیە، ئەم کۆی سەد چیرۆکی هاوپەیوەستە لە یەك چوارچێوەدا.

نەخشە:

پێشەکی کتێبەکە باسی ئەوە دەکات کە چۆن حەوت خانمی لاو و سێ پیاوی گەنج لە ترسی تاعونی ساڵی ١٣٤٨ی فلورەنسا بۆ دەرێی شار هەلدێن. ئەم دە لاوە لە ماڵە هاوینەی یەکێك لەوان دەگیرسێنەوە و لەوێندەر بۆ کات بەسەر بردن تا ماوەی دە رۆژان حیکایەتان دەگێڕنەوە، بەجۆرە هەر رۆژەی یەکێکیان حیکایەتێك دەگێڕێتەوە. لە رۆژی یەکەمدا هیچ بەرنامەیەکیان نابێ، بەلام هەر چیرۆکێك، چیرۆکێکی دی لێدەبێتەوە، بە جۆرێ کە لە کوتایی هەر نۆرە چیرۆکبێژییەك بۆیان دەردەکەوێ کە چیرۆکەکانیانی ئەو رۆژەیان بە دەوری تەوەری یەك ناوەڕۆکدا- لە خەتەر خەلەسین- سوڕاوەتەوە. لەوە بە دواوە لەسەر پێشنیازی رێبەری نافەرمی جەماعەتەکە، کۆمەلێك ناوەڕۆکی تایبەتی بۆ رۆژانی داهاتوو هەلدەبژێرن.

رۆژی نۆیەم- کە بەبێ ناوەڕۆك ماوەتەوە- لایەنی ریز پەری هەس- نێوەڕۆکە هەلبژێردراوەکان بۆ رۆژانی داهاتوو بەمجۆرەن: (٢) بەختی بەد بەجۆرێکی چاوەنۆرنەکراو باش بوو. (٣) چۆن سەبر و دروستی بووە مایەی سەرکەوتن (٤) و (٥) مەسەلەکانی ئەڤین (٦) بەرەکەتی رزگاریبەخشی زیرەکی (٧) خیانەت، حیلە و گەندەلی ژنانی مێرددار (٨) شەڕی موجامەلە ئامیزی رەگەز و (١٠) تەبیعەت بەرزییەکانی ئەڤین.

سەرچاوەکان:

پلۆت و نەخشەی داهێنەرانە لەچیرۆکەکانی بۆکاچۆدا، ئەگەر داهێنانێك لـەگۆڕێ بـێ، زۆر کەم و سنووردارە. پلۆتان لەسەرچاوەێن هەمـە جـۆرەوە هەڵدەبـژێری - چـیرۆکین رۆژهـەلاتی، ئوڤید، ئاپولیوس، فابیلۆ، واریقاتناامان، رۆمانسێن سەدەکانی ناڤین، چەندین کـۆ حیکایـەتێن بەناوبانگی لاتینی سەدەکانی ناڤین وەکو: چیرۆکانی رۆمیـان"٢٣" ، ژیـانی باوکانـە ئەفسانەێن زێرێن"٣٤"، سەد چیرۆکی کۆن"٣٥" کە بە چیرۆکی بچووك-یـش بەناوبانگـە، نـەقلێن زارەکـی و رووداوەکانی رۆژ. هەر کاتێ ناوەڕۆکێك بشوبهێتە سەر ناوەڕۆکێکی دی، بۆکاچۆ دەیگۆڕێ بـۆ ناوەڕۆکێکی نوێ. بۆکاچۆ شـەوق و زەوقـی خـۆی لـە چـیرۆکەکانیا دەردەبـڕێ، هـەر هـەموو دڵبەندییەکانی، شادی و لەزەتە دنیاییەکانی راستگۆیانە لەم چیرۆکانەدا دەگێڕێتەوە.

نێوەڕۆك:

لە کۆ چیرۆکی دکامیروندا سیما و بونیادی کۆمەڵگەی مرۆڤانی بە هەموو فرە رەنگییـەوە لـە خوارترین چینی کۆمەڵایەتییەوە تا بەرزترین توێژان وێنە دەگیرێ. خوێنەر لـە دەمیکـا دەبـێ بـە هاونشینی جەماوەری بێنەوای کۆمەڵگە، دوای دەمێکـی دی هـەوای پـاکی دنیـای سوارچـاکی و دلاوەری و جوامێری هەڵدەمژێ، و دوای تۆزێکی دی بۆ ناو خەڵکی دلسۆز و دروستکار، و ساغڵەم و سەرڕاست دەگەڕێتەوە. دەوڵەمەندی و هەمەلایەنی کارەکانی بۆکاچۆ وای لە مێژوونووسان کردووە کە ناوی کۆمیدیای مرۆڤانی لەم کۆچیرۆکە بنەن –بەرانبەر بە کۆمیدیای خوایی، دانتی-.

تۆن، شێواز و هاماج:

بۆکاچـۆ لـە کـۆ چـیرۆکی دکامیرونـدا لـە دەروونگـەرایی بەرهەمـەکانی سـەرەتای دوور دەکەوێتـەوە، و چـیتر دەربەسـتی ئـەنجامگیری ئـەخلاقی یـا شـیکاری کاراکتـەران نییـە، کاراکتـەرەکان بـە روونـی جەوهـەر و ماهیـەتی خۆیـان ئاشـکرا دەکـەن، و خوێنـەر هـۆگری هەندێکیان دەبێ، بۆکاچۆ هەر کاتێ کە بە پێویـستی بزانـێ قارەمانێـك یـا کاراکتـەرێك بـە گوێرەی نەخشە و پلۆتی چیرۆکەکەی بخولقێنێ، بە زۆری سیفەتی زاڵی ئەو قارەمانە دەکات بـە نـاوی تایبـەتی قارەمانەکـەی، وەکـو "نێـرەنگ بـازی"، "بـەغیل"، و "کـەودەنی". تـۆنی چیرۆکەکانی بۆکاچۆ جۆراوجۆرن- هەندێکیان خەمین، و بەشـێکیان شـاد، و ژمارەیـەکیان پـڕ هەرا و هەنگامەن.

هیچ چیرۆکێکی ئەوەندە فەیلەسووفانە نییە، بەڵام هـەر هـەموو چـیرۆکەکانی زیرەکانـەن. هەندێکیان پڕ سـۆز و گـوداز دەنـوێنن، و زۆریـان رەشـبینانەن. بۆکاچـۆ حەزلـە وێنـەگرتن و

بەرجەستە کردنی رەبەنان و دێرنشینانی هەرزە، مێردانی کەودەن، و ژنانی لاسارە، بەڵام سوود لە وێنەگرتنی سوارچاکانی وەفادار و بوێر و ژنانی سەلار و سەنگینیش وەردەگرێ (هەر چەندە لە وێنەگرتنی ژنی سەنگین و پاکڕەوشتدا ناکامە).

ئەو رەخنانەی کە لە بۆکاچۆ گیراون زیاتر بە دەوری تەوەری بێ نەزاکەتی ئەودا سوڕاونەتەوە. گومان لەوەدا نییە کە ژمارەیەك لە چیرۆکەکانی پڕن لە بێ نەزاکەتی و هەرزەیی. هەندێ لە رەخنەگران پێیان وایە کە دەبێ هەمیشە جیاوازی نێوان سەردەمی بۆکاچۆ و رۆژگاری ئێمە لەبەرچاو بگیرێ، بەڵام هەندێك لە چیرۆکەکانی بۆکاچۆ، وەکو پترارك-یش لە نامەیەکی سەرزەنشت ئامێزا ئاماژەی بۆ کردووە، تەنانەت بۆ قۆناغ و سەردەمی رینیسانس-یش بە بێشەرمانە دەژمێردرێن. هەندێ لە رەخنەگرانی دی لەو باوەڕەدان کە دکامیرون دنیایەکی خەیاڵی وێنە دەگرێت، لەبەر ئەمە ناکرێ بە گوێری پێوانە و پێوەرانی باو رەخنەیان لێبگیرێ، بە هەر حاڵ رەنگە بتوانرێ ئەوە بگوترێ کە چیرۆکە بێ پەردەکانی بۆکاچۆ بە مەبەستی رەواجدانی بێنەزاکەتی نەنووسراون، بەڵکو جۆرە حەنەکچیاتی و نوکتەبازییەکی مەبەست بووە.

بۆکاچۆ لە کۆ چیرۆکی دکامیروندا شێوازی خۆی دەدۆزێتەوە. لەم کۆ چیرۆکەدا ئەو ناوەڕۆکانە هەڵدەبژێرێ کە شارەزایی لێیان هەیە و حەزیان لێدەکات. شێوازێکی رەوان و زمانێکی سواری هەیە، پەخشانی بۆکاچۆ نموونەی پەخشانی راستەقینەی کلاسیکە-پەخشانێکە کە دەبێ بە سەرمەشقی پەخشانی رینیسانس دابنرێ.

چیرۆکە بەناوبانگەکانی:

ژمارەیەك لە چیرۆکە زۆر بەناوبانگەکانی کۆ چیرۆکی دکامیرون بریتین لە: ماستۆی باخەوان، گیلتای ناربوونە (سەرچاوەی شانۆنامەیەکی شەکسپیرە بەناوی ئەو شتە خۆشە کە ئاخری خۆش بێ)، لیزابتا و گوڵدانی رەیحان، قوشی فدریگۆ، ئاشقێك لە پەرستگەدا، و گریزلدای بەسەبر.

کاریگەری:

دکامیرون یەکێکە لەو چوار پێنج کتێبەی کە لە مێژووی ئەدەبیاتدا بە کاریگەرترین کتێبان دەژمێردرێ. ئەم کتێبە نەك هەر سەرمەشقی گەلێك لە نووسەران و کۆکەرەوانی کورتە چیرۆکی ئیتالیایی بووە. بەڵکو کاری لە ناودارانی وەکو هانس ساکتس، لسینگ، لوپەدوگا، چاسر، شەکسپیر، درایدن، کیتس، تنی سن، مولیر، لافونتین، دو موسە، و لانگفلو-ش کردووە.

((کورباچۆ)) (١٣٥٤):

هەجوویەکی تیژە، هەم دژی ئەو بیۆەژنەی کە داواکانی بۆکاچۆی رەتکردۆتەوە و هەم دژی هەموو تیرەی ژنان. ئەم بەرهەمە زۆر جێگەی ئیحتوباری نووسەر نییە، بەڵام بایەخی لەوە دایە کە سەرەتای قۆناغێکی تازەی ژیانی بۆکاچۆ نیشان دەدا-یانی قۆناغی تەرك کردنی دنیا و لەزەتەکانی دنیا.

"ژیانی دانتی" (١٣٥٧- ١٣٦٢):

ئەم بەرهەمە کە بە یەکەمین ژیاننامەی هونەرمەندێك دەژمێردرێ، لەم رووەوە زۆر بایەخدارە کە هەندێ گێڕانەوەی زارەکی کۆنی لەمەڕ ژیانی نووسەری کۆمیدیای خوایی تۆمار کردووە و پاراستووە.

شیعرە ئیتالییەکانی بۆکاچۆ:

"تزیدە" (دەوروبەری ١٣٤١):

بەیتێکی داستانی درێژە (بریتییە لە ١٢ کتێب) لە قاڵبی بەندی هەشت بەیتیدا (ئوتاڤاریما "٣٦")، هۆمەر، ڤیرجیل، ئەستایتوس، و لەگینە رۆمانسێکی رۆژهەڵاتی یا یۆنانی ونبوو سەرچاوەی ئەم داستانەن (مەلحەمە). بۆکاچۆ لێدەبڕێ راپۆرتێك لەمەر سەرکەوتنەکانی قارەمانانی یۆنانی کۆن ئامادە بکات، بەڵام شارەزای مەیدانی شەڕ نییە، و دەنگی تەپڵی سەرکەوتن ناناسێت. بەشی سەرەکی ئەم بەیتە سەروساختی لەگەڵ ئەڤینداییە: دوو هاوڕێ، پالمونە و ئارچیتا ئاشقی ئیمیلیا دەبن، کە لەسەر دلبەر بە شەڕ دێن، ئارچیتا سەر دەکەوێ، بەڵام لە ئەسپ دەگلێ و دەمرێ، و پالمونە لەگەڵ ئیمیلیادا زەماوەند دەکات.

ئەم بەیتە لە باری شیعرییەوە سەرکەوتوو نییە، وێڕای ئەوەش بەسەرچاوە و ئیلهامبەخشی چەند بەرهەمێکی بەهادار دەژمێردرێ، وەکو (چیرۆکی سوارچاکی پالایمون و ئارسایت-ی) چاسر، (دوو نەجیمزادەی خزم) لە نووسینی شەکسپیر و فلچر، و (پالایمون و ئارسایت) لە نووسینی درایدن.

"فیلوستراتو" (١٣٤٤):

چیرۆکێکی شیعری درێژە (نۆ بەشە لە ٥٧٠٤ بەیتدا) کە لە فۆرم و قاڵبی ئوتاڤاریمادا داڕێژراوە. بۆکاچۆ بۆ هۆنینەوەی ئەم بەیتە سوودی لەم سەرچاوانە وەرگرتووە: ئەم راپۆرانەی لە واریقاتنامەکانی دیکتوس کرتی "٣٧" و دارس فریگیە "٣٨"دا دەربارەی چیرۆك و ئەفسانەی تەروادە تۆمار کراون، (رۆمانسی تەروادە) لە نووسینی بنوادوسنت مور، (مێژووی تەروادە) لە

نووسینی گوئیدو دلاکولونا. فیلوستراتۆ سەربهوردی بەناوبانگی ترویلوس و کرسیدا دەگێڕێتەوە، کە پاشان بە دەستکارییەوە لەلایەن چاسر، شەکسپیر، و درایدن-ەوە دووبارە داڕێژراوەتەوە. لە دەقەکەی بۆکاچۆدا، ترویلو، بە کۆمەکی پاندورا، خوازبێنی کرسیدا دەکات، بەڵام ئەو پاشان بۆ ئۆردوگای یۆنانییەکان هەڵدێ و حەز لە دیومید دەکات. ترویلو لە شەڕدا دیومید دەکوژێ، بەڵام بە خۆیشی بە دەستی ئاخیلوس دەکوژرێ، ئەم بەیتە ڕەنگدانەوەیەکی ئاشکرای پەیوەندی خودی بۆکاچۆیە لەگەڵ ماریاداکینودا، و شیکردنەوەیەکی سایکۆلۆژی بەرز و کۆمەڵێك شیعری پڕ جۆش و خرۆشی لەخۆگرتووە.

"خەونی ئاشقانە" (١٣٤٤):

بەیتێکی مەجازییە (لە پەنجا بەش پێکهاتووە) لەسەر بنەمای خەون ڕۆنراوە و لە قاڵبی "ترزاریما"دا داڕێژراوە. ژنێکی جوان (بەناوی پاکڕەوشت) بۆکاچۆ بۆ قەڵایەك ڕێنوێنی دەکات کە دوو دەروازەی هەیە، دەروازەیەکی تەنگ کە ڕووە و بەها مەعنەوی و میتافیزیکییەکاندا دەکرێتەوە، و دەروازەیەکی دی کە بەسەر دنیادا دەکرێتەوە. شاعیر بە تەبیعەت دەروزازی دووەم هەڵدەبژێرێ، پاش گەشتێك بە جیهانی سەروەت و سامان، و شۆرەت و ئەڤیندا (کە بۆکاچۆ لەوێندەر فیامیت دەبینێ و دەیەوێ ماچی بکات)، دەگەڕێنرێتەوە بۆ دەروازە تەنگەکە و، بەیتەکە کۆتایی دێت. ئەم بەیتە مەجازێکە سەبارەت بە ئەشقی دنیایی -تەنیا ئەشقێك کە بۆکاچۆ دەرکی دەکات- و بەڵگەی ئەمەیە کە زانست و ئەشقی سروشتی دەبێتە مایەی شادمانی و کامەرانی هەمیشەیی، پتر لە پازدە بەشی ئەم بەیتە لەڕاستیدا وەرگێرانێکی ئازادی هەندێ بەشی (میتامورفوس)ەکەی ئوڤید-ە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم بەرهەمە لەڕووی قاڵب و وەزنەوە قەرزارباری دانتییە- کە ئەم وەزن و قاڵبە بۆ ناوەڕۆکی کتێبەکەی بۆکاچۆ گونجاو نییە.

بۆکاچۆ هەوڵدەدا هزری نوێی ڕینیسانس لە قاڵبی کۆنی مەجاز-ی سەدەکانی ناڤیندا پیشان بدات و بە هەر حاڵ، ئەم بەیتە، بە هەموو کەم و کوڕییەکانییەوە، بەیتێکی گەرم و گوڕ و پڕ لە ئەفراندن و داهێنانە.

"چامەی شوانکارەیی فیزولە" (١٣٤١):

بەیتێکی شوانکارەییە لە قاڵبی "ئوتاڤاریما"دا (بەندی هەشت بەیتی) هۆنراوەتەوە. مینزولا-ی پەری جوان، و ئەفریکو-ی ئاشقی وی، کە بە ناپاکی ئالودە و لەوتاون وەکو سزا دەبن بەرووبار، ئەم بەیتە چیرۆکی پرونلو-ی دامەزرێنەری ڤیەزولە"[٣٩]، و مناڵەکانی

دەگێڕێتەوە، بەڵام بۆکاچۆ زیاتر بایەخی بە سەربەهوردی مینزولا و ئەفریکۆ داوە و نزیکەی لە سەدی هەشتا و پێنجی بەیتەکەی دەگرێتەوە. لەوە دەچێ ئەم بەیتە کاریگەری بەسەر بربویاردو، ئاریوستو، تاسۆ، و سپنسەرەوە هەبووە.

بەرهەمە لاتینییەکانی بۆکاچۆ:

"دەربارەی ماڵباتی خودایانی بت پەرستان (١٣٥١- ١٣٦٠):

ئەنسکلۆپیدیایەکی مێژووی ئەفسانانە لە پازدە بەرگدا کە لە بەرهەمەکانی ئوڤیدەوە هەڵێنجراوە و وەرگیراوە.

ئەم بەرهەمە لە باری بەرەڤانی لە شیعر و شاعیری-یەوە نەمرە.

"دەربارەی کەوتنی پیاوانی ناودار" (١٣٥٦- ١٣٦٤):

بۆکاچۆ، لەم کتێبەدا وێنەی کۆمەڵێك کەسایەتی بەرجەستە، لە حەزرەتی ئادەمەوە بیگرە تا دەگاتە هاوعەسرانی خۆی، دەگرێت و بەسەرهاتی پڕ لە کارەساتیان دەگێڕێتەوە. مەبەستی بۆکاچۆ نیشاندانی ناپایەداری و بێهودەیی عەزەمەت و گەورەیی مرۆڤانییە. ئەم بەرهەمە بە سەرچاوەی سەرەکی "چیرۆکی رەبەن"ی چاسر دەژمێردرێ، و ئەمە جگە لەوەی کە سێبەری بەسەر (کەوتنی شازادەکان)ی لیدگیت "٤٠"، و کۆ چیرۆکی (ئاوێنەیەك بۆ دادپرس)ی فیرز "٤١"، و بالدوین "٤٢"ەوە دیارە.

"دەربارەی ژنانی ناودار" (١٣٥٦):

ئەم کتێبە سکێچی سەد و چوار ژنی ناودار، لە حەواوە بیگرە تا دەگاتە جوڤانای مەلیکەی ناپول، لەخۆ دەگرێ. لە بن دێڕی ژیاننامەکاندا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ژنان بوونەوەرانی سست و لاوازن و دەبێ باڵادەستی پیاویان پێ قەبووڵ بێ، ئەم کتێبە ئیلهامبەخشی چاسر بووە لە نووسینی "ئەفسانەی ژنانی باش"دا.

کورتەیەکی ئەو رەخنانەی لێی گیراون:

رازی بایەخی بۆکاچۆ، وەکو پترارك، لە پێشڤەبردنی ئارمانجەکانی رینیسانس و لە گەورەیی بەرهەمەکانیدا پەنهانە. بۆکاچۆ، لە رای رینیسانسدا دەکەوێتە شان بە شانی پترارك و لەواری بڵاوکردنەوەی ئەدەبیاتی یۆنانی و لاتینیدا هەنگاوی گەورە دەنێ. بۆکاچۆ یەکەمین مرۆڤی عەسری تازەیە لە ئەوروپای رۆژئاوادا کە دەکەوێتە فێرکردنی یۆنانی، و قەناعەت بە زانکۆی فلۆرانس دەکات کە کورسی فێرکردنی زمانی یۆنانی بەرێوەبەرێ، بۆکاچۆ، هەرگیز لەواری

شاعیریدا گەورەیی بە دەست نایەنێ، بەڵام ئوتاڤاریما (بەندێن هەشت بەیتی) دەگەیەنێتە لوتکە، کارێکی زۆر گەورە دەکاتە سەر شاعیرانی دواتر.

بۆکاچۆ لە مەیدانی پەخشاننووسیدا وەکو مامۆستا بلیمەتی خۆی دەنوێنێ. هەر چەندە شێوازی پەخشانی سەرەتاکانی تاقەتبەر، دەستکرد و تەژی سنعەتی جوانکارییە، بەڵام دکامیرون-ەکەی رێزمانی ئیتالیایی دەچەسپێنێ و هاوئاهەنگی بە پەخشانی ئیتالیایی دەبەخشێت و دەورێکی بەهادار لە چەسپاندنی زمانی فلورانسیدا وەکو زمانی یەکگرتووی ئەدەبی ئیتالیا، دەگێڕێت. لێرەدا کورتبڕی دەگەڵ رەوانی و ئاڵۆزیدا ئاوێتە دەکات و شێوازێکی رازاوە بە هونەرێن جوانکاری، وەزندار و سواری ئەوتۆ بە دەست دێنێ کە هەندێ جار لە زمانی دیالۆگەوە نزیکە. بۆکاچۆ هەر چەند لە شکۆی ئەخلاقی دوورە و حەماسەتێکی ئەوتۆی ئایینی و رەگ و ریشەیەکی قوڵی فەلسەفی نییە، بەڵام بە قوڵی دڵبەندی هونەری جددییە. بە هەر حاڵ دکامیرون، کە شاکاری بۆکاچۆیە، بەرهەمێکی تەڕ و بڕ و زیندووە و لە دەوڵەمەندی و فرە رەهەندیدا، هاوسەنگ و هاوتای بەرهەمەکانی دانتی و شەکسپیرە.

## داستانی رۆمانتێك

بابەتی سێیانی رۆمانسەکانی سەدەکانی ناڤین (حیکایەتی بریتانیایی، فەرەنساوی، و رومی) لە ئیتالیادا، بە تایبەتی لە لومباردی و توسکاندا لەنێو جەماوەری خەڵکدا رەواجێکی زۆر پەیدا دەکات. شاعیرانی گەڕۆك کە لە گەڵ زیارەتکەران و سەربازانی شەڕی سەلیبیدا بۆ وڵاتی فەلەستین (خاکی پیرۆز- Holy Land) دەچن، رەواج بەحیکایەتی قارەمانانی کۆن، دلاوەران و سوارچاکانی ئارتورشا، و بت پەرستان دەدەن. لە سەدەی پانزەیەمدا ئەم حیکایەتانە، ئاوێتەی چیرۆکەکانی کتێبی موقەدەس و سەربوردێن مێژوویی و ئەفسانەیی دەکران و دەبوون بە سەرچاوەی شانۆنامەکانی ئەو شاعیرانە و لە مەیدانانی شاردا بۆ خەڵکیان دەنواند و دەگێڕایەوە و بە گۆرانی و ئاوازەوە دەیانگوت، و زۆر جاریش بۆ ئەنجامدانی بەرنامانی شانۆیی بۆ کۆڕ و ئەنجوومەنانی کۆمەڵایەتی تایبەتی دەعوەت دەکران. هەندێ لە بابەتە هەرە باو و پەسندەکانی چیرۆکێن شارلمانی بریتین لە (کارلو)، رولان (ئورلاندو) ئولیڤەر "٤٣" (ئولیویر، و گانلون "٤٤"، گانو). کەسایەتی شارلمانی لە زەمانی سروودی رولان (١١٠٠) بەدواوە ئاسیوێکی فرە دەبینێ، شاعیرانی گەڕۆك لە شێوەی پاشایەکی پیری بێ دەسەڵاتدا بەرجەستەی دەکەن کە زۆر زوو باوەڕ بە بانگەشەی شەڕانیەتی پەیڕەوانی خۆی

دەكات —تەنانەت ئەو بانگەشانەش كە پەيوەستن بە رولانەوە- كە خانەوادەكەى (كلرمون) لەگەڵ خانەوادەى گانلوندا لە دوژمنايەتى بەردەوام دايە.

جا ئەم نەقڵ و حيكايەتە رۆمانتيكييانە ميراتى پولچى، برياردو، و ئاريوستو بووە، ئەوانەى كە يەكەم كەس بوون لە ئيتاليادا لەم هەواڵ و نەقڵانەوە دەكەونە داهێنانى ئەدەبياتى واقيعى.

لونيجى پولچى (١٤٣٢- ١٤٨٤):

حەنەكچى و شۆخيبازى كۆڕ و مەجليسى لورنتسوى شكۆمەندە"[٤٥]. زانيارييەكى كەم دەربارەى ژيانى وى لە دەستدايە. وەكو ديارە رۆژێ لە رۆژان خانەوادەيەكى دەوڵەمەندى هەبووە، بەڵام پولچى خۆى زۆربەى كات هەر قەرزار و گرفتار بووە. تاقە بەيتى گەورەى خۆى، واتە "مورگانتە ماجورە"ى (مۆرگانتەى ئەعزەم) لەسەر داواى دايكى لورنتسو نووسيوە.

"مورگانتە ماجورە"

(ئەم بەيتە گەورەيە لە ٢٣ بەش پێكهاتووە، لە نێوان ساڵانى ١٤٦٠- ١٤٧٠دا دانراوە، لە ساڵى ١٤٨٢دا پێنج بەشى ديكەى بۆ زێدە دەكرێ ساڵى دواتر بەيتەكە بە تەواوەتى بڵاودەكرێتەوە). ئەم بەرهەمە لە قاڵبى "ئوتاڤاريما"دا (بەندى هەشت بەيتى) هونراوەتەوە. پوختەى چيرۆكەكە بەمجۆرەيە: ئورلاندو كە بە خۆى تاراوگەى هەڵبژاردووە رووبەرووى سێ بت پەرست دەبێتەوە، دووانيان دەكوژێت، و داوا لە نەفەرى سێيەمى، مورگانتە دەكات كە بچێتە سەر ئايينى ئەو، ئەويش دەبێ بە غولامى گوێڕايەڵ و وەفادارى. مورگانتە كۆمەڵێك سەركەوتنى گەورە بەدەستدێنێ، لەوانە: دەبێ بە سەرۆكى كەشتييەكى بازرگانى، نەهەنگێك دەكوژێ، بەتاقى تەنێ گەلە بەرازێكى كێوى راو دەنێ، لە ئەنجامدا قرژاڵێك پەنجەى پێى مورگانتە دەگەزێ و دەيكوژێ، دۆستەكەى وى، واتە مارگوتە، پاڵەوانێكى شەمولەيە، بوونەوەرێكى عەنتيكەيە كە لەزەت لە خواردن و گێڕانەوەى تاوانەكانى خۆى دەبينێ، ئەمە لە نەوەى ئەدەبى سوسيا-ى"[٤٦] پلاوتوس و نياى پانورژ رابليەيە. ئەم بونەوەرە بە ديتنى وەزع و حاڵى سەيرى مەيمونێك لە پێكەنينا نيوە مەرگ دەبێ، ئورلاندو، بە كۆمەكى دۆستە شەيتان سيفەتەكەى خۆى، واتە ئەستارۆت، كە ئەسپێكى باڵدارى بۆ پەيدا دەكات و نامۆژگارييەكانى ئەفلاتوونى بۆ دەگێڕێتەوە، جارێكى دى بۆ پاريس دەگەڕێتەوە. دوا پێنج بەشى بەيتەكە جدى ترە و باسى شكستى ئورلاندۆ لە رونسوف و تۆڵەكردنەوەى كارلو لە گانون دەكات.

"مورگانتە ماجورە" لە سێ لقى سەرەكى پێكدێ: ١- چيرۆكى سەرەكى مورگانتە كە زياتر لە چيرۆكێكى شيعرى ئيتاليايى ئاخر و ئۆخرى سەدەى چواردەيەمەوە وەرگيراوە.

٢- چیرۆکی رونسوف"[٤٧]" کە لە بنچینەدا لە چیرۆکێکی ئەسپانیاییەوە وەرگیراوە.
٣- قسە تەنزئامێز و شۆخبازییەکانی خودی پولچی و دوو پاشکۆی گەورەی وی دەربارەی مارگوتە و ئەستاروت.

ئەم بەیتە لەبەر سێ هۆ مایەی سەرنجە: یەکەم کارێکی سەرگەرمکەرە بە تایبەتی لەڕووی تەنز و حەنەکچیاتییەوە. دووەم زەوق و سەلیقە و داب و نەریتی خەڵکی فلورانسای رۆژگاری لورنتسو مدیچی بە باشی دەنوێنێ. سێیەم کاریگەری گەورەی خودی بەیتەکە رەنگە چیرۆکە لاوەکییەکانی مارگوتە ئیلهامبەخشی چیرۆکنووسانی پیکارسك بووبێ، ئاریوستو، رابلیە، سیرڤانتس، سپنسر هەموو لە ژێر کاریگەری ئەم چیرۆکەدا بوونە. بایرۆن بەشێکی مورگانتەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی و ئەم بەیتەی کردووە بە نموونە و سەرمەشقی خۆی لە "بیوو دۆن جوان"ەکەیدا.

ماتیۆماریا بویاردۆ (١٤٣٤- ١٤٩٤):

کۆنتی سکاندیانۆ، حاکمی ریجو و مودینا، و "هۆمەری سەردەمی سوارچاکی"یە. لە دەف ماڵباتی ئەستەی دۆکی فرارا، پایەیەکی گرنگ بە دەست دێنێ. لە ساڵی ١٤٦٩دا حەز لە ئانتونیا کاپرارا دەکات، و کۆمەڵە غەزەلیات و بەیتی ئورلاندۆی ئاشق بە ئیلهامی ئەوەوە دەنووسێت. و دروشمی (ئەشق سەرکەوتووە) هەڵدەگرێ -ئەو دروشمەی کە لە سەر کێلی راهیبەی "سەرۆکی دێر"ی چاسر-یش هەڵدەکەندرێ.

ئەڤینی دڵخوازی بویاردۆ (و رەنگە دڵخوازی راهیبەی سەرۆکی دێر) ئەڤینێکی رۆمانتیکییە نەك روحانی. بە هەر حاڵ تاقە بەرهەمی زیندووی بویادرۆ بەیتی رۆمانتیکی (ئورلاندۆی عاشق)ە.

((ئورلاندۆ-ی ئاشق)):

بەیتێکە لە قاڵبی بەندێن هەشت بەیتیدا، بۆیاردۆ لە ساڵی ١٤٨٤دا دوو کتێبی (٦٠ بەشی) بلاودەکاتەوە و تەنیا نۆ بەش و چەند بەندێك لە کتێبی سێیەم تەواو دەکات و بەسەریا دەمرێت.. هیچ قەواڵە و بەڵگەنامەیەك لەبەردەستدا نییە کە گەواهی ئەوە بدات بۆیاردۆ ئاگای لە مورگانتەی پولچی بووە، و بەیتەکەی بۆیاردۆ لەڕووی تۆن، شێواز، و ناوەرۆکەوە هیچ لێکچوونێکی لەگەڵ بەیتەکەی پۆلچیدا نییە، لە ئورلاندۆ-ی ئاشقدا کەسایەتییەکەی بەیتەکە قارەمانێکی شەیدای ئەشقە، کە لەبەر خاتری ئانجلیکا-ی دۆتشا-ی دڵرەق و بێدینی چینی، دەست لە هەموو شتێك، تەنانەت لە بەرەڤانی لە شا و وڵاتەکەشی هەڵدەگرێ، بۆیاردۆ هەقی

تەواوی دەداتێ و ئەشق لە هەموو شتێك بە گەورەتر دەزانێ. بەڵام تەنیا ئورلاندۆ گیرۆدەی ئەفسونی ئانجلیکا نابێ، تەقریبەن هەموو دەربارەی فەرەنسا، کە یەکێك لەوانە رینالدۆ-ی پسمامی ئورلاندۆیە، شەیدای ئەڤینی ئەو دەبن. ئورلاندۆ و رینالدۆ هەردووکیان کەمەندکێشی ئەڤینی کیژێ دەبن- و لەم پێناوەدا تەنانەت دەچن بۆ وڵاتی چین و دەگەڕێنەوە. لە ڕێگەدا جووتە سوارچاکی ئاشق لەگەڵ ژنان و پیاوانی جەنگی، سیحربازان، و دێو و درنجانی زۆر و زەبەندەدا گیرۆدەی شەڕ دەبن.

ئەم ڕووداوە پڕە لە واریقاتی جادووئامێز و ئامێر و کەرەستەی ئەفسوناوی -کانیاو، موستیلە، شمشێر، و زۆر شتی دیکە. ئەم بەیتە لە پاریسدا، کە کارلو دەکەوێتە ئابلۆقەی ساراسنەکان (عەرەبەکان)ەوە، کۆتایی دێت.

هەر چەندە زمانی ناوچەیی بویاردۆ درشت و زبرە، بەڵام شیعرەکانی لایەنی ئیجابی زۆریان هەیە. هێڵی چەند سەرەی پلۆتی بە پێچ و پەنا و ئاڵۆزی چیرۆکەکە هوشیارانە دەهێنرێنەوە سەر یەك و پێکڤە گرێ دەدرێنەوە. کاراکتەرسازی بە جوانی ئەنجام دراوە، ئەگەرچی هەندێ جار موبالەغە ئامێز دەنوێنێ.

ئورلاندۆ-ی ئاشق لە ڕۆژگارێکدا یەجگار بەناوبانگ دەبێ، بەڵام گۆڕانی زەمانە و لاوازی زمانی بەیتەکە، دەکەنە کارێك کە لە سەدەی شانزەیەمدا تەواو بکەوێتە بۆتەی فەرامۆشییەوە. فرانچسکو "٤٨" برنی لە ساڵی ١٥٤١دا شێوە و شێوازی ئەم بەیتە مشت وماڵی دەداتەوە و تۆن و ئاوازەکەی بە تەواوی دەگۆڕێت.

وادیارە بۆیاردۆ کاریگەری بەسەر ئاریۆستۆ و سپنسەرەوە هەبووە .

<u>لودۆڤیکو ئاریوستۆ (١٤٧٤- ١٥٣٣):</u>

بە گەورەترین هەڵبەستەوانی داستانی رۆمانتیك دەژمێردرێ، لە ریجو-ی نزیکی فلۆرانس چاو بە دنیا هەڵدێنێ. لە ساڵی ١٥٠٠دا بابی دەمرێ و بە ناچاری ئەرکی خێزانێکی گەورە لە ئەستۆ دەگرێت. هەوەڵجار دەبێ بە وابەستەی کاردینال ئیپولیتۆ و پاشان لە فرارادا دەچێتە لای دۆك ئالفونسۆ- کە هەردووکیان لە بنەماڵەی ئەستە و پەنادەرانی تارادەیەك ڕژد و ڕەزیلن.

ئالفونسۆ لە ساڵی ١٥٢٢دا ئاریوستۆ بۆ حوکمڕانی گارفانیانا دەنێرێ، کە گوندێکی دوورە دەست دەبێ و هەمیشە لەبەر ڕەحمەتی هێرش و پەلاماری چەتە و ڕێگراندا دەبێ. ئاریۆستۆ پاش سێ ساڵان بۆ فرارا دەگەڕێتەوە و خانوویەك دەکڕێ و پاشماوەی عەمری تیای دادەنیشێ.

ئاریۆستۆ شیعرە لیریکی و لاواندنەوەکانی بەزمانی لاتینی و شیعرە شوانکارەیی، غەزەل، تەنز و شانۆنامەکانی بە زمانی ئیتالیایی دەڵێت. بەناوبانگترین شانۆنامەی ئاریوستۆ (جیێ نیشنان)ی ناوە کە گاسکوین شانۆیەکی بەناوی (خەیالات)ەوە لیێ ئامادە دەکات. پێدەچیێ ئەم شانۆنامەیەی ئاریۆستۆ ئیلهامبەخشی شانۆنامەی (رامکردنی ژنی سەرکێش)ی شەکسپیر بووبیێ. بە هەر حاڵ ناو و شۆرەتی ئاریۆستۆ بە (ئورلاندۆی تورە)وەیە.

"ئورلاندۆ-ی تورە":

درێژەی "ئورلاندۆی ئاشقی" ئاریوستۆیە. چل بەشی ئەم بەیتە لە ساڵی ١٥١٦ بڵاودەبێتەوە دەقە بژارکراوەکەشی (کە چل و شەش بەشە) لە ساڵی ١٥٣٢دا بڵاودەبێتەوە. ئاریۆستۆ جگە لە بویاردۆ لە ڤیرجیل، ئوڤید، ستایتوس، بۆکاچۆ، پولچی، و رۆمانسەکانی سەدەکانی ناڤین-یش ئیلهامی وەرگرتووە.

نێوەرۆك:

لە بەیتی ئورلاندۆی تورەدا سەدان رووداوو و چیرۆکی ژێراوژێر هەن کە بە داوی کەم و زۆر سست بەسیێ نێوەرۆکی سەرەکی بەیتەکەوە گریێ دەدرێن (١) یەکەمین نێوەرۆك (تیمە)و چیرۆك بریتییە لە گەمارۆدانی پاریس لەلایەن سارانسەکانەوە بە فەرماندەیی ئارگامانت-ی پاشای ئەفریقیا، کە هاوپەیمانانی سەرەکی وی مارسیلیوی شای ئەسپانیا، جەنگاوەرانی رادومونت-ی حاکمی جەزایر و روجرو-ی پاشای ساراسنەکانن. (٢) نێوەرۆکی دووەم، شێت بوونی ئۆرلاندۆیە. ئانجلیکا لە نێو فەرەنساییەکان هەڵدیێ و خۆی دەگەیەنێتە دەرێی شوراکانی شار. لەوێندەر تووشی مدرورۆ-ی لاوی موسوڵمانی زامدار دەبیێ، دەکەوێتە پەرستاری و تیمارکردنی زامەکانی و لاوەکە چاك دەبێتەوە. ئانجلیکا حەزی لێدەکات و شووی پێدەکات. ئورلاندو کە بەمە دەزانیێ لە تورەیی و بەغیلیدا تێك دەچێت. بەرووت و قووتی دەکەوێتە ناو شار و گوندان و بەگژ مرۆڤ و گیانداراندا دەچێت. (٣) نێوەرۆك و حیکایەتی سێیەم سەربهووردی ئەشقی روجرۆ و برادامانت-ە. روجرو دەبیێ بە مەسیحی و گیرۆدەی داوی ئەشقی برادامانت-ی خوشکی سوارچاکی فەرەنساوی رینالدۆ دەبیێ. ئەم چیرۆك و نێوەرۆکە بایەخێکی یەجگار زۆری هەیە —بە تایبەتی بۆ ئاریۆستۆ- چونکە روجرو و برادامانت بە نەوەی ماڵباتی و خانەدانی گەورەی ئەستە دەزانیێ و شاعیر ئارادەیەکی زۆ لەبەر خاتری ئەوان ئەم بەیتەی خۆی دەهۆنێتەوە. ئەم سیێ زنجیرە نێوەرۆك و حیکایەتە لە کۆتایی بەیتەکەدا یەکدی دەگرنەوە. ئورلاندۆ ئەقڵ و ئاوەزی خۆی بە دەست دێنێتەوە —ئەشق و ئەڤینی ئانجلیکا لە بیر دەباتەوە-

ئاستولفۆ-ی دلاوەر و سوارچاکی بریتانیایی سەفەرێك بۆ مانگ دەکات، لەوێندەر ئەقڵ و هۆشی ئورلاندۆ دەدۆزێتەوە و ئەوسا بۆ سەر زەوی دەگەرێتەوە و هۆشە دۆزراوەکە بە کەپووی ئورلاندۆدا دەکات. ئورلاندۆ، ئاراگامانت دەکوژێت، ئابلۆقەکە دەشکێنێ، و روجرو و برادامانت زەماوەند دەکەن.

کورتەیەکی رەخنەکان:

بەیتەکەی ئاریۆستۆ نە لاسایی کردنەوەیەکی تەنزئامێزی سوارچاکییە (بەو جۆرەی کە لە مورگانتەی پوچی داهاتووە) نە لەڕووی هاوسۆزییەوە دەکەوێتە بە ئایدیالی کردنی (وەکو بویاردۆ لە ئورلاندۆی ئاشقدا ئەمەی کردووە).

ئاریوستۆ، وەکو سیموندز دەڵێت: "دەکەوێتە موجامەلە و مدارا... فەلسەفەی وی ئەوەیە کە بە زەردەخەنەیەکی هەموار و ریشخەنێکی قوڵ، بەڵام نەك تیژ تیرەی بەشەر... ئەو بەشەر وێنە دەگرێ نەك بەو جۆرەی پێویستە وابێ، بەڵکو بەو شێوەیەی کە دەیبینێ.

ئورلاندۆ-ی تورە، لاوازی کەم و کورتیشی هەیە. رەنگە دیارترینیان ئەو ماستاوە خەستە بێ کە ساکارانە بۆ ماڵباتی ئەستە- سارد دەکرێتەوە یان لە هەموو بەندێکی ئەم بەیتەدا بە ئاشکرا ستایشی ئەسڵ و فەسڵی ئەم خانەدانە دیارە، و ئاریوستۆ لەم رووەوە دەچێتە ریزی ئەو شاعیرانەوە کە رەسەنترین بەهرەیان لە ستایشی دەربارێدا بە فیڕۆ داوە.

کێماسی دووەمی بەیتەکە دووبارە کردنەوەیە. ئورلاندوی تورە، وەکو((مەلیکەی پەرییان))ەکەی سپنسەر، داستانێکی مەزنی تەواو نەکراوە، بە وەسفی بێ شوماری خانمانی بێکەس و نەبەردانی هۆڤیانە، خوێنەر بێتاقەت و بێزار دەکات، جا وەسفەکانیش هەموو دەشوبهێنە سەر یەکتر. کێماسی سێیەمی بەیتەکە، خاڵی بوونیەتی لە نێوەرۆکی مەعنەوی یان ئەخلاقی. رەخنە گرێك دەڵێت ئەگەرچی شێوازی ئەو لە وەسفی جوانی بەسەر ژیانەوە قوڵە، بەڵام رەگ و ریشەی لە ژیاندا نییە. رەخنەگرێکی دیکە دەڵێت کە ئەم ئیرادە هەر لە ئاریوستو ناگیرێ، بەڵکو لە بویاردۆ و پولچی-ش دەگیرێ، و لە دوا ئەنجامدا شاکارەکانیان جامعییەتیان نییە و زەمانە ژاکاندوونی. لە بەرهەمی ئەواندا هیچ هاوارێکی دڵ تەزێن لە ناخی مرۆڤەوە نابیسترێ، هیچ دڵە خورپەیەك لە هەنبەر ختوکەی ویژدانی ئەخلاقیدا ریتم و ئاهەنگی ئەم بەرهەمانە ناشڵەقێنێ.

بەیتەکەی ئاریۆستۆ ئیجابیاتی خۆیشی هەیە، کێشی خێرا و بەلەز، بەرزە خەیاڵی، روحسووکی و دڵخۆشی، هەمە رەنگی، شوخیبازی، و ئەستاتیکای داهێنەرانەی بەیتەکە

هەمیشە مایەی پەسن و ستایش بووە. نووسەر نۆڕینێکی قووڵی کەڵکەڵەکانی مرۆڤ بە زەردەخەنەیەکی پڕ توانج-ەوە لێی دەڕوانێ. یەکێك لە لایەنە ئیجابییەکانی ئەم بەیتە کە هەموو توێژەرەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە شێوازە پوختەکەیەتی . ئاریۆستۆ ماوەی بیست و شەش ساڵ بە نووسین و پاکنووسکردنەوەی ئورلاندۆی تووڕەوە خەریك دەبێ ئەوەندە بەسە بۆ سەرکەوتنی نووسەر ئەوەیە کە لەم داستانە پەنجا هەزار بەیتییەدا، ناتوانرێ تاقە یەك بەند یا کۆپلەی لاواز و ناپوختە و نەهاوئاهەنگ بدۆزرێتەوە، ئاریۆستۆ نێوەڕۆکی داستانەکەی بە هەڵبەستێکی گونجاو دەگێڕێتەوە: هەڵبەستێکی خۆش ریتم، بێ گرێ و دوور لە رازانەوە (بە سنعەتی جوانکاری)، هەڵبەستێکی بێ تەکەلوف بەڵام نەك بێ سەروبەر. پیاوانە، بەڵام نەك رەق.

کاریگەری ئورلاندۆ-ی تووڕە:

شۆرەتی بەیتی ئورلاندوی تووڕە لە نێو خەڵکی و کاریگەری و ئیحتوباری مایەی سەرسامییە، تەنیا لە سەدەی شانزەیەمدا سەد و هەشتا جار چاپدەکرێتەوە. بۆ هەموو زمانانی دنیا وەردەگێردرێ و دەبێ بە سەرمەشقی ئەدەبیاتی زۆربەی میللەتانی دنیا، گەلێك لە نووسەران قەرزارباری ئەم بەیتەن: تاسۆ، سێرڤانتیس، سپنسەر، شەکسپیر، میلتن، بایرۆن و شیللی.

## بەیتێن شوانکارەیی

پاکۆپو ساناتسارو (۱٤٥٨- ۱٥۳۰):

شاعیر و چیرۆکنووسە. لە ماڵباتێکی ئەسپانیایی نەژاد لە ناپولی هاتووەتە دنیاوە. لایەنگری دڵسۆزی شاهانی خانەدانی ئاراگۆن بوو، بەتایبەتی هی فدریك-ی دوایین شای ئەوان. ساناتسارۆ لە ساڵی ۱٥۰۱دا کاتێ کە فدریك بۆ فەرەنسا دوورخرا بووەوە لەگەڵیدا چوو بۆ ئەوێندەر، وەختێ فدریك لە ساڵی ۱٥۰٤دا مرد، ئەویش (ساناتسارۆ) بۆ ناپولی گەڕایەوە و تا مردن هەر لەوێندەر مایەوە. ساناتسارۆ کۆمەڵێك بەستەی شوانکارەیی، ژمارەیەك هۆزانی لیریکی و یەك بەرهەمی داستانی بەزمانی لاتینی نووسیوە، زۆر شیعری لیریکیشی بە زمانی ئیتاڵیایی داناوە. بە رۆمانسی "ئارکادیا" ، کە رۆمانسێکی شوانکارەییە، بەناوبانگە.

((ئارکادیا))

لە ساڵی ۱٥۰٤دا بڵاوبووەتەوە. بەشێکی بە هۆزانە و بەشێکی بە نەزمە (هەڵبەست). ساناتسارۆ لەم بەیتەیدا قەرزارباری شێواز و گوزارشت و تیمە و نێوەڕۆکی چیرۆکی فیلوکولو و

بەیتی ئامیتۆ-ی بۆکاچۆیە. هەروەها لە کاریگەری ئەمانەش بەدەر نەبووە! تیوکریتوس، بیون، کاتولوس، ڤیرجیل، ئوڤید، ئاپولیوس، و پترارك. لەڕاستیدا وا دێتە بەرچاو کە بەیتی (منظومة) ئارکادیا بەو بونیادە ئالۆزەوە کە هەیەتی، لە کۆمەڵە بەند و کۆپلەیەکی بچووك بچووك پێکهاتبێ و هەر کۆپلە و بەندێکی لە شوێنێکەوە کۆکرابێتەوە. سینسرۆ-ی قارەمانی ئەم بەیتە ئاشقی ئامارانتایە، و ئامارانتاش گوێی ناداتێ. ئەو هەوڵدەدا ئەم ئەشقە بێ ئاکامە فەرامۆش بکات و هەر بەو مەبەستە ڕێگەی سەفەر دەگرێتەبەر و لە ئارکادیادا گۆشەنشین دەبێ، هەستی ڕوودانی کارەساتێك بەرەو ناپولی بکێشی دەکات، و لەوێندەر هەواڵی مەرگی ئامارانتا دەژنەفێ، ساناتسارۆ لەم قاڵبە چیرۆکڤانییە لاوازەدا وەسفە جوانەکانی خۆی بەرجەستە دەکات- وەسفی ئارکادیای ئارام، وڵاتی دێهاتییانەی خەیاڵ ئەنگێز کە زێدی شوانانی شاعیر و ئەڤیندار و ئاشقی پیشەیە.

ئەم بەرهەمە ڕێچکەیەك دەکاتەوە کە زۆر زوو لە سەرانسەری ئەورووپادا بەرەو دەسەنێ و لە هەندێ وڵاتاندا تا کۆتایی سەدەی هەژدەیەمیش بەردەوام دەبێ. "شوانی وەفادار" نووسینی گوارینی، "دیانا" نووسینی مونتمایر، "ئارکادیا"ی نووسینی سیدنی، و "ئاسترە" نووسینی ئورفە، هەر هەموو لە بەیتەکەی ساناتسارۆ ئیلهامیان وەرگرتووە. نووسەری دیکەش لە کاریگەری ساناتسارۆ نەخەلەسیون، لەوانە: تاسۆ: سپنسەر، مارلۆ، شەکسپیر، فلچر، میلتن و کیتس.

## فەلسەفەی ڕامیاری

### نیکولۆماکیاڤیلی (١٤٦٩- ١٥٢٧):

هزرڤانی سیاسی، مێژوونووس، و شانۆنامەنووسە، لە فلورانس لە دایك بوو. بابی مافناس و داکی شاعیر بوو. نیکولۆ بەشی زانستە مرۆڤانییەکانی خوێندووە. لە ساڵی ١٤٩٨دا بووە بە ئەندامی شورای دە نەفەری، کە دەستەیەکی تایبەتی قانون دانانی کۆماری فلورانس بوو. نیکولۆ بۆ زۆر سەفەری سیاسی بۆ دەرەوەی فلورانس نێردرا، لەوانە چەند ماموریەتێك بۆ دەرباری تزار بورجا"[٤٩]" . لە ساڵی ١٥١٢دا کاتێ مدیچی دووبارە لە فلورانسدا دەسەڵاتی وەرگرتەوە، هەڵبژێردرا نیکولۆ پایەکەی خۆی لە دەستدا و پەنای بۆ مەزراکەی خۆی، لە نزیکی فلورانس، برد، لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەی کە لەوێندەر مابووەوە، کتێبی (میر و چەند گوتارێك دەربارەی یەکەمین دەیەی تیتوس لیڤی) نووسی. لە ساڵی ١٥١٩دا جارێکی دی بەر لوتفی مدیچی کەوتەوە و ڕاسپێردرا کە بەرنامەی ڕیفۆرمی سیاسی فلورانس ئامادە بکات. لە

ساڵی ١٥٢٠ەوە تا ١٥٢٥ خەریکی نووسینی مێژووی فلورانس بوو. دوو ساڵی دواتری بۆ تەواو کردنی بەرنامەی هێزی سوپایی شار تەرخانکرد. لە مانگی مایسی ساڵی ١٥٢٧دا جارێکی دیکە مدیچییەکان لە فلورانس راونران، جارێکی دی حکومەتی شار بووەوە بە حکوومەتی کۆماری، و ماکیاڤیلی دیسان بەرغەزەب کەوت، و ئەوە بوو دوای یەك مانگ کۆچی دوایی کرد.

ماکیاڤیلی وەکو زۆربەی نووسەرانی ئاخر و ئوخری رینیسانس، لە زەمینە و مەیدانی جۆراوجۆردا خۆی جەرباندووە- واریقاتنامەیەکی شیعری، چەند نامەیەك، چەند راپۆرتێك، کتێبێکی مێژوو، کۆمەڵە وتارێکی سوپایی و چەند شانۆنامەیەك دەنووسێت (ماندرا گۆلا، یەکێکە لەشانۆنامە نەئەخلاقییە رەشبینەکانی وی، کە بە چاکترین شانۆنامەی سەردەمی رینیسانس دێتە ژماردن). بەڵام شۆرەتی ماکیاڤیلی تەنیا و تەنیا بە کتێبی (میر)ەوەیە.

(میر):

(لە دەوروبەری ساڵی ١٥١٣دا نووسراوە، و لە ساڵی ١٥١٦دا بڵاوبووەتەوە) رەنگە یەکەمین نووسینی سەردەمی تازە بێ لە مەیدانی فەلسەفەی سیاسیدا، ماکیاڤیلی لەم نامەیەدا ئەوە رادەگەیەنێ کە حکومەتی کۆماری باشترین جۆری حکوومەتە، لە جیهانێکدا کە فێڵ و تەڵەکەبازی و خۆپەسندی و بەغیلی بڵاودەبێتەوە، هەندێ جار رابەرێکی دەسەڵاتدار (میر) ناچار دەبێ هێز بەکاربێنێ و بە ئاگر وەڵامی ئاگر بداتەوە، و هەموو راپەرینێك بە توندی سەرکوت بکات. میری ئاقڵ لەسەرێتی چاکە و فەزێلەتی تەقلیدی بکات بە پیشەی خۆی، بەڵام لەو کاتانەدا کە بەرژەوەندی وڵات ئیجاب بکات، بێ چەند و چوون لەو چاکەکارییە لابدات و پشتگوێی بخات. لە پێناوی گەیشتن بە مەبەستی خۆی کە دامەزراندنی حکوومەتێکی بەهێزە، هەموو رێگەیەك بگرێتە بەر، ئەگەر پەیمانشکێنی و کوشت و کوشتاریشی تێدابێ، ماکیاڤیلی ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە وڵات هێزی پەیداکرد و سەقامگیر بوو، ئەوا میر دەبێ مل بۆ بەرقەراری کۆمار یا بەلای کەمەوە پەرلەمانی پاشایەتی بدات.

لە رۆژگاری ماکیاڤیلییەوە تاکو ئەمرۆ خەڵکانێك نامەی میر-یان بە بەرهەمێکی شەیتانی و ناوی نووسەرەکەیان بە هاوتای ناوی ئیبلیس لە قەڵەم داوە. ئەو خەڵکانە هەندێ دەستەواژە و پەرەگرافیش دەکەن بە نموونەی دەستیان بۆ سەلماندنی کەچرەوی و گەندەڵی ئەخلاقی نووسەرەکەی. هەر چەندە ئەم بۆچوون و نۆرینە هەندێ لە ئینسافەوە دوورە و سەبارەت بە هەموو

تیورییەکانی ماکیاڤیلی دادوەرانە نییە، بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنرێ کە ماکیاڤیلی ئەوەندەی بایەخ بە سیستەمی حوکمڕانی دەدات ئەوەندە بایەخ بە تاك نادات، و خەڵکانی وەکو ناپلیۆن "٥٠" بۆناپارت، بیسمارك "٥١"، ئادولف هیتلەر، موسولینی، و ستالین بە دیارترین نوێنەری تیۆرییەکانی وی دەژمێردرێن، و لە حکومەتەکەی ویدا چ هەواڵێك لە ئەرك و تەکلیفی مەزهەبی و ئەخلاقی لە گۆڕێ نییە. بەڵام نابێ ئەوە لە یاد بکرێ کە مەبەستی بنچینەیی ماکیاڤیلی ئیتالیایی یەکپارچە و بەهێزە و میر لە رۆژگارێکدا دەنووسرێ کە ئەم نیمچە دوڕگەیە بەسەر کۆمەڵێك ویلایەتی بچکۆلەی سەربەخۆدا دابەش بووە کە بەردەوام دژی یەکتر وەستاون و لەلایەن دەرو دراوسێیانی بێگانەی بەهێزەوە گەمارۆ دراوە و چاوی تەماحیان تێ بڕیوە.

دوا فەسڵی ئەم کتێبە، بە تۆنێکی تەواو جیا لە فەسڵەکانی پێشوو، دەکەوێتە داکۆکی و بەرەڤانییەکی پڕهەست و سۆز لە ئیتاڵیایەکی سەربەخۆو یەکگرتوو.

شێوازی پەخشانی ماکیاڤیلی روون، راشکاو، دڵگیر و تەواو بەدەرە لە هەر نارایشتێکی جوانکاری.

## ئەدەبیاتی ئەتەکێت "٥٢"

بالداساره کاستیلونه (١٤٧٨- ١٥٢٩):

لە مانتوا "٥٣". هاتۆتە دنیاوە. سەر بە دەرباری دۆك-ی ئوربینو "٥٤" بوو، بە مەبەستی ئەنجامدانی کارێکی سیاسی چوو بۆ ئینگلیستان، پاشان بە پلەی سەفیری دۆکی ئوربینو لە رۆم داخڵی دەرباری پاپالیوسی "٥٥" دەیەم بوو. دوای ماوەیەکی دی چووە دەرباری پاپا کلیمنس "٥٦"-ی حەوتەم، وەختێ رۆم لە لایەن لایەنگرانی ئیمپراتۆرییەتەوە تالان کرا، پاپا بە کورتبینی و لاوازی سیاسی تاوانباری کرد. کاستیلونە هەر چەندە بێ تاوانی خۆی سەلماند، بەڵام بە رادەیەك دڵی شکا کە دوای ماوەیەکی کەم لە داخا مرد. کاستیلونە لە دید و نۆڕینی هاوعەسرانی خۆیەوە نموونەی هەموو ئەو سیفەتانەیە کە بە "مرۆڤی دەرباری" یەکەی خۆیی بەخشیوە.

"دەرباری" (١٥٢٨):

ئەم بەرهەمە بریتییە لە راپۆرتێك دەربارەی ئەو گفتوگۆ و دیالۆگە خەیاڵییانەی کە لە دەرباری دۆك ئوربینۆدا ئەنجام دەدرێ، لەم گفتوگۆیەدا باسی ئەو توانا و بەهرانە کراوە کە

پێویستە لە هەر ئەجیمزادەیەکی دەرباریدا هەبێ. ئەمە جگە لەوەی گفتوگۆیەکان پەل بۆ پاکڕەوشتی خانمانی نموونەیی دەرباریش دەهاون.

کاستیلونە سیفەتی هەمە لایەن بە مرۆڤی دەرباری یەکەی خۆی دەبەخشێت، وەکو مرۆڤێك دووربین، ژیر و کارزان تەقریبەن لە هەموو وارێکدا، وێنەی دەگرێت، مرۆڤی دەرباری، لەشکری، پێشەنگ، سیاسەتوان، وەرزشکار، هونەرمەند و ئەدیبێکی تەواوە، دەبێ نەفس بەرز و سەرفراز و نەجیب و هەستیار و بە زەوق و سەلیقە بێ. ئەشقی ژنێکی جوان دەیگەیەنێتە لوتکەی کەماڵ، ئەم ئەشقە بە هەموو مانەیەك ئەشقی ئاسمانییە، و ژنەی دلبەر دەبێ یەجگار میانڕەو بێ- نەلاسار و چاو قایم و نە شەرمن بێ، نامەی دەرباری باسی ئەشق و ئەشقی بێ رتوشی-شی کردووە، و کاردیناڵ پیترو بمبو (لە گفتوگۆیەکان) بە باشترین شرۆڤەکاری ئەم نامەیە دەژمێردرێ.

کتێبەکەی کاستیلیونە زۆر زوو لە ئەوروپای رۆژئاواییدا شۆرەتی پەیدا کرد، پاش سی و سێ ساڵ لە دانانی وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی، و لە هەموو کەس پتر کارێکی کردووەتە سەر بەرهەمەکانی سیدنی و سپنسەر.

## ئۆتوبیۆگرافی

<u>بنونوتوچلینی (١٥٠٠- ١٥٧١):</u>

لە فلورانس لە دایك بوو. لە واری مسکاری و پەیکەرسازیدا (بەنووسینی خۆی) خوازیارانی زۆری هەبووە، وێڕای ئەمەش قۆناغی لاوی بە ئاوارەیی و دەربەدەری لەم شار و لەو شار بردۆتە سەر، و بە زۆری لە رۆم، فلورانس و پاریسدا سەرگەردان بووەو هەر لە فلورانسیش کۆچی دوایی کرد.

<u>ئۆتوبیوگرافی چلینی (تا ساڵی ١٧٢٨ بڵاونابێتەوە):</u>

یەکێکە لە گەورەترین و جوانترین ئۆتوبیوگرافییەکانی جیهان. بێ ئەوەی گوێ بەوە بدات کە بە فیشاڵبازی و درۆیان تاوانبار بکرێ، بێباکانە هەر هەموو قۆرپیاتەکانی خۆی، لە دزی و هەرزەکارییەوە تا دەگاتە رەفتاری هۆڤیانە دەگەڵ ماشوقەکانیدا، ئاشکرا دەکات، لە بندێر پەنای وێنەکانیدا، سیمای ئیتاڵیای سەردەمی رینیسانس بەرجەستە دەکات- هەندێ لایەنی متمانە بە خۆبوونی ئەم وڵاتە، کە هەندێ جار توندە و هەندێ جار دێتە خوارەوە بۆ ئاستی فیشاڵبازی، و هەندێ ساتی پڕجۆش و خرۆشی بۆ جوانی حەقیقەت، جوامێری و جەنگاوەری، و

ستەمکاری و دڵڕەقی نیشان دەدات. ئەم ئوتۆبیوگرافە زێدەباری ئەمانـە، راپـۆرێکی بـەهادار دەربارەی بـارودۆخی ئیتالیـا و فەرەنـسای ئـەو رۆژگـارە بەدەسـتەوە دەدا، حـاڵ و ئـەحواڵی نـاودارانی وەکـو فرانـسوا "٥٧" ی یەکـەم، و دۆك کوزیمـو مدیـچی فلورانـسی دەگێڕێتـەوە کـە هەردووکیان لە هاندەران و پشتیوانانی گەورەی هونەر بوونە.

## شانۆنامە

لە ئیتالیای سەردەمی رینیسانسدا، قەرینە و نموونەی وەکو شـانۆنامانی سـەدەکانی نـاڤین یەجگار کەم بوو. حاڵی زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای رۆژئاواش هەر بـەو جـۆرە بـوو، لـە ئـاخر و ئۆخری ساڵی ١٤٧٢دا ئانجیلو پۆلیتسانۆ، بە لاسـایی کردنـەوەی ئەفـسانەی کـۆنی ئورفیـوس شانۆنامەیەکی نەمەزهەبی لە ژێر سەر ناوی (ئەفسانەی ئورفیـو) نووسـی، کـە بـە نوقڵانـەی سەرهەڵدان و گەشـەکردنی شـانۆنامەی شـوانکارەیی دادەنـرا، و بویـاردۆ لـە سـاڵی ١٤٩٤دا "تیمونـە"ی نووسـی، کـە ئامادەکردنەوەیـەکی درامیانـەی چـیرۆکی بـەناوبانگی (تیمـونی ئـاتینی "٥٨")بـوو، ئـەم شـانۆنامەیە چـەند کاراکتـەرێکی مـەجازی (وەکـو "هـەژاری" و "دەوڵەمەندی") تێیدایە، کە دەیخەنە ریزی دوا نەوەی شانۆنامانی ئەخلاقییەوە.

وێڕای ئەم شانۆنامە کۆن و تەقلیدییانـە کـە نیـشانەی قۆنـاغی گـۆڕانی شـانۆ بـوون لـە شانۆنامەی مەزهەبییەوە بۆ شـانۆنامەێن نـە مەزهـەبی، شـانۆنامانی تراجیـدی، کۆمیـدی و شوانکارەییش هاتنە ئاراوە.

<u>تراجیدیا:</u>

لـە مەیـدانی تراجیـدیادا هـیچ بەرهـەمێکی بەڕاسـتی گـەورە پەیـدا نـەبوو. زۆربـەی تراجیدیانووسان شانۆنامەکانی "سنکا"یان دەکردە سەرمەشقی خۆیـان و لـە داب و نـەریت و رەفتار و هـەڵس وکـەوتا پـەیڕەویٚ پرەنـسیپەکانی هـوراس-یـان دەکـرد. پلـۆت و نەخـشەی شانۆنامەکان بـە زۆری لاواز و میلـۆدرامی بـوو، و زیـاتر هەڵگەڕانـەوەی بـەخت و یـەغباڵی بەرجەستە دەکرد- کەوتنی نەجیمزادەیەك لە لوتکەی عیزەت و سەرفرازییەوە بـۆ قـولایی رۆژ رەشی و نەگبەتی، بەزۆریش رووداوانی چیرۆکی شانۆنامەکە لە پشتی پەردەوە روویان دەدا و لە رێگەی جارچییەوە ئەمـە دەگێڕدرانـەوە. ئـەم جـۆرە شـانۆنامەیە بـە (تراجیـدیای زانایانـە) بـەناوبانگ بـوو، کـۆنترین نموونـە تراجیـدیای (سوفونیـسبا "٥٩")یـە (١٥١٥) لـە نووسـینی تریسینۆ "٦٠". چەند نموونەیەکی دیکەی ئەم جۆرە شانۆنامەیە بریتییە لە: (ئوربیکـە- ١٥٤١) نووسینی چینیتۆ، (ئوراتـسیو- ١٥٤٦) کـە تراجیدیایـەکی شـیعرییە و لـە نووسـینی پـیترو

ئارتینو"[٦١]" یە، (ماریانا- ١٥٦٥) لە نووسینی دولچە"[٦٢]" یـە، و (توریسموندو- ١٥٨٦) لـە نووسینی تاسۆ-یە.

کۆمیدیا:

وەزع و حاڵی کۆمیدیا، لە چاو تراجیدیادا پوختەتر بوو. سێ جۆرە کۆمیدیا گرنگ و باوبووە.

کۆمیدیای رەفتاران (کۆمیدیای زانایانە):

ئـەم جـۆرە کۆمیدیایـە لاسـایی کردنەوەیـەکی شـانۆنامەکانی پلاوتـوس و تـرنس بـوو. (کاساریا- ١٥٠٨)ی ئاریوستۆ بە یەکەمین کۆمیـدیای رەفتـاران لـە سـەردەمی رینیسانـسدا دەژمێردرێ، کە دوا بە دوای ئەو چـوار کۆمیـدیای دیکەشـی نووسـی: (جێنـشینان- ١٥٠٩، جادووباز- ١٥٢٠، لینا- ١٥٢٩، و خوێنکاران- کە تاکو مردنی خۆی لە ساڵی ١٥٣٣دا هەر تەواو نەبوو). کۆمیدیا گرنگـەکانی دیکـە بـریتین لـە: (مانـدراگولا- ١٥١٢، لـە نووسـینی ماکیاڤیلی)، (کالانـدریا- ١٥١٣، لـە نووسـینی دۆڤیـزی"[٦٣]")، کـە لـە بابـەتی کۆمیـدیای هەڵەکان-ی شەکسپیرە، و (خانمی دەرباری- ١٥٢٥، لە نووسـینی ئـارتینۆ، کـە هەجوویـەکی "کۆمەڵگەی دەرباری"ی کاستیلیونەیە.

فارس:

جۆرە شانۆنامەیەکی سوکەڵەیە، و لە "نیو پـەردەی" شـانۆنامانی ئینگلیـستان دەچـێت. فارس لە سـەرەتادا شانۆنامـەیەکی خۆشبووە کە لە بنچینەدا بە شـێوەی شـانۆنامەیەکی جـدی رەمزنامێز نمایش دەکرا و کاریگەرییەکی کۆمیدی هەبووە و پاشان شێوەیەکی سەربەخۆی پەیدا کرد. نوکتەو حەنەکی نێو فارس راستەوخۆ و زبرە، کاراکتەرەکانی لە سەرەتادا دێهاتیـانی رەق یا لێبوك بوون، لە فارسـان-ی دواتـردا نموونـانی (وەکـو سـەربازی فیـشاڵباز، و ئـادەمیزادی خۆهەڵکێش) جێی کاراکتەرەکان دەگرنەوە. یەکەمین شانۆنامەنووسێك کە دەکەوێتە نووسـینی هەوەڵین فارسانی ئیتالیایی، جۆڤانی ماریاچککی (١٥١٨- ١٥٨٧).

(کۆمیدیای دیل ئارتەئا-ی راستەوخۆ):

لەڕووی مێـژوویی و لـە بـاری کاریگەرییـەوە، گـرنگترین شـێوەی کۆمیـدیای سـەردەمی رینیسانسە. هەوەڵجار گرووپێکی کۆمیدێن-ی پیشەیی ئەم شێوەیەیان داهێنا، ئەوانە تیمـە و ناوەڕۆکی گشتی شانۆنامەکەیان وەردەگرت و هەموو دیـالۆگ و گفتوگۆیـەکانیان بـە شـێوەی ئیرتیجـالی و راسـتەوخۆ لەسـەر شـانۆدا ئـەنجام دەدا، پلـۆت و تیمـەی شـانۆنامەکانیش لـە سەرچاوەی جۆراوجۆرەوە وەردەگیرا. کاراکتەرەکانیش هەندێ جار وەکو ئەو نموونانە بوون کە لـە

کۆمیدیای رەفتاراندا هەبوون. یەکێك لە تایبەتمەندییە هەرە سەرەکییەکانی ئەم جۆرە شانۆنامەیە، سوودوەرگرتنی بەرە بەرە بوو لە کەسایەتییانی پێکەنیناوی ئیتالیای تازە لە جیاتی کەسایەتییانی تەقلیدی و قەراردادی کۆمیدیانی قەدیمی. کۆمیدێنەکان جۆرە دەمامکێکیان لەسەر دەکرد کە رەنگدانەوەی تەبع و تەبیعەت و خو و خولقی خۆیان بوو. کەسایەتییە بەناوبانگ و خۆشەویستەکانی کۆمیدیای دیل ئارتەئا (ئیرتیجالی) بریتین لە: پانتالونە، وەکو نموونەی باوکێك و کابرایەکی بازرگان رەفتار، دوو ئاشق بەناوی ئارلکینۆ و کولومبینا، پانتالۆنە لە شانۆنامەکاندا بە پانتۆلێکی دەڵب و جلی رەنگاورەنگ و دەمامك لە سەر، و شمشێرێکی دارین بە قەدەوە دەردەکەوێ.

کولومبینا-ی کیژی شۆخ و شەنگی ویژی رۆڵی پێچەوانەی ئارلکینو- دەبینێ. لیونکا"[٦٤] ڤالۆ بە ئۆپرای پالییاچی ئەم دوو کەسایەتییەی جاویدان کردووە. کۆمیدیا-ی دیل ئارتەئا کاری کردۆتە سەر (لوپە دوڤگا، شەکسپیر، سیمونیل جۆنسن، و مۆلیێر).

درامای شوانکارەیی:

شانۆنامانی شوانکارەیی لە ناوەراستی سەدەی شانزەیەمدا هاتە ئاراوە، چینیتۆ لە ساڵی ١٥٤٥دا شانۆنامەی "باز"ی (لەبەر رۆشنایی سیکلۆپەکان-ی یورپیدس و هەندێ تیمەی شانۆنامەکانی ثوڤید)ا نووسی، کە دیمەنەکەی بێشەیە، بەڵام ئەکتەرێکی لە دەوری شواندا نییە. ئاگوستینو"[٦٥] بکاری لە ساڵی ١٥٥٤دا شانۆنامەی (قوربانی) نمایش کرد کە زۆربە بە یەکەمین شانۆنامەی شوانکارەیی تەواوی دەزانن. لەم جۆرە شانۆنامەیەدا ئەڤین دەبێ بە تەوەری هەر هەموو پێچ و پەنای بویەرەکان و بەگرێی شانۆنامەکە، ئەو خەڵکەی کە نابێ ئاشقی یەکتر بن، حەز لێکدی دەکەن و دەبێ گرێی کارەکانیان بکرێتەوە. لە بونیاد و پێکهاتەی شانۆنامەی شوانکارەییدا گرێچن و گرێکردنەوە بە شێوەیەکی ئاسایی بە کۆمەکی تەگبیری وەکو لێکچوون، ناسینەوە و جێنشین سازی کەسێك لە جێی کەسێکی دی ئەنجام دەدرێ.

جگە لە "ئامینتا"ی تاسۆ، گرنگترین شانۆنامەی شوانکارەیی ئیتالیایی (شوانی وەفادار- ١٥٩٠)ی باتیستاگوارینی-یە. لەم شانۆنامە ئالۆز و زیرەکانەیەدا پێشبینی ئەوە دەکرێ کە سیلیویڤ و ئاماریلی پێکڤە زەماوەن دەکەن، وەکو چۆن لە رابردووی دوورا پێشبینی کراوە. لێ سیلیویڤ تەنیا ئاشق و دڵبەندی راوە، و ئاماریلی و میرتیلۆش حەزیان لە یەکترییە، میرتیلو شوانکارەیەکی وەفادارە، کاتێ کە ئاماریلی (بە فێڵ و دەهۆی کورسیکا، کە حەزی لە

میرتیلۆیە) مەحکوم بە مەرگ دەبێ، میرتیلۆ بۆ رزگاری ئەو تەنانەت بەرەو پیری مەرگیش دەچێت، لەم حاڵەدا پەی بەوە دەبەن کە میرتیلۆ و سیلیویڤ بە منداڵی لەگەڵ یەکترا گۆڕاون. سیلیویڤ لەگەڵ دۆریندا دا -کەساڵانێکی دوور و درێژ ئاشقی بووە- زەماوەند دەکات. ئاماریلی-ش دەبێ بە هاوسەری میرتیلو، و کوریسکا-ش عەفو دەکرێ.

ئەم شانۆنامەیە رەواجێکی میللی وەهای پەیدا کرد کە لە ماوەی ساڵانی ١٦٠٠و ١٨٠٠دا هەشتاجار چاپکرایەوە. لە دەرێی ئیتالیاشدا شۆرەتێکی زۆری پەیدا کرد، ئەو شانۆنامانەی دوا بەدوای ئەو لە ئیتاڵیادا هاتنە ئاراوە، باڵی کاریگەرییان بەسەر ئەدەبیاتی شوانکارەیی ئینگلیستانی سەردەمی ئەلیزابتی یەکەم (١٥٣٣- ١٦٠٣)و جیمز-ی یەکەم (١٦٠٣- ١٦٢٥)دا کێشا. جان فلچر شانۆنامەکەی گوارینی کرد بە نموونە و سەرمەشقی کارەکەی خۆی (ژنە شوانی وەفادار). گرین، مارلۆ، و شەکسپیر-یش راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ قەرزارباری ئەو کارەن.

## تاسۆ

تورکواتو تاسو (١٥٤٤- ١٥٩٥):

شاعیری لیریکی، شانۆنامەنووس، و داستانبێژە. لە سۆرینتۆ"٦٦" هاتە دنیاوە، لە قوتابخانەی یەسوعیان"٦٧" دەستی بە خوێندن کردووە، و لە بیرگامۆ"٦٨" و ئوربینۆ، و ڤینیسیا، و رۆمدا درێژەی پێداوە، ئەویش وەکو پترارك و بۆکاچۆ، بە زۆری بابی کەوتە خوێندنی ماف، بەڵام زۆر زوو ئەم بەشەی تەرك کرد و رووی کردە ئەدەبیات، تاسۆ لە هەوەڵەوە چووە خزمەتی کاردینال لوئیجی کە لە خانەدانی ئەستە بوو، بەڵام پاشان بوو بەشاعیری دەرباری ئالفونسو-ی دۆکی فرارا. لە ساڵی ١٥٧٥دا داستانی مەنگ و مەند و پڕ جۆش و خرۆشی (ئۆرشەلیمی ئازاد)ی نووسی، ئەو چوار رەخنەگرەی کە هەڵسەنگاندنی ئەم بەیتەیان پێ سپێردرا بوو هێندە بە بێ ویژدانی لایەنە ئەدەبی و مەزهەبییەکانی ئەم بەرهەمەیان هەڵسەنگاند ناسك و هۆشنی تاسۆ تەواو تێکچوو و دووچاری، کە تەبیعەتی مەیلەو شێتی بوو. ماوەی سێ ساڵان ئاوارە و سەرگەردان بوو، و سەرەنجام بۆ فرارا گەڕایەوە. لێرەدا هێندەی دی ناڕەحەت بوو، و لە ساڵی ١٥٧٩دا بە تەواوەتی شێت بوو. ماوەی حەوت ساڵان لە نەخۆشخانەی سانتاناادا خرایە ژێر چاودێری پاشان مەرەخەس کرا، لەو ماوەیەدا داستانەکەی چەندین جار چاپکرا بووەوە و تەواو مەنشوری کردبوو. دوا ساڵەکانی تەمەنی شاعیر لە ئاوارەییدا بەسەر برا و رێی دەکەوتە هەر

شوێنێ بە شانازییەوە پێشوازی لێدەکرا. تاسۆ بە چەند رۆژێك بەر لە وەرگرتنی تاجی میری شاعیران -کە پێشتر تەنیا بە پترارك درا بوو- کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی تاسۆ:

تاسۆ نووسەرێکی پڕ بەرهەم بوو، و لە بواری هۆزانی لیریکی، دیالۆگ، باس، شانۆنامە، بەیت و داستان، و نامەنووسیندا خۆی جەرباندووە، لە نێو بەرهەمەکانیا تەنیا دووانیان شایستەی باسی تێر و تەسەلن:

"ئامینتا- ١٥٧٣":

شانۆنامەیەکی شوانکارەییە، بە تیمە و ناوەڕۆکێکی سادە و رۆمانتیکییەوە: ئامینتا بە بێهودە حەز لە سیلویا دەکات، و تەنانەت کاتێ کە لە چنگی ساتیرێك"[٦٩]ی هەرزەش رزگاری دەکات، سیلویا گوێی ناداتێ. ئامینتا-ی هێڤی بڕاو خۆی لە هەڵدێرێکی بەرزەوە هەڵدەدێرێ، سیلویا پەشیمان دەبێتەوە و تازیەی بۆ دەگرێت. لەم حاڵ و بارەدا هەواڵێك دەگات کە دەوەنێك گیانی ئامینتا-ی رزگار کردووە، ئیدی جووتە ئاشق بە یەکدی دەگەن و هەموو شتێك بە خۆشی و شادی دەبڕێتەوە، ئامینتا، ئەگەرچی شانۆنامەیەکی سادە و ساکارە، کاراکتەرەکانی قەراردادی و تەقلیدین، بەڵام تەژی ئەستاتیکا و ناسکی شاعیرانەیە، ئەم شانۆنامەیە لە رۆژگاری تاسۆدا سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێناوە- و هێشتاش هەر جوانە دەخوێنرێتەوە- چونکە رەنگدانەوەی ئەو جۆش و خرۆشەیە کە سەبارەت بە سەردەمێکی زێڕین لەئارادا بووە، و جیاوازی بەینی دنیای واقیعی ئارەزووەکان و خیانەت و شەڕ، لەگەڵ جیهانی ئایدیالیستی شادییەکان، وەفاداری و ئاسوودەیی نیشان دەدات. وا دیارە ئەم شانۆنامەیە کاری لە گوارینی، سیدنی، سپنسەر، گرین، شەکسپیر، فلچر و میلتن کردووە.

ئۆرشەلیمی ئازاد- ١٥٧٥):

شاکاری تاسۆیە، داستانێکی بیست بەشییە لە قاڵبی بەندێن هەشت بەیتیدا (ئوتاڤاریما)، ئەو کاتانەی کە شاعیر بە هۆی شێتییەوە لە نەخۆشخانە بوو، ئەم بەیتە دوو جاران بەبێ مۆڵەت چاپکرایەوە، دەقە مۆڵەتدراوەکەی تاسۆ-ش لە ساڵی ١٥٨١ دا چاپکرا. تاسۆ لە ساڵی ١٥٩٣دا گێڕانەوەیەکی تازەی هەمان بەیتی لە ژێر سەرناوی ((ئۆرشەلیمی یەخسیر))دا بڵاوکردەوە- کە لە چاو بەیتەکەی پێشوودا لە ئاستێکی نزمتردایە.

ناوەڕۆك و بابەتی بەیتی (ئورشەلیمی ئازاد) بریتییە لە بویەری گرتنی ئۆرشەلیم لە ساڵی ١٠٩٩دا، لەلایەن گودفروادوبویون"[٧٠] و پەیڕەوانییەوە لە یەکەمین جەنگی سەلیبیدا. ئەم

مەسەلەیە لە دوا چارەکی سەدەی شازدەیەمدا مەسەلەی رۆژ بوو، چونکە تورکەکان جارێکی دی بە هەڕەشە بۆ سەر ئەورووپای رۆژئاوایی دەژمێردران و هەندێ جار هێرشیان بۆ سەر ئیتالیا دەبرد، تاسۆ بەیتەکەی خۆی بە داستانی دنیای مەسیحییەت ناو دەبرد. ئەم داستانە، وەکو خوێنەرانی چاوەنۆڕمم، زنجیرە شەڕێکی دلێرانە دەگێڕێتەوە. هەڵبەتە ئەم شەڕانە تاقە جازیبەی ئەم بەیتە نین، بەڵکو جەزابییەتی چیرۆکەکە لە باسی سێ بویەری ئاشقێنیدا پەنهانە: بویەری ئەڤینی سوفرونیا و ئولیندۆ، دوریندا و تاکردۆ، ئارمیدا و رینالدۆ.

سوفروینا و ئولیندو:

ئەم جووتە مەسیحییە کە لە ئۆرشەلیم دەژین ئاشقی یەکترن. کاتێ کە سوفرونیا بڕیاردەدا لە پێناوی رزگاریی مەسیحییانی شاردا بمرێ و خۆی دەخاتە سەر دار ئەستونەکان تا بیستونێن، ئولیندۆ بە درۆوە دەڵێ کە لە جیاتی سوفرونیا بیستوتێنن، هەردووکیان مەحکوم بەمەرگ دەبن، بەڵام لە دوا ساتدا بەمیانچێتی دوریندا رزگار دەبن.

دوریندا و تانکردۆ:

دوریندا، ئافرەتێکی سوارچاکی ساراسنە (عەرەب)، و تانکردۆی مەسیحی گیرۆدەی ئەڤینی وی دەبێ، و دوریندا گوێ بە ئەڤینی ئەو نادات، تانکردۆ بێ ئەوەی دوریندا بناسێت، لە شەڕێکی تەن بە تەندا بە خەستی برینداری دەکات، لێ دوریندا لەسەرە مەرگدا دەیبەخشێت، غوسڵی تەعمید دەکرێ، و پاش گەیشتنە بەهەشت زەماوەندی لەگەڵدا دەکات.

ئارمیدا و رینالدۆ:

ئارمیدا-ی جادووبازی موشریك، رادەسپێردرێ کە سیحر لە پەنجا سەرکردەی سوارچاکانی مەسیحی بکات. لە کارەکەیدا موەفەق دەبێ، بەڵام گیرۆدەی ئەڤینی رینالدۆ دەبێ کە یەکێکە لە ئازاترین سوارچاکەکان. ژنەی جادووباز رینالدۆ دەفڕێنێ و دەیبات بۆ شوێنێکی چەپەك لە دوڕگەیەکی دوورە دەستدا. گودفروا دەزانێ کە تەنیا رینالدۆ (کە ئەوی بە تاوانی کوشتنی مەسیحییەك لە شەڕی تەن بە تەندا نەفی کردووە) دەتوانێ ئۆرشەلیم بە گرتن بدات، پەیك و تەتەران بەملا و بەولادا دەنێرێ تا رینالدۆ بدۆزنەوە و نەجاتی بدەن، و رینالدۆ بۆ خەتی ئابلۆقە دەگەڕێتەوە. ئیدی شار دەکەوێ، و سوپای میسری کە بۆ شکانی ئابلۆقەکە نێردراوە شکست دێنێ. رینالدۆ و نەفەرەکانی ئارمیدا-ش، کە بە تەمای کوشتنی ئەون، راو دەنێ و ئارمیدا بەگیردێنێ و دەیهێنێتە سەر ئاییینی مەسیحی و دەیکات بە هاوسەری خۆی.

کورتەیەکی ئیراد و رەخنەکان:

رەخنەی ئەوە لە تاسۆ دەگیرێ کە رێگەی داوە ئەڤینی رۆمانتیکی لەسەر حیسابی فەرامۆشکردنی کاروباری سوارچاکی و قارەمانییەتی، بەشێکی فراوان لە بەیتەکەی داگیر بکات. وێڕای ئەمەش خوێنەرانی ئەمڕۆی بەیتەکە، گەمارۆی ئۆرشەلیم وەکو بابەتی شانۆنامەیەکی ئاشقانە تەمەشا دەکەن و رەنگە هەر ئەمەش مایەی رەزامەندی و پەسندی ئەنجوومەنانی دەرباری- کە بەیتەکە بۆ ئەوانە و ئەوان دەدوێنێ- بووبێ، بە هەر حاڵ، بەهرە و بلیمەتی تاسۆ پتر لە قەڵەمڕەوی هەستی ناسك، داهێنانی دیمەنێن جوان، و کەش و هەوای خەیاڵاویدایە تا لە دەربڕین و نیشاندانی گەورەیی و شکۆدا، و لە ئورشەلیمی ئازاددا بە تەواوی رێگەی بەم بلیمەتییە داوە.

رەخنەی ئەوە لە تاسۆ دەگیرێ کە وەسواسە لە مشتومالّدان و رازاندنەوەی بەرهەمەکانی، هەستی شۆخیبازی و حەنەکچیاتی نییە، شاخ و باڵی خەیاڵی لەبەرهەمەکانی نەناوە. لەلایەکی دیکەوە شێوەی مامەڵە کردنی لەواری وێنەگرتندا، بە تایبەتی وێنەی سیمای ژنان، هاوئاهەنگی و گونجانی لوژیکی بویەرێن بەیتەکە، ناسکی و سەنگینی تۆن، هەستی قوڵی مەزهەبی، دلگیریی پەیڤ و ئاخافتن، و ریتمی شیرینی شیعرەکانی مایەی ستایش بووە... کاری کردۆتە سەر سپنسەر و بایرۆن.

# پەراوێز و ژێدەران:

١- فیرارا- Ferrara:

شارێکی باکووری ئیتالیای ناوەندییە.

٢- ئاڤینیون: شارێکی باشووری رۆژهەلاتی فەرەنسایە، لە پروڤانس.

٣- شارلی یەکەم (١٥٠٠- ١٥٥٨):

لە خانەدانی شاهانی ئەسپانیاییە (١٥١٦- ١٥٥٦)، ئیمپراتۆری ئیمپراتۆرییەتی موقەدەسی رۆم بوو (١٥١٩- ١٥٥٦).

٤- بارتولومیودیاش (دیاز):

لە ساڵی ١٥٠٠دا مردووە، دەریاوانێکی پورتوغالی بوو، یەکەمین ئەوروپایی بوو کە بە دەوری "امیدنیک"دا لە ساڵی ١٤٨٨دا سووڕایەوە و بەجۆرە رێگەی دەریایی هیندی کردەوە.

٥- مانیتس: شارێکە لە رۆژئاوای ئەڵمان.

٦- یەکەمین گوناح- Orginal sin):

لە خواناسی مەسیحیدا، گوناحی ئادەمی بابی بەشەرە و لە ئەنجامی ئەم گوناحەوە تیرەی بەشەر لە فەیزی دراوسێیەتی خوا لە بەهەشتدا مەحروم بووە، هۆی ئەم مەحروم بوونە دەگەڕێتەوە بۆ یاخی بوون لە فەرمانی خوا و خواردنی میوەی قەدەغە (کە لە مەسیحییەتدا سێوە و لە ئیسلامدا گەنمە). لە قورئانی پیرۆزدا چەندین جار باسی ئەم یاخی بوونە کراوە. بۆ وێنە لە سورەتی پیرۆزی بەقەرەدا، ئایەتێن ٣٥و ٣٦و سورەتی تەها، ئایەتی ١٢١.

٧- کاردینال- Cardinal:

لە کڵێسای کاتولیکی رۆمیدا، بەو کەسانە دەگوترێ کە پایەی ئایینییان یەکسەر لە دوای پاپاوەیە.

٨- مایکل ئانجیلو (١٤٧٥- ١٥٦٤):

پەیکەرساز و تەلارساز و نیگارکێش و شاعیرێکی ئیتاڵیاییە.

٩- روفائیل (١٤٨٣- ١٥٢٠):

نیگارکێشێکی ئیتاڵیاییە، و یەکێکە لە گەورەترین نیگارکێشانی سەردەمی رینیسانس.

١٠- ئاندریە دلسارتۆ (١٤٨٦- ١٥٣١):

نیگارکێشێکی فلورانسییە، کە نازناوی نیگارکێشی بێ غەل و غەشیان لێنابوو.

١١- کۆردجۆ (١٤٩٤- ١٥٣٤):

نیگارکێشێکی ئیتاڵیاییە.

١٢- تینتورتۆ (١٥١٨- ١٥٩٤):

نیگارکێشێکی ئیتاڵیاییە و یەکێکە لە مامۆستا گەورەکانی سەردەمی رینیسانس.

١٣- فیچینو (١٤٣٣- ١٤٩٩):

فەیلەسووفێکی ئیتاڵیاییە.

١٤- پولیتسیانۆ (١٤٥٤- ١٤٩٤):

شاعیر و هۆمانیستێکی ئیتاڵیاییە.

١٥- میراندولا (١٤٦٣- ١٤٩٤):

هۆمانیستێکی ئیتاڵیاییە.

١٦- مدیچی (١٤٤٩- ١٤٩٢):

بە لورنتسوی مەزن ناسراوە، پیاوی سیاسەت و ئەدەبی ئیتاڵیا بوو.

١٧- فیورنتینۆ (سەدەی چواردەیەم):

چیرۆکنووسێکی مەیدانی کورتە چیرۆکی، ئیتاڵیاییە.

١٨- فرانکوساکیتی (١٣٣٠- ١٤٠٠):

نووسەر و شاعیرێکی ئیتاڵیاییە.

١٩- ماتیو باندولو (١٤٨٠- ١٥٦٢):

کەشیش و چیرۆکنووسێکی ئیتاڵیاییە.

٢٠- جیرالدی چینتیو (١٥٠٤- ١٥٧٣):

چیرۆکنووس و تراجیدیا نووسێکی ئیتاڵیاییە.

٢١- ئارتسو: شاری توسکان، ئیتاڵیا.

٢٢- ئاڤینیون: شارێکە لە باشووری رۆژهەڵاتی فەرەنسا، لە پرۆڤانس.

٢٣- زانکۆی مون پلیە (لە ساڵی ١٢٨٩ دامەزراوە):

کەوتۆتە شاری مۆن پلیە، لە باشووری فەرەنسا.

٢٤- زانکۆی بولونیا ( لە سەدەی یازدەیەمی زایینی دامەزراوە) کەوتووەتە شاری بولونیاوە لە باکووری ئیتالیای ناوەندی.

٢٥- لومبە: گوندێکە لەباشووری رۆژئاوای فەرەنسا، کە کلێسایەکی گەورەی سەدەی چواردەیەمی تێدایە.

٢٦- ڤۆکلوز: ناوچەیەکە لە پروڤانس-ی باشووری رۆژهەڵاتی فەرەنسا.

٢٧- میری شاعیرانی رۆم: پترارك دەیگێڕێتەوە کە لە هەمان ئەو رۆژەدا کە دەگاتە پایەی میری شاعیرانی رومی، پێشنیازی بۆ دەکەن کە ببێ بە میری شاعیرانی فەرەنسا و ئیتالیاش. لێ دڵبەندی ئەو بە بەرهەمێن لاتینی و رۆمییەوە، وای لێدەکات پایەی میری شاعیرانی ئیتالیا هەڵبژێرێ.

٢٨- کولادارینسی (١٣١٣- ١٣٥٤):

یەکێکە لەپیاوانی رۆم کە هەوڵێکی زۆری لە پێناوی چەسپاندنی دیموکراتییەت لە وڵاتەکەیدا، داوە.

٢٩- کارتاژە- Carthage):

شارێکی کۆنە لەسەر کەناری باکووری ئەفریقایە، لە کەناری کەنداوی تونس. کارتاژە (قرطاجة) ئەمرۆ بەشێکە لە قەڵەمڕەوەکانی تونس.

٣٠- ئافریکانۆس (٢٣٤- ١٨٣ پێش زایین):

یەکێك بووە لە سەردارانی رۆم.

٣١- ترزاریما- Terzarima:

شیعرێکە لە فۆرمی بەندی سێ بەیتیدا (بە زۆری لەسەر وەزنی یامبیك-ی پێنج سیلابییە) کە بەیتی دووەمی هەر بەندێکی لەگەڵ بەیتی یەکەم و سێیەمی بەندی دواتردا هاوقافیەیە. ئەم فۆرمە شیعرییە لە داهێنانی دانتییە.

٣٢- شاروبیر (١٢٧٤- ١٣٤٣):

بە رووبیر-ی دانا ناسراوە، شای ناپۆلی بووە (١٣٠٩- ١٣٤٣).

٣٣- چیرۆکانی رۆمیان:

ئەو کۆمەڵە حیکایەت و چیرۆکە لاتینییانەن کە لە سەرەتاکانی سەدەی چواردەمدا، رەنگە لە ئینگلیستان کۆکرابنەوە.

٣٤- ئەفسانەێن زێڕین:

کۆمەڵە ئەفسانەیەکە دەربارەی ژیانی روحانیان، بۆیەرەکانی ژیانی حەزرەتی مەسیح و مریەم، لەگەڵ کۆمەڵە زانیارییەك دا دەربارەی رۆژانی موقەدەس. دانەری ئەم بەرهەمە (Jacobusde Vogarine 1228- 1292)ـە کە نووسەرێکی ئیتالیاییە.

٣٥- سەد چیرۆکی کۆن:

کۆمەڵە چیرۆکێکە کە لە ماوەی ساڵانی ١٢٨١- ١٣٠٠دا نووسراون، و زۆربەی هەرە زۆری لە کتێبی موقەدەسەوە یا لە ئەفسانانی کلاسیکەوە وەرگیراوە.

٣٦- ئوتاڤاریما Ottavarime:

بەندێکی هەشت بەیتییە، کە بەیتی یەکەم و سێیەم و پێنجەم، بەیتی دووەم و چوارەم، و بەیتی حەوتەم و هەشتەم هاوقافیەن و هەر بەیتێکیش یازدە برگە (سیلابە).

٣٧- دیکتوس کرتی:

نووسەرێکی خەڵکی کریتە کە لە جەنگی تەروادە بەشداریی کردووە و واریقاتنامەیەکی ئەم جەنگە دراوەتە پاڵ وی کەیەکەم جار لە سەدەی چوارەمی زایینیدا بە زمانی لاتینی دەرکەوت و بوو بە سەرچاوەی چیرۆکەکانی سەدەکانی ناڤین دەربارەی جەنگی تەروادە.

٣٨- دارس فریگیە:

نووسەرێکی گریانەیی کتێبێکە لەمەڕ مێژووی جەنگی تەروادە.

٣٩- فیەزولە- Fiesoge:

ناوچەیەکە لە ئیتاڵیای ناوەندی، لە توسکان.

٤٠- لیدگیت (١٣٧٠- ١٤٥١):

شاعیر و رەبەنێکی ئینگلیزییە.

٤١- فیررز- Ferrers:

(١٥٠٠- ١٥٧٩): سیاسەتوان و شاعیرێکی ئینگلیزییە.

٤٢- بالدوین (١٥٤٧):

نووسەرێکی ئینگلیزە.

٤٣- ئولیڤەر: لە حیکایەتەکانی شارلمانیدا، دۆستی نزیکی رولانە.

٤٤- گانلون: لە حیکایەتەکانی شارلمانیدا، خیانەتکارێکە کە بۆ شکستی پاشینەی قۆشەنی شارلمانی لە رونسوفدا پیلان دەگێڕێ.

٤٥- لورتسۆی شکۆمەند (١٤٤٩- ١٤٩٢):

سیاسەتوان و زانایەکی فلورانسییە، هاندەر و پەنای شاعیران و نووسەران بوو.

٤٦- سوسیا- Sosia:

ناوی خزمەتکارێکە لە یەکێك لە شانۆنامەکانی پلاوتوسدا.

٤٧- رونسۆڤ: ملەیەکە لە پیرنەی رۆژئاوایی، بەینی فەرەنسا و ئەسپانیا، بە گوێرەی حیکایەت و ئەقلان رولان لەوێندەر دەکوژرێ.

٤٨- فرانچسکۆبرنی (١٤٩٧- ١٥٣٦):

شاعیر و تەنزنووسێکی ئیتالیاییە.

٤٩- تزار بۆرجا: (١٤٧٥- ١٥٠٧):

کاردینالێکی ئیتالیاییە و کوری پاپا ئەلکساندەری پێنجەمە.

٥٠- ناپلیون بۆناپارت (١٧٦٩- ١٨٢١) لە ساڵانی ١٨٠٤- ١٨٠٥)دا ئیمپراتۆری فەرەنسا بوو.

٥١- بیسمارك (١٨١٥- ١٨٩٨):

یەکەمین پێشەوای مەزنی ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانیا بوو.

٥٢- ئەدەبیاتی ئەتەکێت:

جۆرە ئەدەبیاتێکە کە هەوڵدەدات یاسا و رێسا و پێوەر و پێوانەی رەفتار و داب و نەریتی تاك لە کۆمەڵگایەکی ئارام و پەروەردەکراودا بچەسپێنێ.

٥٣- مانتوا: ناوچەیەکە لە باکووری ئیتالیا لە لومباردی.

٥٤- توربینۆ: ویلایەتێکە لە ئیتالیای ناوەندی.

٥٥- پاپالیویسی (١٤٧٥- ١٥٢١):

لە ساڵانی (١٥١٣- ١٥٢١) پاپا بوو. لە بنەماڵەی مدیچی بوو ئەنجوومەنێکی ئەدەبی گەورە و بەناوبانگی هەبوو، و پشتیوانییەکی زۆری لە روفائیل دەکرد.

٥٦- پاپ کلیمنس (١٤٧٨- ١٥٣٤):

پاپای ساڵانی (١٥٢٣- ١٥٣٤) بوو، لە خانەوادەی مدیچی بوو.

٥٧- فرانسوای یەکەم (١٤٩٤- ١٥٤٧):

شای فەرەنسا بوو لە (١٥١٥- ١٥٤٧).

٥٨- تیمۆنی ئاتینی (٤٥٠ پێش زایین):

کەسێکی نیمچە ئەفسانەیی ئاتینی دوورە پەرێز بوو. پاش ئەوەی کە سەروەت و سامانەکەی لە دەستدا، دۆستەکانی لێی دوورکەوتنەوە و ئەویش گۆشەگیریی هەڵبژارد و جگە لە ئالکیبادس، کە وایدەزانی دەبێتە باعیسی وێرانی ئاتین، تێکەڵاوی کەسی دی نەدەبوو، ئەمە تیمە و ناوەرۆك و هەوێنی شانۆنامەی "تیمونی ئاتینی"یە کە دەیدەنە پاڵ شەکسپیر.

٥٩- سوفونیسبا (سەدەی سێیەمی پێش زایین):

سوفونیسبا-ی خانمی کارتاژی، دەزگیرانی ماسی نیسا-ی میری نومیدیا بوو. بابی بە تۆبزی دای بە سوفاکس-ی شای نومیدیا- ماسی نیسا، بەسەر پاشادا زاڵ بوو و سوفونیسبا کەوتە دەستی ئەو. ماسی نیسا ویستی بیخوازێ، بەڵام رۆمییەکان وەکو دیلێك داوایان کردووە. ماسی نیسا-ش بۆ ئەوەی رۆمییەکان سوفونیسبا بە دیلی نەبەن، پیاڵەیەك ژەهری بۆ نارد، و ئەویش بێ دوو دڵی خواردییەوە. سەربور و بەسەر هاتی وی بووە بە تیمە و ناوەڕۆکی چەندین تراجیدیا.

٦٠- تریسینو (١٤٧٨- ١٥٥٠): نووسەرێکی ئیتالیاییە.

٦١- پیترو ئارتینۆ (١٤٩٢- ١٥٥٦): هەجوونووسێکی ئیتاڵیاییە.

٦٢- دولچە (١٥٠٨- ١٥٦٨): نووسەرێکی ئیتالیاییە.

٦٣- دوڤیزی (١٤٧٠- ١٥٢٠): نووسەرێکی ئیتاڵیاییە.

٦٤- لیونکاڤالۆ (١٨٥٨- ١٩١٩): مۆسیقازانێکی ئیتاڵیاییە.

٦٥- ئاگوستینۆبکاری (١٥٤٠- ١٥٩٠): شاعیرێکی ئیتاڵیاییە و بێژەری هۆزانی شوانکارەییە.

٦٦- سۆرینتۆ (بەندەرێکە لە باشووری ئیتاڵیا، لە کەناری کەنداوی ناپولی.

٦٧- قوتابخانەی یەسوعیان: تیمێکی ئایینییە بە ناوی یاودرانی مەسیح کە لە ساڵی ١٥٣٤دا دامەزرا و خەریکی کاروباری بانگەشەیی و مەزهەبی بوو.

٦٨- بێرگامۆ: شارێکە لە باکووری ئیتاڵیا، لە لومباردی.

٦٩- ساتیر- Satyr: لە ئەفسانانی یوناندا، بوونەوەرانێك بوون کە لە بێشە و جەنگەڵاندا بوون و بە خواوەندانی بچووکی فەڕ و بەرەکەت دەژمێردران، لەپەیڕەوانی دیونوسوس و خوازیاری عەیش و نۆش و رابواردن بوون.

ساتیر-یان لە شێوەی پیرەمێردێکی توکنی ئەندام وردیلەی بە کلك و گوێی وەکو بزن بەرجەستە دەکرد و دێنایە بەر چاوی خەیاڵ.

٧٠- گودفرواد بویون (١٠٥٨- ١١٠٠): دۆکی لورنی ژێرییە، و لە هەوەڵێن رابەرانی جەنگی سەلیبییە.

# ئەدەبیاتی ئیتالیا

((٢))

## لە سەدەی هەڤدەوە تا سەدەی بیستەم

سەرەتایەکی مێژوویی:

بەر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم -لەڕووی سیاسییەوە- میللەتێك نەبووە بە ناوی ئیتالیاوە. ئەم نیمچە دورگەیە بووبوو بە شەڕگە و مەیدانی شەڕی، ئەسپانیا، نەمسا، فەڕەنسا، و پاپ، و زۆربەی خاکی ئەم مەرز و بوومە لە سەرانسەری سەدەی هەڤدە و هەژدەیەمدا لە ژێر رکێف و دەسەڵاتی بێگانەدا بوو. رابوونی دژ ریفۆرمی کاتولیکی"١" و یاوەرانی یەسوع، نەیارانی سەرسەختی ئازاد ئەندێشی بوون، و هزری نوێ توانای گەشەکردنی نەبوو. لە سەدەی نۆزدەیەمدا نیشتیمانپەروەرانی وەکو ماتسینی"٢"، کافور"٣" و گاریبالدی"٤"، دەستیان دایە خەباتی دلێرانەی (ریسور جیمنتۆ"٥") تا ناوچە جیاوازەکانی وڵات و گرووپە سیاسییەکان یەکبخەن و نیری بێگانە بپچڕن، ئیمپراتۆری ئیتالیا لە ساڵی ١٨٦١دا رەسمیەتی خۆی راگەیاند و ئەنجام لە ساڵی ١٨٧٠دا کە فەڕەنسا و پروسیا گیرۆدەی شەڕ بوون، ڤیکتۆر ئەمانۆئیل بەرەو رۆم دەستی بە پێشڕەوی کرد، هێزە فەڕەنسەوییەکانی پاپ-ی شکاندو بەناوی پاشای ئیتالیای یەکگرتوو جڵەوی کاروباری گرتە دەست. لەو زەمانە بە دواوە و تا ساڵی ١٩٣٩ ئیتالیا بەرە بەرە بوو بە هێز و دەسەڵاتێکی جیهانی. ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٩١٦دا لەگەڵ هاوپەیمانانـدا چووە جەنگی جیهانی یەکەمەوە. لە ساڵی ١٩٢٠دا بنیتوموسولینی و حیزبەکەی (حیزبی فاشیست) ئیتالیای کۆنترۆڵ کرد، قەڵەمڕەوی

ئیمپراتۆرییەتەکەی فراوان کرد و هێزی سوپایی وڵاتی زیاد کرد، ئیتاڵیا لە ساڵی ١٩٤٠ دا گیرۆدەی جەنگی جیهانی دووەم بوو، ئەمجارەیان لە بەرەی دژی فەرەنسا و بەریتانیادا.

نۆڕینێکی گشتی:

ئەدەبیاتی ئیتاڵیای سەدەی هەڤدەیەم ئەوەندە شایستەی باس و لێکۆڵینەوە نییە. شیعری ئەم قۆناغە بە زۆری شیعری دەستکرد، و بێ گیان، و سست و خاو بە تەنتەنە و سەنسەنەیە- شاعیران یەجگار زۆر پەنا وەبەر توانج پۆشی و سنعەتی جوانکاری دەبەن. بەناوبانگترین نوێنەری شاعیران جوڤانی باتیستامارینۆ"٦"یە، کە وشەبازی و درێژدادرییەکانی بووە بە پێوەر و پێوانەی هونەری سەدەی هەڤدەیەم، و پەیڕەوانێکی زۆریشی هەیە. لە مەیدانی شانۆنامەنووسیدا، کومیدیای دل ئارتەدا وەکو خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام لەڕووی ئەدەبییەوە بایەخێکی ئەوتۆی نییە، کۆمیدیای شوانکارەیی دەبێ بە کارێکی تەقلیدی و قەراردادی مردووی بێ ناوەڕۆك، و تراجیدیا- ش دەرفەتی گەشەکردنی نابێ، تەنیا جوڤانی باتیستا ئاندرئینی"٧"، تراجیدیایەکی هەندێ بایەخدار بەناوی (ئادامۆ) دەنووسێت کە کار لە "میلتن" دەکات.

سەدەی هەژدەیەم کۆمەڵێك پێشکەوتن لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئەدیبانی بێزار و بێ تاقەت لە بەرهەمی پڕئاوتاوی قۆناغی پێشوو، دەکەونە گەڕان بە دووی سەرچاوەێن ئیلهام و سەرمەشق و نموونەێن تازەدا، روو دەکەنە بەرهەمی کلاسیك و نووسەرانی فەرەنساوی. گولدوونی"٨" دەبێ بە پێشەنگای نەو کلاسیسزم و، ئالفیری گەلەك ریفۆرمی گرنگ لە مەیدانی شانۆنامەدا ئەنجام دەدات.

رۆمانتسیسزم، کە لە دەوروبەری ساڵی ١٨٠٠دا بە کزی دەردەکەوێ، لە بەردەم کاردانەوەی موحافەزەکارانەی زادەی شەڕەکانی ناپلیۆندا، بە شێوەیەکی کاتی لە گەشەکردن دەوەستێ، بەڵام لە ئەنجامدا گەشە دەکا و گەورە دەبێ، گەشبینی، نیشتیمانپەروەری، و میللەت پەروەری کە لە خەباتی خۆبیوونی نەتەوەیی و یەکێتییەوە سەرچاوە دەگرێ تین و تاو بە بزاڤی رۆمانتیك دەبەخشن، لە ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەیەمدا میلی رۆژگار بەرەو واقیعگەرایی و تەبیعەتگەرای دەگەڕێ، گرووپێکی توندڕەوی پەیڕەوی فوتوریزم"٩"، بە توندی بەرانبەر بە رۆمانتیکەکان دەوەستنەوە و بەرانبەر دەزگا و یاسا و رێسا و هونەر و ئەدەبیاتی کۆن رادەپەڕن، فوتوریستەکان لەژێر کاریگەری نیتشە و ئارادەیەك والت و یتمندا، سەروەت و سامان، ئامێر و تەکنولۆژیای بەرهەمهێن، (وەکو سەرچاوەی وزە) هەراو هەنگامە، تەپوتۆز، و جەنگیان بەسەرچاوەی ئەستاتیکا و ئیلهام دەزانی.

## گولدونی

کارلوگولدونی (١٧٠٧- ١٧٩٣):

بە (مولیری ئیتالیا) ناسراوە و لە ڤینیس لە دایك بووە. ماوەیەك بە خوێندنی ماف-ەوە خەریك بوو و سەردەمێکیش وەکو دیپلۆمات خزمەتی کرد، بەڵام دڵی هەر لەلای شانۆ بوو، و لە هەشت ساڵیشدا شانۆنامەیەکی نووسی بوو. لە ساڵی ١٧٤٨دا دەستی لە هەموو کارێك هەڵگرت تا شانۆنامە بۆ شانۆی ڤینیس بنووسێت. باشترین بەرهەمی خۆی لە ساڵانی ١٧٤٨-١٧٦٢دا بە زمانی ئیتاڵیایی نووسیوە، ئەوجا چوو بۆ پاریس و تا کۆتایی تەمەن هەر بە زمانی فەرەنسی شانۆنامانی نووسی.

گەورەیی گولدونی لەوەدا بوو کە شانۆنامەی ماسکی، واتە ((کۆمیدیای دل ئارتەئا))ی بە کۆن و لە باوکەوتو و نەزۆك دەزانی. گولدونی بۆ کلاسیسزم گەڕایەوە و لەژێر کاریگەری مولیردا ڕەواجی بەکۆمیدیای ڕەفتاران بەخشییەوە، گولدونی پەیگیری دوو ئامانجی دەکرد: (١) کاراکتەرەکان لە شێوەی بوونەوەرانی مرۆڤانیدا بەرجەستە بکرێن و، (٢) بویەر و ڕووداوەکان ڕەنگدانەوەی ژیانی واقیعی بن. گەلێك لە شانۆنامەکانی گولدونی ئیلهام و زادەی دیتن و خوێندنەوەی ئەون بۆ چینی بورژوای ڤینیسا، گولدونی ئەگەرچی لەڕووی تەنز، توانا، قوڵبینی فەلسەفی، یان سایکۆلۆژییەوە بە پێی مولیر-ی مامۆستایدا ناگات، لێ لەڕووی داهێنانی دیالۆگ، پوختەیی پلۆت، و بەهرەی پێکەناندنەوە، بەهاوتای شانۆنامەنووسانی فەرەنسەوی دەژمێردرێ.

گولدۆنی لە چاکسازی کۆمیدیای ئیتاڵیادا سەرکەوتن بە دەست ناهێنێ، کەسێك جێی ناگرێتەوە، چاکسازییەکانی وی ڕووبەڕووی هێرشی توندی پییترۆکیاری "١٠"، کارلوگوتزی "١١"، و جۆزپیەپارتی "١٢" دەبێتەوە.

گولدونی، نزیکەی سەد و بیست کۆمیدیا و هەشتا دەقی ئۆپرای داهێناوە، بەناوبانگترین کۆمیدیاکانی: قاوەخانە، میوانخانەدار، و ماڵی نوێیان ناوە.

## ئالفیری

ڤیتۆریۆ ئالفیری (١٧٤٩- ١٨٠٣):

شانۆنامەنووس، شاعیر و، تەنزپەروەر و پەیامبەری کلاسیسزمی نوێیە، لە ئاستی نزیکی تورینۆ "١٣"، لە خێزانێکی خانەدانی دەوڵەمەند هاتۆتە دنیاوە، لەلاویدا زۆربەی کات و توانا و

پارە و پولی خۆی لە ئەسپسواری و گەڕان و مێبازیدا سەرفکردووە، ئالفیری لە سالّی ١٧٧٧دا لویز "١٤" ستولبرگ-ی هاوسەری چارلز ئەدوارد ستیوارت-ی (١٧٢٠- ١٧٨٨) مودەعی لاوی تەخت و تاجی ئینگلیستان، دەبینێ، لویز زۆر زوو دەبێ بە ماشوقەی ئالفیری. ئەم جووتە لە سالّی ١٧٨٥ەوە تا ١٧٩٢ لە پاریسدا مانەوە، و لەگەڵ هەلّکشانی شۆڕشی فەرەنسادا پەنایان بۆ فلورانس برد و تاوەکو مردنی ئالفیری لە سالّی ١٨٠٣دا لە وێندەر مانەوە.

ئالفیری پاش نووسینی شانۆنامەی مەیلەو سەرکەوتووی "کیلۆپاترا" لە سالّی ١٧٧٤دا، کەلّکەلّەیەکی توندی شانۆی کەوتەسەر. و لە پڕ هەستی بەوە کرد کە بۆ سەرکەوتن پێویستی بە خوێندن و خوێندنەوەی زۆرتر هەیە، و بە گەرمی کەوتە فێربوونی ئیتالّیایی، لاتینی و یۆنانی.

ئالفیری لە سالأنی ١٧٧٧- ١٧٨٩دا نۆزدە تراجیدیای نووسی. زۆربەی بابەتی شانۆنامەکانی لە ئەفسانانی کلاسیك و لە کتێبی موقەدەس و لە بویەرە مێژووییەکانەوە وەردەگرت. هەلّسوکەوت و مامەلّەکردنی دەگەڵ ئەم بابەتانەدا زیاتر زەینی بوو. ئالفیری زۆر لە خەمی سەرگەرمی بەخشیندا نەبوو. بەلّکو زیاتر پەرۆشی بلاّوکردنەوەی بنەما و پرەنسیپەکانی ئازادی بیروهزرین بوو کە ئیلهامبەخشی ژیانی خۆی بوو. رق لە شاهان لە هەموو شانۆنامەکانی دا بەزەقی دیارە... ئالفیری یەکەمین شانۆنامەنووسە کە باسی زاگەی باوانی، ئیتالّیای یەکگرتووی کردووە و بە کردەوە قوتابخانەی ئەدەبیاتی نیشتیمانپەروەری دامەزراند.

لە تراجیدیایەکانی ئالفیریدا، بە وازوازییەوە پرەنسیپی سێ یەکێتی یەکە رەچاو دەکرێ. شانۆنامەکانی کاتێ دەست پێدەکەن کە ماوەیەك بەسەر پێشڤەچوونی پلۆتی چیرۆکەکەدا تێپەڕیوە و لە دوا ئەنجامدا ئەم نەخشە و پلۆتانە یەجگار سادەن، لە زۆربەی شانۆنامەکانیدا کەمی جولّە و کردار هەیە، زۆربەی شانۆنامەکانی کورتن. تەنیا یەکێکیان لە هەزار و پێنج سەد دێرێك زیاترە. کارەکتەری شانۆنامەکانی ژمارەیان زۆ کەمە و بە درێژایی نمایشەکە هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نایەت. تۆن و ئاوازی شانۆنامەکانی تەواوی خەمینە و ئەم تۆنە —مەخابن لە هەموو بەرهەمەکانیا- هیچ کاتێك ئەو هەستی هاوسۆزییە ناسکەی کە لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا باری تراجیدی خاو دەکاتەوە پەیدا ناکات... شێوازی ئالفیری کورت و گرژ و رەقە.

باشترین تراجیدیای ئالفیری ئەمانەن:

"سائول": شەڕی روحانی یەکێك لە شاهانی کتێبی موقەدەس کە زادەی بەغیلی بردنی ئەوە بەداود، وێنە دەگرێت.

"فیلیپۆ": کە باسی زەماوەندی فیلیپی دووەمی ئەسپانیا لەگەڵ ماشوقەی کوڕەکەی خۆی، و پاشان مردنی هەردوو ئاشق دەکات. "بروتۆسکۆندۆ": کە چیرۆکی کوژرانی ژۆل تزار دەگێڕێتەوە. "ئاگامەمنونە و ئورست": کە بەشێك لەسەر بوری ئورستیا-ی نووسینی ئاسخیلوس دەگێڕێتەوە. و "میرا": ئەمە حیکایەتی کیژێکە کە حەز لە بابی دەکات.

ئالفیری، جگە لە تراجیدیایەکانی، ئوتوبیوگرافییەکی زۆر جوان، و چوار کۆمیدیای (کەم بایەخ) و چەند تەنزێك و چەند شیعرێکی لیریکیشی هەیە.

ئالفیری وەکو گولدونی لەواری ئەدەبیدا کەس جێی نەگرتەوە. پاش مردنی وی، کومیدیای سانتیمانتال-ی فەرەنساوی (کۆمیدیای گریانئاوەر "١٥") لە ئیتالیادا جێی تراژیدیای گرتەوە.

## مانزۆنی

<u>ئالیساندرۆمانزونی (١٧٨٥- ١٨٧٣):</u>

شاعیری لیریکی، شانۆنامەنووس و چیرۆکبێژە، لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند لە میلان هاتۆتە دنیا. لە ساڵی ١٨٠٥دا دەگەڵ دایکیدا بۆ پاریس چوو، و لەوێندەر پەیوەندی بە ئەنجوومەنە ئەدەبییە بەناوبانگەکەی مەدام "دوکوندورسە "١٦" وە کرد. لە دەوروبەری ساڵی١٨١١دا پەیوەندی بە مەزهەبی کاتولیکی رومییەوە کرد و پەرەی بە هزر و بیری یانسنی دا کە پاشان کاریگەرییان لە بەرهەمەکانیدا ئاشکرابوو. مانزونی دوای ماوەیەك بۆ میلان گەڕایەوە و تا کۆتایی تەمەنی دوور و درێژی خۆی لە نزیکی ئەو شارەدا ژیا. هەمیشە پشتیوانی میانەڕەو بەڵام ئەمەکداری مەسەلەی خۆیبوونی ئیتالیا بوو.

<u>هۆزانە لیریکییەکانی:</u>

یەکەمین هەڵبەستێن ئەدەبیی مانزونی هۆزانی لیریکییە. لە ساڵی ١٨٠٦ دا هەندێ شیعری بێ قافیەی دەربارەی بەرەڤانی لە دایکی و ئاشقە مردووەکەی دایکی نووسی. ئەم شیعرانە لەڕووی دەربڕینی قوڵی ئارمانجەکانی خودی مانزونییەوە یەجگار بەهادارن. لە فاسیلەی ساڵانی ١٨١٢- ١٨٢٢دا پێنج سروودی ئایینی بەبۆنەی جەژنەکانی کڵێساوە نووسی: جەژنی مژدە "١٧"، ئادڤینت "١٨"، پاسیون "١٩"، رابوونی پاش مەرگی عیسا "٢٠"، جەژنی پەنجامینە "٢١"، ئەم سروودانە کە بە زمانێکی سادە بەڵام بەهێز دەربڕدراون، جلوەیەکە لە هەست ونەستی توند و بێڕیای شاعیر. بە ناوبانگترین شیعری مانزونی، هۆزانی پێنجەمی مایسە، کە لاوانەوەیەکی دڵگیرە و لەساڵی ١٨٢١دا بە بۆنەی مردنی ناپلیۆنەوە گوتراوە.

**شانۆنامەکانی:**

مانزونی دوو تراجیدیای لەسەر بنەمای بابەتی مێژوویی نووسیوە کە زیاتر لەبەر ناواخنی تیۆری شانۆیی ماونەتەوە تا لەبەر توانای خودی و هونەری. شانۆنامەی: (کۆنت کارمانیولا-١٨٢٠)، چیرۆك و سەرگوزەشتەی فرانچسکۆ بوسونە-ی سەربازی بەنێوبانگی ڤینیسی لە سەدەی پازدەیەمدا کە بەتۆمەتی خیانەت لە سێدارە درا دەگێڕێتەوە. شانۆنامەیەکی دیکە لە ژێر سەر ناوی (ئادلکی-١٨٢٢)یە، ئەمە خەباتی لومباردەکان دژی شارلمانی دەگێڕێتەوە. مانزونی، یەجگار دڵبەندی شەکسپیرە و کەسێکی رۆمانتیکی تەواو عەیارە و چاوپۆشی لە یەکێتییەکانی کات و شوێن دەکات. بەڵام بە پێچەوانەی شەکسپیرەوە، حەقیقەتە مێژووییەکان، ئەگەر واقیعی نمایشنامەکەش بخوازێ، ناگۆڕێ و دەستکارییان ناکات. جا لەم بارەیەوە تراجیدیایەکانی لە باری سەرنجی شانۆییەوە سەرکەتوو نین، زیاتر بۆ خوێندنەوە دەست دەدەن، لەگەڵ ئەمەشدا شانۆنامەکانی مانزونی ئیجابیات و لایەنی پۆزەتیفیشیان هەیە: شێوازێکی یەکدەست، سادە، بتەو و سفت و دڵگیریان هەیە. پڕن لە دیمەنی جوان و هزر ئەنگێز، و هەندێ لە گۆرانی کۆرالەکان، شیعری لیریکی جوانن و رەنگدانەوەی هەستی نیشتیمانپەروەرانەی خودی مانزونی-ن.

## رۆمان:

**((دەزگیرانەکان)) (قەولی زەوجین بە یەکدی دەدەن):**

بە "تاقە رۆمانی گەورەی ئیتاڵیایی" ناو دەبرێ. لە ساڵی ١٨٢٣دا تەواو کراوە بەڵام لە ساڵی ١٨٢٧دا بڵاوبووەوە پاشان مانزونی پێیدا چووەتەوە و زمانەکەی لە میلانی لەهجەدارەوە گۆڕیوە بۆ زمانی توسکانی پەتی باو، و دەقە دەستکاریکراوەکە بە زنجیرە لە ساڵانی ١٨٤٠-١٨٤٢دا بڵاوبووەوە.

چیرۆکی ئەم رۆمانە لە گوندی لیکو-ی نزیکی میلان، لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەڤدەیەمدا، لەو ساڵانەدا کە دەڤەرەکە لە ژێر رکێفی داگیرکەرانی ئەسپانیاییدا بوو، دەست پێدەکات. "دون رۆدریگو" خەیاڵی خراپ دەرهەق بە "لوچیا"ی کیژە گوندیی دەزگیرانی ((لورنزۆ))ی کوڕە دێهاتی لە خەیاڵدانی خۆدا پەروەردە دەکات. پلۆت و تیمەی رۆمانەکە بە شێوەیەکی سەرەکی بە دەوری تەوەری هەڵاتن و رەڤینی ئەم جووتەیە لە دەستی رودریگۆ.

ئەم رۆمانە چەند کێماسییەکی ناشکرای هەیە. مانزونی کە حەز دەکات چیرۆکەکە لەگەڵ حەقیقەتە مێژووییەکاندا جووت بێ، قەواڵە و بەڵگەنامانی مێژوویی لەگەڵ زنجیرەی

بویەرەکانی چیرۆکەکەدا ئاوێتە دەکات. هەندێ لە وەسفەکان لەرادەبەدەر درێژن، و ژمارەیەك لە رەخنەگران قارەمانانی پیاو و ژنی چیرۆکەیان بە وشك و بێ پرشنگ زانیوە، بەڵام لایەنی ئیجابی رۆمانەکە زۆر زیاترە لەلایەنی سەلبی، پلۆتی چیرۆکەکە هاروژێنەرە، کاراکتەرسازی، بەتایبەتی بەرجەستەکردنی گوندییانی لومبارد، مایەی سەرسامییە. نێوەرۆکی کتێبەکەش دڵگیرە: ململانێی نێوان هەق و نەهەق، و خوداش لایەنگری هەقە، زۆر ساتی چیرۆکەکە بە شۆخیبازی و حەنەك-ی جوان پر بووەتەوە، شێوازی رۆمانەکە یەکهاوی رازاوەیە، و ئەمەش بەرزییەکی لە ئاستی بەرهەم و کارە کلاسیکییەکانی پێ بەخشیوە، و لە کۆتاییدا رۆمانی دەزگیرانان، هاتووە ماهیەت و جەوهەری مرۆڤی وێنە گرتووەو بەمەش لە هێرش و ئیرادی رەخنەگران دوور کەوتووەتەوە، سکوت، گوتە و شاتوبریان بەستایش کاری ئەم رۆمانە دەزانرێن.

## لیوپاردی

جاکومۆلیوپاردی (١٧٩٨- ١٨٣٧):

شاعیر، فەیلەسووف، رەخنەگر و باسکارە، و بێ چەند و چوون لە دوای "تاسۆ"وە تا وەکو ئەمرۆ گەورەترین شاعیری ئیتالیایە، جاکۆمۆ لە بازێرۆکی "رکاناتی"ی نزیکی بولونیا لە دایك بووە. هەوەڵێن ساڵانی تەمەنی بەوپەڕی ناخۆشی و لەشبەباری لە سایەی بابە مۆن و دەست نوقاوەکەی و دایکە رژد و پیسکەکەیدا بەسەر برد، جاکومو شەیدا و رمودەی خوێنەواری بوو، لەرادەبەدەر ئاشقی خوێندنەوەو موتاڵا بوو، هەر ئەمەش کردیە کارێك کە بەر لە تەمەنی بیست ساڵی، لە یۆنانی و لاتینیدا ببێ بە ئەدیبێکی تەواو، هەروەها زمانانی فەرەنسی، ئەڵمانی، و عیبریش بە تەواوەتی فێر بوو، ئەم سوور بوونە زۆرەی لەسەر خوێندنەوەو خوێنەواری کردیە کارێك کە هێندەی دیکە بێ هێزو لەش بەبار بێ، نەخۆشی و لە شبەباریش بەرەو رەشبینییان برد. لیوباردی لە ساڵی ١٨٢٢ وە تا ساڵێ ١٨٣٣ شارە جۆراوجۆرەکانی ئیتالیای دایە ژێر پێیان و بێهودە بە دووی ئەشق، بەختەوەری و سەلامەتیدا دەگەڕا. سەرەنجام هەژار و داماو لە ساڵێ ١٨٣٧ دا لە ناپولدا کۆچی دوایی کرد.

لیوپاردی گەڵێك نامەی دڵگیری لەمەڕ حاڵی خۆی، شرۆڤەیەك لەسەر پترارك-١٨٢٦، چەندین وتار دەربارەی رەخنەی ئەدەبی و کۆمەڵێك باسی دەربارەی (١٨٢٤- ١٨٢٨) بەرەڤانی لە رەشبینی وەکو تاقە فەلسەفەی قابیلی روونکردنەوە نووسی.

ناو و شۆرەتی لیوپاردی بە دیوانێکی چکۆلەی چل چامەییەوەیە (کنزونە) کە بە گوێرەی یاسا و پێوەرە شیعرییەکان، پەیوەندی چەمك و خەیاڵ، فۆرم و ناوەرۆك و هەندێ جار وەرگرتن لە بابەتێن یۆنانی کۆنەوە، شیعری تەواو کلاسیکن، بەلاّم لە باری گوزارشتی رەشبینانە و تاکگەرایی خودی شاعیرەوە دەبێ بە رۆمانتیك حەساو بکرێن. ژمارەیەك لەم چامانە لە نیشتیمانپەروەرییەوە سەرچاوە دەگرن وەکو "بۆ ئیتالیا" و "لەبەر بارەگای دانتی"دا، و چەند دانەیەکی دیکەیان دەربارەی ئەڤینن وەکو: "یەکەمین ئەڤین" و هەندێکی دیکەشیان فەلسەفی و هزرین وەکو: "دوا گۆرانی سافو". زۆربەی ئەم شیعرانە -تەنانەت شیعرە دڵدارییەکانیش- کە ئاوێتەی رەش بینین، هەڵقولاّوی کانگای دڵ و وەستایانەن. لە گۆشەنیگای لیوپاردییەوە بەختەوەری خێری بالاّیە، بەلاّم بە دەگمەن، و ئەویش بۆ هەندێ ساتی کورت خایەن، دەکرێ بە دەست بێت. نەگبەتی و رۆژڕەشی نەك هەر لەم رۆژگارەدا، بەڵکو هەمیشە فەرمانڕەوای جیهان بووە و قەدەرە کە هەتا هەتایە هەروا بێ.

بێ تاقەتی، ئازادیخوازی، نەفرەت لە دکتاتۆرییەت، رەشبینی لیوپاردی، یادی بایرون و شللی لە دڵاندا زیندوو دەکاتەوە، جوانیپەرستی ئەو و دڵبەندی بە بەرهەمێن کلاسیکی یۆنانەوە و مێبازییەکەی، کیتس وەبیر دێنێتەوە.

سنت بوڤ، لیوپاردی بە نەجیبترین، هێمنترین و عەبوسترین شاعیری دنیا دەزانی، ماتیو ئارنولدیش بە هاوتای میلتن و دانتیی دەژمارد، و راوبۆچوونی هەمووان بە شێوەیەکی گشتی ئەمەیە کە لیوپاردی گەورەترین شاعیری ئیتاڵیای چەرخی تازەیە.

## کاردوچی

جوزویەکاردوچی (١٨٣٥- ١٩٠٧):

شاعیر و رەخنەگر و خەتیبە، لە ڤاڵ دی کاستلۆ، لە توسکانی لە دایك بوو، قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لە فلورانس تەواو کرد، پاشان چووە زانکۆی پیزا، و لە ساڵی ١٨٥٦دا خوێندنی تەواوکرد، ماوەیەك بەکاری چاپ و بلاّوکردنەوە و دەرس دانەوە لە قوتابخانەی ئامادەییدا خەریك بوو، پاشان بوو بە مامۆستای زانکۆی بولونیا، و لە ساڵی ١٨٦٠ەوە تا ١٩٠٤ لەم زانکۆیەدا دەرسی گوتەوە.

کاردوچی هەر چەندە هیچ کاتێك خۆی بە سیستەمێکی فەلسەفی هاوئاهەنگ و گونجاوەوە خەریك نەکردووە، بەلاّم لە واری پرس و دۆزی سیاسی، ئایینی و جوانیناسیدا، راوبۆچوونی ئاشکرا و بنجبڕی هەبوو.

لە سیاسەتدا لە هەوەڵەوە لایەنگری رژێمی پاشایەتی و تەرفداری ڤیکتۆر ئیمانۆئیل"٢٢" بوو کە لە ماڵباتی شاڤۆ بوو. ماوەیەکیش بەو بیانووەی کە پاشا دەرهەق بە میللەت کەمتەرخەمە، بوو بە کۆماریخواز، بەڵام دووبارە گەڕاوەتەوە سەر سەڵتەنەتخوازی و لە دوا ساڵەکانی تەمەنی دا لە دۆستانی نزیکی شابانۆ مارگریتا"٢٣" بووە.

کاردۆچی لەڕووی ئایینییەوە موشریك بوو، کڵێسای بە رەمز و هێمای دەسەڵاتی داگیرکاری"٢٤" ئەمسا و فیودالیزم و کەلتووری سەدەکانی ناڤین و کۆیلایەتی دەزانی، زێدەباری ئەمەش وەکو سوین برن، باوەڕی تەواوی بەوە بوو کە مەسیحییەت دینی زوهد و ریازەتە. جا لەبەر ئەمە رووی کردە ئەفسانانی خواوەندانی یۆنان و روم-ی کۆن، خواوەندانێك کە بە زیندوو و واقیعی دەزانین، نەك بە زادەی خەیاڵاتی شاعیرانەی رووت. کاردۆچی موشریکانە هەم لەزەتی لە ژیان دەبینی، ژیانێکی سادە، دادوەرانە، سەلامەت، و پڕ خەبەتین لە جیهانی جوانییەکاندا. هەر چەندە کاردۆچی هیچ باوەڕێکی بە ئەخلاقیاتی مەسیحی نەبوو، بەڵام کاریگەری ئەم ئەخلاقیاتە بەسەر ئەوەوە لەوە پتر بوو کە خۆی هەستی پێدەکرد.

کاردۆچی لە واری جوانیناسیدا شاعیرێکی کلاسیك بوو. لە رۆمانتیزم بێزار بوو، و بە هاوتای مەسیحییەت، کەلتووری سەدەکانی ناڤین، و دەسەڵاتی بێگانەی دەزانی.

کاردۆچی ئیلهام و سەرۆی لە ڤێرجیل، هوراس، پترارك، و بۆکاچۆوە وەردەگرت. لە ستایشکارانی دانتی بوو و ئەوی بە قارەمانی ئازادیی ئیتاڵیا دەزانی، لێ دەربارەی مەسەلە مەزهەبییەکان دانووی دەگەڵ شاعیرانی پێش دانتیدا نەدەکولا، کلاسیسزمی گەرم و گوڕ و پڕجۆش و خرۆش تا ئەندازەیەك زادەی نیشتیمانپەروەری کاردۆچی بوو. کاردۆچی لەو رووەوە کە رۆڵەی رومیانی کۆن بوو و نەك هەر میراتگری کەلەپووری ئەدەبی وان بوو بەڵکو زادەی گوندە پڕشکۆدارەکانی ئیتاڵیاش بوو -ئەو گوندانەی کە ئیلهام بەخشی شاعیرانی وەکو ڤێرجیل و هۆراس بوون- شانازی بە خۆوە دەکرد.

شیرك، مرۆڤگەرایی، کلاسیسزم و نیشتیمانپەروەری، بابەت و نێوەڕۆکی هەمیشەیی شیعرەکانی کاردۆچییە، کاردۆچی کە لە بنەڕەتدا شاعیرێکی لیریکی باڵادەست بوو، زیاتر مامەڵەیەکی سۆزداری لەگەڵ ئەو نێوەڕۆك و بابەتانەدا هەبووە تا مامەڵەی فەلسەفی و فێرکاری، هەر چەندە شیعرە لیریکییەکانی تایبەتمەندییەکانی شیعری رۆمانتیکییان هەیە، توند و بە قوەت، تاکگەرایانە و گەشبینانەن، بەڵام لە قاڵب و فۆرمی کلاسیکدان، کاردۆچی بۆ زۆر کێش و وەزنی یۆنانی و رومی دەگەڕێتەوە، و گوزارشت و دەربڕینێکی ناباوو چڕ دەدۆزێتەوە،

ئەم چری و پڕییە هەندێ جار دەکاتە کارێك کە تێگەیشتنی ئەندێشە و هزرەکانی ئەستەم و زەحمەت بێ، بە تایبەتی کاتێ کە دێتە سەر تیل نیشانی فەزلفرۆشانە و خۆنواندن. لەبەر ئەمە شیعری کاردۆچی هیچ کاتێك مایەی پەسندی عەوامی خەڵك نەبووە.

گرنگترین دیوانی شیعری کاردۆچی: (شاعیری ١٨٧١)، (قافیەی نوێ- ١٨٧٣)، (چامەێن هۆڤی- سێ کۆمەڵە شیعرە: ١٨٧٧، ١٨٨٢و ١٨٨٩)و (کێش و قافیە- ١٨٩٩)یان ناوە.

کاردۆچی نەك تەنیا لە مەیدانی شاعیریدا، بەڵکو لە مەیدانی پەخشاننووسیشدا- بە تایبەتی لە هونەری وتاربێژیدا- زیندووە، رەنگە گەورەترین خوتبەی وی دەربارەی گاریبالدی بێ- ١٨٨٢.

## دانونتسیۆ

گابریلە دانونتسیۆ (١٨٦٣- ١٩٣٨):

شاعیر و رۆماننوس و شانۆنامەنوس و ئاسمانەوان بوو، خەڵکی پسکارا"٢٥"یە، لە پراتۆ"٢٦" خوێندوویەتی، لە تەمەنی هەرزەکاریدا ماوەیەکی کورت لەدام و دەزگایانی پەخش و وەشاندندا کاری کرد و ئەوسا لێبڕا و نووسەریی کرد بە پیشە. خۆی تایبەتمەندی بەشی هەرە زۆری ژیانی دوور و درێژی وی بریتی بوو لەسەر کێشی، بەرەڵڵایی، سۆزداری و بێ سەروبەری.

لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، هەر چەندە بە تەمەن بوو، لە هێزی ئاسمانیدا بەشداری شەڕی کرد و چاوێکی خۆی لەدەستدا، لە ساڵی ١٩١٩دا، بە پێچەوانەی پەیمانی ڤێرسای، لەشکری کردە سەر فیوم"٢٧" و گرتی.

دانونتسیو یەکەجار وەکو شاعیر شۆرەت و ناوبانگی پەیدا کرد، کاریگەری هەموو ئەم نووسەرانە بەسەر شیعری ئەوەوە دیارە، ئەو شیعرانەی کە بە تێکەڵەیەك لە بەدەوییەت و داروخان ناویان دەرکردووە کاردۆچی، فلوبیر، موپاسان، رامبۆ، وایلد، سوین برن، ڤارلین، نیتشە، بۆدلێر، رۆمانتیکەکانی ئینگلیز، و رۆماننووسە روسەکانی هاوعەسری خۆی، رەقی و توندی ئەم شیعرانە کردوویانەتە کارێك کە کۆن و بەدەوی بێنە بەرچاو، تەسلیم بوون بە لەزەتی نەفسانی، بێزاری، هەوەسکاری لە هونەرا، یاخی بوون لە کۆت و زنجیری ئەخلاقی و شیرك ئەم شیعرانە دەخاتە خانەی داڕووخانەوە. دانونتسیو رەنگدانەوە و ئاوێنەی سروشت و تەبیعەت نییە، مەبەستی سەرەکی ئەو تەنیا جوانی پەروەرییە، مەیلی وی زیاتر بەلای بەرجەستە کردن و نیشاندانی جوانیدایە تا بەلای وەسفی ژیاندا، جوانی لە روانگەی دانونتسیووە جوانییەکی

دەروونی و سایکۆلۆژییە، و ڕێ یەك نییە بچێتەوە سەر قوڵایی هەست یان هزر و ئەندێشە. وەسفەکانی تەڕ و پاراو و بە ئاووتاون، لەڕادەبەدەر بەشکۆ و بەسام و سەنگن، بەڵام ئەو شکۆیە هەمیشە تاڕادەی تێربوون تاقەتبەرە دانونتسیو هەندێ جار بەلای دزێوی، هەرزەکاری و شەڕەنگێزی، نادروستی و نزمی دا دای دەشکێنێ، ئەم لاوازییانە بە تایبەتی لە شیعرەکانی سەرەتایدا دیارن، بەناوبانگترینی ئەم شیعرانە لەم کۆمەڵە شیعرانەدا بڵاوبوونەتەوە: (بەڕاستی یەکەمین- ١٨٧٩)، (گۆرانیانی نوێ- ١٨٨١)، (لولو- ١٨٨٨)و لەگەڵ زنجیرە دیوانێکی دیکەدا بە ناوانی: (لە ستایشی ئاسماندا، دەریا، زەمین، و قارەمانان- لە ساڵانی ١٩٠٣- ١٩٠٤)..

هەندێ لەو شیعرانەی کە دانونتسیو لە ساڵی ١٩١٤ بە دواوە نووسیونی دەربارەی نیشتیمانپەروەرییە.

خەوشەکانی شیعری دانونتسیو لە پەخشانەکانیشیدا بەدی دەکرێن، گەلێك لە ڕۆمانەکانی ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی نیتشەن و قارەمانێکی وەکو خودی دانونتسیو وێنە دەگرن- مرۆڤێکی لەزەت خواز، بە هەستێکی توندی جوانی پەروەرییەوە، سەرکێش و قارەمان ئاسا. بەناوبانگترین ڕۆمانی وی بریتییە لە: (منداڵی لەزەت- ١٨٨٩)، (بێگوناح- ١٨٩٢)، (سەرکەوتنی مەرگ- ١٨٩٤)، (پاکیزانی تاوێران- ١٨٩٥) و (ئاگر- ١٩٠٠)- کە بێگومان باسی پەیوەندی نەفەرمی خودی نووسەر لەگەڵ خانمێکی ئەکتەری ئیتالیاییدا بەناوی ئیلیونورا دووره "٢٨" دەکات.

دانونتسیو لە واری شانۆنامەنووسیدا هیچ جۆرە سەرکەوتنێك بە دەست ناهێنێ، زێدەباری ئەو خەوش و کەم و کوڕییە ئاساییانەی کە لە شیعر و ڕۆمانەکانی دا هەن، شانۆنامەکانیشی زۆر بێ جووڵەن، و لە ئەندازە بەدەر زەینین. باشترین شانۆنامەی وی بریتیین لە: (فرانچسکادا ریمینی- ١٩٠٢و فیدرا- ١٩٠٩).

شۆرەت و ناوبانگی دانونتسیو ئەمڕۆ تەواو کاڵ بووەتەوە. تەنیا وەکو نموونەیەکی شاعیرانی سەردەمی خەملێنی میللەتی ئیتاڵیای نوێ یاد دەکرێتەوە. میللەتێك کە دانونتسیو بە میتاهومانیزم و نەفسپەرستی خۆی، بە زبری جۆش و خرۆش و یا لێشاوی شێوازی خۆی، پەنای بۆ دەبرد.

# پیراندیلۆ

لویچی پیراندلۆ (١٨٦٧- ١٩٣٦):

لە ئاگریجنتو، لە سیسیل هاتۆتە دنیاوە و ساڵانی منداڵییەتی لەوێندەر بەسەر بردووە. بابی کابرایەکی دەوڵەمەند، و خاوەن و بەڕێوەبەری کانگەیەکی گۆگرد بوو. لویچی بۆ ماوەیەکی کەم خۆی بە کاروباری بازرگانییەوە خەریك کرد و لە ساڵی ١٨٨٧ دا بۆ خوێندن چوو بۆ زانکۆی روم، دواتر چووە زانکۆی بون، و دکتۆرای لە زمانەوانیدا وەرگرت. لە ساڵی ١٨٩٤ دا ژنی هێنا، لە ساڵانی ١٨٩٧- ١٩٢١ لە پەیمانگەی ژنانی رومدا خەریکی گوتنەوەی وانە و دەرسی ئەدەبیاتی ئیتالیایی بوو. لە ساڵی ١٩٢٥دا دامەزراندنی شانۆی نەتەوەیی لەئەستۆگرت، و موسولینی بە خۆی پەیگیری بەڕێوەچوونی ئەم کارەی دەکرد، پیراندیللو لە ساڵی ١٩٣٤دا لەسەر شانۆنامەکانی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی وەرگرت، دوا ساڵانی تەمەنی بە نووسین و سەفەر بۆ ئەمریکای باشوور، فەڕەنسا، و وڵاتە یەکگرتووەکان گوزەراند.

پیراندیللو لە ساڵی ١٨٨٣دا دەستی بە شیعر گوتن کرد، لە سەرەتاکانی ژیانی خێزانداریدا هەندێ وتاری دەربارەی رەخنەی ئەدەبی بڵاوکردەوە، و تاوەکو پێش ساڵی ١٩١٤ زۆر رۆمان و کورتە چیرۆکی نووسی، لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا حەزی چووە سەر شانۆ، و ئەو شانۆنامانەی کە لە ساڵی ١٩١٥ بە دواوە نووسینی، ناو و ناوبانگێکی جیهانی گەورەیان بۆ دروست کرد.

فەلسەفەی پیراندیللۆ:

شانۆنامەکانی پیراندیللو رەنگدانەوەی بۆچوونە تاڵەکانی خودی نووسەرن، نائومێدی و رەشبینی و بەدگومانی پیراندیللو زادەی ژیانی بەزەیی ئەنگێزی خانەوادەکەین، چونکە لە ساڵی ١٩٠٤دا لافاو کانگەکەی بابی و بەشی هاوسەرەکەی ویی، لەنێوبرد و دووچاری رۆژی مەینەتی کردن. هاوسەرەکەی لە هەمان ساڵدا تێك چوو و تا مردنی لە ساڵی ١٩١٨دا ئەو نەخۆشییەی هەر لەگەڵدا بوو. کیژەکەی کە توانای تەحەمولی شێتییەکەی دایکی نەبوو، ویستی خۆی بکوژێت، بەڵام گیربوونی گوللەکە لە لولەی دەمانچەکەیدا نەجاتیدا، پیراندیللو کە زۆر لەم مەینەتییانە وەرس و بێزار بوو، لەو پێوانگەوە کە ویراسەت و ژینگە تارادەیەکی زۆر ژیانی مرۆڤ کۆنترۆڵ دەکەن و بنیادەم هیچ دەسەڵاتێکی بەرانبەریان نییە، گەییە ئەو ئەنجامگیرییەی کە چارەنووسی مرۆڤ لە هی گیانلەبەرانیتریش خراپتر و بە ئازارترە، گیانلەبەران

هیچ نەبێ بە حوکمی مەیل و غەریزەی زکماك حاڵەتێکی خۆشی پەیدا دەکەن، واتە گیانلەبەران وەکو چۆن هەن و وەکو خۆیان مل بۆ ژیان دەدەن و دەژین، بەڵام مرۆڤ هەر کە تەسلیمی غەریزە بوو، یەکسەر هێزی ئەقڵ و ئاوەز وەگەڕ دەخات تا پاساو و ئەنگێزەیەکی ئایدیالی بۆ کردارە غەریزییەکانی بدۆزێتەوە. مرۆڤ ئەگەرچی لەم ئارمانجە ئایدیالییە حاڵی دەبێ، بەڵام هەرگیز پێی ناگات، چونکە ڕێنوێنی ئەو لە واقیعدا غەریزە و مەیلی ئەوە. توانا و هێزی ئەقڵ و ئاوەز و حاڵی بوون مرۆڤ بە جۆرێ فریو دەدات کە وا تەسەور بکات ئەنگێزەکانی نموونەیی و ئایدیالین، بەڵام لە ئەنجامدا دەردەکەوێ کە ئەم ئارمانج و ئایدیالپەروەرییە جگە لە خەیاڵ پلاو چ شتێکی دیکە نەبووە. ململانێی لە سازان نەهاتووی نێوان جوانی نموونەیی و دزێوی ژیان، وەکو چۆن هەیە، بناغە و هێمی بەدگومانی پیراندیللۆیە.

__شێوەی شانۆییەکانی:__

ڕەنگە حاڵی نەبوون لە شەیدایی پیراندیللۆ سەبارەت بە ململانێی نێوان واقیع و ئایدیال، ئەم خەیاڵەی چێ کردبێ کە شانۆنامەکانی (ناواقیعی)ن و کەمتر سەروساختیان لەگەڵ مرۆڤانی (واقیعی)دا هەیە. رات شپارد فلپس دەڵێت کە: "شانۆنامەکانی پیراندیللۆ چەمکێکی سەرڤسەرڤە لەمەڕ واقیعگەرایی نیشاندەدەن، بەڵام ئەنجامی شانۆنامەکە کە لە لۆژیکەوە هەڵدەقوڵێ، هیچ جۆرە واقیعگەراییەکی لەخۆ نەگرتووە، دیارە ئەم ئەنجامە لەڕادەبەدەر ئایدیالییە... و بە هیچ جۆرێ ناشوبهێتە سەر ژیان. شانۆنامەکانی پیراندیللۆ بە هیچ جۆرێ باسی سۆز و گودازی مرۆڤانی یان کار و کاریگەری کەسایەتییەکان لەسەر یەکدی ناکەن. تەواو ئیستیعاری و مەجازین". ویتورینی ئەم تۆمەتە ڕەتدەکاتەوە و باوەڕی وایە کە ((یەکێك لە خەسڵەتە دیارەکانی هزر و ئەندێشەی پیراندیللۆ ئەوەیە کە پەیوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ ژیاندا هەیە. ژیانی واقیعی و خەیاڵی بە شێوەیەکی خەماوی لە بوونی پیراندیللۆدا ئاوێتە و تێکەڵ دەبێ)).

شانۆنامەکانی پیراندیللۆ هەر چەندە خەمناك بن، هێشتا هەر ئاوێتەی پێکەنین و شۆخیبازی و حەنەکن، بەڵام پێکەنین لەم شانۆنامانەدا پێکەنینێکی گرژ، کۆمیدی، و تەنزئامێزە، ((لندرمك کلینتاك)) دەڵێت کە پیراندیللۆ کۆمیدێنەکە کە مرۆڤ دەخاتە پێکەنین تا لە گریان، لە دەستی ڕەنجان لە ژیان و سەختییەکانی بوون، دووری بخاتەوە. پیراندیللۆ بە خۆیشی باوەڕی وایە کە کۆمیدیانووس دەبێ دروشمەکەی ((جوردانو برونۆ)) بەکار بێنێ: "شاد لە کاتی خەم، خەمین لە کاتی شادی".

پیراندیللۆ کە هیچ چارەسەرێك بۆ گیروگرفتەکانی ژیان نادۆزێتەوە، گەلێك لە شانۆنامەکانی خۆی لە شوێنێکدا کۆتایی دێنێ، کە هەندێ جار وا دێتە بەرچاو تازە لە ناوەڕاستی چیرۆکەکەدایە —بەڵام هەر ئەم بێ ئەنجامییەی شانۆنامەکان- نەبوونی کۆتاییەکی خۆش یان ئەنجامێکی ناخۆش- روحی فەلسەفەکەی ئەوە، کە چ شتێك بۆ کۆتایی هێنان نییە، چونکە ژیان بەو جۆرەیە، و ئەمە خۆی لە خۆیدا کۆتاییەکە.

شانۆنامەکانی:

ویتورینی سی و هەشت شانۆنامەی پیراندیللۆ بەسەر پێنج گرووپدا دابەش دەکات: ١- ئەو شانۆنامانەی بە گوێرەی رێبازی ناتورالیزم نووسراون، ٢- گرووپی بوون و نواندن. ٣- شانۆنامەی کۆمەڵایەتی. ٤- شانۆنامانی ژنانە. ٥- شانۆنامانی هونەر و ژیان. ئەمانە لە جوملەی گرنگترین شانۆنامەکانی ئەون: هەقی خۆتە گەر وا بیر بکەیتەوە- ١٩١٨، شەش کەس بە دووی نووسەرێکدا دەگەڕێن- ١٩٢١، هنری چوارەم- ١٩٢٢، ئەمشەو موفاجەئە دروست دەکەین- ١٩٣٢، هەمووان بۆ باشترین- ١٩٣٧و بەمجۆرەی کە دەتەوێم.

((شەش کەسایەتی لە نووسەرێك دەگەڕێن))، بە یەکێك لە باشترین شانۆنامەکانی پیراندیللۆ دەزانرێ. ئەم شانۆنامەیە نموونەیەکی شایستەی هزرین و جۆری کارکردنی خودی نووسەر نیشاندەدات، چونکە مامەڵە دەگەڵ خەمە سەیر و سەمەرە و کۆمیدییەکانی تیرەی بەشەر و پەیوەندی خەیاڵ (لە زەینی نووسەردا) لەگەڵ واقیعدا (لە ژیانی کاراکتەرەکاندا) دەکات، ئەم شەش کەسە (باوك، دایك و چوار منداڵ) لە دیمەنێکی سادە و بێ نارایشتدا، لە حوزووری تاقمێك ئەکتەردا دەردەکەون و دەری دەخەن کە کۆمەڵێك خەڵقەندەی نوقستان و زادەی خەیاڵی نووسەرن، و داوا لە ئەکتەرەکان دەکەن کە بە نواندنی ژیانی ئەوان (شەش کەسەکە) واقیعیەتیان پێ ببەخشن. ئەکتەرەکان قاییل دەبن و کەسایەتییەکان ئامادە دەبن تا سەر لە نوێ ژیانی رابردووی خۆیان نمایش بکەن، لە یەکەمین دیمەنی ئەم ژیان دووبارە کردنەوەیەدا باوکەکە دەست لە ژنەکەی، کە کوڕێکی لێی هەیە، هەڵدەگرێ و هانی دەدا کە پەیوەندی لەگەڵ سکرتێرەکەی ویدا بگرێ، و ژنە سێ منداڵ لە کابرای سکرتێر دێنێ، ئەم خانەوادەیە دوای مەرگی کابرای سکرتێر ون دەبێ و باوکەکە خەمبار و دڵتەنگ دەبێ. دیمەنی دووەم باوکەکە لە ماڵی ژنێکی سۆزانیدا نیشاندەدات کە بووە بە مشتەری زڕ کیژەکەی (کە نایناسێتەوە) خۆی، بویەرەکە هەندە حەیابەرەیە کە کەسایەتییەکان لە بیریان دەچێتەوە کە تەنیا ئەکتەرن و رابردووی خۆیان دەنوێنن و نمایش دەکەن، لە هەنبەر ئەکتەرەکاندا، کە بە

بێهوودە هەوڵدەدەن ژیانی ئەوان نمایش بکەنەوە، یاخی دەبن، لە دیمەنی کۆتاییدا، کەسایەتییەکان لە ماڵی بابەکەدا، کە ژیانی خۆی بە ناڕەحەت و خەمناك و بێهوودە دەزانێ، نیشان دەدرێن، کوڕەکە دەرهەق بە دایکی گرژو مۆن و خەمساردە و دەیخاتە سەر ساجی عەلی، زڕ کچەکە، وێڕای شەرمنییەکەی لوتبەرز و شەڕانییە، کیژە بچوکەکە لە رووبارێکدا غەرق دەبێ، و کیژە لاوەکە بە دەمانچە خۆی دەکوژێ.

ئەنجامی جوانیناسی و فەلسەفەی پیراندیللۆ -ئەگەر بکرێ وای ناو بنەین- لەمەدایە کە هونەر هەرگیز ناتوانێ جگە لە نمایشێکی تاریك و نوقستانی واقیع زیاتر بێ و ژیان بە جۆرێکی نائومێدانە خەمناکە.

# پەراوێز و ژێدەران:

١- ریفۆرمی کاتولیکی:

بزووتنەوەی ریفۆرمی کڵێسای کاتولیکی روم بوو کە دوابەدوای ریفۆرمی ئاینی سەری هەڵدا.

٢- ماتسینی (١٨٠٥- ١٨٧٢):

نیشتیمانپەروەرێکی ئیتاڵیاییە.

٣- کاڤور (١٨١٠- ١٨٦١):

سیاسەتوانێکی ئیتاڵیایی و لە دامەزرێنەرانی سەرەکی یەکێتیی ئیتاڵیایە.

٤- گاریبالدی (١٨٠٧- ١٨٨٢):

نیشتیمانپەروەرێکی ئیتاڵیایی و قارەمانێکی نەتەوەیی ئەو وڵاتە بوو.

٥- ریسور جیمینتۆ: لە مێژووی ئیتاڵیادا، دەکاتە قۆناغی ساڵانی ١٨١٥- ١٨٧٠ کە لەو سەردەمەدا ئیتاڵیا یەکی گرتەوە.

٦- جوڤانی باتیستا مارینو (١٥٦٩- ١٦٢٥).

٧- باتیستا ئاندرئینی (١٥٧٨- ١٦٥٠):

لە ئەندامانی بەناوبانگی خانەدانی ئاندرئینییە، لە ماڵباتی ئەکتەرانی ئیتاڵیایی سەدەکانی ١٦و ١٧یە.

٨- گولدونی (١٧٠٧- ١٧٩٣):

شانۆنامەنووس و شاعیرێکی ئیتاڵیاییە.

٩- فوتوریزم: ناوی قوتابخانەیەکی ئیتاڵیاییە لە واری هونەر و مۆسیقا و ئەدەبیاتدا، کە لە ساڵانی ١٩٠٥- ١٩١٥دا لە رەواج و برەودا بووە و خەسڵەتی بنچینەیی ئەم قوتابخانەیە رەتکردنەوەی داب و نەریت و یاسا و رێسا باو و تەقلیدییەکان بووە، پەیڕەوانی ئەم قوتابخانەیە ستایشی خەتەر و جەنگ و سەردەمی تەکنولۆژیایان دەکرد.

١٠- پییترۆکیاری (١٧١١- ١٧٨٥):

درامانووسێکی ئیتاڵیایی بوو.

١١- کارلۆگوتزی (١٧٢٠-١٨٠٤):

درامانووسێکی ئیتاڵیایی بوو.

١٢- جوزپیەبارتی (١٧١٩- ١٧٨٩):

رەخنەگرێکی ئیتاڵیایی بوو.

١٣- تورینو: دەڤەرێکە لە باکووری رۆژئاوای ئیتاڵیا.

١٤- لویزستولبرگ (١٧٥٢- ١٨٢٤):

لە ساڵی ١٧٧٢دا شووی بە چارلز کرد و پاش هەشت ساڵان مێردەکەی بەجێهێشت. ماوەیەك بوو بە قەپاتمەی ئالفیری و پاش مەرگی شاعیر بوو بە ماشوقەی هونەرمەندێکی فەرەنساوی.

١٥- کۆمیدیا گریانئاوەر: ئەم شێوەیە لە کۆتایی سەدەی هەڤدیەمدا لە ئینگلیستان هاتە ئاراوە و لەم کۆمیدیایەدا هەوڵ دەدرا تەماشاڤانان بهێنرێنە گریان، ئەم شێوەیە لە فەرەنساشدا برەوی پەیدا کرد و پێیان دەگوت کۆمیدیای گریانئاوەر.

١٦- دوکوندورسە (١٧٤٣- ١٧٩٤):

ژنێکی بیرکاریزان و فەیلەسووف و شۆرشگێری فەرەنساوی بوو.

١٧- جەژنی مژدە: جەژنێکە کە هەموو ساڵێك مەسیحییان لە ٢٥ی مارسدا دەیگێرن. بە باوەری وان رێك لەم کاتەدا جبرائیلی فریشتە مژدەی بە مریەمی دایکی عیسادا کە عیسای لێ دەبێ.

١٨- ئادڤینت: بە گوێرەی تەقویمی مەسیحی، قۆناغی چوار هەفتەی پێش لە دایك بوونی مەسیحە، کە وەرزی تۆبە و تۆبەکارییە،

١٩- پاسیون: خەم و عەزابی عیسایە لە کاتی دوا شامییەوە تا کاتی مردنی.

٢٠- رابوونی پاش مەرگی عیسا: بە باوەری کاتولیکەکان، عیسا پاش ئەوەی کە بە خاك سپێردرا، لە گۆرەکەی هەستایەوە و بەرەو ئاسمان هەڵکشا.

٢١- بە پێی تەقویمی ئایینی مەسیحییان جەژنی پەنجامینە بەرانبەر بە هەوتەمین یەکشەمەی دوای جەژنی پاکە، مەسیحییان لەم رۆژەدا بە یادی هاتنە خوارەوەی روح القدس، و هەروەها بە یادی دامەزرێنەری کلێسای مەسیح-ەوە جەژن دەگێرن.

٢٢- ڤیکتۆر ئیمانۆئیل (١٨٦٩- ١٩٤٧):

شای ئیتاڵیا بوو لە ساڵانی (١٩٠٠- ١٩٤٦)دا.

٢٣- شابانۆ مارگریتا (١٨٥١- ١٩٢٥):

شابانۆی ئیتاڵیا بوو، و لە خانەدانی سافۆی بوو.

٢٤- داگیرکاری ئەمسا: پاپا، ساڵانێکی زۆر لە دژی ئەو کەسانەی کە هەوڵیاندەدا ئیتاڵیا یەکبخەن و ئازاد بکەن وەستا و لایەنگری ئەمسای کردبوو.

٢٥- پسکارا: بەندەری ئیتاڵیای ناوەندی بوو لە دەریای ئادریاتیك.

٢٦- پراتو: ویلایەتێکی ئیتاڵیای مەرکەزی بوو لە توسکانی.

٢٧- فیوم: گەورەترین بەندەری یوگسلافی بوو لە کەناری دەریای ئادریاتیك.

٢٨- ئیلیونورا دوزە (١٨٥٩- ١٩٢٤):

ژنێکی ئیتاڵیایی ئەکتەر بوو، کە بە یەکێك لە هونەرمەند و ئەکتەرە هەرە گەورەکانی دنیا دەژمێردرا.

# بەشی دووەم

## ئەدەبیاتی فەرەنسا
## لە سەردەمی ڕێنیسانسدا
## ((١٤٩٤- ١٦٠٠))

سەرەتایەکی مێژوویی:

کاتێ کە شارلی هەشتەم پاشای فەرەنسا لە ساڵی ١٤٩٤دا هێرشی بردە سەر ئیتاڵیا، ئەوەی لەوێندەر بینی هێندەی (بە بۆچوونی ژول میشلە) بەلاوە تازە بوو، مەگەر کەشفی دوو ساڵ لەوە پێشی ئەمریکا بەلای کریستوف کۆڵەمبسەوە ئەوەندە تازە بووبێ. لە ماوەی جەنگەکانی سەدەی چواردەیەم و پانزەیەمدا، تاعون و قات و قڕی تەقریبەن پەیوەندی فەرەنسای دەگەڵ مەملەکەتانی دیدا بڕی، و چالاکی و چەلەنگییە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکانی وەستان، بویەرێن هزری -ئەقڵی و کۆمەڵایەتی- ناسراو بە ڕێنیسانس، کە ماوەی سەد و پەنجا ساڵێك بەسەر گەشەکردنیا لە ئیتاڵیا دەبوری، هێشتا لە فەرەنسادا جێی کەلتوور و ڕۆشنبیریی سەدەکانی ناڤینی نەگرتبووەوە، هەڵبەتە هەندێ هەواڵان لەمەڕ پترارك و بۆکاچۆ گەیی بووە فەرەنسا، و لە ساڵی ١٤٥٠ یان ١٤٦٠دا گەلێك لەو بازرگانە ئیتاڵیاییانەی کە سەرگەرمی بازرگانی ئاوریشم بوون هەندێ لە سەرەتا و تیۆرییەهونەری و ئەدەبییەکانیان لەگەڵ خۆدا بۆ لیون هێنابوو، بەڵام لە قۆناغی شەڕەکانی ئیتاڵیادا بوو (١٤٩٤- ١٥٢٥) کە بزاڤی ڕێنیسانس بە مانای ڕاستەقینەی وشە گەیییە فەرەنسا، ئەرستوکراتان و سەربازانی شارلی هەشتەم و لویسی دوازدەیەم (کە لە ساڵی ١٥٠٠دا لەشکری کردە سەر ئیتاڵیا) بە تەواوەتی کەوتنە ژێر کاریگەری فەرهەنگ و زەوقی ئیتاڵیایی و کەوتنە خەمی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ

و رۆشنبیری وان لە ولاتی خۆیاندا. فرانسوا-ی یەکەم (پاشایەتی ١٥١٥- ١٥٤٧)، "بابی رێنیسانس-ی فەرەنسا" بە هاندان و پشتیوانی کردنی ئەهلی ئەدەب و هونەر، و بەتایبەتی بە دەعوەتکردنی هونەرمەندان، زانایان، و ئەدیبانی ئیتالیایی -لیوناردو داڤینچی، ئاندریە دل سارتۆ، و بنونو توچلینی- بۆ فەرەنسا، ئەنگێزەی گەشەکردنی رێنیسانس-ی هێنایە ئارا، فرانسوا-ی یەکەم زۆر پەرەی بە کتێبخانەی پاشایەتیشدا و پاشان بوو بە کتێبخانەی نەتەوەیی، و لە سالی ١٥٣٠دا دەزگایەکی فێرکاری تازەی بە ناوی زانکۆی سێ زمانەوە دامەزراند کە زمانی یۆنانی، لاتینی، عیبری و بیرکاری تیا دەخوێنرا، لە سەردەمی پاشایەتی ئەم شایەدا سێ کۆلیژی دیکەش کرانەوە: کۆلیژی ترینیتە لە لیون ١٥٢٩، کۆلیژی گیین لە بوردۆ ١٥٣٣، و زانکۆی نیم- ١٥٣٩.[1]

مەلیکە مارگریت دوناڤار[2]-ی خوشکی فرانسوای یەکەم، لە خوازیارانی پڕجۆش و خرۆشی زانستی تازە بوو، گەلێك لە ئەدیبانی لە بارەگا و دەربارەکەی خۆیدا خڕ کردەوە و زۆری هاندان بۆ خوێندنەوەی زۆر، نووسین و وەرگێڕان (بە تایبەتی بۆ وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ئەفلاتوون، دانتی، بۆکاچۆ، و فیچینۆ[3]. ئەو بە خۆیشی کۆمەلێك بەرهەمی بە پەخشان نووسی و زۆر شیعریشی هۆنییەوە.

جێگرانی فرانسوای یەکەم-یش هەر لە هاندەرانی رۆشنبیریی رێنیسانسی ئیتالیا بوون. مەلیکە هانری دووەم (حوکمڕانی ١٥٤٧- ١٥٥٩)، کاترین دومدیچی کە لە مالباتە بە ناوبانگەکانی فلورانس بوو، دەربار و بارەگاکەی خۆی کرد بە ئەنجوومەن و شوێنی ئیتالیاییەکان، و کوڕەکانیشی، فرانسوا-ی دووەم (دەسەلات ١٥٥٨- ١٥٥٩)، شارلی نۆیەم (حوکمڕانی ١٥٦٠- ١٥٧٤)، و هانری سێیەم (حوکمڕانی ١٥٧٤- ١٥٨٩) بە تەواوەتی ئاشق و شەیدای رۆشنبیریی و فەرهەنگی ئیتالیایی بوون، بەهەرحال لە ئاخر و ئۆخری ئەم سەدەیەدا ناسیونالیستان بە توندی رووبەڕووی فەرهەنگی ئیتالیا وەستانەوە.

لە بەرانبەر مرۆڤپەروەران و لایەنگرانی زانستە مرۆڤانییەکاندا، ریفۆرمکارانی ئایینی هەبوون، کە لە هەموویان گرنگتر جون کالڤین[4] بوو، ئەگەرچی زۆربەی فەرەنساوییان هیچ کاتێ تیۆرییە وشکەکانی کالڤین-یان قەبوول نەکرد، و وێڕای ئەوەی کە لە فەرەنسادا هومانیزم بەسەر ریفۆرمی ئایینیدا زال بوو، ریفۆرمیستانی ئایینی لەوێندەر دەسەلات و ئیحتوباریان زۆر زیاتر بوو لە هی ئیتالیا، و توانیان ئەدەبیاتی فەرەنسا بە مەبەستی ئەخلاقی و جدییەتێکی توندی وەها ئاوێتە بکەن کە لە باشووری ئالپدا نموونەی نەبوو. لە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا

پێکادانی نێوان پرۆتستانت و کاتولیکەکان توند بوو. لە فاسیلەی ساڵانی ١٥٦٢- ١٥٩٨دا هەشت جەنگی ئایینی قەوما، خراپترین رووداو، کوشتاری رۆژی قەشەبارتلمی "٥" ١٥٧٢ بوو کە بە فیتی شارل-ی نۆیەم ژمارەیەکی زۆر لە پروتستانەکان بە دەستی کاتۆلیکە توندڕەوەکان کوژران، ئەم کوشتارە کاردانەوەی فەرەنساوییانی نەیاری دەسەڵاتی ئیتاڵیای زیاتر کرد. لە ساڵی ١٥٩٨دا هانری چوارەم بە فەرمانی نانت کۆتایی بە جەنگی مەزهەبی هێنا. بە گوێرەی ئەم فەرمانە بەناوبانگە ئازادی هزری و بیروباوەڕ بە پروتستانەکان درا، رێگەی دامەزراندنی قوتابخانانیان پێدرا، رێگەیان درایێ کە پایە و پۆستی دەوڵەتی وەربگرن، و زۆر ئاسانکاری تریان بۆ دابین کرا کە سروودێن ئایینی خۆ ئەنجام بدەن.

نۆڕینێکی گشتی:

ئەدەبیاتی رێنیسانسی فەرەنسی گەلێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبیاتی رێنیسانسی ئیتاڵیای لەخۆگرتووە. تاکگەرایی، هۆمانیزم، گیانی سەرکێشی و بایەخدانی ورد بە فۆرم و جۆری پەرداخت، بە تایبەتمەندییە دیارەکانی ئەدەبیاتی رێنیسانسی فەرەنسا دەژمێردرێ.

باتلەر سەردەمی رێنیسانسی فەرەنسا دەکات بە چوار قۆناغەوە:

***٥٤- قۆناغی سەرهەڵدان و پەیدا بوون، ١٤٩٤- ١٥١٥***

***٥٥- قۆناغی میللی، ١٥١٥- ١١٥٠***

***٥٦- قۆناغی ئیتاڵیایی، ١١٥٠- ١٥٧٢***

***٥٧- قۆناغی مونتێنی، ١٥٧٢- ١٥٨٩***

لە قۆناغی سەرهەڵدان و پەیدا بووندا هیچ بەرهەمێکی ئەدەبی گرینگ نایەتە نووسین و دانان.

لە قۆناغی میللی، ناسراو بە (سەردەمی پەیڤپەروەرانی مەزن) هۆزان، ژانری ئەدەبیی باو بوو، و شاعیرانیش جەختیان لەسەر جۆری مامەڵە کردن، سنعەتی ئەدەبی، ئاڵۆزی کێش و قافیە دەکردەوە. دیارە لە بەرانبەر ئەم شاعیرانەدا، کلیمان مارۆ (١٤٩٧- ١٥٤٤) هەبوو کە سادەیی، روونی و رەوانی، و ناسکی لە نووسین و پەیڤاندا پێ بەجێ و پەسند بوو. مارگریت دوناڤار، لە شاعیرانی قۆناغی میللییە. باشترین شیعریشی هۆزانی ئایینی یان شەخسییە. مارگرێت لە شیعری مەجازی (زیندانەکان)دا مەسیحییەت و حیکمەتی ئەفلاتوون ئاوێتەی یەکدی دەکات، و لە (ئاوێنەی روحی گوناحکار)دا باسی زمانەوانی دێنێتە گۆڕێ، و لە ئەنجامدا (لە نێو شاعیرانی قۆناغی میللیدا) دەبێ ئاماژەیەك بۆ خودانی قوتابخانەی لیون-

واتە ئەو ئەفلاتوونییان و پترارك گەرایان- بکرێ، کە شیعری خالیسەیان نەدەگوت. لەواری پەخشاندا، زێدەباری ئەو تەرجەمانەی کە لە یونانی و ئیتاڵیاییەوە دەکران، رابلەوکالڤن شاکاری مەزنی خۆیان داهێنا، و مارگرێت دوناڤار ((هپتامرون))ی نووسی کە کۆمەڵێك کورتە چیرۆکە و بۆکاچۆ- ئیلهامبەخشیەتی.

لە قۆناغی ئیتاڵیاییدا گرووپی پلیئاد، شۆرەت و ئیحتوباری پەیدا کرد، ئەو شاعیرانەی کە ئیلهام و سەرۆیان لەبەرهەمێن کلاسیکی یۆنانی و رومی کۆنەوە وەردەگرت. ئەمانە کە بەرەڤانییان لە زمانی فەرەنسی دەکرد، لەواری ئارایشت و پاککردنەوەی ئەم زمانەدا هەنگاوی گەورەیان نا و زۆریان دەوڵەمەند کرد.

مونتینی گەورەترین سیمای دوا قۆناغی رێنیسانسە، لەم قۆناغەدا، دوو کەس لە موریدانی پلیئادەکان، واتە ((دپورت ١٥٤٢- ١٦٠٦))، ((گیوم دوبارتا ١٥٤٤- ١٥٩٠)) شۆرەت و ناوبانگی زۆریان پەیدا کرد. گیوم دوبارتا بە بەیتی (خیلقەتی عالەم) کاری کردە سەر: ئان برادستریت، میلتن، تۆماس مۆر، و بایرون، شیعر و پەخشانی ئەم قۆناغە سێبەر و کاریگەریی موناقەشاتی ئایینی رۆژی پێوە دیارە.

ئەگریپادوبینیە، بە بەیتی حەوت بەشی (مسیبەت بارەکان)، دید و بۆچوونی پروتستانەکان سەبارەت بە جەنگە ئایینییەکان نیشان دەدا و- تەنزی مێنیپی، کە پارچەیەکە لە تەنزی ئایینی و سیاسی و کاتولیکەکان نووسیویانە، بەڵام لایەنگری لە تاقمی میانڕەوەکان دەکات، پایەی پاشایەتی فەرەنسادا، فەرەنساوییەکی پروتستانی پێ باشترە لە کاتولیکێکی بێگانە. تەقریبەن لە ناوەڕاستی ئەم سەدەیەدا دراما گەشەی کرد و بایەخی پەیدا کرد.

## رابلە

فرانسوا رابلە (١٤٩٤- ١٥٥٣):

تەنزپەروەر و پێکەنینۆکنووسێکی خەڵکی شینونی ویلایەتی تورنە، لە ساڵی ١٥٠٩وە تا ١٥٢٤ لە ریزی رەبەنانی تیمی فرانسیسیاندا "٦"، لە دێری فونتاری لوکنتدا بردە سەر و لەوێندەر یونانیی خوێند. لە ساڵی ١٥٢٤دا پەیوەندی بە فیرقەی بندیکتیان-ەوە "٧" کرد، رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە لێرەدا هەندێ ئازادتر بووبێ، بەڵام زۆر زوو دێری بەجێهێشت و بوو بە کەشیش. لە ساڵی ١٥٣٠دا لە زانکۆی مون پلیە دەستی بە خوێندنی پزیشکی کرد، و دوای دوو ساڵ بوو بە یاریدەدەری نەخۆشخانەی لیون. ساڵێك دواتر بوو بە پزیشکی جان

دوبلە"[٨]" (پاشان بەکاردینال) و لەگەڵ ئەودا سەردانی روم-ی کرد. پاش گەڕانەوە لە روم لە ساڵی ١٥٣٧دا پلەی دکتۆرای لە مون پلییە وەرگرت، و لە لیوندا مژولی دکتۆری بوو. لە دەوروبەری ساڵی ١٥٤٦ یان ١٥٤٧دا کە نووسینەکانی مەحکوم و رەفزکران، بۆ متز"[٩]" هەڵات. لە ئەنجامدا رابلە لە ساڵی ١٥٥٠دا کرا بە کەشیشی مودون"[١٠]" و تاکو مردن هەر لەم پۆستەدا مایەوە.

بەرهەمەکانی:

"واریقاتنامە گەورە و ستایش ئەنگێزەکانی گارگانتوا، دێوی پایەبەرز و کەلەش مەزن-١٥٣٢": ئەمە کتێبێکی چکۆلەیە و نووسەرەکەی نەناسراوە، بەڵام مەزەندەی ئەوەی لێدەگرێ کە رابلە ئامادەی کردبێ نەك نووسیبێتی. لەم کتێبەدا شەجەرەنامەی گارگانتوا، ئەو دێوەی لە خزمەتی ئارتورشادایە پیشاندەدرێ، کتێبەکە بە شێوەیەکی گشتی چاولێکەرییەکی هەجوئامێزی رۆمانسەکانی سەردەمی سوارچاکی و دلاوەرییە.

"کردار و گوتاری سەرکێشانەی پانتاگرویلی باش،ی کوڕی گارگانتوا": ئەمە هەر درێژەی بەرهەمەکەی پێشووە، کە لە ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٥٣٢ یان ١٥٣٣دا لەلایەن ئالکوفریبانازیەوە (ناوی خوازراوی فرانسوا رابلە)یە بڵاوکرایەوە. ئەم بەرهەمە پاشان بوو بە کتێبی دووەم لە زنجیرەی گارگانتوا، لەدایکبوون و خوێندنی قارەمانی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە، و دەکەوێتە ناساندنی خزمەتکار و هاونشینەکەی ئەو، پانورج، کە نموونە و سەرمەشقێك بووە بۆ داهێنانی "سانچۆپا نتزا"ی دۆنکیشوت. لەم کتێبەدا مەسەلە خرۆشێنەرگەرمەکانی رۆژ دەخرێنەڕوو، لێرەشدا گاڵتە و تەوس بە رۆمانسە سوارچاکی و دلاوەرییەکان و فەزلڕۆشی دەکرێ، و لایەنگری لە تیۆرییانی سەردەمی رێنیسانس دەربارەی پەروەردە و فێرکردن دەکرێت.

((ژیانی ستایش ئەنگێزی گارگانتوای گەورە، بابی پانتاگرونیل":

رابلە لە ساڵی ١٥٣٤دا هەست دەکات کە کتێبە چکۆلەکەی ساڵی ١٥٣٢ شایستەی ئەوە نییە ببێ بە پێشینەی ((کردار و وتاری سەرکێشانەی پانتاگرونیل...)) بۆیە بە ناوی ((ژیانی ستایش ئەنگێزی گارگانتوای گەورە، بابی پانتاگرونیل))ەوە جارێکی دی دایدەڕێژێتەوە، ئەمجارەش ناوی "ئالکوفریبا نازیە"ی لەسەر دادەنێ ، ئەم نوسخەیە باسی لەدایکبوون و خوێندنی گارگانتوا، و سەردانی بۆ پاریس دەکات، لەوێندەر زەنگی کلێسای نۆتردام دەدزێت تابیکات بە ملی ئەسپەکەی خۆیەوە، رابلە لێرەشدا هێرش دەکاتە سەر شێوەی کۆنی پەروەردە و فێرکردن و ستایشی هومانیزم دەکات.

لە باسی بویەری شەڕەکانی نێوان گرانگوزیەو (بابی گارگانتوا)و پیکەر جولدا، شەڕیش مەحکوم دەکات. گرنگترین فەسڵی ئەم کتێبە دروستکردنی دێری تلم-ە بە دەستی گارگانتوا. ئەم دێرە یوتوپیایەکە و ئەمە دروشمیەتی ((بە کەیفی دڵی خۆت بکە)). دێرنشینەکان هیچیان تەمەڵ و بێکارە نین، ژیانیان بە ئازادی، چالاکی، و شادی و ئومێدەواری لە هەنبەر ناسازگارییەکانی ژیاندا —کە ئەمە فەلسەفەی خودی رابلە-ئاوێتەیە، ئەو گیانی ئازادییەی کە بەسەر یاساکانی ئەم دێرەدا زاڵ و فەرمانڕەوایە، بەڵگە و نیشانەی بێزاری خودی نووسەرە لە ژیانی رەبەنایەتی خۆی لە رۆژانی لاویدا..

کتێبی سێیەم:

رابلە لە ساڵی ١٥٤٦دا کتێبی سێیەمی (بەناوی راستەقینەی خۆیەوە) نووسی. لە سەرانسەری کتێبەکەدا ئەم "پرسیارە دژوارە" خراوەتەڕوو کە ئایا پانورج پێویستە ژن بێنێ یان هەر بە سەڵتی بمێنێتەوە، ئەم پرسیارە لە زۆر کەس دەکات، بەڵام هیچ کەسێك وەڵامی قەناعەتبەخشی ناداتەوە، پانورج لە ئەنجامدا لێدەبڕێ کە داوای کۆمەك لە ئیلهامگای جامی مقەدەس بکات، ئەم کتێبە لەبەرهەمەکانی پێشووتری رابلە جدیتر و بنجبڕترە باسێکی تێروتەسەل و چڕوپڕی دەربارەی رەگەز و مامەڵەی فەرهەنگی سەدەکانی ناڤین لەگەڵ ژندا، لەخۆگرتووە، لە هەمان فەسڵی کتێبەکەدا، رۆندیبیلیی پزیشك، لە زمانی رابلەوە، بەوپەڕی راستگۆییەوە دەڵێت: کە باسی ژن دەکەم، بیر لە بوونەوەرێك دەکەمەوە یەجگار ناسك و لە زرەنج ، گەلەك دەمدەمی مجێز، زۆر هەلپەرست، زۆر بێ قەرار، وەك ئەوەی تەبیعەت لە کاتی ئەفراندنی ژندا ئەقڵی خۆی لە دەست دابێ ((لە کاتێکا هەموو بوونەوەرانی دیکەی بە زەبری ئەقڵ ئەفراندووە)).

کتێبی چوارەم: (١٥٥٢- ١٥٥٣):

ئەم کتێبە بەسەر هاتی سەفەری پانتاگرویل و پانورج دەگێڕێتەوە کە بۆ دۆزینەوەی ئیلهامگای جامی موقەدەس، لە رچەڕێی باکووری رۆژئاواوە بەرەو ختا و هیند دەڕۆن، ئەم دووە سەردانی زۆر دوڕگان دەکەن و لە هەر دوڕگەیەك کۆمەڵێك سستی "ئەخلاقی" بەشەری دەبینن و گاڵتەی پێ دەکەن.

کتێبی پێنجەم:

ئەم بەرهەمە لە ساڵی ١٥٦٢دا، واتە نزیکەی هەشت یا نۆ ساڵ پاش مردنی رابلە بڵاوبووەوە، گەلێك لە رەخنەگران گومانیان لەوەیە کە ئەم کتێبە هی رابلە بێ، بەڵام ئەمڕۆ وا مەزەندە دەکرێ کە ئەم کتێبە لە یادداشتنامە و شرە بەیاز و دەستنووسەکانی رابلەوە

نووسراوە. لەم چیرۆکەدا پانورج و پانتاگروئل سەردانی کۆمەڵێك دورگەی زیاتر دەکەن، بۆ نموونە دەگەنە دورگەیەکی پڕ هەرا و زەنا، کە نموونەیەکی روم-ە، و گیرۆدەی کۆمەڵێك بویەر و رووداوان دەبن، سەرەنجام لانترن (خوێنەواری) بۆ ئیلهامگای جامی موقەدەسیان دەبات، و لەوێندەر و لە وەڵامی پرسیارەکەیاندا تەنیا یەك کەلیمە جواب دەژنەون: "بنۆشە"- کە تەفسیر و شرۆڤەکەی ئەمەیە: "لە ژیان، لە حەقیقەت، و لە مەعریفەت، پاراو بە"، بەڵام بەم وەڵامەش پانورج، هیچی لەمەڕ زەوجین بۆ روون نابێتەوە.

کورتەیەکی رەخنە و ئیرادەکان:

رابلە، وەکو رەخنەی زۆری لێدەگرن، و ستایش و ئافەرینی زۆریش دەکرێ..لە روانگەی نەیارانییەوە دەتوانرێ بگوترێ هەندێ پارچە لە بەرهەمەکانیدا هەن نووسینەکانی بۆ ئاستی راز و نیازی دزێو و ناشیرین و ناپەسند خوارە. جا بۆ ئەوەی بتوانرێ پاکانەیەك بۆ ئەو هەندە نووسینانەی بکرێ دەبێ جیاوازی نێوان زەوق و سەلیقە و هەستیاری فەرەنساویانی سەردەمی رێنیسانس لەگەڵ هوشیاری و هەستی ئەمریکاییانی سەدەی بیستەمدا لەبەر چاو بگیرێ. جگە لەوەی کە ئەم دزێوی و رەقییەی کە لە بەرهەمەکانی رابلەدا دەبێتە مایەی رەخنە و ئیراد، هیچ کاتێ هەرزەیی و بەدرەفتاریی لێناکەوێتەوە، بەڵکو زۆری ئەم دزێوی و رەقییەیە کە بە زۆری نەفرەت و بێزاری لەلای خوێنەر دروست دەکات، دووەمین خاڵێك کە لە رابلە دەگیرێ ئەمەیە کە عادەتەن —نەك هەمیشە- حورمەتی بەها بەرز و مەعنەوییەکانییە..

لەلایەکی دیکەوە قسە لەمەڕ ستایشی رابلە، یەکەم: مەیل و ئارەزووی پڕجۆش و خرۆشی وی بۆ زانست بە مانای بەرینی وشە، و زانیاری هەمەلایەنەی وی خوێنەر ناچاری ستایش دەکات. لەڕاستیدا ئەم هزرڤانە هومانیستە، بەزەبری وشەی نایاب مەعریفەی دەوڵەمەندی رێنیسانسی لەبەرهەمەکانی خۆیدا کۆکردووەتەوە. دووەم: رابلە هیچ کاتێك ریاکاری، خۆهەڵکێشان، کورتبینی، زوڵم، توندڕەوی، و کۆنەپەرستی تەحەمول ناکات و هەمیشە پەردە لەڕووی کەشیشانی درۆینە و هەموو شەڕانیانی کۆمەڵگە هەڵدەماڵێ، سێیەم: رابلە لە کاراکتەرسازیدا بێ ئەندازە وەستا و کارامەیە، بە تایبەتی دەربارەی پانورج کە تەقریبەن کەماڵی هزری- ئەقڵی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، بەڵام بە تەواوەتی لەبەها ئەخلاقییەکان بەتاڵە، کابرایەکە ترسنۆك، شەرابخۆر، شەهوەتپەروەر، حیلەبازی رکوونی و دەستبڵاوە، لەگەڵ ئەمەشدا لە رادەبەدەر دڵگرە.

دوا وتەو لە هەمووان گرنگتر پەیامە ئینسانییەکەی رابلەیە، ئەو هەوێن و مایەی ژیانە، هەموو بەرهەمەکانی دەچنەوە سەر ژیاندۆستی و ماقولییەت بەخشین بە ژیان و بەردەوامانندنی

هاوسەنگی ژیان. ئەزموون بە تەنیا دەتوانێ مرۆڤی ساغڵەم و ماقول بەرهەم بێنێ، بەڵام تیۆریبازی، تەجرید، ڕێسای ڕەبەنایەتی، و سەرکوتکردنی نەفس، تەبیعەت و سروشتی بەشەری تێك دەشکێنێ و بەرەو نەمانی دەبات. فەلسەفەی رابلە –"پانتاگرو ئلیزم" دەشێت بە سازش کردن لێك بدرێتەوە، یانی پەرەپێدانی هاوهزری هەمەلایەنە لە هەموو کاروبارە مرۆڤانییەکاندا، لەگەڵ دەرك کردنی بێهودەییاندا. رابلە گوتەنی: پێکەنین ئیمتیازێکە تایبەت بە ئادەمیزاد.

## کالڤن

<u>جان کالڤن یا جان کلوڤین (١٥٠٩- ١٥٦٤):</u>

ئەم ریفۆرمیستە پروتستانە لە نوایون-ی ویلایەتی پیکاردی (باکووری فەرەنسا) هاتووەتە دنیاوە، لە زانکۆی سوربۆندا زانستی کەلامی خوێندووە و لە ئورلیان و بورجەدا مافی خوێندووە. لە هەوەڵی ژیاندا لە ئەنجامی گۆڕانێکی روحی کتوپڕدا چووەتە سەر مەزهەبی پروتستان، و لەساڵی ١٥٣٤دا بۆ سویسرا هەڵات و رۆڵی رابەرایەتی لە نێو هەوادارانی مەزهەبی پروتستاندا وەرگرت، دوو ساڵان دواتر دەقی لاتینی گەورەترین بەرهەمی خۆی، واتە (پرەنسیپەکانی ئایینی مەسیحی) بڵاوکردەوە، و لە ساڵی ١٥٤١ دا هەر خۆی ئەو کتێبەی وەرگێڕایە سەر زمانی فەرەنسایی، کالڤن پاش سەردانێکی ئیتالیا، لە جنێڤدا ئاکنجی بوو و زۆربەی ساڵانی تەمەنی خۆی لەوێندەر قەتاند.

کتێبی (پرەنسیپەکانی ئایینی مەسیحی) کە راوبۆچوونەکانی کالڤن-ی لەخۆ گرتووە لەبەر دوو هۆ زۆر گرنگە، یەکەم: گەورەترین کاریگەری بەسەر ئەندێشە و هزری کەلامی و زمانەوانییەوە هەبووە. کاریگەری تەواوی بەسەر جۆن کنوکس"١١"، میلتن، و جواناتان ئەدواردزەوە هەبووە. دەکرێت پرەنسیپە بنچینەییەکانی باوەڕی کالڤن لەم خاڵانەدا کورت بکرێنەوە:

١- مەسەلەی تەقدیر و قەدەر (کالڤن باوەڕی وابوو چارەنووسی هەر تاکێکی بنیادەم لە پێشەوە دیاری کراوە کە رزگارە یان نا، و هەر کارێك بکات ناتوانێ کەمترین گۆڕانکاری لەم چارەنووسە بکات).

٢- گوناحی یەکەمین، واتە شەڕانییەت و بەدی زگماك و خۆرسکی بەشەر.

٣- عیلم و توانای موتڵەقی خوا.

٤- خوا بە خۆی کۆمەڵێك هەڵدەبژێرێ (بۆ چوونە بەهەشت) و کۆمەڵانێکی زۆریش ترۆ دەکات (کالڤن دەیگوت خودا بە خۆی کەسانێك دەخاتە بەهەشت و خەڵکانێك بۆ دۆزەخ دەنێرێ، واتە چوونە بەهەشت یان دۆزەخ بەدەستی خوایە و خودا خۆی هەردوو تاقمەکە هەڵدەبژێرێ.

٥- رزگاری تەنیا بە لوتف و مەرحەمەتی خواوە بەندە.

٦- بالآیی ئیمان بەسەر کاری خێرەوە.

هۆی دووەمی گرنگی پرەنسیپەکانی ئایینی مەسیحی (هۆی بایەخیدانی تایبەتی خوێنکارانی ئەدەبیات پێی) ئەمەیە کە کتێبەکەی کالڤن لە مێژووی پەخشانی فەرەنسیدا بە خالّی وەرچەرخان دەژمێردرێ، شاکارێکی فیکری روون و سیستەماتیکە، و شێوازەکەی کورت، ورد، سادە، سفت و بە زۆری جوان و رەوانە.

کالڤن و رابلەی هاوعەسری رێك دوو جەمسەری دژ بە یەکن، رابلە نوێنەری هومانیزمە، و کالڤن نوێنەری ریفۆرمی ئایینییە.

## پلئیادەکان"١٢"

لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەیەمدا، کاتێ کە دەسەلاّتی ئیتالّیا و ئینسانگەرایی گەییبووە لوتکەی خۆی، دەستەیەك شاعیری لاو بەرابەرایەتی پییردو رونسار، راپەڕینێکیان بە مەبەستی ریفۆرمی زمان و بەرزکردنەوەی ئاستی ئەدەبیاتی فەرەنسەوی دەست پێکرد، بەیاننامەی ئەم دەستە شاعیرە بە ناوی (بەرەڤانی لە زمانی فەرەنسی- ١٥٤٩) بوو کە لەلایەن جواشم-ەوە نووسرا، و بریتی بوو لە دوو بەش: لە بەشی یەکەمدا گالّتە بەو کەسانە دەکات کە سوورن لەسەر ئەوەی بۆ نووسینی جدی زمانی لاتینی بەکار ببرێ و هەروەها بەرگری لە زمانی فەرەنسی وەکو زمانێکی لەبار بۆ نووسینی ئەدەبی و فەلسەفی، دەکات، لە بەشی دووەمدا چاککردن و ریفۆرمی زمانی فەرەنسی لە گۆڕییە، بۆ گەیشتن بەم مەبەست و ئامانجەش پێشنیازی خوێندنی ئەدەبیاتی کۆن و لاسایی کردنەوەی پێشینان، دەکرێ، بەتایبەتی هۆمەر، ڤێرجیل، هۆراس، هەروەها جەخت لەسەر دەست هەلگرتن لە کلێشە و قالّبە ئەدەبییەکانی سەدەکانی ناڤین، و گەڕانەوە بۆ فۆرمە کۆنەکان، و پەیڕەوی کردنی شێوازی بەرهەمێن کلاسیکی کۆن دەکرێ.

ئەو شاعیرە لاوانەی کە پشتیوان و پراکتیزەکاری ئەم تێورییانە بوون، بە پلئیادەکان بەناوبانگن ئەندامانی دیار و ناسراوی دەستەی پلئیاد حەوت کەس بوون:

پییردو رونسار، جواشم دوبلە، پونتودروتیار"١٣"، ئاتین جودل، رمی بلو"١٤"، ئانتوان دو بائیف"١٥"، جان دورا"١٦".

پلئیادەکـان ئەگەرچـی لـەڕووی ستایـشی کوێرانـەی بەرهـەمی کلاسـیکەوە، -تەنانـەت بەرهەمی کۆن- لەبەر خۆهەڵکێشیێ و فەزڵفرۆشی و نەبوونی سەربەخۆیی دەبنە مایەی رەخنە، بەڵام ئەدەبیاتی فەرەنسا لە هەندێ رووەوە قەرزارباری ئەوانە، پلئیادەکان لە دەوڵەمەند کردنی زمانی فەرەنسیدا سەرکەوتنی بەرچاویان هەبوو، حورمەتی پەیامی شاعیریان دەگرت، برەویـان بە غەزەلی فەرەنسیدا، و بناغەی ئەدەبیاتی کلاسیکی سەدەی حەڤدەیەمیان دارشت.

## رۆنسار

پییردو رۆنسار (١٥٢٤- ١٥٨٥):

کە بە (میری شاعیران) ناسراوە، لە شاتو دولاپواسونیر-ی نزیکی ڤەندم لە دایك بووە، پاش خوێندنێکی کەم لە کۆلیجی ناڤار-ی پـاریس، چـووە دەربـاری دۆك ئورلیـان، و پاشـان چـووە خزمەتی مادلین دوفرانس، رۆنسار، لە کاتی شووکردنی مادلین بە جیمز-ی پێنجەم، هـەتاوەکو سکوتلاندا لەگەڵی چوو و بـەرێی کـرد، پـاش گەڕانـەوەی بـۆ فەرەنـسا، لـە خزمـەتی چـەند ئەرستۆکراتیکدا کۆمەڵە سەفەرێکی سیاسیی کرد، و وەها دەهاتە بەرچاو کە بە تەمایـە بـبێ بە سیاسەتوان، و لەم سەرو بەندەدا گوێیەکانی کەڕ بوون، بۆیە لە کڵێسادا کەوتـە ئەنجامـدانی خزمەتی ئایینی، بەڵام هەر زوو بە هەموو هێز و توانایەوە کەوتە فێر بوونی یۆنانی و لاتـینی، نزیکەی شەش ساڵ لەگەڵ ئەنتوان دوبائیفدا لەلای جون دورا-ی گەورە هومانیست خوێنـدی، و هەر لەم ساڵانەدا ئاشنایەتی لەگەڵ دوبلە، جودل، و بلودا پەیدا کرد، رۆنسار لە سـاڵی ١٥٥٠ بە دواوە هەندێ جار لە پاریس و هەندێ جار لە تورن دەژیـا، هەمیـشە لـە پاشـایان- هنـری دووەم، فرانسوای دووەم، شارلی نۆیەم و هنری سێیەمەوە نزیك بوو.

بەرهەمەکانی:

رۆنسار وەکو رابـەری پلئیادەکـان، شـاعیرانی لیریکـی و داسـتانی (مەلحـەمی) یۆنـانی و لاتینی، و پترارك بە نموونە و سەرمەشقی خۆی هەڵدەبژێری، رۆنسار شاعیرێکی فـرە بەرهـەم و پڕکار بوو، تەقریبەن لـە هـەموو بوارەکانـدا، جگـە لـە بـواری شـانۆنامە، شـیعری گوتـووە، شارەزایان بەرهەمەکانی رۆنسار بەسەر سێ قۆناغدا دابەش دەکەن:

١- قۆناغی سـاڵانی ١٥٥٠- ١٥٦٠، قۆنـاغی لاسـایی کردنـەوەی شـێوازی پـترارك و ئەدەبیاتی یونانییە.

٢- قۆناغی سالآنی ١٥٦٠- ١٥٧٤، لەم قۆناغەدا دەبێ بە شاعیری فەرمی دەربار.

٣- قۆناغی سالآنی ١٥٧٤- ١٥٨٤، قۆناغی خەلوەت و گۆشەگیری و ئاسودەیی شاعیرە و هەندێ شیعر دەربارەی سروشت و ئەڤین دەلێت.

گرنگترین بەرهەمێن رۆنسار:

"چامەکان": (بریتییە لە پێنج کتێب: ١٥٥٠- ١٥٥٢):

بەشێوەیەکی گشتی چاولێکەرییەکی ناسەرکەوتووی پینداره، هەولی رۆنسار بە مەبەستی دروست کردنی هەست و ئافراندنی قارەمانانی هاوتای نیمچە خواوەندانی کۆن، شیعرەکانی پڕ کردووە لە هێما و رەمزی مێژوویی و ئەفسانەیی، لەگەڵ ئەمەشدا چامەکانی رۆنسار لە سەردەمی خودی رۆنساردا پەسندی عەوامی خەلکی بوون.

غەزەلیاتەکان: (ئەڤینداری):

لە غەزەلەکانی رۆنساردا جۆرێك لە نەرمە خەم و ناسکە خەم شەپۆل دەدا، لەبەر ئەوەی کە جوانی زووتێپەڕە و تەمەنی ژیان کورتە، غەزەلیاتەکان دەکرێن بە چەند بەشێکەوە:

چەند غەزەلێك بۆ کاساندرا:

ئەم بەرهەمە بریتییە لە (١٨١) غەزەل کە بۆ کاساندرا سالویاتیی خەلکی بلو گوتراون. ئەم غەزەلانە لە ژێر کاریگەری هۆراس، بەلآم بە شێوەی پترارکی "١٧" وتراون، ئەم شیعرانە ئەگەرچی داهێنانیان تیانییە، بەلآم هەندێ بەیتی لەڕادەبەدەر شکۆدارە. ئەم شیعرانە لەگەڵ کۆمەلە شیعری (چەند غەزەلێك بۆ ماری)دا بوونە مایەی شۆرەت و نێوبانگی رۆنسار و نازناوی شازادەی شاعیرانی فەرەنسەوی-بەدیاریی بۆ هێنا.

جەند غەزەلێك بۆ ماری: (١٥٥٥- ١٥٥٦):

رۆنسار، ئیلهامی ئەم شیعرانەی لە بەرهەمەکانی کریون، تیوکریتوس، و پترارکەوە وەرگرتووە، شاعیر لەم بەرهەمەدا رووی دەمی لە ماری دوپن-ی کیژە گوندیی خەلکی ئەنژۆ-یەو ئەو دەدوێنێ، و رونسار هەم لە رۆژگاری ژیانی ماشوقەکەیدا و هەم لە پاش مەرگی وی، هەر ستایشی دەکات و پێیا هەلدەلێ. ئەم شیعرانە لەرووی هەستەوە تارادەیەك لە غەزەلەکانی کاساندرا قوولترن، بەلآم هێشتا هەر کەم هەوێن و سەرڤەسەرڤەن.

چەند غەزەلێك بۆ هیلین (١٥٧٤- ١٥٨٤):

کۆمەلە سۆناتەیەکە بۆ هیلین دوو سورجیر-ی هاودەمی دەرباری کاترین دوو مدیچی. ئەم غەزەلانە لە ریزی شیعرە رەسەن و شەخسی و راستگۆیەکانی رۆنسارن.

هۆزانێن رامیاری:

رۆنسار لە ماوەی یەکەم شەڕی ناوخۆیی ئایینیدا (١٥٦٢- ١٥٦٣) سێ گوتاری شیعری بۆ پشتیوانی لە کاتولیکەکان گوتووە: گوتارێك دەربارەی مەینەتییەکانی رۆژگار، درێژەی گوتارەکە و سەرزەنشتی خەڵکی فەڕەنسا، رۆنسار لەم گوتارانەدا پەنا وەبەر ئەفسانان نابات و شیعرەکانی راستگۆ، بتەو و هەندێ جار تانە ئامێزن.

بەیتی فرانسیاد – ١٥٧٢:

بەیتێکی تاقەتبەرە. رۆنسار کە بەتەمابوو نەژاد و رەگ و رەچەڵەکی خەڵکی فەڕەنسا لە داستانێکی (مەلحەمە) بیست و چوار کتێبی دا بگێڕێتەوە، تەنیا چوار کتێبی بۆ دانرا، ئیلهامبەخشی رۆنسار لەم کتێبەدا هۆمەر و ڤێرجیل بوون و سەرچاوەی سەرەکیشی کتێبی (چەند وێنەیەك دەربارەی خەڵکی گل و خەسڵەتەکانی خەڵکی تەروادە)ی نووسینی (جیهان لومردو بلچ)ە بوو، فرانسیاد، شکستێکی تەواوە، چونکە دەستکردە، چونکە چەمکی بێ چەن و چوونی قەدەری ئینسان بەسەریا زاڵ نییە.

هەڵسەنگاندن:

گەورەترین کێماسی و کەم و کورتی بەرهەمەکانی رۆنسار درێژدادڕی و ئەدەبییەتە کە زۆر بەلای فەزلفرۆشیدا دەشکێتەوە، لایەنی ئیجابی شیعرەکانی رۆنسار بریتییە لە: تەبایی و سازان، زیندوویەتی، شارەزایی لە کێش و ئاهەنگ (کە شیعری فەڕەنساوی دوای رۆنسار لە بەکار هێنانی کێش و ئاهەنگدا قەرزارباری ئەوە). و هەندێ جار هەستی ئاشقێنی خالیسەیە. رۆنسار لەواری شیعری داستانیدا کەم مایەترە لە جۆرەکانی دی، و توانا و بەهرەی وی زیاتر لە هەر شتێك لە غەزەل و شیعرە سیاسییەکانیدایە کە لەوێدا بێ درێغی دەرفەتی بە سۆزەکانی خۆیداوە تا خۆ بنوێنن.

رۆنسار سێ تاك شیعری بەناوبانگی هەیە بەم ناوانە: "ئازیزم، وەرە بچینە دیداری گوڵی رۆز"- کە هونەراندنێکی یەجگار بەرزی بابەتی فرسەت لە دەست مەدە-یە، "ئەو کاتەی کە بیست یا سی مانگ بێ کە رۆشتبم"، و "ئەو دەمەی کە تۆ زۆر پیر بوویی" کە غەزەلێکی (سۆناتە) زۆر جوانە بۆ هیلین.

## دوبلە ((دوبلی))

جواشم دوبلیَ (١٥٢٥- ١٥٦٠):

لە دوای رۆنسار، گەورەترین شاعیری دەستەی پلئیادە، لـە لیریـی دەڤـەری ئـانجۆ هاتۆتـە دنیاوە. پاش خوێندنێکی کەمی ماف لە پواتیە، ئاشنایەتی لەگـەڵ جـاك یلەتیـە و رونسـاردا پەیدا کرد، بوو بە ئەندامی کۆلیژی کونکورە و بە هەموو هێز و توانـای خۆیـەوە خـووی دایـە ئەدەبیات. ئەویش وەکو رۆنسار کەڕ بوو (١٥٤٩)و وەکو رابلە، لەگەڵ جـۆن دوبلـە-ی خزمـی خۆیدا چوو بۆ روم (١٥٥٣). لە ساڵی ١٥٥٧دا بۆ فەرەنسا گەڕایـەوە، و لـە تەمـەنی سـی و چوار ساڵیدا بە هۆی سەکتەوە کۆچی دوایی کرد.

دوبلیَ جگە لە نووسینی بەیاننامە بەناوبانگەکەی پلئیادەکان کە بە ناوی (بەرەڤانی و ڕێـز لە زمانی فەرەنسی) بوو، یەکەمین کۆمەڵە سۆناتەی هاوشێوەو هاوبابەتی بە زمانی فەرەنـسی لە ژێر سەرناوی (زەیتوون- ١٥٥٠)دا گوت کە لاسایی کردنەوەیـەکی پـترارك و ئاریوسـتۆیە، زیاتر باسی مەعریفەتناسی ئەفلاتوونی دەکات. کۆمەڵـەی (یادگـارە کۆنـەکانی رۆم- ١٥٥٨) شکۆی رابردووی "شاری جاویدانی" (رۆم) زیندوو دەکاتەوە، و (ئەفسوسان) داخ بـۆ گەنـدەڵی رۆم-ی سەردەمی شاعیر دەخوات و بە توندی رەخنەی لێدەگرێت.

## مونتنی

میشیل ئیکم دوو مونتنی (١٥٣٣- ١٥٩٢):

لە پریگور"١٨" ، لە خێزانێکی یازدە فەرزەنـدی هاتۆتـە دنیـاوە، بـابی بازرگـانی ماسـی و شەراب بوو، پیاوێکی رەسەن و سەلار و سـەنگین بـوو، بـە یـەکێك لـە لایـەنگرانی دڵـسۆزی ئینسانگەرایی دەژمێردرا، دایکی ئەسپانیاییەکی جولەکە نەژاد بوو، میشیل بەشەش ساڵی بۆ کۆلیژی گی ین، لە بوردۆ نێردرا، تا ساڵی ١٥٤٦ لەوێ خەریکی خوێندن بوو. دوای بوردۆ بـۆ ماوەی چەند ساڵێك (١٥٤٧- ١٥٥٤) لە تولوز مافی خوێند.

بابی لە ساڵی ١٥٦٨دا کۆچی دوایی کرد و مـاڵ و سـامانەکانی بـۆ میـشیل مایـەوە، ماوەی هەڤدە ساڵ لە پۆستی سوپایی، دەرباری، و گەشـتوگوزاریدا ژیـانێکی پـڕ جموجـۆلی هەبوو و ماوەی چوار ساڵیش (١٥٨١- ١٥٨٥) سەرۆکی شارەوانی بۆردۆ بوو. مـونتنی لـە ئەنجامدا لە ساڵی ١٥٨٥دا لە شاتودو مـونتنی"١٩" گیرسـایەوە و بـاقی عـەمری خـۆی بـۆ

خوێندنەوە، نووسین، پاکنووسکردنەوە و بڵاوکردنـەوەی بەرهەمـەکانی خـۆی تـەرخان کـرد. ئەنجام بە نەخۆشی ملەخڕێ مرد.

بەرهەمەکانی:

((ڕۆژانە هەواڵی سەفەر- ١٥٧٤)):

مونتنی لەم سـەفەرنامەیەدا بـیرەوەری گەشـت و گـەڕانی خـۆی لـە سویـسرا، ئـەڵمان، و ئیتاڵیـادا دەگێڕێتـەوە، شـۆرەت و ناوبـانگی سـەرەکی ئـەم بەرهەمـە لـە تـول و تەفـسیلی گێڕانەوەکەیدایە- کە ڕێك پێچەوانەی نامەکانیەتی.

((نامەکان))

مێژووی بڵاوبوونەوەیان:

کتێبی یەکەم و دووەم لە ساڵی ١٥٨٠دا بڵاوبووەوە. لـە سـاڵی ١٥٨٢، ١٥٨٧، و ١٥٨٨ چاپی تازەکراونەتەوە. و دوا بژاری (کە ١٠٧ نامەیە) لە ساڵی ١٥٩٥دا- واتە سێ ساڵ پـاش مردنی نووسەرەکەی- لەلایەن ماری دوگورنەوە بە چاپ گەیی.

جەوهەر و نێوەڕۆك:

ئەم نامانە بۆچوونە جۆراوجۆرەکانی مونتنی نیشان دەدەن، وا دیارە ئەم نامانە لەو پەراوێز و یاداشتانەوە ئامادە کراون کە مونتنی لـە کـاتی خوێندنـەوەدا (پیـاوێکی زۆر موتـاڵابووە و کتێبخانەکەی نزیکەی هەزار کتێبی تیا بووە) بەپەلە لەسەر وردە کاژان و پەراوێزی کتێبەکاندا نووسیونی و تۆماری کردوون، ئامانجی نامەکان پشکنینی دنیای دەروون و ناوەوەیـە. مـونتنی دەڵێت: "من خۆم بابەتی کتێبەکەی خۆمـم... من سیمای خۆم وێنە دەگرم". لـێ مـونتنی بـە شێوەیەکی گشتی بەشەرییەتیش شی دەکاتەوە، ئەو بەشەرییەتەی کە ئەو خۆی بە نموونەیـەکی بچووکی دەزانێ.

مونتنی، بە پێچەوانەی رابلە و کالڤنەوە، باوەڕی بە ئایدولۆژیایـەکی تایبـەتی نـەبوو، بەڵام لە نامـەکاندا زۆر ڕاوبۆچوونان دەخاتەڕوو، هەر چەندە لە تێورییە زەینییەکانی ئـەودا چ گونجان و هاوئاهەنگییەك لە ئارادا نییە، بەڵام ژمارەیەك لە مێژوونووسان و ڕەخنـەگران بە خوێندنەوە و موتاڵای نامەکانی پەیان بەوە بردووە کە وردە وردە لە ڕەواقیگەرییەوە بـۆ شەکاکییەت و سەرگەرمی فـەنبازی لـە هونـەردا چـووە، ئـەو ڕەخنەگرانـەی کـە لایـەنی مونتنی-یان گرتووە لە واری هونـەردا بـە کەسـێکی کـەم و سـەرڤە سـەرڤە هەوەسـکاری نازانن، بەڵکو بە شیکەرەوەیەکی ئەمین و دەستپاك و محافەزەکاری لە قەڵـەم دەدەن و پێـی

باشە دوا حوکم و داوەری بۆ رۆژگارو روونبوونەوەی هەموو رووداوەکان بەجێ بێڵێ، "من چوزانم" دروشمی ئەوە. شەکاکییەت و گوماندراری وی هیچ کاتێک -توند و تاڵ نییە- بەڵکو زۆربەی کات هەر ئاقڵانە و هێمن و ماقوڵە.

هەڵسەنگاندن:

ئەو خەوش و ئیرادانەی لە نامەکانی مونتنی دەگیرێن سەرگەرمی و فەنبازییە لە هونەردا، (کە پێشتر باسکرا) گوێ نەدان بە یاساکانی رێزمان، بێ نەزمی تەواو، پەشێوی پلۆت و ناتەبایی تۆنە، بەڵام ئەم نامانە لەرووی گیانی شیکارییەوە و بەتایبەتی لەرووی نیشاندانی ژیانی نووسەرەوە مایەی ستایش و ئافەرینە —مایەی خوێندنەوەی هەمووان- بووە..

مونتنی کاریگەرییەکی یەجگار گەورەی هەبووە. گوماندراری و شەکاکییەتی ئەو کاریگەرییەکی زۆری بەسەر روبرت برتون "٢٠"، تۆماس براون، رۆسۆ، و نیتشەوە هەبووە، شەکسپیر لە کاریگەری وشە و دەستەواژەکانی وی (هەڵبەتە لە رێگەی تەرجەمەکەی فلوریۆوە، ساڵی ١٦٠٣) بە دوور نەبووە، و هارۆلدمب رێبازەکانی ئەوی گرتۆتەبەر، و بیکن و گەلێك لە نووسەرانی دواتر لاسایی شێوەی کاری ئەویان —واتە هەمان شێوەی نامەنووسی کە لە داهێنانی خودی ئەوە- کردووەتەوە.

## شانۆنامە

فۆرم و قاڵبی شانۆیی سەدەکانی ناڤین تاوەکو هەوەڵین ساڵەکانی سەدەی شازدەیەمیش هەر لە برەو باودا بوو. هەڵبەتە گرووپی پلئیادەکان و هومانیستەکان زۆر بە پەرۆش بوون کە کۆمیدیا و تراجیدیای کلاسیك بخەنە جێی ئەم فۆرم و قاڵبانە، بەڵام کاتولیك و پرۆتستانەکان دژی توخمە کفرئامێزەکانی شانۆنامە رەمزو رازدارەکان بوون. لە ساڵی ١٥٤٨دا بە گوێرەی فەرمانێکی پەسندکراوی ئەنجوومەنی فەرەنسا رێگەی دەرهێنان و ئەنجامدانی شانۆنامانی رەمز و رازداری مەزهەبی لە شارەکاندا درا. دوای ماوەیەکی کەم نواندنی شانۆنامانی کلاسیك دەستی پێکرد، وێرای ئەمەش، ئەنجامدانی هەندێ شانۆنامەی مەزهەبی، ئەخلاقی و، فارس تا ساڵی ١٥٩٩ هەر بەردەوام بوو.

## تراجیدیا

ئیتاڵیایی و فەڕەنساییەکان لە ساڵانی ١٥٣٧- ١٥٥٠دا هەندێ لە تراجیدیاکانی ئورپیدس و سوفوگلس-یان وەرگێڕایە سەر زمانی فەڕەنسی. بەڵام ئەوەی بوو بە نموونە و سەرمەشق شێوەی پەرداختی تراجیدیاکانی سنکا بوو.

ئیتێن جودل (١٥٣٢- ١٥٧٣):

جودل یەکەمین تراجیدیای تەواوی لە زمانی فەڕەنسیدا گوت. ئەم تراجیدیایە (کلیوپاترا- ١٥٥٢)ی ناوە، کە لەڕووی ناوەڕۆکەوە تەقریبەن دەشوبهێتە سەر پەردەی پێنجەمی شانۆنامەی (ئانتونی و کلیوپاترا)ی شەکسپیر. شانۆنامەکەی جودل تەقریبەن بەدەر لە هەر کار و جوڵەیەکە، بەڵام سوود لە شێوە کلاسیکەکانی دابەشکردنی پێنج پەردەیی، ڕەچاو کردنی یەکێتییەکان، بەکارهێنانی یەك گرووپی کۆراڵ و، سنوورداری ژمارەی کاراکتەران، وەردەگرێت، دووەمین تراجیدیای جودل، (خۆکوژی دیدۆ — ١٥٥٨)ی ناوە و هەمان تایبەتمەندییەکانی تراجیدیای یەکەمی هەیە.

روبرت گارنیە (١٥٣٤- ١٥٩٠):

گارنیە، هەشت تراجیدیای نووسیوە کە بۆ زۆربەیان ئیلهامی لە نێوەڕۆکانی کلاسیکەوە وەرگرتووە (وەکو هیپولیتوس ١٥٧٣، مارك ئانتوان- ١٥٧٨، و ئانتیگونە- ١٥٨٥).

لە تراجیدیاکانی گارنیەدا دیالۆك شوێنی گفتوگۆی دوور و درێژ (وەکو ئەوانەی کە لە شانۆنامەکانی سنکا و جودلدا دەبینرێن) دەگرێتەوە و کردار و ژمارەی ئەکتەران زیاد دەکەن، جۆرە گمنگەشەیەکی واقیعی ناوێتەی پلۆتی شانۆنامە دەبێ، و ناوە ناوەش هەندێ هەوڵان بۆ خستنەڕووی هەندێ پرسێن دەروونی دەدرێ.

ئانتوان دومون کرتین (١٥٧٥- ١٦٢١):

مون کرتین شەش شانۆنامەی نووسیوە کە شێوازێکی یەکنەواتر و دەربڕینێکی پوختەتریان لە تراجیدیاکانی گارنیە هەیە، بەڵام لەڕووی دراماتیکییەوە لاوازترن، (ژنی سکۆتلاندییان ماری ستوارت- ١٦٠١) باشترین شانۆنامەی کرتینە.

کۆمیدیا

وەکو چۆن سنکا بە نموونەو سەرمەشقی تراجیدیای کۆن دەژمێردرێ، پلاوتوس و ترنس،ی شانۆنامەنووسانی کلاسیك-یش بە دامەزرێنەرانی شێوازی کۆمیدیای فەڕەنساوی دەژمێردرێن، و لە ساڵی ١٥٧٠ش بە دواوە کاریگەریی قوڵی ئیتاڵیاییەکان دیار و لەبەرچاوە.

کۆمیدیانووسانی رێنیسانس لە مەیدانی پێشڤەبرنی شانۆنامەی فەرەنسیدا چوار هەنگاوی گەورە چوونە پێشێ، فێری ئەوە بوون کە:

١- شانۆنامانی کۆمیدی بەسەر چەند پەردە و دیمەندا دابەش بکەن.

٢- پەیوەندی نووسەر لەگەڵ تەماشاڤانانی شانۆنامەدا لە رێی پێشگوتارەوە فەراهەم بکەن.

٣- پەردە لەرووی دەسیسەیەکی خەندەدار لابەرن یان گرێیەك لە چیرۆکی شانۆنامەکەدا دروست بکەن و پاشان بیکەنەوە.

٤- پەخشان لە جیاتی شیعری هەشت سیلابی باوو ئاسایی لە فارسدا بەکار بێنن.

گرنگترین کۆمیدیانووسان بریتی بوون لە: ئیتین جودل، پییرلاریوڤی (١٥٤٠- ١٦١١)، و ئودە دوتورنب (؟- ١٥٨٥). جودل خاوەنی یەکەم کۆمیدیا و یەکەم تراجیدیایە بە زمانی فەرەنسی. کۆمیدیای (ئوجین- ١٥٥٢)ەکەی دەقێکە تەقریبەن بە شێوەی فارس، کە چۆن پیاوێکی هەڵە و هەرزە مێردی گەوجی ژنێکی گەنجی دۆخین هەندێ شل فریو دەدات، لاریوڤی دوانزە شانۆنامەی پەخشانی نووسیوە، کە لەرووی دیالۆگە زیندووەکانییەوە مایەی سەرنجن، (تاپۆ- ١٥٧٩) یەکێکە لە شانۆنامە سەرکەوتووەکانی لاریوڤی کە بە (باشترین کۆمیدیای سەدەی شازدەیەم بە زمانی فەرەنسی) دەژمێردرێ.

شانۆنامەی (مرۆڤانی بەختەوەر- ١٥٨٤)ی تورنب بووە مایەی گەرمترین ستایشی رەخنەوانان و ناوی "باشترین کۆمیدیای رێنیسانسی فەرەنسی" یان لێنا.

# ژێدەر و پەراێزان:

١- ئاندریە دل سارتۆ (١٤٨٦- ١٥٣١): نیگارکێشێکی فلورانسی بوو.

٢- مارگریت دوناڤار (١٤٩٢- ١٥٤٩): مەلیکەی ناڤار و نووسەر بوو.

٣- فیچینۆ (١٤٣٣- ١٤٩٩): فەیلەسووفێکی ئیتالیایی بوو.

٤- کالڤین (١٥٠٩- ١٥٦٣): ریفۆرمیستێکی پرۆتستانی خەلکی فەرەنسا بوو.

٥- قەشەبارتلمی: یەکێك بوو لە دوازدە یاوەرەکەی عیسا، کە لە ٨/٢٤دا یاد دەکرێتەوە.

٦- تیمی فرانسیسیان: دامەزرێنەری ئەم فیرقەیە قەشە فرانسیس یا فرانسیس ئاسیزی (١١٨٢- ١٢٢٦) ئیتالیاییە.

٧- فیرقەی بندیکتیان: دامەزرێنەری ئەم فیرقەیە قەشە بندیکت یا بندیکتوس (لە سالی ٥٤٧ی ز دا مردووە) ئیتالیاییە.

٨- جان دوبلە (دوبلیَ): (١٤٦٢- ١٥٦٠) هومانیست و سیاسەتوانی فەرەنساوی و کاردینالی کلێسای کاتولیکی رۆم بوو.

٩- متز: شارێك بوو لە باکووری رۆژهەلاتی فەرەنسا.

١٠- مودون: شارێکی مەرکەزی فەرەنسا بوو، نزیکی کلێسای نۆتردام.

١١- جۆن کنوکس (١٥٠٥- ١٥٧٢) ریفۆرمیستێکی ئایینی سکۆتلاندی بوو.

١٢- پلئیادەکان- Pleiad: ناوی خۆیان لەو گرووپەوە وەرگرتبوو کە لە حەوت شاعیری ئەسکەندەرانی سەدەی سێیەمی پێش زایین پێك هاتبوون، تیوکراتیس یەکێك بوو لەوان، و ئەوانیش ناوی خۆیان لە حەوت ئەستێرە گەرۆکەکەوە وەرگرتبوو.

١٣- پونتودوتیار (١٥٢١- ١٦٠٥).

١٤- رمی بلۆ (١٥٣٢- ١٥٧٣ز).

١٥- ئانتوان دو بائیف (١٥٣٢- ١٥٨٩).

١٦- جان دورا (١٥٠٨- ١٥٨٨).

١٧- شێوەی پترارك: تایبەتمەندییەكانی پترارك گەرایی بریتییە لە: دركە و لێكچوونی ناچاری، مەجاز، سوود وەرگرتنی زۆر لە هێما و دركەێن ئەفسانەیی، دڵەڕاوكێ و پەرۆشی، حەسرەت و كەسەر بۆ ئاشقانی خێر لە خۆ نەدیو، و گلەیی و گازاندە لە جەفای ژنی بەناز، وەسفی پرسۆز و وەستایانەی جوانی.

١٨- پریگۆر: یەكێكە لە تەقسیماتی گی ین-ی باكوور لە باشووری رۆژئاوای فەرەنسا.

١٩- شاتو دومونتنی: كەوتۆتە دوردونی-یەوە.

٢٠- روبرت برتون (١٥٧٧- ١٦٤٠) نووسەر و روحانییەكی ئینگلیزی بوو.

# ئەدەبیاتی فەرەنسا
# لە
# سەدەی حەڤدەیەمدا

سەرەتایەکی مێژوویی:

سەدەی هەڤدەیەم سەردەمی فەڕ و شکۆی فەرەنسا بوو، لە باری رامیاری و لەشکرییەوە بە گرنگترین هێزی ئەورووپا دەژمێردرا، لەڕووی چالاکی و چەلەنگی هزری و هونەرییەوە بە مەڵبەندی رۆشنبیری و فەرهەنگی جیهان دادەنرا.

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا هنری "١" چوارەم قۆناغێکی پڕ لە ئەمن و ئاسایش و تەرەقیی لە وڵاتدا هێنایە ئاراوە. بە پێی فەرمانی نانت "٢" - ١٥٩٨ کۆتایی بە شەڕی مەزهەبی ناوخۆ هێنا، پەیمانانی ڤیرڤن (١٥٨٨) لەگەڵ ئەسپانیادا، پاریس و (١٦٠٠) لیون- (١٦٠١) لەگەڵ ساڤۆیدا کۆتاییان بە موناقەشە نێودەوڵەتییەکانی سەدەی شازدەیەم هێنا. دە ساڵی کۆتایی دەسەڵاتی هنری چوارەم و بیست و پێنج ساڵی یەکەمی حکوومەتی لویسی "٣" سیازدەیەم قۆناغی ئاشتی و ئارامی بوو. هەم هنری چوارەم و هەم دۆك دو ریشیلۆ-ی "٤" سەرۆك وەزیرانی لویسی سیازدەیەم، هێز و دەسەڵاتی ئەرستوکراتیان کەم کردەوە: ریشیلۆ بە کردەوە دەسەڵاتی رامیاری پروتستانەکانی کەم کردەوە. لە ساڵی ١٦٣٦دا فەرەنسا بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە داخلی جەنگی سی "٥" ساڵە بوو، و بەمەش ئیحتویار و ئابڕوی دەرەکی وڵات زیادی کرد. دەسەڵات و هێز و شکۆی حکوومەتی پاشایەتی لە سەردەمی لویسی چواردەیەم "٦" دا و لە دەوروبەری ساڵی ١٦٨٥دا گەییە لوتکە، لە ماوەی سی ساڵی دوایی حوکمڕانی ئەودا

ئەستێرەی بەختی فەڕەنسا رووی کردە کزی و ئاوابوون. هەڵوەشانەوەی فەرمانی نانت لە ساڵی ١٦٨٥دا کردیە کارێك هەزاران پروتستان روو بکەنە هەندەران و لە ئەنجامدا مەملەکەت لەڕووی سەروەت و سامان، رۆشنبیری و فەرهەنگ، و بەهرەی هونەرییەوە زەرەر و زیانێکی زۆری بینی. شێوەی حوکمڕانی موتڵەقی لویس (کەوتە بەناوبانگەکەی "مەملەکەت یەعنی من" نیشانەی دیکتاتۆرییەتی ئەوە)، زێدە مەسرەفی لەڕادەبەدەری، بەرزەفڕییە سیاسییە ترسناکەکانی (کە لە دوا ساڵانی ئاخر و ئۆخری تەمەنیدا بە تەواوەتی رووبەڕووی شکست بووبووەوە)، بە جۆرێ فەڕەنسییەکان و جەماوەری میللەتانی دیکەی تەنگەتاو کردبوو، هەرکە قۆناغی دەسەڵاتە دوور و درێژەکەی تەواو بوو، هەناسەیەکی ئۆخەیان هەڵکێشا.

نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەیەم قۆناغی گۆڕانکاری ئەدەبیاتی باروك"[٧]" بوو بۆ ئەدەبیاتی کلاسیسزم، ئەم رەوتە لە هەستی توند و، تاکگەرایی و گومانداری و شەکاکییەتی سەدەی شانزەیەم بەدوور بوو، و رووی لە ئاوەزگەرایی، یەکسانی، باوەڕی بتەوی مەزهەبی، زەبت و رەبت، تەربیەت و نەزاکەت بوو.

یەکێك لە فاکتەرە کاریگەرەکانی پەروەردەی کۆمەڵگە پەیدا بوونی تەلارانی ئەدەبی بوو. کاترین دوڤیون"[٨]" (کە بە مارکیز دو رامبویە) ناسرا بوو، کەچاوی بە پەشێوی و پاشاگەردانی کۆمەڵایەتی دەرباری هنری چوارەم کەوت، دەرگای ماڵەکەی خۆی لەبەردەم هونەرمەندان و ئەدیبانی بەرجەستە و هەروەها ئەرستۆکراتەکاندا خستە سەر گازی پشت، کە بە جۆرێ هونەر و ئەدەبیات چەکەرەی کرد و گەشایەوە و بوژایەوە. ئیدی هەموو خانمانی ئەرستۆکراتی بە چاولێکەری مەدام دوو رامبویە دەرگای تەلارەکانی خۆیان بۆ پێشوازی کۆڕ و کۆبوونەوە زانستی و رۆشنبیرییەکان کردەوە. (ئەم تەلارانە دەورێکی زۆریان لە خەملاندنی زمان و پاك کردنەوەی ئەدەبیاتی فەڕەنسیدا بینی و نووسەرانی گەورەیان لە باوەشی خۆدا پەروەردەکرد و پێگەیاند). بەڵام لە ئەنجامدا چالاکی و چەلەنگی ئەم تەلارانە بە توندڕەوی لە مەیدانی رازانەوە و سنعەتی ئەدەبیدا شکایەوە.

رژێمی دیکتاتۆری دەرباری لویسی سیازدەیەم و لویسی چوارەم لەواری هزریدا پشتیوانی لە یەکسانی دەکرد. هەردوو پاشا و، ریشیلۆ-ش، پشتیوان و پارێزەری ئەدەبیات بوون، و بە دوو کۆڵەکەی بەهێزی واری پەرەپێدانی ئەدەبیاتی دەژمێردران. ئەکادیمیای پاشایەتی (کە بە فەرمانی لویسی سیانزەیەم لە ساڵی ١٦٣٥دا دامەزرا) کاریگەرییەکی یەکسانسازی هەبوو سەنگ و ئیحتویاری زۆری بە ئەدیبان بەخشی، فەلسەفەی رینیەدیکارت"[٩]" ، کارێکی قووڵ و زیندووی کردە سەر هزر و بیری فەڕەنساوییان لە سەدەی هەڤدە و هەژدەیەمدا، ئەم هزرڤانە

گوماندار و شەکاکە بناغەی ئایدیولۆژیای خۆی لەسەر یەك شت رۆنا کە بەبێ هیچ شك و گومانێك دەیتوانی قەبوولّی بکات ئەویش بوونی خۆی بوو (من بیر دەکەمەوە، کەواتە هەم).

دیکارت هەموو قانوونێکی رەتدەکردەوە، تەنیا ئەوانە نەبێ کە لە رێگەی دیتن و ئەزموونەوە بەدەست دەهێنران، ئەم زاناریییانەش دەبووایە بە پێوەری ئەقلّ لە مەحەکی ئەزموون بدرێن، چونکە گرتنەبەری ئەم رێچکەیە لە جوانیناسی و ئەدەبیاتدا، بەرەو چوونیەکی هەقیقەت و جوانیناسی دەچێت رێچکەیەك لە هەستۆکی، خەیاڵپەروەری، رۆمانتیزم و، مکاشەفە بەرەو کلاسیسزم.

سیستەمێکی ئایدیۆلۆژی دیکەی تەواو جیاوازیش، کاریگەری بەسەر هزر و بیری سەدەی هەڤدەیەمەوە هەبوو، ئەم سیستەمە یانسنیزم بوو. کورنلیوس "١٠" یانسن لە مەسەلەی گوناحی یەکەم و قەدەر و چارەنووسدا هاوبیر و بۆچوونی کالڤن بوو، بەلاّم نکۆلّی لە باوەڕی کالڤن بە رزگاری لە رێگەی ئیمانەوە، دەکرد. واتە کالڤن پێی وابوو مرۆڤ لە رێگەی ئیمانەوە رزگار دەبێ و دەچێتە بەهەشت، بەلاّم یانسن باوەڕی بەوە نەبوو، و جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە تاك دەتوانێ لە رێگەی کلێسای کاتولیکەوە پەیوەندی لەگەلّ خودا بکات. راسین و پاسکال کاریگەرییەکی قولّی یانسنیزمیان بەسەرەوە بووە.

<u>ئۆڕینێکی گشتی:</u>

هەمان ئەو رەوت و رێبازانەی کە لە داب و نەریت و دەستکەوت و بیردۆزەکانی کۆمەلّگە و لە مەیدانی فەلسەفەدا دەبینرێن، لە ئەدەبیاتی سەدەی هەڤدەیەمیشدا دیارە، فرانسوادو "١١" مالرب (١٥٥٥- ١٦٢٨) بە توندی هێرشی کردە سەر نەریتپەروەری، زۆر لە خۆ کردن و فیشالّبازی شاعیرانی فەرەنسەوی پاش قۆناغی باروك- بە تایبەتی گیوم دوبارتاو دپورت- تەنکیدی وی لەسەر دیاری نەکردن، میانڕەوی، رونی، و پاکی و سەراحەت بوو، غەزەلخوانی بە کردەوە لابرد و فەساحەت و زمان پاراوی لە جێ دانا.

رەخنە توندەکانی مالرب، ئاوەزگەرایی دیکارت، زۆرداری و جەوری دەرباری، ناسکی و رازاوەیی تەلارەکان، چەسپاندنی دەسەلاّتی فەرهەنگستان (ئەکادیمیا) -هەر هەموو یەکیان گرت تا رێگەی کلاسیسزمی فەرەنسی (یا نەو کلاسیسیزم) خۆشبکەن، کە لە نیوەی دووەمی سەدەدا سەرکەوتنی تەواوی بە دەست هێنابوو. نیکولا بوالو- دپریو "١٢" (١٦٣٦- ١٧١١)، دوای مالرب هەمان رێگەی ئەوی لە خزمەت و رازانەوەی زماندا بە شێوازی مەیلەو

دیکتاتۆرییانەی ئەدەبی درێژەپێدا - و لەمەش گرنگتر ئەوە بوو کە پرەنسیپەکانی باوەڕ ئەدەبی کلاسیسیزمی فەرەنسی خستەڕوو: "حەقیقەت جوانە، شاعیر دەبێ تەبیعەت- کە حەقیقەتە- بکات بە نموونە و سەرمەشق، دەبێ ئەقڵ بەسەر بەرهەمی شاعیردا زاڵ و فەرمانڕەوا بێ، دەربڕینی شاعیرانە لەگەڵ ئاوەزی ساغڵەمدا بگونجێت. لاسایی کردنەوەی پێشینیان فرەتربێ... داهێنان و تازەیی، داهێنانی هزر نییە، بەڵکو دەربڕین و بەرجەستە کردنی تەواوی هزرێکە"، دەکرێ خولاسەی باوەڕەکانی بوالو بەمجۆرە نیشان بدرێن: "تەبیعەت بە چاوی ئەقڵ دەرك دەکرێت، و بە فۆرم و قاڵبانی کۆن دێتە دەربڕین و بەرجەستە دەبێ" کتێبی (هونەری شیعر)ەکەی ئەو لە ئینگلتەرا و فەرەنسادا کاریگەرییەکی فرەی هەبوو، و بایەخی بەرزی ئەو لە واری رابەرایەتی کردنی کلاسیسزمی نوێدا پێویستی بە موبالەغە بێژی نییە.

لە دوا ساڵەکانی کۆتایی ئەم سەدەیەدا گیانی کلاسیسزم و دەسەڵاتی ئەدەبیات و هونەری یۆنان و رۆمی کۆن رووی کرده کزی و نەمان، کێشەی نێوان کۆنەپەروەران و تازەخوازان (١٦٨٧- ١٧١٥) لەسەر (فەزڵدانی نووسەرانی کۆن بە سەر تازەدا) ئەوەی سەلماند کە ئەقڵ و سونەت (داب و نەریت و کەلەپور) پێکەوە هەڵناکەن (بەو جۆرەی کە پەیڕەوکارانی کلاسیسزمی فەرەنسی پێیان وابوو) ئەم کێشمانەکێش و ململانێیانە مەسەلەی هزر و بیری پێشکەوتنی هێنایە ئاراوە، هزر و بیرێك کە پێی وایە مەدەنییەت و شارستانییەت پێشکەوتووە، لە حاڵی پێشڤەچوونە، و بە گوێرەی حەزی دڵ دەچێتە پێشێ، لە ئەنجامدا ئەم بیرکردنەوە و هزرینە بێ چەند و چوون پەسندکراو، ئەم پەسندکردنەش مەسەلەی تاکگەرایی عاتیفی و ئەقڵی سەدەی هەژدەیەمی بەدووودا هات.

لە سەدەی هەڤدەیەمدا شیعری لیریکی باش کەم گوترا، ژانر و فۆرمی ئەدەبی هەرە باو بریتی بوو لە تەنز، درام و چیرۆکی گیانلەبەران، هەڵبەتە لە قاڵب و فۆرمی دیکەشدا هەندێ بەرهەمی چاك بڵاوبوونەوە، رۆمانسی شوانکارەیی سەرباری "ئاسترە"ی ئونورەدو ئورفە، رۆمانسە داستانییەکانی کالپرند"١٣" (١٦١٤- ١٦٦٣)، جورج دوسکودری"١٤" (١٦٠١- ١٦٦٧)، و مادلین دوسکودری"١٥" (١٦٠٧- ١٧٠١)، (ئەندێشان- نووسینی بلزپاسکال)، (ئامۆژگاری و پەندان- نووسینی لارو شفوکو"١٦")، نامە زانستی و بەهادارەکانی (لەڕووی مێژووییەوە) مارکیز دوسوینیە"١٧"، رۆمانە تەنزئامێزەکەی ئانتوان فورتیر"١٨"، رۆمانە سایکۆلۆژییەکانی مەدام دولافایت"١٩"، وەعزە جوان و دلێرانەکانی جاك بوسویە"٢٠"،

بەرجەستەکردنی کەسایەتییە نموونەییەکانی جان دولا بروڤیر، و چیرۆك و بەرهەمە رەخنەییەکانی فرانسوا دولاموت فنلون"٢١" .

## تراجیدیا

تراجیدیای فەرەنسی لە کۆتایی سەدەی شازدەیەمدا شتێکی بێ روح و مردوو و تاقەتبەر بوو کە زیاتر گوتار (خطابة) بوو. لە ساڵی ١٥٩٩دا ئالکساندەر هاردی"٢٢" هاتە پاریس و دەستی بە کۆمەڵە ریفۆرمێکی گرنگ کرد: دەستەی کۆرس و کۆرال و دیالۆگی دوور و درێژی وەلاوە نا و بویەر و دیمەنی بەرجەستە و کاریگەری لە شوێنیان دانا. لە ساڵی ١٦٣٤ دا سێ یەکێتییەکە (شوێن و کات و کردار) لە تراجیدیای (سوفونیسب)ی نووسینی جان دومرەدا"٢٣" زۆر بە وردی رەچاو کرا. دوو ساڵ دواتر تراجیدیای (سەید)ی شاکاری کورنی گەنگەشەیەکی توندی لەسەر ئەوە نایەوە کە ئایا بەزاندنی یاسای سێ یەکێتییەکە و دابە ئەدەبییەکان شیاوە یا نەشیاوە. سەرەنجام ئەو رێسایانەی کە لەلایەن ئەنجوومەنی رۆشنبیری و تەلاری مەدام دورامبویەوە دانران، پەسند کران و زۆربەی شانۆنووسان، کە کورنی یەکێکیان بوو، رێساکانی ئەو کلاسیکەکانیان بەکار هێنا.

پیەر کورنی (١٦٠٦- ١٦٨٤):

ئەم نووسەرە لە روین"٢٤" چاوی بە دنیا هەڵێناوە، مافی خوێندووە و ماوەی پتر لە ٢٥ ساڵان وەکو باوەڕپێکراوی ئاشتی خزمەتی کرد، بەڵام هەمیشە هەر دڵی بە شانۆوە بووە.

تراجیدیایەکەی بە ناوی (سەید- ١٦٣٦)، ئەگەرچی هێرشی توندی کرایە سەر بووە، مایەی شۆرەت و ناوبانگیشی. کورنی بیست و چوار ساڵی دواتری بە نووسینی تراجیدیا، کۆمیدیا، و کۆمیدی تراجیدییەوە بەسەر برد، کە هەموو بەرهەمەکانی زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێکرا، کورنی لە ساڵی ١٦٤٧دا بوویە ئەندامی ئەنجوومەنی رۆشنبیری (کۆڕی زانیاری) لە ساڵی ١٦٦٠ بەدواوە چەند شانۆنامەیەکی رووبەڕووی ناکامی و فەشەل بوونەوە، و لە ساڵی ١٦٧٤دا شانۆنامەی (سورنا)ی شکستی تەواوی هێنا و ئەمەش کورنیی لە نووسینی شانۆنامە نائومێد و سارد کردەوە، ئەوە بوو دە ساڵی دواتر بە دەستکورتی و تەقریبەن فەرامۆش کراوی کۆچی دوایی کرد.

بۆچوونانی شانۆیی:

سەروبەندی کورنی (سەردەمی کار، توانا و دەسەڵات، و بڕیاری لەز و خێرا بوو، و ئەو کەسانەی کە هەوڵیان دەدا واقیعیەت بە خەیاڵ و هزر عەزمی جەزم ببەخشن بە دیاردەکەوتن و دەکەوتنە ریزی پێشەوە. شانۆنامەکانی کورنی نموونەی گەش و زیندووی ئەم بۆچوون و روانینە هومانیستیانەن)، کورنی تراجیدیای بە جۆرە شیکردنەوەیەکی دەروونی و نمایشێکی کێشمانەکێشی ویستی مرۆڤ لەگەڵ هەست و سۆزە توندەکانیا دەزانی، کۆرنی باوەڕی وابوو کەئەقڵ و ئاوەز مرۆڤ رێنوێنی هەڵبژرادنی کارەکانیەتی، و ویستی مرۆڤ –کە بە زۆری رووبەڕووی نارەزایی سۆزەکانی خۆی یان ویستی خەلکانی دی دەبێتەوە- هەوڵدەدات تا ئەو کارانە جێبەجێ بکات. ((ستایشی ویستی بنجبڕی ئەقلانییەت ئەنگێزە و ماکی هەموو تراجیدیاکانی کورنییە)). لەم تراجیدیانەدا ئەڤین دەورێکی زۆر کەمی هەیە، ئەڤین لە تراجیدیاکانی ئەودا لە ژێر رکێف و فەرمانی ئەقلّ دایە.

کورنی زۆربەی بابەتەکانی خۆی لە مێژوو و ئەفسانانی کۆنەوە هەڵدەهێنجێ و وەردەگرێت، کاتێ کە مامەڵە لەگەڵ بابەتێکی مێژووییدا دەکات، بە زەروری نازانێ پابەندی بویەرە مێژووییەکە بێ هەر گۆڕانێك کە خزمەتی ئامانجی شانۆنامەکەی بکات، بە بێ سێ و دوو ئەنجامی دەدات. ئەمە جگە لەوەی کە رایدەگەیەنێ نێوەڕۆکی تراجیدیایەکی جوان نابێ حەقیقەت نوێن بێ، بە وتەیەکی دی، ئەکتەری سەرەکی تراجیدیا دەبێ پتر لەلایەنی قارەمانییەوە وێنەبگیرێ تا لەلایەنی واقیعییەوە، کورنی، کەم دابێژێك وەکو مارلو، شەیدای شتی ناوازە و نابێاو و هەرە باڵا و نموونەییە و ئەوەندە گوێی بە مرۆڤی ئاسایی نادات.

شێواز و جۆری مامەڵە کردن:

دەربڕینی کۆرنی دلگیر و رەوان و شکۆدار و هەندێ جاران بە ئاو و تاوە، و دەگەڵ تیمە و ناوەڕۆکەکانیا تەواو دەسازێ و یەك دەگرێتەوە. شانۆنامەکانی، وەکو دراماکانی هاردی، لێوان لێون لە کار. لە پاش مشت ومڕەکەی لەمەڕ تراجیدیای (سەید)، کورنی پابەندی یەکێتییەکان بوو، بەڵام ئەم سنووردارییانە بلیمەتی ئەویان لە جۆش و خرۆش دەخست پلۆتی شانونامەکانی ئەنگێزەی بەرز و باڵای هەیە بێ قەراری کە هەوێنی پلۆتی دراماکانی ئەوە، بە شێوەیەکی ئاسایی و خۆڕسك لە کێشمانەکێشی ویست و ئیرادەی کاراکتەرەکانییەوە پەیدا دەبێ. ئەم کاراکتەرو کەسایەتییانە پتر بە هێڵی درشت وێنە دەگیرێن تا بە هێڵی ورد و باریك، و زیاتر ستایش و ئافەرینی خوێنەر دەوروژێنن تا سۆز و گودازی، چونکە هێزی بەرەڤانی و بەرگرییان بەهێزترە لە هاماج و کەش و هەوای چەوساوەییان.

شانۆنامەکانی:

کورنی هەژدە تراجیدیا، هەشت کۆمیدیا، و حەوت تراجیکۆمیدیای (کە هەندێ جار هەر بە تراجیدیا ناو دەبرێن) نووسیوە. باشترین کۆمیدیای ئەو (درۆزن- ١٦٤٣)ی ناوە. لە خوارەوەش ئاماژە بۆ باشترین تراجیدیاکانی دەکەین.

(سید- Cid- 1636):

ئەم بەرهەمە لەڕاستیدا تراجیکۆمیدییە، بەڵام لە ریزی تراجیدیاکاندا دەگیرسێتەوە. ئەم بەرهەمە یەکێکە لەو چەند شانۆنامانەی کورنی کە ئەڤینی رۆمانتیکی دەورێکی گرینگی تیا دەبینێ. چیرۆکی ئەم تراجیدیایە بویەری ئەڤینی شیمن و رودریگ-ی قارەمانی گەورەی داستانی ئەسپانیا، دەگێڕێتەوە. ئەم جووتە ئەڤیندارە، مینا رۆمیۆ جولێت، باجی رق و ناحەزی خانەوادەیی نێوان بابیان دەدەن. رودریگ کە سوکایەتی بە بابی کراوە، بابی ماشوقەکەی خۆی (شیمن) دەکوژێ، شیمن وێڕای ئەوەی رۆدریگ-ی بە دڵ و بەگیان خۆشگەرەکە، داوای هەقکردنەوە و سزادانی لە شا دەکات، شا پاڵەوانێك دەنێرێتە شەڕی وی، لێ رودریگ بەسەریا زاڵ دەبێ، شیمن کە شەیدای ئازایەتی رودریگ بووە، دەیبەخشێت ئەم کۆتاییە زەمینە خۆشکردنە بۆ زەماوەندی ئایندەی شیمن و رودریگ.

((هۆراس- ١٦٤٠)):

ئەم تراجیدیایە چیرۆکی هوراتی و کوریاتی (لە لیوییەوە وەرگیراوە) دوو خانەوادەی رومی دوژمن بەیەك دەگێڕێتەوە کە ئەڤین و ژن و ژنخوازی تێکەڵ بە یەکتری کردوون (هوراس سابینا-ی خوشکی کوریاس-ی خواستووە، و کوریاس کامیلا-ی خوشکی هوراس-ی نیشانە کردووە). هوراس لە شەڕێکدا لە پێناوی رومدا، کوریاس-ی دەزگیرانی خوشکەکەی دەکوژێت. خوشکەکەشی هەم ئەو و هەم روم بە نەعلەت دەکات، و هوراس دەیکوژێت . لەم تراجیدیایەدا، بە پێچەوانەی ((سەید))ەوە هەر سێ یەکێتییەکە رەچاو کراوە..

(( سینا-١٦٤٠)):

شانۆنامەیەکی دیکەیە بە نێوەڕۆکێکی رومی، لەم تراجیدیایەدا کێشمانەکێشی دەروونی ئاوگوستوس تزار، لەسەر سزادان یا بەخشینی سیناو هاوکارە پیلانگێرەکانی، بەرجەستە دەکرێت. سەرەنجام گەورەیی و لێبوردەیی تزار زاڵ دەبێ.

((پولیوکت-١٦٤١یا ١٦٤٢ )):

نێوەڕۆکی ئەم شانۆنامەیەش رۆمییە کە ستایشی مەزەب و ئایین دەکات. پولین هاوسەری مەسیحی شەهید پولیوکت-ە، شیڤری کۆنە دڵداری خوازبێنی دەکات. سەرەنجام خواناسی و

ئەفسکوژی پولین بەتەواوەتی بەسەریا زاڵ دەبێ و بەرەو خوای دەبات، و هەنگینێ پولین خەڵکانی دیکەش ڕێنوێنی دەکات بۆ مەسیحییەت و بە مەسیحی بوون.

هەڵسەنگاندن: (نرخاندن)

ڕەخنەگران گەلێك لە کەموکورییەکانی تراجیدیاکانی کورنی-یان وا دەست نیشانکردووە کە: دوورن لە هەر حەقیقەت نماییەك، دوورن لە نەزاکەت و زەوقی دروست، زۆر داخراون و پڕن لە بەیت و دێڕی کۆن و سواوی سەیر و سەمەرە. لەلایەکی دیکەوە ستایشکارانی کورنی پێیان وایە کە ئەم کەم و کوریانە لە ئاستی. ئامانجە بەرزەکانی، لە ئاستی ڕەسەنایەتی و شکۆداری ئەودا ناکەنە هیچ و قابیلی چاوپۆشین. بە هەر حاڵ کورنی هەم داهێنەری تراجیدیای کلاسیکی فەڕەنسییە و هەم گەورەترین شاعیری ڕۆمانتیکی فەڕەنسایە.

جانراسین (١٦٣٩-١٦٩٩):

لە لافر تەملیون چاوی بەدنیا هەڵێناوە. هەر بە منداڵی دایك و بابی مردن و داپیرەی بەخێوی کرد، لە ساڵی ١٦٤٩دا خوێندنی لە قوتابخانەی سەرەتایی (یانسنی) لە پوڤیە "[٢٥]" دەست پێکرد، لە پازدە ساڵیدا چووەتە قوتابخانەی "یانسنی" لە پۆرت رویال، کە تا ساڵی ١٦٥٨ لەوێندەر مایەوە، ئەوسا بۆ خوێندنی فەلسەفە بۆ پاریس چوو، لەم پایتە شاد و دڵگیرەدا زۆر زوو لافونتین و چەند ئەکتەرێکی ناسی و ناشنایەتی لەگەڵدا پەیدا کردن. لە ساڵی ١٦٦٠ یا ١٦٦١ دابوو پوری راسین، کە دەترسا راسین لە زەلکاوی فەساددا غەرق بێ، ناردی بۆ نوزیس "[٢٦]" تا لەوێندەر ئیلاهییات و خواناسی بخوێنێ، راسین دوای دوو ساڵان ئەم لقەی کە لەگەڵ زەوقیا نەدەگونجا تەرك کرد و بۆ پاریس گەڕایەوە، بە گەرمی لە کۆڕ و مەجلیسی لافونتین، مولیر، و لوالودا پێشوازی لێکرا، و لەواری شانۆدا کەوتە نووسین، یەکەمین شانۆنامەی "تباید" بوو کە لە ساڵی ١٦٦٤دا نمایش کرا، و پاشان "ئەسکەندەری گەورە"ی لە ساڵی ١٦٦٥دا نووسی، ئەم شانۆنامانە سەرکەوتوو بوون، بەڵام بە هۆی دەرهێنانەکەی ئاندروماك-ەوە لە ساڵی ١٦٦٧دا بوو کە راسین گەییە پایەی گەورەترین تراجیدیانووس، شانۆنامەکانی دیکەی کە لە ماوەیەکی کورتدا بڵاوبوونەوە بریتی بوون لە: "خودانی مەرافەعەکان- ١٦٦٨"، تاقە کۆمیدیای ئەوە کە هێرش دەکاتە سەر دادگاکانی عەدلیە و قازییان و یاسا و ڕێسای دادپرسی (لە زەرگەتەکانی ئاریستوفانس-ەوە وەرگیراوە)، بریتانیکوس ١٦٦٩، برنیس- ١٦٧٠، بایزید- ١٦٧٢، مهرداد- ١٦٧٣، ئیفی جنی- ١٦٧٤

و فدر- ١٦٧٧. راسین لە ساڵی ١٦٧٣دا بوو بە ئەندامی ئەکادیمیای (کۆڕی زانیاری) فەرەنسا. پاش نمایشکردنی فدر، راسین کە وادیارە قەناعەتی بەوە هێنابوو دراما مایەی هەرزەیی و فەسادە، بە تەواوەتی وازی لێ هێنا و بوو بە مێژوونووسی دەربار. چەند ساڵێك دواتر بە هاندان و پشتیوانی خاتو دومنتون[٢٧]-ی هاوسەری لویسی شازدەیەم، دوو شانۆنامەی مەزهەبی (ئیستر- ١٦٨٩)و (ئاتالی- ١٦٩١) نووسی، دوا ساڵانی تەمەنی راسین، بە هۆی ساردی پاشا لەگەڵیا، بەجۆرە خەمبارییەك بەسەرچوو.

شێواز و جۆری مامەڵە:

وێڕای ئەوەی کە راسین یەکەمین دوو تراجیدیای خۆی بە لاساییکردنەوە و چاولێکەری کورنی نووسی، بەڵام پاشان خۆی لە کاریگەری کورنی دەربازکرد و لە تراجیدیاکانی دواتریدا شێواز و ڕێچکەی تایبەتی خۆی دۆزییەوە و ڕێك پێچەوانەی شێوازی مامۆستاکەی جارانی بوو.

لە بەرانبەر ئاڵۆزی و گشتییەتی شانۆنامەکانی کورنیدا، تراجیدیاکانی راسین سادەو، تراجیدیاکانی کورنی یەکپارچە جوڵە و بزوتن-ی بەدەنین، و تراجیدیاکانی راسین مەنگ و تەقریبەن وەستاو و بێ جوڵەن، جەبر و گوشاری زەمانی کورنی ناچاری دەکات پابەند و وەفاداری سێ یەکێتییەکە بێ، و راسین ئەم پابەندییە بە زەروری نازانێ، شانۆنامەکانی کۆرنی پڕەنسیپی ئیحتمالی و حەقیقەت نوێنییان تێدا نییە و، تراجیدیاکانی راسین تەنانەت ئەگەر لەگەڵ حەقیقەتیشدا نەگونجێن، لە واقیعی ژیانەوە نزیکن، کۆرنی زۆری کەیف بە نیشاندانی ڕووبەڕووبوونەوەی ویستی مرۆڤ و جیهانی دەرەوە یان ڕووبەڕوو بوونەوەی ویستەکان دەگەڵ یەکتردا دێ، راسین لە سنووری کێشمانەکێشە سۆزدارییەکانی کانگەی دڵی مرۆڤان هێوەتر ناچێت. لە شانۆنامەکانی کۆرنیدا ڕۆڵی ئەڤین و ئاشقێنی زۆر کاڵ و کزە، کەچی لە زۆربەی تراجیدیاکانی راسیندا ئاسکە سۆز سۆنگەی سەرەکییە، دەستەواژە و ڕستەکانی کۆرنی هەمەجۆر و پڕجۆش و خرۆشە، دەستەواژەکانی راسین هێمن و ئاساییە. لە کۆتاییدا ئەکتەرانی سەرەکی شانۆنامەکانی کۆرنی کەسایەتی ریز پەڕن، بە عەزم، ئاقڵ و مەنگ و تاڕادەیەك سۆپەرمانن، قارەمانانی تراجیدیاکانی راسین، کەسانی ئاساین و شوێنکەوتووی لافاوی هەستی خۆیانن- وەکو هەر مرۆڤێکی ئاسایی.

پەیگیری کردنی یەك مەبەست، لە تایبەتمەندییە بەرجەستەکانی درامی کلاسیکی فەرەنسییە، بەتایبەتی درامای راسین، شێوازی راسین ئەمەیە کە تراجیدیا لە ناوەندی چیرۆکەکەوە دەست پێبکات، لە خاڵێکی نزیکی قەیرانی گەورەی سۆزداری. کار و کرداران

سادە و بە دوور لە هەر زیادەو درێژدادڕییەك و پەیوەست، بە کاراکتەرەکانەوە بێ، هەر هەموو دوو دڵی هەڵچوون، و خەمێکی دڵی قارەمانەکان نیشان دەدات، لە میانەی ئەم هەڵسەنگاندنە دەروونییەوەیە کە دەگاتە حەقیقەت نیشاندان، کە مەبەست و ئامانجی سەرەکی تراجیدیایە.

راسین چیرۆکەکانی لە ئەفسانان، کتێبی موقەدەس، و مێژووی کۆنی یونان و رۆم و رۆژهەڵاتەوە وەردەگرێ لە زۆربەی تراجیدیاکانیدا ژنان رۆڵی سەرەکیان هەیە، چونکە راسین لەواری شیکردنەوەی سۆزی ژناندا شارەزاو باڵادەستە.

شانۆنامەکانی:

((ئاندروماك- ١٦٦٧)):

لەم تراجیدیایەدا راسین وێنەیەکی ئەڤین و سۆزی دایکانە دەگرێت، پاش رووخانی شاری تەروادە، ئاندرۆماك-ی بێوەژنی هیکتۆر، لە پێناوی رزگاری ئاستیاناکس-ی کوڕیدا، وادەنوێنێ کە ئاشقی پیرۆس "٢٨"-ی یۆنانییە. لێ پیرۆس، ئەگەرچی گیرۆدەی ئەشقی ئاندروماك-ە، هرمیون، کە پیروسە ، مارە دەکات. لەلایەکی دیکەوە ئوریست بە دڵ و بەگیان ئاشقی هرمیون-ە. سەرەنجام، پیروس هەڕەشەی کوشتنی ئاستیاناکس، لە ئاندروماك دەکات و دەیەوێ بەمە ئاشقی دڵسوتاوی بکات کە شووی پێ بکات... ئاندروماك بە ناچاری قابیل دەبێ بەڵام ژێراوژێر بیر لە خوکوژی دەکاتەوە، هرمیون، ئوریست ناچار دەکات پیروس بکوژێت، و هەنگێ بە بیانووی پیاوکوژییەوە وازی لێ دێنێ و خۆی دەکوژێت، ئوریست-یش شێت دەبێت.

وێنەگرتنی سیمای دایکانەی ئاندروماك و هرمیون-ی پڕخرۆش حەسوود "دێڵە بەوری جوان"، هەوێنی و جوانی شانۆنامەکەن.

((برنیس- ١٦٧٠)):

ئەم شانۆنامەیە هێندە بێجوڵە و کەم رووداوە مەگەر تەنیا لەبەر هەندێ هۆی ناڕاستەوخۆ ناوی تراجیدیای لێ بنرێ، و لەڕاستیدا لاوانەوەیەکی دراماتیکییە. تیتۆس-ی ئیمپراتۆری رۆم کە ئاشقی برنیس-ی (مەلیکەی فەلەستین) بووە ناچار دەبێ دەستی لێ هەڵگرێ، چونکە یاسای رۆم رێگە نادا ئیمپراتۆر ژنێکی بێگانە بخوازێ، (لەم تراجیدیایەدا، سێ کەسایەتی سەرەکی: تیتۆس، برنیس و ئانتیوکوس، خەمناکترین وێنەی ئەڤینی ناکام لە جیهاندا دەنوێنن).

ئەم شانۆنامەیە باشترین بەڵگەی بەهرەی داهێنەرانەی راسینە، داهێنانی "هەموو شتێك لە هیچەوە" و لە دیاریکردنی رووداوێکی بەهێزی دراماتیکی لە قەیرانێکی عاتیفی کە

کەسانی دی عادەتەن لە بێناگایی پێیدا ڕەت دەبن. هەر هەموو پلۆتی شانۆنامەکە لە شەش وشە، کە لە سویتونیوس "٢٩"وە خوازراوە پێکدێ: ((تیتۆس، ناچار، وازهێنان لە مەلیکە برنیس، (هەروەها) ناچار" یان بەو جۆرەی کە ڤیکتۆر هۆگو ریزی دەکات: "پەردەی یەکەم، تیتۆس، پەردەی دووەم، مەلیکەبرنیس، پەردەی سێیەم، ناچاری، پەردەی چوارەم، ناچاری، پەردەی پێنجەم، وازهێنان".

((فیدر- ١٦٧٧)):

ئەم تراجیدیای حەسوودی و پەشیمانییە، دارشتنەوە و نووسینەوەی تەواوی هیپولوتوس-ەکەی یورپیدس-ە، لێ لە بری هیپۆلوتوس-ی پاك و ئارام، جەخت لەسەر کەسایەتی فیدر-ی دڵڕەش و ڕکونی و حەسوود دەکرێتەوە، کە وەکو یونانییەك دەمێنێتەوە، بەڵام لە ویژدانی جوسوجوکارانەی یانسنی بەرخوردار دەبێ، ئەم شانۆنامەیە یەکەجار شکستی هێنا، چونکە دۆشس دوبوڤیون، پرادون "٣٠" (١٦٣٢- ١٦٩٨)ی شانۆنامەنووس هاندەدات کە وەکو هەڤرکی راسین بێتە مەیدان، و "فیدر"ێکی دیکە دەنووسێت تا هاوکات لەگەڵ شانۆنامەکەی راسیندا نمایش بکرێ. لە کاتی نمایشی ئەم دوو شانۆنامەیەدا، دۆشس ریزەکانی پێشەوەی شانۆکەی راسین پڕ دەکات لەسەر سەریان و فیکەکێشان، و شانۆکەی پرادون پڕ دەکات لە چەپڵە لێدەران و هاندەرانی بەکرێگیراو، (فیدر)کەی راسین هەر چەندە لەسەرەتاوە ڕووبەڕووی شکست بووەوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بە شاکاری ئەوی لە قەڵەم دەدەن، ئەم تراجیدیایە، لەڕووی نواندن و دەربڕینی جۆش و خرۆشەوە رەنگە لە ئەدەبیاتدا بێ هاوتا بێ.

((ئاتالی- ١٦٩١)):

ئەم شانۆنامەیە چیرۆکی ئاتیلیا-ی کیژی ئاخاب، و ئیزابیل، بە ریوایەتی کتێبی موقەدەس (دووەم پاشایان، بابی ١١) دەگێڕێتەوە. ئاتیلیا پاش کوژرانی ئەحزیا-ی کوڕی، هەر هەموو نێرینەکانی ماڵباتی پاشایەتی (جگە لە یەهواش، کە هەڵدێ) دەکوژێت و بە خۆی لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێ. دوای شەش ساڵان ئاتیلیاش دەکوژرێ و یەهواش دێتە سەر حوکم.

راسین ئەم چیرۆکە لە قاڵبی شانۆنامەیەکدا دادەڕێژێ کە نیشانی دەدات چۆن خودا (کە گرنگترین کەسایەتی شانۆنامەکەیە) تووڕەیی خۆی بەسەر تاوانبارانـدا، بەتایبەتی بەسەر دوژمنانی کلێسا و نیشتیماندا هەڵدەڕێژێ.

قوەتی ئەم شانۆنامەیە تەنیا لە جۆش و خرۆش و شەوق و زەوقە ئەخلاقییەکەیدا نییە، بەڵکو لە کاراکتەرسازییە بەرزەکەی ئاتالی پەریشان، یەهویاداع-ی کاهینی توندڕەوی یەهوە، و مەتان-ی کاهینی فێڵبازی بەعل دایە.

هەر چەند لە نێوان هاو عەسرانی راسیندا تەنیا بوالو بوو کە ئاوڕی لە بایەخی راستەقینەی ئاتالی دایەوە، بەڵام رەخنەگرانی دواتریش پەیان بە گەورەیی ئەو کارە برد، بە جۆرێ کە ئەم شانۆنامەیەیان بە ((پوختەترین شیعری دراماتیکی راسین)) و بە ((گەورەترین شانۆنامەی ئەو و بە لوتکەی کلاسیسزمی فەرەنسییان)) لە قەڵەمدا.

کورتەیەکی رەخنەکان:

گەلێك لە رەخنەگرانی ئینگلیز بەوە قایبل نەبوونە کە راسین لە خانەی درامانووسێکی زۆر گەورە دابنرێ. بە نووسەرێکی تاقەتبەر، سارد و سڕ، و بیرتەسکیان زانیوە، رەخنەیان لێگرتووە کە کردار لە شانۆنامەکانیدا کەمە، و وشەکانیشیان بە نارەسەن زانیوە، سیتتس بر"٣١" کە یەکێکە لە رەخنەگرە سەختگیرەکانی راسین، سپڵەیی و پێ نەزانی ئەو دەرهەق بە دۆستان و خێر وێستانی خۆی مەحکوم دەکات و زۆر بە توندی رەخنە لە لاسایی کردنەوەکانی دەگرێت- "بەهرەیەکی سەیری لە مەیدانی تەقلید و لاسایی کردنەوەدا هەیە"، هەر ئەم رەخنەگرە لە شوێنێکی دیکەدا دەربارەی ئەو دەڵێت: "بابایەکی سنعەتکارە و هەرگیز لە خەمی گەیشتن بە کەماڵی شیعری نییە، و تەنیا ناوەرۆك و تیمەی سواو و قەراردادی هەڵدەبژێرێ".

زۆربەی رەخنەگران-و نەك هەر فەرەنسییەکان- پایەی ئەدەبی ئەویان لە پایەی هەموو ئەدیبانی فەرەنسی بە بەرزترزانیوە، هەموویان لەڕووی بەهرەی داهێنانەوە، وردی و لە بونیادی پلۆتی دراما، حەقیقەت نیشاندان، راستگۆیی و راشکاوی، هاوئاهەنگی، پاکی و شێوازی رازاوەوەدا ستایشی راسین دەکەن، زمانەکەشی مایەی ستایشی هەموو رەخنەگرانە، چونکە هەر وشە و دەستەواژەیەکی وی راستەوخۆ ئامانجی خۆی دەپێکێ و کاریگەری زمانەکەی لە بیر ناچێتەوە. لە هەموو ئەمانەش زیاتر ئەوەیە کە رەخنەگران بەهۆی شیکردنەوەی کانگە و قوڵاییەکانی روحەوە، ستایشی دەکەن. باشترین خەسڵەتی وی ئەمەیە کە ورشە و پرشە و جیلوەی خەیاڵ لە درێژترین هۆزاندا بە توانایەکی لەرادەبەدەری عاتیفەی دراماتیکییەوە لە یەك کاری هونەری یەکگرتووی یەکپارچەدا ئاوێتەی یەکتر دەکات و ئەمەش وای لێدەکات کە شان بەشانی سوفوکلیس، لە بەرزترین پایەی ئەبەدییەتدا، هەنگاو بنێ.

## کۆمیدیا:

لە نیوەی یەکەمی ((سەردەمی شکۆداریدا)) (سەدەی هەڤدەیەم) کۆمیدیای فەرەنسی هێشتا هەر لە سنووری چاولێکەری و لاسایی کردنەوە و لیبۆکی دا بوو کەلە دەستکاری رۆمانسێن ئەسپانیایی و کۆمیدیای "دل ئارتا"ی ئیتالیاییەوە ئامادە دەکرا، لە پاش جۆدل و لاریوڤی، کورنی و راسین چەند کۆمیدیایەکیان نووسی، بەڵام بلیمەتی وان لە بنچینەدا لە مەیدانی تراجیدیادا بوو. بۆیە فەرەنسا دەبوو چاوەنۆڕی مولیر بکات تا کۆمیدیای هاوتای بەرهەمەکانی شەکسپیر بنووسێت.

مولیر (ناوی راستەقینەی: جان باتیست پوکل سە- ١٦٢٢- ١٦٧٣):

لە پاریس هاتە دنیاوە، بابی پەردەدار و پێشخزمەتی لویسی چواردەیەم بوو. مولیر لە ساڵی ١٦٣٧دا چووە کۆلیژی یەسوعی کلرمون و لەوێندەر کەوتە خوێندنی زانست و دەستووری زمان و موتالەعە و خوێندنەوەی بەرهەمەکانی پلاوتوس و ترنس. شەش ساڵ دواتر چاوپۆشی لە قەبوولکردنی پۆست پایەکەی بابی لە کۆشکی پاشایەتیدا کرد و بوو بە ئەکتەر و رێبەری ئەکتەران و بە یارمەتی و هاوکاری چەند دۆستێکەوە، کە سیانیان ئەندامی ماڵباتی بژار "٣٢" بوون، گرووپێکی بەناوی (ئیلوسترتیاتر)ەوە دامەزراند. لە سەرەتادا رووبەڕووی گیروگرفت و قەرزارییەکی زۆر بووەوە تەنانەت لەبەر قەرزداری کەوتە زیندانیشەوە، کە بابی فریای کەوت و رزگاری کرد. مولیر لەگەڵ گرووپەکەیدا لە ساڵی ١٦٤٥ەوە تا ساڵی ١٦٥٨ بە فەرەنسادا کەوتە گەڕان و شار بەشار گەڕا و شانۆنامەکانی نمایش کرد. لە ساڵی ١٦٥٨دا بۆ پاریس گەڕایەوە و لویسی چواردەیەم و بوالو پشتیوانی و پارێزگارییان لێکرد. مولیر لەم ساڵەدا زەماوەندی لەگەڵ ئارماندا "٣٣" بژاردا کرد، و ماوەی پازدە ساڵان سەرکەوتووانە بەکاری دەرهێنان و شانۆنامە نووسین و ئەکتەرییەوە خەریك بوو. وێڕای ناو و ناوبانگ، مولیر وەکو هەجو بێژێك دوژمنانی زۆری هەبوو، و هەمیشە لەبەر هێرش و پەلاماری روحانیان، پزیشکان، دەرباریيان، خۆهەڵکێشان، و ئەو ژنە بەفیز و دەعێیانە بوو، کە لە شانۆنامەکانیا تەوسی پێدەکەن تەنیا شا هاندەر و پشتیوانی بوو. مولیر لە ساڵی ١٦٧٣ لە کاتی ئەنجامدانی دەوری سەرەکی لە شانۆنامەیەکی خۆیدا بە ناوی (نەخۆشی خەیاڵی) تووشی خوێنرێژی بوو و دوای چەند سەعاتێك کۆچی دوایی کرد.

ئامانج:

ئامانج و مەبەستی مولیر وەکو خۆی دەڵێت پیشاندانی هەموو عەیب و عارەکانی مرۆڤ بەگشتی، و عەیب و عاری خەڵکانی سەردەمی خۆی بە تایبەتییە.

سەرچاوە:

هەر چەندە مولیر ئیلهامی نووسینی شانۆنامەکانی لە کۆمەڵگەی سەردەمی خۆی وەردەگرێ، بەڵام هێشتاش هەر لەڕووی تیمە و ناوەڕۆکی کۆمیدیاکانیەوەو لە باری شێوازی کاریەوە قەرزارباری چەند سەرچاوەیەکی ئەدەبییە. پلاوتوس، تەرنس، چیرۆك و درامای ئەسپانیایی، کۆمیدیای ئیتاڵیایی، فابیل و فابیلۆی فەڕەنسی، و کومیدیای کۆنی فەڕەنسی بە گرنگترینی ئەم سەرچاوانە دەژمێردرێن..

تایبەتمەندییەکانی:

درامای مولیر لە بنچینەدا کومیدیای ڕەفتارانە. هەندێ جار پشت بە دەسیسە و پیلانگێڕی دەبەستێ و هەندێ جار بە ڕووداوی پێکەنیناوی و ناخۆش، بەڵام زۆربەی کات داهێنەری کۆمیدیای کەسایەتییە تا داهێنەری کۆمیدیای بۆیەر و ڕووداو. دەکەوێتە کاراکتەرسازی تا لەو ڕێگەیەوە ڕەخنە لە سستی و لاوازییە باوەکانی مرۆڤ بگرێ، و زیاتریش لە خەڵکانی دوو زمان و ریاباز دەدات. جابۆ ئەوەی بتوانێ تایبەتمەندییەکانی کەسایەتییەك بە بەرجەستەیی نیشان بدات، دەکەوێتە موبالەغەکاری- تەقریبەن کاریکاتۆر دەخولقێنێ- کەسایەتییەکانی وەکو نموونە دەخاتەڕوو. ئەنجام، هەندێ جار پێکەنینێکی قایمە، بەڵام هەندێ جار ئاوێتەیەکە لە بەزەیی و ڕەخنەی توند- هەندێ جار شادی دوای خەم و تاڵییە کە ڕەنگدانەوەی ژیانی خودی مولیرە... ئەم تراجیدیای ژیانی هەناوی کۆمیدیایە کە ئەو هەوڵدەدا نیشانی بدا.

شانۆنامەکانی:

بیست و حەوت کۆمیدیا لە پاش مولیر بەجێماوە کە هەندێك لە گرنگترینیان ئەمانەن:

((ژنانی فیشاڵباز- ١٦٥٩)):

یەکەمین کۆمیدیای گەورەی مولیرە، کە ناز و نوزی خانمانی تەلارە ڕۆشنبیرییەکان لە ژێر ناوی (هوتیلی رامبۆیە)دا، دەداتە بەر تەوس و توانجان. دوو کەسی وەچاخزادە دەچنە خوازبینیێ دوو کیژی (شارستانی شەیدای ڕواڵەتبازی و داب و نەریتی کۆمەڵگەی ڕۆشنبیریی پاریس)، چونکە بە شێوەی چینی "خوێنەوار) خوازبێنییەکە ناکەن، ڕەفز دەکرێن. جا ئەو

دوو وەچاخزادەیە هەڵدەستن دوو خزمەتکاری خۆیـان لـە شـێوەی دوو نـەجیمزادەدا دەنێرنـە خوازبێنی کیژەکان و، تەگبیریان بۆ دەکەن کە وەکـو خـەڵکانی خوێنـەوار ئاشـقێنی بکـەن، کیژەکان هەرزەیی و رەفتاری عـامیانەی خزمەتکارەکان وەکو باشترین نموونەی رەفتاری چینی خوێنەوار وەردەگرن، و خوازبێنییەکەیان قـەبووڵ دەکـەن. ئەوسـا دوو ئاشـقە راسـتەقینەکە ناسنامەی خۆیان ئاشکرا دەکەن.

((دۆن جوان- ١٦٦٥):

ئەمە تراجیکومیدیایەکی واقیعییـە، کـە ناوەڕۆکەکـەی بریتییـە لـە ئاشـقێنییەکانی دۆن جوانی قارەمانی بەناوبانگی ئەفسانەی ئەسپانیایی. مولیر دۆن جوان وەکو کەسێکی لوتبەرزی، دوو روویی، خوانەناسی، تاوانکاری دڵگر وێنە دەگرێت.

((پزیشکی ناچاری- ١٦٦٦)):

یەکێکە لە چوار کۆمیدیای [٣٤] مولیر، کە رەخنە لە ریاکاری پزیشکان دەگرێ، مولیر ئـەم فارس-ە شادەی لەسەر بنەمای فابیلۆ-ی ((پزیشکی گونـدی)) دانـاوە. سـگانارل، کابرایـەکی دارشکێنە کە بە هەڵە بە دکتۆرێکی لێهـاتوو دەزانـرێ، و بـە ناچـاری دەکەوێتـە چارەسـەری لاڵییەکەی لوسیند. پەی بەوە دەبات کە ئەم لاڵییـە تـەنیا بیانوویەکـە و هیـچی دی، چـونکە جرونتە-ی بابی لوسیند بەتەمایە بە تۆبزی بیدات بە پیاوێك کە ئەم خۆشی ناوێـت. سـگارناڵ بە دزییەوە ئامۆژگاری لوسیند دەکات کە بڕەڤێ، و لوسیند لەگـەڵ لیانـدر-ی حەزلێکردەیـدا هەڵدێ. فێڵەکەی سگارناڵ ئاشکرا دەبێ و حوکمی مـەرگ دەدرێ... لـە پـڕ خەبـەر بەلیانـدر دەگات کە بووە بە میراتگری سەروەت و سامانێکی زۆر. جرونتە ئەو بـە زاوای خـۆی قـەبووڵ دەکات و تەنانەت سگارناڵ-یش دەبورێ و دەبەخشـێت. -نوکتە و تەنزی- ئەم شـانۆنامەیە لەوەدایە کە کابرای دارشـکێن توانیویـەتی جرونتـەی سـادە و سـاکار فریـو بـدات. قۆنـاغی ئەنجامگیری و گرێ ڤەبوونەوەی شانۆنامەکە بێ ئەنگێزە و سۆنگەیە.

((مەردم دژ- ١٦٦٦):

نزیکترین کۆمیدیای مولیرە لە تراجیدیاوە و، لەڕاستیدا هـەملێتی فەرەنـسییە، ئالسیسـت-ی قارەمانی هەستیار و تاڕادەیەك سەرکێش و ئەسرەوت، دڵی دەخاتە گرەوی ئەڤینی سلیمن-ەوە، کە لەگەڵ دنیاو خەڵکیدا رادەبوێرێ، سلیمن ئامادە نییە دنیای رەنگاو رەنگ و سەرانسـەر خیانـەت و دووروویی لەبەر خاتری ئالسیست تەرك بکات، و ئالسیست-یش بە هیچ جۆرێ ئامادە نییە دەست لە ژیانی گۆشەنشینی و دوورە خەڵکی هەڵگرێ، هەموو بویەر و رووداوەکە ئەوەندەیە.

شانۆنامەکە بە ڕەنجان و شکستی ئالسیست تەواو دەبێ. گەلێك لە ڕەخنەگران ئەم شانۆنامەیەیان بە ڕەنگدانەوەیەکی زەماوەندی نەگونجاوی خودی مولیر لەگەڵ ئارماند بژارا زانیوە.

((تارتوف))، یان ((ریاباز- ١٦٦٤)):

مولیر لەم شانۆنامەیەدا هێرش دەکاتە سەر ریاکاری ئایینی. تارتوف یەکەمجار کە لە ساڵی ١٦٦٤دا نمایشکرا، بە جۆرێ روحانییەکانی دابووە بەر ڕەخنە کە ناچار قەدەغەیان کرد، ئەم شانۆنامەیە ڕەخنەگرتن نییە لە هەموو دین، بەڵکو پەردە هەڵماڵینە لەڕووی کەڵەکبازانێك کە بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان وا دەنوێنن کە زۆر دیندارن. تارتوفی قارەمانی شانۆنامەکە، ئورگۆن-ی دەوڵەمەند و خاتوو پرنل-ی دایکی فریو دەدات و وایان لێدەکات باوەڕ بە خواپەرستی و دینداری ئەو بکەن، فێڵەکەی هێندە کاریگەرو بەجێ و ڕێ دەبێ کە ئورگون هەموو سەروەت و سامانەکەی بە کومپیالە بە تارتوف دەسپێرێ و تەنانەت لێدەبڕێ ماریان-ی کیژیشی بدات بەو کەڵەکبازە. لە ئەنجامدا، کاتێ حەقیقەت ئاشکرا دەبێ کە بە عەشقبازییەوە لەگەڵ ئەلمیر-ی ژنیدا دەیگرێ. ئیدی بە فەرمانی پاشا سەروەت و سامانەکەی ئورگون دەدرێتەوە و، تارتوف بە سزای خۆی دەگات.

((پیسکە- ١٦٦٨)):

کۆمیدیایەکی شادە، بە دەوری تەوەری کەسایەتی هارپاگوندا، کە پیسکەیەکی دەوڵەمەندە، دەسوڕێتەوە. ئەم پیاوە سوخۆرێکە تەنانەت سوو لەکلەنت-ی کوڕی خۆیشی وەردەگرێت، بە فڕۆفێڵان دەیەوێ ماریان-ی دەزگیرانی کوڕەکەی بۆ خۆی بیخوازێت، و بە تەمایە ئەلیزی کیژی خۆی، بە پێچەوانەی حەز و ڕەزامەندی خۆیەوە بکات بە هاوسەری ئەنسەلیم-ی پیر، بەڵام دەوڵەمەند. خزمەتکارەکەی کلەنت هەموو ریسەکەی هارپاگون دەکاتەوە بە خوری، قاسەی پارەکانی هارپاگون دەدزێ و نایەوێ بیداتەوە. هارپاگون ناچار مل دەدات و بە زەماوەندی کلەنت و ماریان قایل دەبێ و، ئەلیز-یش مۆڵەت وەردەگرێ کە ببێ بە هاوسەری دڵدارەکەی خۆی (ڤالیر)، کە کوڕ و میراتگری ئەنسەلیم دەردەچێ، (ئەم کومیدیایە، کاریگەری رژدی و ڕەزیلی و پیسکەیی لەسەر شێواندن و داڕووخانی تاك و خێزان و کۆمەڵگە بە باشترین شێوە بەرجەستە و شرۆڤە کردووە).

پوختەیەکی رەخنەکان:

کەموکوڕی کۆمیدیاکانی مولیر زیاتر زادەی پەلەکارییە، رەنگە زەقترین لاوازی ئەو، لە ڤەبوونەوەی گرێی پلۆت و نەخشەی دراماکانی دا بێ... زۆر جار مولیر وەکو پزیشکی ناچاری، رووداوێکی ناخۆش بە بویەر و رووداوانی رێکەوتەکی و بێ سۆنگە کۆتایی دێنێ. ئەمە جگە لەوەی کە رووداوێن نەشیاو، نێرەنگبازی فرە، و تەوس و گاڵتەبازی لەرادەبەدەر، زیانی زۆر بە شانۆنامەکانی دەگەیەنێ، ولە دوا ئەنجاما قارەمانە بچووکەکانی زۆر لە یەکدی جیاواز نین. ئەمانە بە ناوی جۆراوجۆرەوە بە بەردەوامی لەسەر شانۆ دەردەکەون و هەمووشیان لێکدی دەچن.

بە هەر حاڵ ئەم کەموکوڕییانە لە چاو لایەنە ئیجابییەکانیدا بایەخێکی ئەوتۆیان نییە، یەکەمین ئیمتیازی کۆمیدیاکانی مولیر قوڵی و گۆشەنیگایانە، مولیر کە بوالو بە (هزرڤانی گەورە)ی ناو دەبات، بە قوڵایی تەبیعەتی مرۆڤانیدا رۆ دەچێت و شی دەکاتەوە، پوچییەکان دەدۆزێتەوە و بە دەستەواژەیەك بێ، بە هێما و ئاماژەیەك یا جووڵەیەك بێ وێنەی دەگرێت. خەسێتی دووەمی ئەقڵی ساغڵەمی ئاوێتە بە میانڕەوییە. لە گۆشەنیگا و روانگەی مولیرەوە تراجیدیا و کۆمیدیا بە جۆرێ ئاوێتە و تێکەڵی یەکدی دەبن کە هاوسەنگی و یەکپارچەیی پەیدا دەکەن. خەسێتی سێیەم حاڵەتی ئاسایی یان حەقیقەتنماییە، بەتایبەتی لە دیالۆگەکانیا. چوارەم ئەمەیە پڕ بەیەك سەرا کەسایەتی نائاسایی ئەفراندووە. وێڕای ئەوەی کە زۆربەی ئەم کەسایەتییانە لە قاڵبی نموونەدا پیشاندراون و لەبەر ئەمە دوورن لە هەر ئاڵۆزییەك، ئەوجاش بەوپەڕی لێهاتوویی و وەستاییەوە وێنە دەگیرێن، رەنگە تارتوف و هارپاگون زیاتر لە هزر و بیردا بمێننەوە تا پیکزنیف-ی دیکنز و شایلۆك-ی شەکسپیر، مولیر وەکو رەخنەگر لە کۆمەڵگە بێهاوتایە، وەکو نیگارکێشی سستی و لاوازییەکانی سەردەمی خۆی مامۆستایە... لە کۆمیدیای خالیسەدا هاوسەنگی شەکسپیرە. "بێ زێدەڕۆیی گەورەترین بلیمەتی کۆمیکە لە نێو کۆمیدیانووسانی سەردەمی تازەدا".

## فابیل- Fables

## چیرۆکی گیانلەبەران

((جان دولافونتین- ١٦٢١- ١٦٩٥)):

لە شاتۆتیری لەدایکبوو، پاش خوێندنێکی سەرەتایی نارێك و پێك کە بە خوێندنەوەی ئازادی هەمە لایەنە پڕ بووەوە، دەستی بە خوێندنی خواناسی و ماف کرد، بەڵام زۆر زوو وازی لە هەردوو لقەکە هێنا. لە ساڵی ١٦٤٧دا بۆ زێدی خۆی گەڕایەوە، و لە جیاتی بابی بوو بە سەرۆکی دایەرەی ئاو و دارستان و لەگەڵ ماری هریکار-ی شانزە ساڵەدا زەماوەندی کرد. دەرهەق بە خانەوادە و پیشەکەی کەمتەرخەم بوو- و لە ئەنجامدا هەردووکیانی بەجێهێشت. لە ساڵی ١٦٥٧دا بۆ پاریس چوو، و لەوێندەر چووە کۆڕی راسین، مولیر، بوالوەوە. لە ساڵی ١٦٨٣دا بوو بە ئەندامی ئەکادیمیای (کۆڕی زانیاری) فەرەنسا... لە زۆربەی ئەو ساڵانەی کە لە پاریسدا بەسەری دەبرد، هەمیشە لەلایەن دەوڵەمەندانی وەکو فوکە (١٦١٥- ١٦٨٠)ی وەزیری لویسی چواردە، دوشس دورلیان، دوشس دوبرڤیون، خات دولا سابلیر، و موسیودارڤارەوە یارمەتی دراوە و پشتیوانی لێکراوە و تەنانەت لە ماڵی دارڤاردا مرد.

لافونتین زۆر شیعر، لاوانەوە، نامە، کومیدیا، و چیرۆکێن خانەوادەیی "٣٥" ناسك بەڵام ئاوێتە بە بێشەرمی لە پاش بەجێماوە، بەڵام تەنیا فابیلەکانی شۆرەتیان بە دنیادا بڵاوکردوەتەوە.

((فابیلەکان- ١٢ کتێبە، ١٦٦٨- ١٦٩٤)):

بریتییە لە ٢٤١ حیکایەت کە درێژییان لە نێوان چەند دێرێکەوە بۆ چەند سەد دێرێك دەبێت. ئەم حیکایەتانە هەر هەموویان بە شیعر هۆنراونەتەوە، و لافونتین درێژی بەیتەکان و قافیەبەندی، تەنانەت لە بەیتێن یەك هۆزانیشدا، دەستکاری دەکات و دەگۆڕێ. لەڕاستیدا ئەو "هۆزانی ئازادیی هەڵبژاردووە، چونکە هەر حیکایەتێك لە قاڵبی خۆیدا دەهونرێتەوە، و هەر هزر و ئەندێشە و حاڵەتێك دێڕی تایبەتی خۆی دەدۆزێتەوە- تا پڕ بە پێستی ئەو بیر و هزرە بێ کە دێتە دەربڕین و نیشاندان".

لافونتین وەکو بۆکاچۆ و مولیر، کەمتر نێوەرۆکی حیکایەتەکانی دادەهێنێ. بابەتەکانی لە ئیزۆپ، فدرۆس، و هەر سەرچاوەیەکی رۆژهەڵاتی، یۆنانی، لاتینی، و فەرەنساوی دیکەوە، کە

لەگەڵ زەوق و سەلیقەیدا بگونجێت وەردەگرێ، ڕەسەنایەتی بەرهەمەکانی وی لە جۆری مامەڵە کردنیەتی لەگەڵیاندا:

"پانۆراماسازی، گێڕانەوەیەکی خێرا لەگەڵ دیالۆگی دراماتیکیدا، گرێ کردنەوە و ئەنجامگیری لە یەك بەیتدا، پەندێك-ی جیهانی، یان بیرۆکەیەکی کورتی شەخسی، و چیرۆکێك کە دێتە گێڕانەوە یان دیمەنێك کە لەبەر چاوی ئێمە نمایش دەکرێ".

بە پێچەوانەی ئیزۆپەوە کە پێدەچێت هەر حیکایەتێك لە پێناوی پەندی ئەخلاقی حیکایەتەکەدا بنووسێت، لافونتین هەر پەندێکی ئەخلاقی بە بیانوویەك دەزانێ بۆ چیرۆك گوتن.. ئەو لە حیکایەتی پەند ئامێزی ئەخلاقیی روونەوە، واتە لە فابیل-ەوە، شێوە چیرۆکی خێزانی (Contes) داهێنا، کە لەو جۆرە چیرۆك و حیکایەتدا وەسف، دیتن، تەنز، و دیالۆگ بایەخی سەربەخۆی هەیە، و بایەخی ئەخلاق لە رادەی رووداوێکایە.

"حیکمەت و پەندی جیهانی"ش بریتییە لە حیکمەتی ئەقلانی و ریالیستی سەردەمی لویسی چواردەیەم.

قارەمانانی فابیلان بە زۆری گیانلەبەرانن لێ ئەمانە نە گیانلەبەرانی راستەقینەن و نە خەڵکانێکن لە پێستی گیانلەبەراندا، ئەوانە گیانلەبەرانێکن بەهزر و بیرێکەوە کە مرۆڤان، ئەگەر بە شێوەی گیانلەبەران مەسخ بوایەن، بێگومان ئەو بیرانەیان دەبوو.

هەندێ لە باشترین فابیلەکانی لافونتین بریتین لە:

١-((بەڕوو و نەیچە)):

*لەم حیکایەتەدا داربەڕوویەکی ناسك گاڵتە بە نەیچەیەك دەکات، بەڵام داربەڕووەکە بە خۆی لە ئەنجامی لافاوێکەوە لە ڕەگ و ریشەوە هەڵدەکەندرێ و بەڵام نەیچەکە بەچەمینەوە لە بەردەم لافاوەکەدا نەجاتی دەبێت.*

*٢-((گورگ و بەرخ)):*

*لەم حیکایەتەدا گورگێك بە خواردنی بەرخێك حەقانیەتی زوڵم و زۆر دەسەلمێنێ.*

*٣- ((کوللەو مێرولە)):*

*لەم حیکایەتەدا مێروولە بەزەیی هاتنەوە بە حاڵی کوللەدا، کە بە درێژایی هاوین بێ خەم و خەیاڵ هەر هەڵبەز و دابەز و سەما دەکات، و زستانان برسێتی دەکێشێت، بە رەوا نازانێت.*

٤-((پینەدۆز و سەرمایەدار)):

لەم حیکایەتەدا پیاوێکی دەوڵەمەند پارەیەکی فرە بە پینەدۆزێکی هەژار و دەستکورت، بەڵام شادمان و بەختەوەر دەدات، کابرای پینەدۆز لە ترسی ئەوەی کە نەبادا پارەکان بدزن نیگەران و هەراسان دەبێ کە ئیدی رەنگی شادی بەخۆیەوە نابینێ، بۆیە پارەکان بۆ کابرای دەوڵەمەند دەگێڕێتەوە.

# ژێدەران:

١- هنری چوارەم (١٥٥٣- ١٦١٠):

پاشای فەرەنسا بوو لە ساڵانی (١٥٨٩- ١٦١٠).

٢- نانت- Edect of nantes:

بە گوێرەی ئەم فەرمانە کە هنری چوارەم لە شاری نانت، لە باکووری رۆژئاوای فەرەنسا ئیمزای کرد، گەلێك ئازادی مەزهەبی و مافی مەدەنی بە پەیڕەوانی مەزهەبی پروتستان درا.

٣- لویسی سیانزەیەم (١٦٠١- ١٦٤٣):

پاشای فەرەنسا بوو لە ساڵانی (١٦١٠- ١٦٤٣).

٤- ریشیلو (١٥٨٥- ١٦٤٢):

بە کاردینال ریشیلو ناسراوە و سیاسەتوان و سەرۆك وەزیری لویسی سیانزەیەم بوو.

٥- جەنگی سی ساڵە (١٦١٨- ١٦٤٨):

جەنگێکی سەرانسەری ئەورووپا بوو، کە مەیدانی سەرەکی ئەم جەنگە ئەڵمانیا بوو، گرنگترین هۆکاری ئەم شەڕە ناکۆکی بوو لەسەر خاك و ململانێی خانەدانانی پاشایەتی و جیاوازی و ناتەبایی ئایینی بوو، لە ئەنجامی ئەم شەڕەدا فەرەنسا بوو بە گرنگترین هێزی ئەورووپا.

٦- لویسی چواردەیەم (١٦٣٨- ١٧١٥):

پاشای هەتاویان پێدەگوت، پاشای فەرەنسا بوو لە ساڵانی (١٦٤٣- ١٧١٥).

٧- باروك- Barogue:

شێوازێکە لە تەلارکاری و رازانەوەدا کە لە ئاخر و ئۆخری سەدەی شانزەیەمی زایینیدا لە ئیتالیا هاتە ئاراوە و دوای یەك سەدە لە سەرانسەری ئەورووپادا برەوی سەند و گەییە لوتکە. خەسڵەتە دیارەکانی ئەم شێوازە بریتییە لە: ئازادی لە ئەخشەرێژیدا، زۆری شێوە و فۆرمی جۆراوجۆر، و تێکەڵ و پێکەڵی شێوەی

پێکهاتنی کەرەستە و توخمەکان، لەواری مۆسیقادا، ئەم شێوازە زادەی شۆڕشێکە کە لە ئاخر و ئۆخری سەدەی شانزەیەمدا لە دژی مۆسیقای فرە دەنگی بەرپا بوو. خەسڵەتە سەرەکییەکانی شێوازی باروك لە هونەرێن پەیکەرسازی و لە مۆسیقادا چوونیەکن: ئەم خەسڵەتانە بریتین لە: هەمەجۆری، جۆش و خرۆش، هونەرنوێنی تەکنیکی و ناکۆکی و ناتەبایی لە نێوان بەشە جیاوازەکاندا، لە ئەدەبیاتدا پەیڕەوانی ئەم شێوازە ڕێگەی موبالەغە و زێدەڕۆییان گرتۆتەبەر و راستگۆیی و میانڕەوییان کردووە بە فیدای فیشاڵبازی و زۆر وێژی، رازانەوەی زۆر، و ئارایشتی بێ ئەندازەی جوانکاری.

٨- کاترین دوڤیون (١٥٨٨- ١٦٦٥):

خانمێکی زۆر بەناوبانگی فەرەنسییە و بۆ یەکەمجار تەلارێکی ئەدەبیی لەو وڵاتەدا دامەزراند.

٩- رینیە دیکارت (١٥٩٦- ١٦٥٠):

فەیلەسووف و ریازیاتزانێکی فەرەنسییە کەبە پێشەوا و پێشەنگی فەلسەفەی "ئەقڵگەرایی" لە فەلسەفەی تازەی ئەورووپادا دەژمێردرێ.

١٠- کورنیلوس یانسن- Cornelius Jansen: (1585- 1638):

حەکیمێکی خواناسی هۆڵاندی بوو، و دامەزرێنەری یاسا و رێسای یانسن بوو کە باوەڕی بە خراپی و گوناهکاری بەشەر و فەیز و فەزڵ و رەحمەتی خوا و بێ دەسەڵاتی بەشەر لەهەنبەر گوناح و چارەنووس و قەدەر و سزای سنووردار و کەمی گوناحان بوو.

١١- فرانسوا دو مالرب (١٥٥٥- ١٦٢٨):

شاعیرێکی فەرەنسی بوو لە دەرباری هنری چوارەم و لویسی سیانزەیەم، کەسێکی چامە بێژ و غەزەلخوان بوو. دیقەت و وردی ئەو لە هەڵبژاردنی وشەی زماندا کردیە کارێك کە شێوەزاری پاریسی ببێ بە زمانی سەرتاسەری فەرەنسا.

١٢- نیکولا بوالو- دپریو (١٦٣٦- ١٧١١):

شاعیرو رەخنەگرێکی فەرەنسی بوو کە پەیڤداری قوتابخانەی کلاسیسزم بوو.

١٣- کالپرند (١٦١٤- ١٦٦٣):

چیرۆکنووس و شانۆنامەنووسێکی فەرەنسییە.

١٤- جورج دوسکودری (١٦٠١- ١٦٦٧):

نووسەرێکی فەرەنسییە.

١٥- مادلین دوسکودری (١٦٠٧- ١٧٠١):

شاعیرو چیرۆکنووسێکی فەرەنسییە.

١٦- لارو شفوكۆ (١٦١٣- ١٦٨٠):

مامۆستای ئەخلاق و نووسەرێکی فەرەنسی بووە.

١٧- مارکیز دوسوینیە (١٦٢٦- ١٦٩٦):

خانێکی نووسەری فەرەنسییە.

١٨- ئانتوان فورتێر (١٦١٩- ١٦٨٨):

زمانەوانێکی فەرەنسییە.

١٩- مەدام دولافایت (١٦٣٤- ١٦٩٣):

رۆماننوسێکی فەرەنسییە.

٢٠- جاك بوسویە (١٦٢٧- ١٧٠٤):

نووسەرێکی فەرەنسییە و یەکێك بووە لە گەورەترین وتاربێژانی ئەو وڵاتە.

٢١- فرانسوا دولاموت فنلون (١٦٥١- ١٧١٥):

زانایەکی واری خوداناسی و نووسەرێکی فەرەنسییە.

٢٢- ئالکساندەر هاردی (١٥٧٠- ١٦٣١):

شاعیر و شانۆنامەنووسێکی فەرەنسییە.

٢٣- جان دومرە (١٦٠٤- ١٦٨٦):

شانۆنامەنووسێکی فەرەنسییە.

٢٤- روین: شارێکە لە باکووری فەرەنسا لەسەر رەخی رووباری سین-ە.

٢٥- پوڤیە: شارێکە لە باکووری فەرەنسا.

٢٦- نوزیس: شارێکە لە باشووری فەرەنسا

٢٧- خات دومنتون (١٦٣٥- ١٧١٩).

٢٨- پیروس (٣١٨- ٢٧٢پێش ز):

پاشای ئیپیرس بوو، ناوچەیەکە لە باکووری رۆژئاوای یونان.

٢٩- سویتونیوس: مێژوونامەنووس و بیۆگرافیانووسێکی رۆمییە، لە سەدەی دووەمی پێش زاییندا ژیاوە.

٣٠- پرادۆن (١٦٣٢- ١٦٩٨):

شانۆنامەنووسێکی فەرەنسییە.

٣١- سینتس بری (١٨٤٥- ١٩٣٣):

رەخنەگرێکی ئینگلیزە.

٣٢- بژار: بنەماڵەیەکی هونەرمەندی فەڕەنسییە، کە لە ساڵی ١٦٤٣ بە دواوە پەیوەندی و هاوکارییان لەگەڵ مولیردا هەبووە.

٣٣- ئارماندا بژار (١٦٤٢- ١٧٠٠):

یەکێك بوو لە بنەماڵەی بژار و هاوسەری مولیر بوو.

٣٤- چوار کۆمیدیا: سیپانەکەی دی بریتیین لە: پزیشکی ئاشق، ئاغای پورسونیاك و نەخۆشی خەیاڵی.

٣٥- خانەوادەیی- Contes:

هەندێ چیرۆك و سەرگوزەشتەی کورت و خەیاڵین کە لە مەسەلە خێزانییەکانەوە وەردەگیرێن.

# ئەدەبیاتی فەڕەنسا
# لە
# سەدەی هەژدەیەمدا ، سەردەمی ڕۆشنگەری

سەرەتایەکی مێژوویی:

سەدەی هەژدەیەم لە فەرەنسادا سەردەم و ڕۆژگاری گۆڕانکاری مەزنە. لە ساڵی ١٧٠٠دا و تەنانەت لە ساڵی ١٧١٥شدا، واتە کاتی مردنی لویسی چواردەیەم، رژێمی پاشایەتی هەر بە دەسەڵاتە، ئایینی کاتولیك هێشتا هەر زاڵـە، کلاسیـسزم لـە بـواری هونـەردا فەرمانڕەوایـە، ئەقڵیەتگەرایی وەکو جاران مەحەکی هزری فەلسەفییە. لە ساڵی ١٧٩٣دا لـە ملـی پاشـا و پاشـاژن دەدەن، و لـە فەرەنـسادا رژێمـی کۆمـاری رادەگەیـەنرێ، دیانـەتی تـەبیعی ((خـوا پەرستی"[١])) لە نێو کاتولیکەکاندا بە تەواوەتی برەو دەسەنێ، کلاسیـسزم لـەواری پراکتیکـدا مردووەو تاڕادەیەك جـێ بـۆ رۆمـانتیزم چـۆڵدەکات ئەقڵیەتگـەرایی روو لـە نـشێوی نـەمان، لەبەردەم هەست و سۆز پەروەریدا دەکەوێتە پاشەکشێ.

هاتنە سەر حوکمی لویسی پانزەیەم خۆشی و شادمانییەکەی زۆری نایـەوە. فەرەنـسییەکان ئومێدێکی زۆریان بەوە هەبوو کە زێدەگاڤی و دیکتاتۆرییەت، کە خەسڵەتی زەق و زاڵی رژێمی پێشوو بوو، بە یەکجارەکی بوەستێ و نەمێنێ، بەڵام ئومێد و هیواکانیان زۆر زوو بە نائومێدی گەڕا، زوڵم و زۆری ئەهلی کڵێسا و ئەرستۆکراتان بەسەر عەوامی خەڵکەوە هەر بەردەوام بـوو، باری قورسی باج و خەراج بەسەر شانی چینی چەوساوەوە مایـەوە. بـەڕێوەبردنی کاروبـاری دەوڵەتی، بەتایبەتی ئەو کاروبارانەی پەیوەندییان بە سیاسەتی دارایی و نێودەوڵەتییەوە هەبوو،

وەکو جاران بە خەڵکانی بودەڵە و بێ توانا سپێردرا، بەشداری کردن لە سێ جەنگدا —جەنگی جێنشینی ئەسپانیا "٢"، جەنگی جێنشینی نەمسا "٣"، و جەنگی حەوت ساڵە "٤" - زۆر کەوت لەسەر فەرەنسا، و پارەیەکی یەجگار زۆر، هێزێکی مرۆڤانی فرە، و تاڕادەیەك ئابڕوو ئیحتوباری ئەم وڵاتەی بە بادادا، و هەموو کۆلونیەکانی لە دەست چوو.

لویسی پانزەیەم، کە لە هەوەڵین ساڵانی حکومەتڕانیدا بە "لویسی خۆشەویست" ناوبانگی دەرکرد، لە ئەنجامدا بوو بە کەسێکی خۆپەرست، نا مەسئوول، و هەرزە و هەڵە، کە بەوپەڕی بێ شەرمییەوە دەیگوت: دنیا لە دوای مەرگی ئێمە چ دەریا بێ و چ تراویلکە، لویسی شازدەیەمی جێنشینی ئەو، کە لە ساڵی ١٧٧٤ەوە تا ١٧٨٩ حوکمڕانی کرد، بە یەکەم پاشای ئازادی بەخش دەزانرا، بەڵام بەرەبەرە لاوازی، تەمەڵی و بێ موبالاتی، و نەزانی ئەو بە دیار کەوت و ئاشکرا بوو، ماری ئەنتوانێت-ی ژنیشی، ئافرەتێکی هەرزە و بێ سەروبەر و خۆشگوزەران بوو، ئیدی خەڵکی جارێکی دی ئومێدی ئەوەیان لە دەستدا کە لە ناوەوەی حکومەتەوە ریفۆرم بکرێ.

هاوار و قریوەی ریفۆرمخوازی لێکدا لێکدا بەرزتر دەبووەوە. ئیلهامبەخشی ریفۆرمخوازان، بەرهەمەکانی رۆسۆ، دیدرۆ و ئەو رۆشنبیرانە بوو کە باوەڕیان بە چاکی سروشتی بەشەر، یەکسانی ئادەمیزاد، و کەماڵپەزێری ئاك هەبوو، و لە ئەنجامدا خەتاکانیان دەختە ئەستۆی سیستەمی باو. لە ساڵی ١٧٨٩دا خەڵکی کاروبارەکانیان گرتە دەستی خۆ، پەلاماری باستیل "٥" ی (رەمزی زوڵم و زۆر)یاندا و گرتیان، پاشایان لەسەر تەختی دەسەڵات هێنایەوە خوارێ، و رژێمی کۆمارییان دامەزراند. لە ساڵی ١٧٩٣دا پاشا ئیعدام کرا، دوای شەش ساڵ ناپلیۆن بۆناپارت گەییە پایەی کونسولێ، و لە ساڵی ١٨٠٤دا بەخۆی تاجی ئیمپراتۆری لەسەرنا. ئەم سەدەیە زێدەباری مەسەلەێن حوکمڕانی، رووداو و بویەران و هەلومەرجێکی هێنایە ئاراوە کە پەیوەندی بە ئەدەبیاتەوە هەیە. یەکەم، ئەوەبوو بزووتنەوەی رۆشنبیری و فەلسەفی و هونەری لە دەربارەی ڤێرسای، کە چیتر لەوێندەر دەرفەتی گەشەکردنی ئەدەبینی، هاتە دەرێ، جارێکی دیکە یانەو تەلارە رۆشنبیرییەکان رەونەق و رەواجیان پەیداکردەوە، لێ ئەمجارە مەودایەکی فراوانتریان گرتەوە و کەمتر لەسەردەمی مەدام رامبویە لایەنی نوخبەویان هەبوو. سیاسەت، زانستی ئابووری، بازرگانی و حوکمڕانی عەمەلی وەکو بابەتی شایستەی باس و خواس و گفتوگۆ هاتنە دنیای ئەدەبیات و هونەرەوە، لەڕاستیدا ئەهلی ئەدەب هەمیشە هاتووچۆی یەك یان چەند تەلار و یانەیەکیان دەکرد و، قاوەخانەکانیش بوون بە شوێن و

بارەگای کۆبوونەوەی ئەو کەسانەی کە ئارەزوومەندی باس و خواس بوون دەربارەی رووداوەکانی ڕۆژ و تیۆرییانی نوێ.

لایەنگیر لە ئەقلانییەت و یا وابەستەیی بە ئەقلگەراییەوە لە سەرانسەری ئەم سەدەیەدا بەردەوام بوو. ئەم باوەڕ بوونە لە زانستدا بووە مایەی دەست هەڵگرتن لەزۆر تەسەوراتی کۆن، دوور کەوتنەوە لە توندڕەوی و ئەنجامدانی ژمارەیەك توێژینەوە و کۆڵینەوەی نوێ. لە مەزهەبدا، "خواپەرستی" و خوانەناسیی هێنایە ئاراوە. لە فەلسەفەدا بووە مایەی گوێنەدان بە تیۆرییانی میتافیزیکی و جەختکردنەوە لەسەر حیکمەت و ئەپستمولۆژیای پراکتیکی.

لە چارەکی سێیەمی ئەم سەدەیەدا ڕۆسۆ و هزرڤانانی دیکە ئەم گومانەیان هێنایە ئاراوە کە ئایا دەتوانرێ تەنیا لە ڕێگەی ئەقڵەوە وەڵامی هەموو پرسیارەکان بدرێتەوە. ئەوانە لەبەر ڕۆشنایی ئەم گریمانەیەی کە بەشەر بە تەبیعەت چاکە خوازە، دەیانبەڵگاند کە سۆزی بەشەری وەکو ئەقڵ و ئاوەزی وی جێی باوەڕ و متمانەیە، هەر مرۆڤێك بگری کەماڵپەزێرە، و کۆمەڵێك مافی سروشتی هەیە، وەکو: ژیان، ئازادی، یەکسانی، برایەتی و بەختەوەری، ئەمە باوەڕە هێزێکی زۆری بە دیموکراسی و مرۆڤدۆستیدا، هزرڤانانی مینا دیدرۆ"٦"، و ژمارەیەك لە دانەرانی"٧" ئینسکلوپیدیا، بەلای ئەقلانییەتدا دایانکێشا، بەڵام بە مرۆڤدۆستی موتوربەیان کرد.

دوو ڕێچکە و ڕەوتی دیکەش لەم سەدەیەدا دەبێ هەڵوەستەیان لەسەر بکرێ. یەکێکیان ڕەوتی هزر، ئەدەبیات و دەزگا فەرەنسییەکانە لەسایەی کاریگەری میللەتانی بێگانەدا.

موهاجیرانی هوگەنو"٨" یەکەمین کەسانێك بوون کە کتێبانی ئینگلیزییان وەرگێڕایە سەر زمانی فەرەنسی و فەرەنساییەکانیان ڕمودەی کەلتووری ئینگلیزی کرد. پاشان، زۆربەی هەرە زۆری نووسەرە گەورەکانی فەرەنسا ژبلی دیدرو لە ڕێگەی مانش-ەوە بۆ ئینگلیستان دەچوون، و ئینگلیزەکانیش دەچوونە دیدەنی ئەوان. هوراس، والپول، براك، گیبون، بولینگ بروك"٩"، جیسترفیلد، و هیوم"١٠"، مشتەریانی دایمی تەلار و یانەکان بوون، ئەمە جگە لەوەی کە، لاك، سویفت، پوپ، ئەدیسن، دیفو، و ریچاردسن کاریان لە ئەدەبی فەرەنسی کرد. ڕۆشنبیری و هزری ئەڵمانیش بەرەبەرە لە فەرەنسادا ئامادەیی پەیدا کرد، لەم مەیدانەدا دەسەڵات و حزووری لایپ نیتز، لسینگ، شیلر، هردر و کانت لە هەمووان زیاتر بوو، و لە ئەنجامدا متاسازیو"١١"، گولدونی، ئالفیری ئیتاڵیایی پەیرەوانێکی بەرچاویان لە فەرەنسادا پەیدا کرد.

لە شرۆڤە و شیکردنەوەی ڕەوت و ڕێچکەکانی سەردەمی ڕۆشنگەریدا، دەور و ڕۆڵی مەزنی ژنان-یش لە کاروباری نەتەوەییدا شایانی باسە. هاوسەران و ماشوقانی پاشایان (بە تایبەتی

مەدام دو پومپادور"١٢"، مـەدام دوبـاری"١٣"، و مـاری ئـەنتوانێت) لـە پرسـە حـوکمڕانی و کۆمەڵایەتییەکانـدا دەوری گـەورە و زۆریـان هـەبوو و ئـەو خاتوونانـەی کـە یانـە و تـەلارە ڕۆشنبیرییەکانیان بەڕێوەدەبرد، بە داوەرانی ڕاستەقینەی چالاکییە هزرییەکان دەژمێردران.

نۆرینێکی گشتی:

ئـەدەبیاتی سـەردەمی ڕۆشـەنگەری، بەپێـچەوانەی بەرهەمـە ئەدەبییـەکانی سـەدەی هەڤدەوە، زیاتر بایەخی بە ناوەڕۆك دەدا تـا بـە فـۆرم و شـێوە، و زیـاتریش ئـەدەبیاتێکی ئامانجدار و فێرکاری بوو. فەلسەفەی گومانداری شەکاکییەت کە دوژمنی هەر شێوەیەك لـە شێوەکانی دەسەڵات یا باوەڕی کۆن بوو، لایـەنی ڕیفۆرمخـوازی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی ئـەم ئەدەبیاتەی دەگرت و ئاراستەی دەکرد. ڕیفۆرم، ئازادی هزر و لێبوردەیی، دروشمانی سەرەکی ڕۆژ بوون، نووسەران و دانەرانی سەدەی هەڤدەیەم چیتر پێـشینیانیان نـەدەکرد بـە نموونـە و سەرمەشق، بەڵام فۆرم و قاڵبە کلاسیکییەکانیان هەر بەکار دێنا، و لە بەکارهێنانی یاسـا و ڕێساکانی بوالو نەدەپرینگانەوە، حەنەکبێژی و جیهانییەت بەشێك بوو لە ئـەدەبیات، و لـە ناوەڕاستی ئەم سەدەیەوە حەساسیەت و هەستەوەری (سۆزداری، بەتایبەتی دەربارەی سـۆز و گودازی شکۆداری ئەڤین، دڵسۆزی، دڵاوایی و سەخاوەت و ئەو جۆرە شـتانە) بـاوی سـەند و ڕەواجی پەیدا کرد.

زۆربەی هەرە زۆری ئەدەبیاتی بەرجەستەی سەدەی هەژدەیەمی فەرەنسا بە پەخشانە، بەڵام ڤۆلتێر لە قاڵبی جۆراوجۆری شیعریدا سـەلیقەی خـۆی تاقیکردۆتـەوە، و لـە کۆتـایی سـەدەدا ئاندریە شینیە، هۆزانێن لیریکی، فەلسەفی، ڕامیاری، و تەنزئامێزی داناوە و گوتووە، بەڵام ئەم هۆزانانە ناچنە خانەی بەرهەمی مەزن و بەرجەستەوە.

ڤۆلتێر و ڕۆسۆ دوو سیمای مەزنی ئەدەبیاتی ئەو سەردەمەن، کە لە لاپەڕەکانی دواتردا بـەدوور و درێـژی باسـی بەرهەمـەکانیان دەکـرێ، سـەبارەت بـە نووسـەرانی دیکـە، بـە ئاماژەیەك دەیبڕینەوە.

لـەواری نامەنووسـیدا، شـارل دوسـکوندا مونتـسکیو (١٦٨٩- ١٧٥٥) لـە ڕیـزی پێشەوایاندایە. ((نامە ئێرانییەکان (١٧٢١))ی وی کۆمەڵە تەنزێکە لەمەڕ خو و خدە و داب و نـەریتی ئێرانییـان، ((گیـانی یاسـاکان- ١٧٤٨))ی وی کـە بایـەخێکی زیـاتری هەیـە، بەشـیکردنەوەی ڕژێمـە جۆراوجۆرەکـان ئـەوە سـاغ دەکاتـەوە کـە حکوومـەت و ڕژێمـان لـە هەلومەرجی ئەخلاقی، ئابووری، و تەبیعیدا پەیدا دەبن و یاسا بەشەرییەکان ڕێژەیین.

یەکێك لە نامەنووسە بەناوبانگەکانی دیکە (جورج لویس لوکلریوفون ١٧٠٧- ١٧٨٨ـە. کە (مێژووی سروشتی ١٧٤٩- ١٧٨٨)ی لە ٣٦ بەرگدا نووسیوە، و نامەیەکی رەخنەیی بەناوبانگی هەیە بە ناوی (گوتار لە شێوازدا- ١٧٥٣) کە لەوێدا لایەنگری لە بەرنامەداری ورد و دەربڕینی سادە دەکات.

رەنگە بەناوبانگترین و بێ گومان یەکێك لە کاریگەرترین فاکتەرەکانی ئەدەبی سەدەی هەژدەیەم (ئەنسکلوپیدیا یان فەرهەنگی بەڵگەداری زانست و سەنعەت و پیشەکانە ١٧٥٠- ١٧٧٧) کە لە سی و چوار بەرگدا تۆمار کراوە. سەرنووسەر و دانەری راستەقینەی ئەو ئەنسکلوپیدیایە دنی دیدرۆ (١٧١٣- ١٧٨٤)یە، و تەقریبەن هەموو ناودارانی ئەو رۆژ و زەمانەی مینا دالامبر "١٤"، رۆسۆ، مونتسکیۆ، بوفون و زۆری دیکە لە نووسین و دانانیدا هاوکارییان هەبووە، ئینسکلوپیدیا هەوڵ دەدات هەموو زانیارییەکانی تیرەی بەشەر لەمەڕ زانستان، سنعەتان، و پیشەکان کۆبکاتەوە و بە جۆرێکی سیستماتیك ریزبەندی و تۆماری بکات، خاوەنانی ئینسکلۆپیدیا ئەم بەرهەمەیان کردووە بە دەستاوێزێك بۆ دژایەتی هەر جۆرە زۆرداری و ستەمێك و بۆ بەرەڤانی لە ئازادی تاك، ئەقڵی بەشەری، و کەماڵپەزێری مرۆڤ. ئەم بەرهەمە رۆڵێکی مەزنی لە زەمینەسازی هزری بۆ شۆڕشی فەرەنسا هەبووە.

لە سەدەی هەژدەدا زۆربەی کۆمیدیا فەرەنسییەکان میانمایە بوو.

<u>ئەم کۆمیدیانە لە چوار جۆردا ریزبەند دەکرێ:</u>

*١- کۆمیدیای کەسایەتی، کەزیاتر نووسینی فیلیپ نیکولا دستوش-ە (١٦٨٠- ١٧٥٤).*

*٢- کومیدیای سایکولوژی هەست، کە دیارترین نووسەری پییر دوماریوڤە (١٦٨٨- ١٧٦٣).*

*٣- کۆمیدیای دەسیسە و (ئانتریگ) و ردفتاران، کە نووسەری سەرەکی ئەم مەیدانە پییرئوگوستین دو بومارشە (١٧٣٢- ١٧٩٩) کە خاوەنی (بەربەری ئەشبیلیە-١٧٧٢)و (زەماوەندی فیگارۆ- ١٧٧٨)یە.*

*٤- کۆمیدیای سۆزداری و خانەوادەیی، بەناوبانگترین نووسەرانی ئەم مەیدانە بریتین لە: نیڤل دولاشوسە (١٦٩٢- ١٧٥٤)، دیدرو، میشل جان سدن (١٧١٩- ١٧٩٧)، و لویس سباستین مرسیە (١٧٤٠- ١٨١٤).*

حاڵ و رەوشی تراجیدیا لە کۆمیدیاش خراپتر بوو. لە پاش ڤۆلتیر، تەنیا فرانسوا جولیو کرەبیون (١٦٧٤- ١٧٦٢)، وەکو تراجیدیانووس شایانی ناوهێنانە، ئەو نۆ شانۆنامەی میلودرامای نووسیوە، کە تەنیا لەڕووی چێکرنی ترس و دڵە راوکێوە ماونەتەوە.

رۆمانی فەرەنسی لە سەدەی هەژدەیەمدا پێگەیی، گێڕانەوەکانی سکودری و لاکالپرند بە زەحمەت دەتوانرێ بە رۆمان حەساو بکرێن، وا باوە ئالن رنە لوساج (١٦٦٨- ١٧٤٧) بە یەکەمین رۆماننووسی فەرەنسی دادەنەن. ئەهریمەنی لەنگ (١٧٠٧)ـەکەی وی تەقریبەن پلۆت و نەخشەی تێدا نییە، بەلام زۆر بە وردی سروشتی مرۆڤ شیدەکاتەوە، و هەروەها "جیل بلاس"ەکەی (١٧١٥- ١٧٣٥) رۆمانێکی پۆلیسی تەواوە کە بەسەرهات و واریقاتی قارەمانە ئاوارەکەی پەیگیری دەکات. ماریوف دەستی بە نووسینی دوو رۆمان کرد (کە هەردووکیان لەلایەن نووسەرانی دیکەوە تەواوکران) کە خەسڵەتی سەرەکی ئەم دوو رۆمانە شیکردنەوەی سایکۆلۆژییانەی قارەمان یان کەسایەتییەکانە، ئەم دوو رۆمانە ناویان "ژیانی ماریان ١٧٣١- ١٧٤١) و (گوندیی تازە پیاکەوتوو ١٧٣٥- ١٧٣٦)ـە. ئا بە پرەڤو (١٦٩٧- ١٧٦٣)ش چەند رۆمانێکی دوور و درێژی پڕ لە درێژدادڕی و وشەبازی نووسی، بەلام ئەو زیاتر ناویانگی بە (سەرگوزەشتەی سوارچاکی گوندی گریوف و مانون لسکو- ١٧٣١)وە دەرکرد کە حەوتەمین بەشە لە (بیرەوەری کابرایەکی شایستە ١٧٢٨- ١٧٣٢، مانون لسکو چیرۆکێکی هەڵچو و هەست کوژ و مقاوەمەت ناپەزێرە، و یەکێکە لە شاکارەکانی جیهان، رۆماننوسێکی گەورەی دیکەی رۆژو وەخت رۆسۆیە کە لەم بەشەدا باس دەکرێ.

لە کۆتاییدا دەبێ ئامازەیەك بۆ چیرۆکی پەخشان بکرێ. لەم مەیدانەدا، لە دوای ڤۆلتیرەوە تەنیا یەك نووسەر شۆرەت و ئیحتوبار پەیدا دەکات، ئەویش برناردن دوسن پییر (١٧٣٧- ١٨١٤)ە لە موریدانی رۆسۆو لە سەرنامەدانی رۆمانتیزمە.

رۆمانە ئاسکەکەی، لە ژێر سەرناوی (پل و ڤیرجینی- ١٧٨٧)دا چیرۆکێکی تەژی هەست و سۆز و وەسفی سروشتی ناوچە گەرمەسێرەکانە.

# ڤۆلتێر

ڤۆلتێر (ناوی راستەقینەی: فرانسوا ماری ئارویە، ١٦٩٤- ١٧٧٨):

بەرجەستەکەری سەردەمی رۆشنگەرییە. لە بنەماڵەیەکی مامناوەندی، لە پاریس لە دایك بووە، لە کۆلیژی یەسوعی لویس لوگران دەرسی مافی خوێند. لە ساڵی ١٧١٧دا بە تاوانی نووسینی دوو هەجوونامە دەربارەی نوێنەری شا، کە بە درۆ دابوویانە پاڵی، کەوتە باستیل-ەوە، پاشان بە هۆی دوو شانۆنامەی کۆمیدی خۆیەوە، بوو بە مایەی لوتف و مەرحەمەتی شاژنە ماری لکزینسکا-ی هاوسەری لویسی پانزەیەم. لە ساڵی ١٧٢٠دا جارێکی دیکە لە باستیل زیندانی کرا، و تۆمەتەکەی ئەوەبوو کە سووکایەتیی بە سوارچاك دوروان کردبوو.

فولتێر کە لە زیندان دەرچوو بۆ ئینگلیستان هەڵهات، سێ ساڵان (١٧٢٦- ١٧٢٩) لەوێندەر مایەوە و ئاشنایەتی و ناسیاوی لەگەڵ ناودارانی وەکو ڤالپول، کنگرو، سویفت، پوپ، بولینگ بروك، تومسن و چیسترفیلدا پەیدا کرد، بە قووڵی کەوتە ژێرکاریگەری فەلسەفەی نیوتون و لاك و شانۆنامەکانی شەکسپیرەوە. لە ئینگلیستاندا بەیتی (هانریاد)ی کە داستانێکە دەربارەی هنری چوارەم-ی پاشای فەرەنسا بڵاوبووەوە (١٧٢٨)، و سەروەت و سامانێکی بەرچاوی بەنسیب کرد.

ڤۆلتێر پاش گەڕانەوەی بۆ پاریس (نامە فەلسەفییەکان- ١٧٣٤)ی بڵاوکردەوە، کە لەو نامانەدا دام و دەزگا سیاسی، کۆمەڵایەتی و مەزهەبییەکانی فەرەنسای بە بەراورد لەگەڵ دەزگا ئینگلیزییەکاندا بەرهێرشێکی توند دابوو. ئەم نامانە بە دەستی میرغەزەب و پیاوکوژان هاتنە سوتاندن، و ڤۆلتێر جارێکی دی رێگەی هەڵاتنی گرتەبەر.

ئەنجارەیان رووی کردە سیرە "١٥"، و لە کۆشکی مەدام دوشاتلە "١٦"دا گیرسایەوە. ڤۆلتێر تاوەکو مردنی ئەم خاتوونە چاکەکارە (لە ساڵی ١٧٤٩)دا لە ماڵەکەی ئەودا مایەوە. ڤۆلتێر لەساڵی (١٧٤٦)دا بە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسا هەڵبژێردرا.

ڤۆلتێر لە ساڵی ١٧٥٠دا لەسەر بانگهێشتی فەردریکی "١٧" گەورە-ی پاشای پروسن بۆ پوتسدام "١٨" رۆیی. پەیوەندی ڤۆلتێر لەگەڵ پاشادا لەسەرەتاوە زۆر قووڵ بوو، بەڵام ناکۆکی خو و خدە و تەبیعەتیان زۆر زوو ئاشکرا بوو، ئەمە جگە لەوەی کە ڤۆلتێر خۆی لە کارێکی دارایی گومان لێکراوەوە گلاند و لەگەڵ یەکێك لە کەسە نزیکەکانی شاشدا کردی بە قەرقەشە و رکابەری. لە ئەنجامدا و لە ساڵی ١٧٥٣دا دەرباری پروس-ی بەجێهێشت و بەرەو سویسرا

چوو، و ماوەی پێنج ساڵی لە جنیف بردە سەر. لە ساڵی ١٧٥٨دا مولکێکی لە فرنیە لە بورگاندی، لەسەر سنووری فەرەنسا و سویسرادا کڕی، ڤۆلتێر بیست ساڵی کۆتایی تەمەنی لە فرنیە قەتاند، بەڵام بۆ ساتێکیش دەستبەرداری خەباتی سیاسی، فەلسەفی و کۆمەڵایەتی نەبوو. لە ساڵی ١٧٧٨دا بۆ پاریس گەڕایەوە تا نمایشی شانۆنامەیەکی خۆی بەناوی (ئیرن)ەوە ببینێ، خەڵکی زۆر بە گەرمی و بەرێزەوە پێشوازییان لێکرد، بەڵام ڤۆلتێر تەحەمولی ئەو هەموو گوشار و هەڵچوونەی نەبوو، پاش ماوەیەکی کەم، لە حاڵێکا کە لە چەند مانگێ پتری بۆ ساڵوەگەری هەشتا و چوارەمینی لەدایکبوونی نەمابوو کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی:

ڤۆلتێر نەك هەر لەڕووی هەموو جۆری بەرهەمەوە نووسەرێکی کەم وێنەیە، بەڵکو بە یەکێك لە فرەکارترین و پڕبەرهەمترین نووسەرانی جیهان دەژمێردرێ، لە هەوەڵی هەرزەکارییەوە تا مردنی، تراجیدیا، کۆمیدیا، مێژوو، تەنز، چیرۆك، داستان، پێکەنینۆك، نامە و گوتار بێوچان وەکو رووبارێکی بێ کۆتایی لە قەڵەمەکەیەوە هەڵدەقوڵی، کۆی بەرهەمەکانی (لە دوو چاپی جیاوازدا) دەگاتە نەوەد و حەوت بەرگ، کە دەکرێن بەشەش دەستەوە.

شانۆنامە:

کۆمیدیاکانی ڤۆلتێر دەچنە خانەی ناسەرکەوتووترین بەرهەمەکانییەوە و ئەوەندە شایانی باس نین. بەڵام هەندێ لە هاوعەسرانی ڤۆلتێر، تراجیدیاکانی بە هاوسەنگی شانۆنامەکانی کۆرنی و راسین دەزانن. ڤۆلتێر هەر چەندە لە هەرزەکاریدا زۆر دڵبەندی تراجیدیاکانی شەکسپیر بوو، پاشان لادان لە پرەنسیپە کلاسیکەکانی بە کێماسی کارەکانی شەکسپیر زانی، و ئەوە بوو خودی بۆچوونی سەدەی هەڤدەیەمی بە سەرمەشق دانا، کە بریتی بوو لە تەرکیزکردن لەسەر سۆزی ئەو کاراکتەرانی کە وەکو نموونە وەسف دەکران. هەندێ لە تراجیدیا بەناوبانگەکانی ئەمانەن: "ئۆدیپ- ١٧١٨" لە ئەفسانەی کۆنی ئودیپیوس-ەوە هەڵێنجراوە، (برۆتۆ- ١٧٣٠) لە مێژووی رومەوە وەرگیراوە، (زئیر- ١٧٣٢) داستانێکە دەربارەی حەسادەت و تاوانبارکردنی شانسی وەکو ئۆتێللۆ، و(مرۆپ- ١٧٤٣) لە ئەفسانانی کۆنەوە وەرگیراوە، ئەمڕۆ ژمارەیەکی کەمی شانۆنامەکانی ڤۆلتێر برشتی نمایشکردنیان.

هۆزان:

ڤۆلتێر لە فۆرم و قاڵبی جۆراوجۆری شیعریدا خۆی جەرباندووە و هۆزانێن داستانی، تەنزئامێز، چیرۆکئانی، غەزەل. بە ناوبانگترین شیعری وی بەیتێکی داستانییە بەناوی

(هانریاد- ١٦٢٨)، کە لە ژێر کاریگەری ڤێرجیلدا نووسراوە، و قۆناغی پاشایەتی هنری چوارەم کە (لە سالآنی ١٥٨٩- ١٦١٠دا حوکمڕانی کردووە) دەگێڕێتەوە. ئەم بەیتە زۆر هەواڵی زیندوو دەربارەی جەنگە مەزهەبییەکان نیشان دەدات، بەڵام لە شکۆداری، ئیلهام و خەیاڵ بەتاڵە و تەواو دەستکردە. ئەم داستانەش وەکو بەرهەمەکانی دیکەی ڤۆلتێر زۆر بە توندی هێرش دەکاتە سەر توندڕەوی و پڕوپوچ، وێنەی ئەم هێرشە لە (هۆزانی کارەساتی لیسبوندا- ١٧٥٦) کە لە بوومەلەرزەی ئەو شارەوە هەڵێنجراوە، دەردەکەوێ. ناسکی و حەنەکچیاتی و زیرەکی لە شیعرە سەرگەرمکەرەکانی ڤۆلتێردا شەپۆل دەدەن.

میژوو:

ڤۆلتێر لە ریزی پێشەوەی ئەو کەسانەیە کە مێژوویان بە هۆ و ئەوزارێك زانیوە بۆ رێکخستنی هزر و ئەندێشە گشتییەکان، و هەوڵیدەدا تا ئەو بنەما سەرەکییانەی کە دەرخەری مێژووی رابردوون بدۆزێتەوە و هۆکارە پەنهانەکان کەشف بکات و شان و شەوکەتێکی شایستەیان پێ ببەخشێت وەکو چۆن ئەمە بە دیاردە و رووداوە دیاریکراو و واقیعییەکاندا دەدرێ، ڤۆلتێر لەم سێ بوارە سەرەکییەکی خوارەوەدا کاری مێژوونووسیی دەکات:

١- ژیاننامە:

(مێژووی شارلی دوازدەیەم- ١٧٣١) بە باشترین کاری ڤۆلتێر، لەم مەیدانەدا، دەژمێردرێ، نووسەر لەم بەرهەمەدا زیاتر بایەخی بە ژیانی قارەمانی کتێبەکەداوە تابە تەگبیری سوپایی و فێڵ و فەندە جەنگییەکانی.

٢- واریقاتنووسی:

گرنگترین بەرهەمی ڤۆلتێر لەواری بویەر و واریقاتنووسیدا (سەردەمی لویسی چواردەیەم- ١٧٥١)ـە. لەم بەرهەمەدا زانیارییەکی پڕ بەها دەربارەی زانست و پیشە و هەروەها دەربارەی شا و دەربارییانی شا نیشاندەدرێ.

لەوەیە (سەردەمی لویسی چواردەیەم) لە هەر مێژوویەکی دیکە کاریگەرتر بووبێ لە ناساندنی سەدەی هەڤدەیەمی فەرەنسا بە هزری جیهانیان.

٣- فەلسەفە:

(نامەی داب و نەریت و گیانی میللەتان- ١٧٥٦) نموونەی کاری ڤۆلتێرە لەم بوارەدا، ئەم نامەیە نەك هەر باسی حەزو ئارەزوو و مەیل و هەستەکانی تیرەی بەشەر لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی مێژووی خۆیدا و لایەنە عیبرەت و پەندئامێزەکانی دەکات، بەڵکو هەر جۆرە

جەور و ستەم و ڕێباکارییەك بەر پەلاماری توند دەدا. ئەم نامەیە کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەرهەڵدان و بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسادا.

رەخنەی ئەدەبی:

بۆچوون و باوەڕێن ڤۆلتێر دەربارەی ئەدەبیات لە بندێری هۆزان، مێژوو، نامە و بەرهەمەکانی دیکەیدا بڵاو و پەراگەندەیە، "ڤۆلتێر وەکو رەخنەگری ئەدەبی کەسێکی نیمچە کلاسیکی لەڕادەبەدەر محافەزەکارە... راسین و بوالو-ش خواوەندانی ئەون". بەرهەمی هەرە گرنگی ڤۆلتێر لەم وارەدا بریتییە لە "شەرح و شرۆڤەیەك لەمەڕ کورنی - ١٧٦٤" کە لەوێدا دەکەوێتە ستایش و ئافەرینی ئەم شانۆنامەنووسە ، بەڵام لەبەر ((تەسلیم بوونی بە سەلیقە و زاراوەی زمانی سواو کە زۆربەیان لە کاتی نووسینی شانۆنامەکاندا پەسند نەبوون)) گلەیی لێ دەکات.

چیرۆك:

حیکایەتە پەخشانییە کورتەکانی ڤۆلتێر (چیرۆکی درێژی ئەدەنووسی) لە هەر هەموو بەرهەمەکانی دیکەی فرە خوێنەر بوونە. هەر چیرۆکێکی بگری مەبەست و ئامانجێکی ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی، رامیاری، یا زمانەوانی و کەلامی پەیگیری دەکات، قارەمانانی چیرۆکەکانی ڤۆلتێر رێك وەکو ئەو نەقڵبێژانەن کە تەنز و نێشخەنەکانی نووسەر دەبەنە ناو خەڵکەوە و بۆ خەڵکی دەگێڕنەوە. بونیادی نەخشە و پلۆتی چیرۆکەکانی بە زۆری سست و بویەر و رووداوەکان نالوجیکین.. وێڕای ئەمەش، چیرۆکەکانی ڤۆلتێر دڵگیر و خۆش خوێندنەوەن، و تەژی درکە و ریشخەن و حەنەکن. ((زادیگ و کاندید)) بەناوبانگترین چیرۆکی ڤۆلتێرن و لەڕاستیدا بە شاکاری ئەو دەژمێردرێن.

((زادیگ یا چارەنووس- ١٧٤٧)):

ئەم چیرۆکە ئەوە دەگێڕێتەوە چۆن کابرایەکی بابلی دروستکار و خواناس لە لوتکەی بەختەوەری و شادمانییەوە دەکەوێتە هەڵدێری نەگبەتی و بەدبەختییەوە، و جارێکی دیکە دلبەری شادمانی لە با وەش دەگرێتەوە. ئەنجامی ئەخلاقی ئەم چیرۆکە، وەکو چیرۆکی (ئەیوب)ی کتێبی موقەدەس، واتە حیکمەتی توانای موتڵەق لە بەشەر شاراوەیە.

((کاندید یان گەشبینی- ١٧٥٩)):

ئەمە جەماوەریترین بەرهەمی ڤۆلتێرە، هێرشە بۆ سەر شادمانی "خودا پەرستان- دئیستەکان" بەتایبەتی فەیلەسووفی ئەڵمانی: گوتفرید ویلهام فون لایب نیتز. لەم چیرۆکە

فەلسەفییەدا کە لە بوومەلەرزەکەی ساڵی ١٧٥٥ی لیسبونەوە وەرگیراوە، کاندید-ی قارەمانی چیرۆکەکە و پانگلوس-ی پەروەردەکاری ئاقڵی ئەو، دەکەونە دنیای رەنج و مسیبەتەوە، ئیدی پانگلوس بە گەشبینییەکی ساکارانەوە، کاندید فێری باوەڕە باوەکەی لایب نیتز دەکات کە ((سیستەمی ئەم جیهانە باشترین سیستەمی مومکین-ە و لەمە باشتر نابێ)). کاندید ئاقیبەت لە غەفلەت بێدار دەبێتەوە و پەی بەوە دەبات کە ئەم دنیایە باشترین جیهانی مومکین نییە، و ئەوەش هەیە بە زەروورەت بە باشترین شێوە نییە، دەگاتە ئەو ئەنجامگیرییەی کە بنیادەمان دەبێ بەوپەری ئازایەتییەوە دژواری و سەختییەکانی ژیان تەحەمول بکەن، و سەبارەت بە باوەڕ و رەفتاری خەڵکی بەسەبر بن، و سوود لەو رەوش و بارودۆخە وەربگرن کە هەیە، ڤۆلتێر لێرەدا باشترین تەنزی خۆی نیشان دەدات و لەم پێناوەشدا سوود لە ئایین، رژێم و حوکمڕانی، تایبەتمەندی نەتەوەیی، لاوازی بەشەرین، پایەخوازی، ئەڤین، وەفاداری و شتەکانی دی وەردەگرێت.

نامەکان:

وادیارە ڤۆلتێر پشوودرێژترین نامەنووسی جیهان بووبە، پتر لە دە هەزار نامەی کۆکراونەتەوە و بێگومان زۆر نامەی دیکەش دەدۆزرێتەوە، ئەوانەی نامەکانیان ئاراستە کراوە، کە ژمارەیان دەگاتە حەوت سەد کەس، ئەو کەسانە لە خەڵکانی زۆر هەژاریان تێدایە تاوەکو کەسایەتییانی گەورەی خەڵکانێکیش لەنزمترین چینی کۆمەڵگەوە تا کەسایەتییانی گەورەی ئەوروپا، وەکو: فردریك-ی گەورە، کاترین-ی گەورە (روسیا)، دیدرۆ، رۆسۆ، دالامبر، هۆراس، ڤالپول و گولدونی، دەگرێتەوە ڤۆلتێر جگە لە چەند بارێك، ئیدی هیچ کاتێ نیازی بڵاوکردنەوەی نامەکانی نەبووە، بۆیە نامەکانی هەموو راشکاو و راستەوخۆ و خۆرسکن.

نامەکان بەسەریەکەوە خود ژینامەیەکی پڕ بەهای ڤۆلتێر نیشاندەدەن، لەڕووی ئاشنابوون بە کۆڕ و ئەنجوومەنە ئەرستوکراتییەکان، داب و نەریت و کۆمەڵگەی سەدەی هەژدەیەم یەجگار سەرنج راکێشن.

هزر و بیران:

تاکو ئەو زۆربەی بیر و بۆچوونەکانی ڤۆلتێر بە هێما و ئاماژان هاتوونەتە دەربڕین، لێ دەبێ ئەوەش بگوترێ کە نە هزرڤانێکی قوڵ روانە و نە داهێنەر، بەڵام لە وەرگرتنی بیر و هزری خەڵکانی دیدا و نیشاندانەوەیان بەگوێرەی زەوقی خەڵکی یەجگار بە توانایە. هەڵبەتە سیستەمێکی هزری رەوان و گونجاوی نییە. وەکو گوتوویانە زەینێکی پڕ

ئەندێشەی روون، بەڵام پەرێشانی هەیە، لەڕاستیدا ڤۆلتێر وێرانکەری سیستەمانە، نەك بونیادنەری سیستەمان. بوێرانە چەمك و پرەنسیپانی نادروست و نابەجێ دەکوتێ، بەڵام چ شتێکیان لە جێگە پیشان نادات. ڤۆلتێر لە هەموو شتێکدا موحافەزەکار و بە پارێزە، تەنیا لە ئاییندا لیبراڵە باوەڕی بە خوایە کە کە ئافرێنەر و سزادەری خراپەکانە، بەڵام لە هێرش کردنە سەر هەر مەزهەبێك کە گومانی خورافات تیایدا، قەدەغە دەبوو، غافڵ نەدەبوو. (هەر هەموو هەست و هۆشی خۆی دژی ئیمتیازاتی ناماقوڵ و گەوجایەتییەکانی کڵێسا و کۆمەڵگە بەکار دەبرد، و لەم پێناوەدا هەمیشە هاواری دەکرد: "بەدناو پان و پلیش بکەنەوە"). ئەنجام "رەخنە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ڤۆلتێر توند و تیژە، و تۆوی نەفرەت لە توندڕەوی و زوڵم و ستەمکاری لە دڵاندا دەچێنێ، بەڵام ریفۆرمە دڵخوازەکانی وی بە گشتی لە چوارچێوە و بازنەی سیاسەتی عەمەلی دەرناچن، و جێبەجێ بوونیان پێویستی بە شۆڕش و کودەتا نییە).

هەڵسەنگاندن:

ڤۆلتێر وێڕای ئەمەی کە فەلسەفەیەکی قووڵ و روونی نییە، و ئەگەرچی تامەزرۆیی و تاسەمەندیی بۆ ئەقڵ و لوجیك، حەقیقەت و قەبووڵ کردنی رای پێچەوانەی بەرانبەر و مرۆڤپەروەری زۆرجار دەبێتە مایەی سەریەشە بۆی، بەڵام لە حەقیقەت پەیجوریدا زۆر چالاکە، و دوژمنی سەرسەختی ریاکاری، زوڵم و ستەم، دیکتاتۆرییەت، تەرەفداری و کورتبینی و خورافاتە. وێڕای ئەم راستییەی کە لە هیچ ژانرێکی ئەدەبیدا ناگاتە بەرزترین پایە، بەڵام پایەی مەیلەو بەرزی وی لە زۆر ژانرا، دەیخاتە ریزی گەورە ئەدیبانی ئەدەبیاتی فەرەنساوە.

## رۆسۆ

## ١٧٧٨ - ١٧١٢

جان جاك رۆسۆ (١٧١٢- ١٧٧٨):

لە جنێف، لە وڵاتی سویسرا، لە خێزانێکی پروتستان لە دایك بووە، دایکی بەسەر ئەوەوە مرد، و جان تا دەساڵی لە سایەی سەرپەرشتی بابیدا، کە کابرایەکی سەعاتساز بوو، و تەبع و تەبیعەتێکی رۆمانتیکی و کەسایەتییەکی ناسەقامگیری هەبوو، پەروەردە بوو. بابی لە ساڵی ١٧٢٢دا لە دوای کێشەیەك لەگەڵ هاوڵاتییەکی دیکەدا، تووشی کێشە و سەریەشە بوو، و بۆ

جنێڤ هەڵات، جان لە بواسیە "لەلای لامبرسیەی کەشیش دەستی بە خوێندن کرد. جان دوای دوو ساڵان مەکتەبی تەرك کرد و هەوەڵجار لەلای بەرپرسی نووسینگەیەکی فەرمی و پاشان لەواری لیتوگرافیدا کەوتە کارکردن و فێربوونی کار. لە ساڵی ١٧٢٨دا هەڵات و ماوەیەك لە ساڤووا ئاوارە بوو، چووەسەر مەزهەبی کاتولیکی رومی (کە پاشان وازی لێهێنا) ئەوجا لە ماڵی خاتوونێکی ئەرستۆکراتی بوو بە پێشخزمەت.

لە ساڵی ١٧٣١دا بۆ شامبری"[١٩] چوو، بۆ ماوەی دە ساڵان لەساو پەنای خات دوواران"[٢٠]دا بوو. چەند ساڵێکیشی بە وتنەوەی دەرسی مۆسیقا (لە لیون) و مامۆستایەتی ماڵان و کاتبی (لە پاریس و ڤینیسدا) بەسەر برد، لە ساڵی ١٧٤٥دا پەیوەندی دەگەڵ ترزلوڤاسوردا، کە کیژێکی کارەکەری تەقریبەن نەخوێندەوار بوو، بەست، و پێنج منالی لێی بوو، و هەموویانیشی بەدایەنگەی منالانی دۆزراوەی سەر رێیان سپارد.

رۆسۆ، لە ساڵانی ١٧٤١- ١٧٥٧دا پەیوەندییەکی قوڵی لەگەڵ دیدرۆدا پەیدا کرد و چەند وتارێکی بۆ ئینسکلۆپیدیاکەی نووسی، بە گوتاری "دەربارەی زانست و هونەران" (کە پاشان دێینە سەر باسی) ناوی کەوتە سەر زاران. رۆسۆ نیوەی دووەمی تەمەنی خۆی بە نووسین بردە سەر. لەم ماوەیەدا کە لەگەڵ یەکێك لە پشتیوانەکانیدا تێك دەچوو، رووی دەکردە یەکێکی دی، و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە هەڵدەهات تا لە ئازار و زەجری واقیعی یان خەیاڵی بە دوور بێ. لە ساڵی ١٧٤٧دا بوو بە ئەندامی ئەنجوومەن و یانەکەی خاتوو دپینە"[٢١]، و کولبەیەکی ئارامی لە مونمرنسی خرایە خزمەت. لە زستانی ساڵی ١٧٥٧دا پاش ئەوەی لەگەڵ رەخنەگرێکدا بەشەڕ هات، ناچار کولبەکەی بەجێهێشت و هەر لەو نزیکانە ئاکنجی بوو، و گرنگترین بەرهەمەکانی خۆی لەم شوێنەدا و لە ماوەی ساڵانی ١٧٥٨- ١٧٦٢دا نووسی، پاشان ماوەیەکی کورتی لە سویسرادا بەسەر برد. لە ساڵی ١٧٦٦دا، لەسەر دەعوەت و بانگهێشتی دیڤید هیوم چوو بۆ ئینگلیستان و ساڵ و نیوێك لەوێندەر مایەوە. پاش گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا، ماوەیەکی لە شارانی جیاوازدا کە یەکێك لەو شارانە پاریس بوو، قەتاند. ئەنجام لە ئیرمنو نوڤیلدا کۆچی دوایی کرد.

رۆسۆ دە یان پانزە ساڵی کۆتایی تەمەنی گیرۆدەی ترس و لە تاقیب و ئازاری خەلکی بوو ئاوێنەی زەینی بە جۆرێ تەڵخ و تاریك بووبوو کە وایدەزانی هەموان پیلانیان بەو گێڕاوە.

هزر و بیران:

رۆسۆ وێڕای ئەوەی کە هزرڤانێکی ئەوەندە داهێنەر و مەنتیقی نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر رۆشنایی دید و باوەڕ و بۆچوونەکانیا شۆرەت و ناوبانگی جیهانی پەیدا کرد و کارێکی

زۆری کردە سەر دیموکراسی، شۆڕشی فەڕەنسا، و ڕاپەڕینی ڕۆمانتیکی لە ئەوروپا و ئەمریکا ڕەگ و ریشەی زۆربەی بۆچوونەکانی ڕۆسۆ دەچێتەوە سەر بورژوازیی کۆماریخوازی پروتستانی سویسری. ڕۆسۆ پێی وایە کە بەشەر سروشت و نیهادێکی پاکی هەیە بەڵام مەدەنییەت و ژینگەی کۆمەڵایەتی لەوتاندوویەتی ، ڕۆسۆ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سۆزو نوێرینی ئادەمیزاد جێگەی متمانەیە تەنیا تەبیعەت لە کاریگەری وێرانکەرانەی مەدەنییەت خەلەسیوە بۆیە بابەتێکی لەبارە بۆ ستایشی مرۆڤ.

ئەم بیروباوەڕانە، و بەتایبەتی باوەڕی کۆمەڵایەتی، سیاسی، فێرکاری، و مەزهەبی ڕۆسۆ لەبەرهەمەکانیدا دیارە.

بەرهەمەکانی:

((گوتارێك لەمەڕ زانست و هونەرەکان- ١٧٥٠)):

ئەم نامەیە خەڵاتی ئەکادیمیای دیجون-ی وەکو باشترین وەڵامی ئەم پرسیارە کە: "ئایا زانست و هونەران لە چاککردنی ئەخلاق و داب و نەریتاندا کاریگەر بووە یان نا؟" وەرگرت، ڕۆسۆ وا دیارە لەسەر پێشنیازی دیدرۆ، دژی لایەنە ویرانکەر و پوچەڵ و درۆینەکانی مەدەنییەت وەستا، و توندترین جەزرەبەی لێدا، دوا نامە ستایشی ژیانی سادە و ئەخلاقیات و پاکی ڕۆمیانی کۆن دەکات.

((گوتارێك دەربارەی پرەنسیپی نایەکسانی لەنێوان بەشەردا — ١٧٥٥)):

پاشکۆ و درێژەی گوتاری دەربارەی زانست و هونەرەکانە. کە پێنج ساڵ زووتر نووسرابوو.

ڕۆسۆ لەم نامەیەدا مرۆڤی تەبیعی (وەکو سورپێستانی ئەمریکا) بە خودانی کەلتورێکی سەرەتایی بەڵام شادیبەخش وەسف دەکات. ئەوە دووپات دەکاتەوە کە نایەکسانی هەوەڵجار کاتێ هاتە ئاراوە کە تاقمێك لە تیرەی بەشەر کەوتنە سەر ئەوەی سەروەت و سامان و دەسەڵاتێکی پتر لە هاورەگەزانی خۆ بەدەست بێنن، و ئەم نایەکسانییە بووە مایەی گەندەڵی، جەور و زوڵم و کۆیلایەتی.

((جولی، یان هلویزی نوێ- ١٧٦١)):

چیرۆکێکە لە قاڵبی نامەدا، کە تا ئەندازەیەك لە ڕۆمانی کلاریسا هارلو-ی شاکاری ریچاردسن-ەوە و تاڕادەیەك لە سەربوری ئاشقینی نێوان ڕۆسۆ و خاتوو دودتو-وە هەڵێنجراوە. وەکو لە ناونیشانی بەرهەمەکەوە دەردەکەوێ، نەخشە و پلۆتی ڕۆمانەکە تاڕادەیەك دەشوبهێتە سەر سەربوری ئاشقانی بەنێوبانگی سەدەکانی ناڤین، واتە هلویز و ئابلار: جولی حەز لە سن

پرو-ی مامۆستای خۆی دەکات. ئەم رازە بە پەنهانی نامێنێتەوە، و جولی بە ناچاری شوو بە پیاوێکی دیکە دەکات. سن پرو-ش نائومێدانە رێگەی سەفەر دەگرێتە بەر... لە ئەنجامدا دەگەڕێتەوە، جولی لێدەبڕێ بچێتەوە بۆ لای ئەو، لێ مەرگ مەودای نادات.

ئەم رۆمانە تاڕادەیەکی زۆر بیۆگرافی خودی نووسەر و رۆمانێکی زاتییە، رۆسۆ لێرەدا باوەڕ بوونی خۆی بە باشی خۆڕسکی مرۆڤ و کەسایەتی و ئازادی تاك دووپات دەکاتەوە، و لە بابەتی خیلافکاری جولی و قەشە پرودا پتر کۆمەڵگە خەتابار دەکات تا خودی ئەوان (جولی و سن پرو).

((رێککەوتننامەی کۆمەڵایەتی- ١٧٦٢)):

رۆسۆ بیر و بۆچوونی "کۆنتراکتی کۆمەڵایەتی" لەم کتێبەدا شەرح کردووە و باوەڕی نەگۆڕی خۆی دەرهەق بە مافی بێ چەند و چوونی تاك و رژێمی دیموکراسی بە دوور و درێژی دەربڕیوە. پێی وایە کە رژێم یان حکومەت دەبێت بە رەزامەندی و بە دڵی ئەو کەسانە بێ کە حوکم دەکرێن، واتە بە دڵی جەماوەری گەل بێ. رۆسۆ باوەڕی وایە کە یاسا زادە و هەڵقوڵاوی ئەوەیە کە مەردم بۆ پاراستنی بەرامبەر، رێك کەوتوون کە چاوپۆشی لە ئازادی کاری فەردی بکەن، و هەموو تاکەکان لە بەردەم یاسادا یەکسانن. "رێککەوتننامەی کۆمەڵایەتی"یەکەی رۆسۆ لەڕاستیدا نامە و پەیامێکی فەلسەفەییە، و بە یەکێك لە بەرهەمە هەرە کاریگەرەکانی جیهان دەژمێردرێ.

((ئیمیل- ١٧٦٢)):

چیرۆکێکی فێرکارییە و بیر و بۆچوونەکانی رۆسۆی لەمەڕ پەروەردە و فێرکردن و ئایین لەخۆ گرتووە. ئەم بەرهەمەش مینا چیرۆکی هلویزی نوێ، تاڕادەیەك حاڵەتی ئوتوبیوگرافی لەخۆ گرتووە. ئیمیل بەشێوەی ((فەرزەندی تەبیعەت)) تەقریبەن بێ هیچ پابەندی و ناچارییەك پەروەردە دەبێ، حەزی دەچێتە وەرزشی بەدەنی، و لە هەرزەکاریدا حەزی دەچێتە خوێندنەوەی بەرهەمێن ((مێژوونووسانی روحی بەشەر))ی وەکو پلوتارك تا لە رێگەی خوێندنەوەی ئەوانەوە هەستەکانی بێدار ببنەوە. ئیمیل کە بالق دەبێ و خۆی دەناسێت لەگەڵ سوفیدا، کە لە بنچینەدا بۆ زەماوەند لەگەڵ ئەودا پەروەردە بووە، زەماوەند دەکات.

(رۆسۆن باوەڕی وایە کە دەبێ مناڵ خۆبەخۆ و دوور لە هەر مداخەلەیەکی کەسانی دیکە نەشونما بکات، مەبەست و ئامانجی فێرکردن بەمە دەزانێ کە توانا و بەهرە شاراوەکانی منداڵ لە نهێنی دانی خودی مناڵەوە بێنێتە دەرێ و بە پەروەردەکردنیان، مناڵ بۆ ژیان ئامادە

بکات).چیرۆکی ئیمیل وێڕای نەهاتنە دی پەروەردە و فێرکردنی ئیمیل، و سەرباری نامەسئولیەتی خودی رۆسۆ وەکو باوك و، بە کەڵك نەهاتنی وەکو مامۆستا، بە شێوەیەکی یەجگار سەیر بووە مایەی پەسندی خەڵکی و رێگەی بۆ دامەزراندنی زارۆکستانان و پرەنسیپەکانی پەروەردە و فێرکردنی سەدەی بیستەم خۆشکرد.

رۆسۆ لە بەشی چوارەمی ئەم کتێبەدا، باسی فێربوون و خوێندنی مەزهەبی ئیمیل و قەشە ساڤۆیار-ی مەسئولی فێرکردنی ئایینی وی دەکات. رۆسۆ، بە خۆی باوەڕی بە یەزدان هەیە، بەڵام ئەم باوەڕە لەسەر بناغەی هەست و غەریزەیە نەك ئەقڵ و ئاوەز. ئەو روحی خوا بە ئاشکرا لە سەرانسەری سروشت و تەبیعەتدا دەبینێ. ئەم بەشەی کتێبی ئیمیل کاری کردۆتە سەر نووسەرانی رۆمانتیکی سەدەی دواتر، بەتایبەتی شاتوبریان و وردزورس.

((دان پێدانان)):

لە ساڵانی ١٧٦٥- ١٧٧٠دا نووسراوە و لە ساڵانی ١٧٨١- ١٧٨٨دا بڵاوبووەتەوە.

ژیاننامەی راستەوخۆ و بەڵام نە زۆر وردی رۆسۆیە بە پێنووسی خۆی، رۆسۆ لەم کتێبەدا دەکەوێتە باس و وردکردنەوە و شیکردنەوەی نەشونما و پەرەسەندنی روحی خۆی تا تەمەنی پەنجا و سێ ساڵی، و خزین و گوناح و تاوانەکانی خۆی بەوپەڕی راستگۆیی دەگێڕێتەوە.

"دان پێدانان" داهێنەری شێوازێکی تازەیە کە بریتییە لە دەربڕین و نیشاندانی سۆز و هەست و هەموو خەسڵەتە خودییەکان. ئەم بەرهەمە بە شاکاری رۆسۆ دەژمێردرێ و لە ریزی گەورەترین ئەو ئیعترافنامانەیە کە تا نهو نووسراوە.

هەڵسەنگاندن: نرخاندن

بایەخی کاری رۆسۆ لەوەدا نییە کە نووسەرێکی داهێنەرە، بەڵکو لە مەیدانی رەوجدان و برەو پێدانی هزرو بیراندا دەردەکەوێ.

زەمانە بۆ قەبوولکردنی پەیامی رۆسۆ لەبار بوو، کە بەوپەڕی لێهاتوویی و رەوانییەوە ئەو پەیامەی بە جەماوەری خەڵك سپارد، جۆش و خرۆشی سۆزداری رۆسۆ هێندە بەهێز بوو کە خزین و بیرە ئالوجیکییەکانی داپۆشی، بۆچوونانی کۆمەڵایەتی و رامیاری رۆسۆ بووە فاکتەری سەرەکی شۆڕشی فەرەنسا، ئەم بۆچوونانە هاوڕێ لەگەڵ تاکگەرایی، هەستپەروەری، و سروشتدۆسی ئەودا، وەکو دامەزرێنەری بزووتنەوەی رۆمانتیك ناساندیان. ئەمرۆکە، وێڕای ئەوەی کە ماوەی دوو سەدە بەسەر بڵاوبوونەوەی یەکەمین نامەی رۆسۆدا رەت دەبێ، هێشتاش هزر و بیرەکانی کاریگەری قووڵیان بەسەر هزرینی خەڵکییەوە هەیە.

# ژێدەران:

١- خواپەرستی- Deism:

ئەم زاراوەیە وەکو ناوێکی تایبەتی بە دەستەیەك لە نووسەران و هزرڤانانی سەدەکانی هەڤدە و هەژدەی فەرەنسا و ئینگلیز دەگوترا کە دەیانویست ئایینێکی تەبیعی لە هەنبەر هەموو ئایینە فەرمییەکان بێننە ئاراوە کە لەسەر بناغەی ئەقڵ و ئازادی لێکۆڵینەوە و دوور لە میتافیزیقا بێ.

٢- جەنگی جێنشینی ئەسپانیا (١٧٠١- ١٧١٤):

دوا جەنگی گشتی ئەورووپایە- لە نێوان بەریتانیا و نەمسا و هۆڵەندا و پورتوغال لەلایەك، و فەرەنسا و ئەسپانیا و باڤاریا لە لایەکی دی -کە پاش مردنی کارلوسی دووەم-ی دوا پاشای ئەسپانیا لە خانەدانی هاپسبورگ، لەسەر جێنشینی ئیمپراتۆری ئەسپانیا قەوما.

٣- جەنگی جێنشینی نەمسا (١٧٤٠- ١٧٤٨):

ناوی جەنگی نێوان نەمسا و پشتیوانەکانی، واتە ئینگلیستان و هۆڵەندا لەلایەك، و پروس و فەرەنسا و ئەسپانیا لەلایەکی دییە. ئەم جەنگە پاش مردنی شارلی شەشەم لەسەر جێنشینی ماری ترز-ی کیژی هەڵگیرسا.

٤- جەنگی حەوت ساڵە (١٧٥٦- ١٧٦٤):

جەنگی نێوان فەرەنسا و نەمسا و روسیا و ساکس و سوید و ئەسپانیا لەلایەك و، پروس و بریتانیا و هانوڤر لەلایەکی دییە.

هۆی سەرەکی ئەم شەرە هەڤرکییەکی کۆلۆنیستی فەرەنسا و ئینگلیز بوو لە ئەمریکا و هتد، و هۆیەکی دیکەشی کۆششی ماری ترزی مەلیکەی نەمسا بۆ داگیرکردنی ئەڵمانیا.

٥- باستیل: زینداننێکی دەوڵەتی بوو لە پاریس، ئەم زیندانە لە دەوروبەری ساڵی ١٣٦٩دا وەکو قەڵایەك دروستکرا، و لە ساڵی ١٧٨٩دا وێرانکرا و رووخێنرا.

٦- دیدرۆ (١٧١٣- ١٧٥٤):

نووسەری ئینسکلوپیدیای فەرەنسا و رەخنەگربوو.

٧- دانەرانی ئینسکلوپیدیا:

دانەرانی یەکەمین ئینسکلوپیدیای جیهان بوون بە زمانی فەرەنسی...

٨- هوگەنو: پروتستانی فەرەنسەوی.

٩- بولینگ بروك (١٦٧٨- ١٧٥١):

سیاسەتوانێکی ئینگلیز بوو.

١٠- داڤیدهیوم (١٧١١- ١٧٧٦):

فەیلەسووف و مێژوونووسێکی سکوتلاندی بوو.

١١- میتاسازیو (١٦٩٨- ١٧٨٢):

شاعیر و شانۆنامەنووسێکی ئیتاڵیایی بوو.

١٢- مەدام دو پومپادور (١٧٢١- ١٧٦٤):

ماشوقە و قەپاتمەی لویسی پانزەیەم بوو.

١٣- مەدام دو باری (١٧٤٣- ١٧٩٣):

قەپاتمە و ماشوقەی لویسی پازدەیەم بوو، و ناوی راستەقینەی جان بکو بوو.

١٤- دالامبر (١٧١٧؟- ١٧٨٣):

بیرکاریزانێکی فەرەنسی بوو.

١٥- سیرە- Cirey: شارێکە لە باکووری رۆژئاوای فەرەنسا.

١٦- مەدام دوشاتلە (١٧٠٦- ١٧٤٩):

نووسەرێکی فەرەنسی بوو.

١٧- فەردریکی گەورە (١٧١٢- ١٧٨٦):

١٨- پۆتسدام: شارێکە لە رۆژهەلاتی ئەڵمان و باشووری رۆژئاوای بەرلین.

١٩- شامبری: شارێکە لە رۆژهەلاتی فەرەنسا لە ساوڤا.

٢٠- مەدام دو واران (١٧٠٠- ١٧٦٢):

ئافرەتێکی رووخۆش و چاکەکار بوو کە پشتیوان و پەنای رۆسۆ بوو.

٢١- خاتوو دپینە (١٧٢٦- ١٧٨٣):

نووسەرێکی فەرەنسی و پشت و پەنای رۆسۆ بوو.

# ئەدەبیاتی فەڕەنسا
# لە
# سەردەمی رۆمانتیکدا
((١٨٠٠-١٨٤٢))

سەرەتایەکی مێژوویی:

زۆر رووداوی خرۆشنەنگێز لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا قەوما کە کارێکی فرەی بەسەر ئەدەبیات و هزری میللی و ناسیونالیستییەوە هەبوو، ناپلیۆن بوناپارت لە ساڵی ١٧٩٩دا پۆستی کونسوڵی وەرگرت و لە ساڵی ١٨٠٤دا بوو بە ئیمپراتۆر، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم ئەوە روون بووەوە کە نەك هەر کەیفی بەو شۆڕشە نایەت کە رۆژگارێك ئامانج و مەبەستی رزگاری بوو لە زوڵم و ستەمکاری، بەڵکو لە بیری جیهانگیری سەرکەوتنە لە جەنگ و شەڕێن نارەواشدا، ئەستێرەی بەختی ناپلیۆن تاکو هێرشە ناکامەکەشی بۆ سەر روسیا (١٨١٢) هەر دیار بوو. ئەنجام ناپلیۆن لە شەڕی لایپزیگ"[١]" دا (١٨١٣) جارێکی دی خراپ شکا و بۆ دوورگەی ئەلب"[٢]" (١٨١٤) دوور خرایەوە، بەڵام لە مارسی ١٨١٥دا هەڵات. ئەنجام شکستی شەڕی واترلو"[٣]" (١٨١٥) چۆکی پێ دادا و جارێکی دیکە نەفی کرا، بەڵام ئەمجارەیان بۆ دوورگەی سانت هیلانە"[٤]" کە لە ساڵی ١٨٢١دا هەر لەوێندەر مرد.

پاش ناپلیۆن، جارێکی دیکە ماڵباتی بوربون"[٥]" هاتنەوە سەرکار و دەسەڵاتی پاشایەتی لویسی هەژدەیەم دەستی پێکرد، لە ساڵی ١٨١٥وە تا ساڵی ١٨٢٤ بەردەوام بوو. شارلی

دەیەم لە دوای لویسی هەژدەیەم هاتە سەر حوکم، پاشایەکی ملهوڕ و دیکتاتۆر بوو، حوکمڕانیی دیکتاتۆرییانەی ئەو شۆڕشی تەمموزی ساڵی ١٨٣٠ی هێنایە پێشێ. لە فەڕەنسادا ڕژێمی پەرلەمانیی پاشایەتی ڕاگەیەنرا، و لویس فیلیپ هاتە سەر حوکم. شۆڕشی ١٨٤٨ بنە و بارگەی ئەم دەسەڵاتەی پێچایەوە و دووەمین حکومەتی کۆماری لە فەڕەنسادا بەرپابوو. لویس ناپلیۆن-ی برازای ناپلیۆن-ی یەکەم بەسەر کۆمار هەڵبژێردرا و لە ساڵی ١٨٤٨ەوە تا ساڵی ١٨٥١ لەم پۆستەدا بوو. لەم کاتەدا لویس بە کودەتایەك هەموو دەسەڵاتەکانی گرتە دەستی خۆی، و جارێکی دی لە فەڕەنسادا حوکمی ئیمپراتۆری ڕاگەیاند و لە دیسامبەری ساڵی ١٨٥١دا بەناوی ناپلیۆنی سێیەمەوە تاجی پاشایی لەسەرنا.

پەشێوی باری سیاسی کاریگەرییەکی زۆری بەسەر بیر و هزرینی خەڵکی ئەو زەمانەوە هەبوو. ناکامی شۆڕشی فەڕەنسا لە دامەزراندن و پاراستنی حکوومەتی کۆماری، و شکستی ناپلیۆنی یەکەم، جۆرە بێدارییەکی هزریی لە نێو زۆربەی گرووپەکاندا دروست کرد. لە سەردەمی حکوومەتی بۆناپارتدا، ئازادیخوازان و لایەنگرانی ڕژێمی کۆماری لە هەموو ڕوویەکەوە لە ژێر گوشار و تەنگانەدا بوون، و لە پاش کەتنی ناپلیۆن-یش کۆنەپەرستان و هەوادارانی دەسەڵاتی پاشایەتی دەسەڵاتیان گرتەوە دەست. بە هەر حاڵ ئەوەی کە سەرنگونی شارلی دەیەم و لویس فیلیپ نیشانیدا، ئەوەیە کە ڕەوتی گشتی ماوەی ئەم نیوە سەدەیە بە ئاراستەی ئازادیخوازی دابوو.

لە مەزهەبیشدا، ئازادیخوازان و ڕۆشنبیران بەرانبەر بە موحافەزەکاران وەستانەوە. موحافەزەکاران دژی "خودا پەرستی" (دیانەتی تەبیعی- deism) و ئەقڵانییەت و ئاوەزگەرایی سەدی هەژدەیەم هەستان و ڕوویان کردە پرەنسیپەکانی مەزهەبی کاتولیك و عیرفان. لە واری زانستە سروشتییەکانیشدا هەنگاوی گەورەنران، و دار و دەستەیەکی زۆری دڵبەندی خۆی کرد، ئەمانە جەزم هزرینی ئایینی و سۆزگەراییان وەلاوە ناو، و لەبەر ڕۆشنایی ئەم گریمانەیەی کە کار و کاردانەوە و ڕەورەوەی پەرەسەندنی ژیان بە شێوەیەکی میکانیکی ڕوویداوە و پەیوەستە بە هەلومەرجییە فیزیکی و کیمیاییەکانەوە، ڕوویان کردە ماددەگەرایی، میکانیزم و تەنانەت کوفرو خوانەناسی. باوەڕ بوون ((بە چاکی سروشتی مرۆڤ)) پاش شۆڕش و لە سەردەمی بوناپارت-یشدا بە هەمان دەقی خۆیەوە مایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمانی ئاکگەراییدا، ئەم باوەڕە بە ڕێبازی مرۆڤدۆستی، گۆڕانی بەسەردا هات.

یەکێك لە گەورە هزرڤانانی ئەم قۆناغە ئۆگوست کۆنتە (١٧٩٨- ١٨٥٨) کە فەیلەسووف و کۆمەڵناسێکی بەناوبانگی فەڕەنسییە. کۆنت لە ڕێگەی ریفۆرمی کۆمەڵگە و ڕێبەری کردنی

مرۆڤ بەرەو کەماڵ، ڕێبازی مرۆڤدۆستی ئاوێتەی شێوە زانستییەکان کرد و زانستیی تازەی کۆمەڵناسی هێنایە ئاراوە. کونت لەو پێوادنگ و باوەڕەوە کە تەنیا زانستی بینرا و جەربێنرا و واقیعییە. لێرا پەرە بە زانست و ئایینێك بدات کە زادە و بەرەنجامی دیتن و سەرنجەکانی خۆی بن دەربارەی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری مرۆڤانی. هەر هەموو ئەو شتانەی، کە بە موتڵەق و یەقین تەسەور دەکران، توڕدا، و رایگەیاند کە تاقە ڕێگەی چاکبوون و چاککردنی هەلومەرجی ژیان لەسەر رووی زەوی، هەوڵ و کۆششی بەردەوامە بۆ بەکارهێنانی میتۆدی زانستی لەواری ئاوتوێ و خوێندنەوەی مەسەلە مرۆڤانییەکاندا.

هزرڤانی دیکەش لە پێناوی پێشکەوتنی کۆمەڵگەدا تێز و نەخشەی جۆراوجۆری رامیاری، ئابووری، و کۆمەڵایەتییان خستەڕوو. شارل فوریە (١٧٧٢- ١٨٣٧)، لەلایەنگرانی گەرم و گوڕی تیۆری و بۆچوونەکانی رۆسۆ بوو، پێشنیازی کرد کۆمەڵگە بەسەر وردە کۆمەڵگایانی کشتوکاڵی و فەلاحیدا دابەشبکرێ، و هیچ هەلومەرجێك لەبەردەم مەیل و ئارەزووی سروشتی و ویستی تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایانە دانەنرێ. هەندێ لە پێشنیازو بیرۆکەکانی فوریە لە کۆمەڵگەیەکی تەجریبیدا بە نێوی (مەزرای بروك"٦") لە ئەمریکا جێبەجێ کراوە، یەکێك لە تیۆریسینەکانی دی (پییر جوزیف پرودون ١٨٠٩- ١٨٦٥)ـە، کە ئەویش لە پەیڕەوانی رۆسۆیە. پرودون بە یەکێك لە لایەنگرانی هەڵوەشاندنەوەی مولکداری تایبەتی- و پاشان هەڵوەشاندنەوەی خودی دەوڵەت- دەژمێردرا. سێیەمین ریفورمخوازی کۆمەڵایەتی (لویس بلان- ١٨١١- ١٨٨٢)ـە، کە لە رابەرانی شۆڕشی ١٨٤٨ی فەرەنسایە، بۆ باشتر کردنی هەلومەرجی کار پێشنیازی دامەزراندنی کارگەێن میللی کرد.

جا لەم جۆرە ژینگە کۆمەڵایەتی، فەلسەفی و سیاسییەدا بوو کە ئەدیبانی فەرەنسی لە ماوەی نێوان سالانی ١٨٠٠- ١٨٤٢دا کەوتنە نووسین و داهێنانی بەرهەمەکانیان.

<u>نۆرینێکی گشتی:</u>

شۆڕشی فەرەنسا و جەنگەکانی ناپلیۆن، بزووتنەوەی رۆمانتیکی کە لە رۆسۆ و سن پی یەرەوە دەستی پێکردبوو، دووچاری وەستان کرد. ناپلیۆن ئازادی چاپەمەنی و پلاڤۆکانی سنووردارکردو بەتواناترین کەسانی راکێشایە ناو دام و دەزگا سیاسی و سوپاییەکانی خۆیەوە، ئەوە بوو ئەدەبیات لە نێوان سالانی ١٨٠٠- ١٨١٥دا گەشەیەکی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینی.. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە ژمارەیەك گوتار و بلاوکراوەی سیاسی هەبوون کە زۆر ئەستەمە بتوانرێ بە ئەدەبیات دابنرێن.

لەگەڵ رووخانی ناپلیۆندا، رۆمانتیزم گەشەی کرد، و لە ماوەی نێوان سالانی ١٨٢٨- ١٨٤٢دا گەییە چلەپۆپەی خۆی.

چەمکی رۆمانتیزم هێندە ئاڵۆز و لە هەمان کاتدا ئاشنا و باوە کە لەم باسۆکەیەدا جێی نابێتەوە. تەنیا ئەوەندە دەکرێت ئاماژەیەك بە خەسڵەتە هەرە گرینگەکانی بکرێت: یاخی بوون لە هەر هەموو داب و قاڵبە ئەدەبییە باوەکان، باوەڕ بوون بەمرۆڤایەتی، رەسەنایەتی مرۆڤ، و ئازادی شەخسی و تاك، تەبیعەت دۆستی، گەڕانەوە بۆ رابردووی دوورو هەر شتێکی نائاسایی و میتاسروشتی، ئازادی موتڵەقی هەست و خەیاڵان، خەمینی و رەشبینی، باوەڕ بوون بەوەی کە جیهان نیشتیمانی هەموو کەسێکە، خوددۆستی و خۆهەڵکێشان، نەوعیپەروەری، و هەڵاتن لە واقیع.

ژانرە سەرەکی و باوەکانی سەردەمی رۆمانتیك بریتی بوون لە: شیعری لیریکی، شانۆنامە، رۆمان، کورتە چیرۆك، مێژوو و رەخنەی ئەدەبی.

## رۆمان

جان جاك رۆسۆ پەیامبەری گەورەی بزووتنەوەی رۆمانتیکی فەرەنسایە. سێ سیمای بەرجەستەی دی کە دوا بە دوای رۆسۆ هاتن و بناغەی سەردەمی رۆمانتیکیان لە ئەدەبیاتدا دارشت بریتی بوون لە شاتو بریان-ی باوکی رۆمانتیزم و سن پیر و مەدام دوستال. بە گوتەیەکی دی رۆمانەکانی شاتۆبریان و مەدام دوستال بە یەکەمین بەرهەمێن راستەقینەی رۆمانتیکی ئەدەبیاتی فەرەنسی دەژمێردرێن. دەتوانرێ هەموو رۆمانەکانی نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیە بەسەر رۆمانانی زەینی، مێژوویی، رۆمانانی سەرکێشی و سوارچاکی، رۆمانانی رەفتار، و رۆمانانی واقیعیدا دابەش بکرێ، رۆسۆ، ریچاردسن، سترن، سکۆت، و گوتە زۆرترین کاریگەرییان بەسەر رۆمانتیزمی فەرەنسییەوە هەبووە.

## رۆمانێن هەستیاری:

مەدام دوستال (ناوی راستەقینەی: ئان ماری جەرمەن نکیرە، ١٧٦٦- ١٨١٧):

کیژی نکیر (١٧٣٢- ١٨١٧)ی پسپۆری کاروباری دارایی و سەرۆك وەزیرانی فەرەنسایە لە پاریس لە دایك بوو. قۆناغی منداڵییەتی زیاتر لە دیوەخانانەکەی دایکیدا بەسەر بردووە و لەوێندەر ئاشنای پیاوانی ناودار، و بیر و بۆچوونانی سیاسی و ئەدەبی بوو. ئان ماری زۆری بۆچوونەکانی رۆسۆی بە بابەتی زەوقی خۆی زانی و لە ئەنجامدا بووە بە لایەنگر و موریدێکی

نەگۆڕی ئەو. لە ساڵی ١٧٨٦دا شووی بە بارون دوستال هولشتاین کردو نازناوی مەدام دوستال-ی لێنرا. مەدام دوستال لە قۆناغی شۆڕشدا لە فەرەنساوە بۆ جنیف رەڤی (١٧٩٢، بەڵام لە ساڵی ١٧٩٧دا بۆ پاریس زڤرییەوە و بە خۆی تەلارێکی رۆشنبیریی (یانە) دامەزراند کە لە کۆڕە گرنگە سیاسی و هزرییەکان بوو، لە ساڵی ١٨٠٣دا جارێکی دیکە لە ئەنجامی بەربەرەکانی کردنی توندی ناپلیۆندا لە پاریس دوور خرایەوە و ماوەی دە ساڵانی لە ئەڵمانیا، سویسرا، نەمسا و ئیتاڵیادا بە گەشت و گەڕان بەسەر برد. دوستال لەژێر کاریگەری رۆمانتیکانی ئەڵمانیادا کتێبی (دەربارەی ئەڵمان- ١٨١٣)ی نووسی، کە بووە مایەی دوورخستنەوەی لە خاکی فەرەنسا. لە ساڵی ١٨١٥دا جارێکی دی بۆ پاریس گەڕایەوە و دوا دوو ساڵی تەمەنی بە چاك کردنەوە و پاکنووسکردنەوەی هەندێ لەبەرهەمەکانی بردە سەر.

رۆمانەکانی:

مەدام دوستال دوو رۆمانی هەستیاری (احساساتی) تەقریبەن بە شێوە ئوتوبیوگرافی نووسی:

*١- دلفین (١٨٠٢): کە لە فەلسەفە و فۆرمە نامە ئاساکەیدا قەرزارباری رۆسۆیە. قارەمانی چیرۆکەکە لە جوملەی ئەو ژنانەیە کە چ کەسێك لە روحیان تێناگات، و قوربانی داب و نەریتی زەمانەن. لەم رۆمانەدا هێرش دەکاتە سەر ئەو داب و نەریتە و، تونلرەوییانەی کە بوونەتە باعیسی پوکاندنەوە و لەناو بردنی ئەڤینی قارەمانی چیرۆکەکە.*

*٢- کۆرین یا ئیتاڵیا (١٨٠٧):*

*رۆمانێکی دیکەی هەستیاریی دوستالە، ئەمیشیان دەربارەی ژنێکە کە هیچ کەس دەرکی ناکات، قارەمانی رۆمانەکە، سەبارەت بە پەیانی دەزگیرانەکەی دەرهەق بە خۆی (قارەمانی رۆمانەکە) چاوپۆشی دەکات و قاییل دەبێ کە لەگەڵ زرخوشکەکەیدا زەماوەند بکات. کۆرینی دڵشکاو ئاقیبەت لە سۆییاندا دەمرێ.*

دوستال لەم رۆمانەدا چەند چمکێکی جوانییەکانی ئیتاڵیا وەسف دەکات و هەندێ لە خەسڵەت و تایبەتمەندییە میللییەکانی ئینگلیزان، ئیتاڵییان و فەرەنساوییان زیرەکانە دەخاتە بەر باس.

بەرهەمە رەخنەییەکانی:

بایەخی دوستال پتر پەیوەستە بە دوو نامەی رەخنەیی ئەوەوە. لە نامەی یەکەمدا (ئەدەبیات لە روانگەی پەیوەندی لەگەڵ دەزگا کۆمەڵایەتییەکاندا- ١٨٠٠) شێوازێکی نوێی رەخنەنووسی دەخرێتەڕوو: لە شیکردنەوە و راڤەی بەرهەمێکدا نابێ پەنا وەبەر کۆمەڵێك پێوەر

و مەحەکی بابەتی و موتڵەق بیرێ، بەڵکو دەبێ ژینگەی زەینی، کۆمەڵایەتی، رامیاری و فەلسەفی نووسەری بەرهەمەکە رەچاو بکرێ، بە کورتییەکەی، مەدام دوستال مونتسکیۆ-ی رەخنەی ئەدەبییە... رایدەگەیەنێ کە سیستەمی تازەی کۆمەڵایەتی و سیاسی کە زادەی شۆڕشە دەبێ جۆرە ئەدەبیاتێکی تازە بێنێتە ئاراوە... نامەی دووەم (دەربارەی ئەڵمان ١٨١٣) باسی داب و نەریت، خووخدە، ئەدەبیات، فەلسەفە، بنەما ئەخلاقییەکان، و ئایینی ئەڵمان دەکات. و بایەخێکی تایبەتی بەلسینگ، گوتە، شیلە، هردر، کانتو فیختە دەدات. دوستال گەلێك لە رۆمانتیکەکانی ئەڵمانی بە فەرەنسییەکان ناساند و کاریگەرییەکی دیاری بەسەر رۆمانتیزمی فەرەنسییەوە هەبوو.

فرانسوا رنەدو شاتۆبریان( ١٧٦٨- ١٨٤٨):

شاتۆبریان لە سان مالۆ، لە خێزانێکی ئەرستۆکراتی لە دایك بوو، لە ساڵی ١٧٩١دا سەردانی وڵاتە یەکگرتووەکانی کرد و، پاشان بۆ فەرەنسا گەڕایەوە. ساڵی دواتر پەیوەندی بە لەشکری ئیمیگرە"٧"وە کردو پاشان وڵاتی بەجێهێشت و بۆ ئینگلیستان رۆیی، ماوەی حەوت ساڵان لەوێندەر مایەوە و لە رێگەی مامۆستایەتی و وەرگێرییەوە ژیان و بژێوی خۆی دابینکرد، شاتوبریان لە ساڵی ١٧٩٨دا بوو بە کاتولیك. لە ساڵانی ١٨٠٦و ١٨٠٧ی لە میسر و رۆژهەڵاتی نزیکدا کەوتە گەشت و گەڕان. لە ساڵی ١٨١١ دا بە ئەندامی ئەکادیمیای (کۆڕی زانیاری) فەرەنسا، پاش گەڕانەوەی بۆربۆنەکان بۆ سەر حوکم، بوو بە پێشەنگ و رابەری باڵی شاهنشاخوازان و چەند ساڵێك (١٨١٥- ١٨٣٠) خەریکی چالاکی سیاسی بوو، لە ساڵی ١٨٣٠دا لە سیاسەت دوور کەوتەوەو نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی.

بەرهەمەکانی:

دەڵێن نێوەڕۆکی هەموو بەرهەمەکانی شاتوبریان لە سێ بابەت زیاتر نییە: "سروشت، مەسیحییەت، و خۆی"، لەڕاستیدا ئەم سێ بابەتە تەقریبەن لە هەر بابەتێکی سەرەکی ویدا هەست پێ دەکرێن.

دەربارەی سروشت:

شاتۆبریان میناگەلێك لە رۆمانتیکەکانی دیکە، لە دیمەنە سروشتییەکاندا بۆ ئاسودەیی دەگەڕا، لایەنە شکۆدار و دووورە دەستەکانی سروشت کاریان تێدەکرد، و خەمەکانی خۆی لەوێدا دەدۆزییەوە. ستایشکاری جوانیی سروشت بوو، وەسفەکانی گەرم و گوڕ و دڵگیر و ئاوێتە بە هەستێن راز ئامێزن، شاتوبریان مینا رۆسۆ، سورپێستانی بە فەرزەندان و رۆڵەی پاك

و بێگەردی سروشت دەزانی، و لە سێ چیرۆکی خۆیدا، کە لە ئەمریکادا روو دەدەن، سورپێستانی وەکو مرۆڤانی ئایدیالی وێنەگرتووە.

(ئاتالا – ١٨٠١):

کورتە رۆمان (یا چیرۆکێکی درێژە)، و لەڕاستیدا بەشێکە لە کتێبی (بلیمەتی مەسیحییەت)ی شاتۆبریان کە زووتر بڵاوبووەتەوە. کاگتاس، کە لاوێکی سورپێستە دڵبەندی ئەڤینی ئاتالای مەسیحی دەبێ، کە گیانی رزگار کردووە، جا بۆ ئەوەی رەزامەندی ئاتالا بەدەست بێنێ و شووی پێ بکات، دەبێ بە مەسیحی. لێ ئاتالا سۆزی بە دایکی خۆی، کە لەسەرە مەرگدایە داوە، بچێتە ریزی رەبەنانەوە. چیرۆکەکە بە خۆکوژی ئاتالا کۆتایی دێت. لەم کتێبەدا چیرۆکەکە لە زمانی کاکتاسەوە بۆ رنە کە فەرەنسییەکی دوورخراوەیە، دەگێڕدرێتەوە. شێوازی رۆمانەکە بە تەن تەنەیە و تۆنەکەی.

"رنە- ١٨٠٢":

درێژەی رۆمانی ئاتالایە، کە هەوەڵجار وەکو بەشێك لە کتێبی بلیمەتی مەسیحییەت، و پاشان لە ساڵی ١٨٠٥دا بە جیا بڵاوبووەوە. قارەمانی چیرۆکەکە شاتۆبریانێکی دیکەیە، فەرەنساوییەکی گەنجی رۆژەڕەشە کە بەختەوەری نە لە مەدەنییەت و شارستانییەتی ئەورووپاییدا دەدۆزێتەوە و نە لە وڵاتی ئەو دیوی دەریایان.

لەم چیرۆکەدا رنە بەسەرهاتی ژیانی خۆی بۆ کاکتاس-ی سورپێست کە ئێستا تەواو پیر بووە، خاڵ بە خاڵ دەگێڕێتەوە. چیرۆکەکە بە خەمەکانی رنە دەست پێدەکات، پاشان ئەشق و خۆشەویستی ئەو بۆ خوشکە داماوەکەی نیشاندەدرێ کە ئاقیبەت رەبەنایەتی دەکات بە پیشە، و ئەوجا باسی گەڕانە بێهودەکان لە وەڵامی پرسیارە فەلسەفییەکانی دروستبوون دەکرێ، و ئەنجام چیرۆکەکە بە شەرحی سەفەر کردنی بۆ بیابانەکانی ئەمریکا کۆتایی دێت.

نەخۆشی رنە لەڕاستیدا نائومێدی هەمیشەیی ئەوە کە لەگەڵ هیوا و ئارەزووە بێ کۆتاییەکانیدا تێك ناکاتەوە. نەخۆشی روحێکی ماندووە کە نازانێ چی گەرەکە. ئەم نەخۆشییە کە بە نەخۆشی قەرن ناو دەنرێ تەنیا خەسڵەتی شاتۆبریان نییە، بەڵکو خەسڵەتی گەلێك لە شاعیرانی رۆمانتیك و پەخشاننووسانی فەرەنسا، ئینگلیستان و ئەڵمانیشە.

((نچز- ١٨٢٦)):

شاتۆبریان بە خۆی ئەم چیرۆکە درێژەی ناو ناوە "داستانی سروشت"، کە لەم چیرۆکەدا پاشماوەی چارەنووسی رنە دەگێڕدرێتەوە. قارەمانی بەدخووی چیرۆکەکە لەگەڵ کیژێکی

سورپێستدا زەماوەند دەکات، لێ کیژەکە دڵنیایە کە ئەم پیاوە خیانەت لە قەبیلەکەی وی دەکات. ئەم چیرۆکە بە رووداوی قەتڵ و عامی ساڵی ١٧٢٧ی نچز تەنراوە، هەردوو زنجیرەی رووداوەکانی چیرۆکەکە بە کوشتن و خۆکوژی دەبڕێنەوە. نووسەر زۆر قەراردادی داستانی نەگونجاوی وەکو پەنابردنە بەر وێرد و روح و دەخاڵەتی خودایانی سورپێستان لە جەنگەکاندا بەکار هێناوە.

دەربارەی مەسیحییەت:

مەسیحییەتی شاتۆبریان پتر لەسەر بنەمای ئەستاتیکییە تا پیرۆزکاری و خواناسی. ئەو دڵبەندییەکی ئەوتۆی باوەڕ و ئیمان نەبوو، بەڵام داخی بۆ بێ سەروبەری "خوداپەرستی" (دئیزم= دیانەتی سروشتی) دەخوارد و پڕ بە دڵ حەزی دەکرد شایینی مەسیح بەگشتی و مەزهەبی کاتولیك بەتایبەتی بۆ ئەو پایە بەرزە ئەدەبی و هونەرییە بگێڕێتەوە کە بەر لە رێنیسانس هەیبوو، چونکە لە رێنیسانس بەدواوە جێی بۆ ئەفسانانی موشریکان چۆڵ کردبوو.

((بلیمەتی مەسیحییەت- ١٨٠٢)):

ئەم بەرهەمە نەك هەر بووە مایەی ستایشی هەمووان بەڵکو رەزامەنی ناپلیۆن-یشی لەگەڵا بوو. شاتۆبریان لەم کتێبەدا پشتی بەم پرەنسیپ و بنەمایە بەستووە کە مەسیحییەت بایەخی سۆزداری، فانتازی و هونەریی بەرزی هەیە، و ئەم مەزهەبە سەرچاوەی سەرەکی هەموو پێشکەوتنەکانی دنیای تازەیە، و لەم بارەیەوە بەیتە گەورەکانی جیهانی مەسیحییەت-ی وەکو کۆمیدیای خوایی دانتی، بەهەشتی گومبووی میلتن و هەروەها شێوازی تەلارکاری شکۆداری گوتێك "٨"-ی سەدەکانی ناڤین بە نموونە و بەڵگە دێنێتەوە.

((شەهیدان- ١٨٠٩)):

داستانێکی پەخشانییە دەربارەی زەجر و عەزابی مەسیحییانی سەدەی سێیەم بە دەستی دیوکلتین. ئەم داستانە وەکو ئاتالا و رنە پڕە لە شەقڵی خۆماڵی و ناوچەیی و وەسفی پرشنگداری دیمەنەکانی سروشت، وەکو "نچز" قەراردادە پێکەنیناوییە داستانییەکان ئاسیوی پێ گەیاندووە، بە هەر حاڵ هەندێ وێنەی بەهاداری دنیای کۆن ئەم داستانە پتر دەڕازێنێتەوە.

دەربارەی خۆی:

وادیارە شاتۆبریان لە هەر بابەتێك زیاتر شەیدای خۆی بووە، ئەویش وەکو بایرون لەزەتی لە رەشبینی زادەی ئەم خۆپەسندییە وەردەگرت، و حەزیدەکرد ئەمە بۆ هەموو کەسێك ئاشکرا بکات، رنە تا ئەندازەیەکی زۆر وێنەیەکی خودی خۆیەتی، "بیرەوەرییانی دوای

مردن، ١٨١١- ١٨٤١" کە لە سـالانی ١٨٤٨- ١٨٥٠دا چـاپ و بلاوبـووەوە، دەقـاودەق دەربـارەی شـاتۆبریان خۆیـەتی، چـاکی و خراپـەکانی، توانـای ئـەو، خۆپەرسـتی ئـەو و منداڵبازاڕی خودی ئەوە. ئەم بیرەوەرییانە باسێکی تەقریبەن تەواوی ژیانی ئەو دەگێڕێتەوە، بەلام خۆی لە گـوتنی راسـتییەکان، واتـە خـۆی لـەووتنی هـەموو راسـتییەکان دەبـوێرێ، شاتۆبریان بەپێچەوانەی رۆسۆوە، خۆی لە قەرەی وتنی ئەو شتانە نادات کە مایەی ریسوایی ئەون، لە راستیدا وێنەیەکی وەها دەربارەی خۆ نیشاندەدات کـە مایـەی پەسـندی دنیایـە، وێڕای ئەمەش "بیرەوەرییانی دوای مردن" کە بە شاکارێك دەژمێردرێ، بەڵگەنامەیەکی پـڕ بەهایە لەمەڕ بزووتنەوەی رۆمانتیکی فەڕەنسی.

هەڵسەنگاندن:

شـاتۆبریان هـەر چـەندە نووسـەرێکی خۆپەرسـت، و خۆهـەڵکێش و رواڵـەتبازە، بـەلام نووسینەکانی پڕن لە شتی ناسك و جوان و جادووئامێزن، چ قـسەیەك لەسـەر ئـەوە نییـە کـە باوەڕی مەزهەبی ئەو قوڵی پێویستی ئیمانداری نییە و وەسفەکانی لەمەڕ تەبیعەت هەندێ جار لە سنووری وشەبازی پرشنگداردا دەوەستێ، بەلام لە باری ئیمانی واقیعی مەزهەبی و ئەشـقی راستەقینەی بەرانبەر بە دیمەنانی سروشت نموونە و سەرمەشقی نووسەرانی ترە.

لەڕاستیدا دەبێ دان بەوەدابنرێ کە هێزی خەیاڵ و فەنتازی فەڕەنسی سەرچـاوەی خـۆی لـە دەست دابوو، و شاتۆبریان جارێکی دیکـە دۆزییـەوە و رێـی ئـەو سەرچـاوەیەی بـە هـەموان نیشاندایەوە... بەم جۆرە بزووتنەوەی رۆمانتیکی فەڕەنسی لەڕووی ئەم جـۆرە تازەگەرییانـەوە رێبەری کردووە: گەڕانەوە بـۆ کـەلتووری سـەدەکانی نـاڤین، زینـدوو کردنـەوەی ئەسـتاتیکای مەسیحی، وەسفی پڕجۆش و موبالەغەئامێزی سروشت و تەبیعەتی دەڤەرە دوورە دەستەکاندا و زاڵ کردنی ئیگۆ "من"ی ماخۆلانی. شێوازی شاتۆبریان بەرجەسـتە، خـەیالاوی و هاوسـەنگە، بەو رادەیەی کە بە دامەزرێنەری راستەقینەی پەخشانی نوێی فەڕەنسیی دەژمێرن، دوا گوتەش ئەمەیە کە هەر چەند بیر و ئەندێشەکانی شاتۆبریان نائاسایی نین، بـەلام توانـای دیـتن، بـەرزە خەیاڵی، و جۆش و خرۆشی ئەو لە بەرزترین پلەدایە.

جۆرج ساند (١٨٠٤- ١٨٧٦):

(ناوی راستەقینەی: ئاماندین ئورۆرلوسی دوپن-ە، بە بارون دو دوڤان ناسراوە).

بەرجەستەکاری گیانی رۆسۆیە، لە پاریس چاوی بە ژیان هـەڵهێناوە، قۆنـاغی منداڵیـەتی زیاتر لە نوهان-ی دەڤەری بری بەسەر بردووە. لە ساڵی ١٨١٧وە تـا سـاڵی ١٨٢٠ لـە دێـری

ژنانی تەرکە دنیا لەپاریس خوێندوویەتی، و ژیانی ناو ئەو ئافرەتە رەبەنانە کردییە کارێك کە مەزهەبییەکی گەرم و گوڕی لێ دەربچێت. ساند لە ساڵی ١٨٢٠دا بۆ نوهان گەڕایەوە و زۆر زوو سارد بووەوە. دوای دوو ساڵان شووی بە کابرایەکی ئەرستۆکراتی رەق بەڵام نیازپاك بە نێوی بارون دوو دوڤان کرد، بەڵام دوای هەشت ساڵ بە دوو منداڵەوە لێی جیابووەوە. ساند جاریکی دیکە بۆ پاریس چوو، و لەوێندەر هاونشینی هەندێ لە فەیلەسووفان، نووسەران، و موسیقازانانی بەناوبانگی سەردەمی خۆی کرد، وەکو ئالفردوموسیە، فردریك چۆپان، و فرانتس فون لست"٩" . لە چەندین بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی و دامەزراندنی کۆمەڵەێن ئایدیالیستیدا بەشداری کرد-بزووتنەوەی ئازادی ژنان، لایەنگری لە کۆماریخوازی، و کۆمەڵێن کۆمۆنەی شوبات، ساند لە ساڵی ١٨٦٠دا لە نوهاندا کونجی قەناعەتی گرت و دوا ساڵەکانی تەمەنی بۆ نووسین تەرخان کرد.

بەرهەمەکانی:

ساند سەرباری سەد دانە رۆمان، ژمارەیەکی زۆر نامەشی نووسیوە کە لە شەش بەرگاندا کۆکراونەتەوە. رۆمانەکانی بە گوێرەی بابەت و بەرواری نووسینیان دەکرێن بە چوار بەشەوە.

رۆمانێن ئاشقانە (١٨٣١- ١٨٣٧):

ئەم رۆمانانە بۆچوونەکانی رۆسۆ دەربارەی جوانییەکان و سوودمەندی ڤیانی رۆمانتیکی روون دەکەنەوە. ساند لە وێنەگرتنی کەسایەتی ژندا چاو لە مەدام دوستال دەکات و بە جۆش و خرۆش و هاودەردییەوە دەربارەی ژنانێك دەنووسێت کە روحیان دەرك ناکرێت و دەبنە قوربانیانی داب و نەریت و قەراردادەکانی رۆژگار و زەمانە.. دژی زەوجینی نەبەدڵ، ستەمی پیاوان، ئاراستە و جڵە و کردنی ژنان هاوار دەکات و دەکەوێتە بەرەڤانی لە ماف و کەسایەتی و ئازادی و یەکسانیان لەگەڵ پیاواندا. بۆ نموونە لە رۆمانی (جاك- ١٨٣٤)دا مێردێکی جوامێر و دووربین خۆی دەکوژێت تا هاوسەرەکەی بتوانێت بە خەیاڵی ئاسوودەوە بە ویساڵی ئاشقەکەی بگات.

ئەمەش ناوی هەندێ لە رۆمانەکانی دیکەی ساندە:

(موپرا) کە دەکرێ ناوی رامکردنی پیاوی سەرکێشی لێ بنرێ، (ئیندیانا- ١٨٣١)، (ڤالنتین- ١٨٣٢)، و (لولیا- ١٨٣٣).

رۆمانێن سیاسی و کۆمەڵایەتی (١٨٣٩- ١٨٤٩):

ئەم تاقمە رۆمانە نیشاندەری دڵبەندی ساندە بەو بزووتنەوە جۆراوجۆرانەی کە لە هەردوو دەیەی ١٨٣٠- ١٨٤٠دا لە پێناوی ریفۆرمی کۆمەڵگە و مشتومالدانی ئەخلاقی بەشەریەتدا

هەنگاویان دەنا، لە (ئاشەوانی ئانژیبو- ١٨٤٥)دا قارەمانی هەژاری رۆمانەکە داوا لە ماشوقە دەوڵەمەندەکەی خۆی دەکات کە خۆی لە شەڕی سەروەت و سامان رزگار بکات و شوو بەم بکات، تا بتوانن ئاینی نوێی برایەتی هەڵبژێرن. لە رۆمانی (گوناهی ئاغای ئانتوان- ١٨٤٧)دا، ساند دەکەوێتە پشتیوانی کردن لە سیستەمی کۆمونی شوبات و بەرگری لە بۆچوونەکانی کۆمۆنەی شوبات دەکات کە داوای دامەزراندنی کۆمەڵەێن بچووکی هاوبەشی دەکات. دوو رۆمانی دیکەی ئەم دەستە رۆمانەی (سپیر یدیون- ١٨٣٩)و (کنسوئیلو- ١٨٤٢) یان ناوە.

رۆمانێن دێهاتیانە (١٨٤٤- ١٨٥٨):

رەنگە ئەم دەستە رۆمانەی ساند لە هەر هەموو بەرهەمەکانی دیکەی زیندووتر بن، چونکە لە نووسینیاندا هیچ پێشنیازێکی نییە. کۆمەڵێك وێنەی زۆر جوان و دلگیری (هەر چەند هەندێ جار برێك ئایدیالیستین) گوندییان و دیمەنانی دێهاتی فەرەنسا، بەتایبەتی دەڤەری بری دەگرێت. ساند دەروونناسێکی باڵا دەستە، و هەستی راستەقینە و ناسك دەرهەق بە گوند و خەلکی گوندنشین لە رۆمانەکانیدا شەپۆل دەدات. باشترین رۆمانانی ئەم بوارەی بریتین لە: "کانی شەیتان- ١٨٤٦)، (فادیتە چکۆل- ١٨٤٩)و (وەستای زەنگ لێدەر- ١٨٥٢).

رۆمانانی رەفتار (١٨٥٨- ١٨٧٦):

رۆمانەکانی دواساڵەکانی چالاکیی ئەدەبی ساند دەشوبهێنە سەر رۆمانەکانی سەرەتای دەستپێکردنی، بەڵام ئەم رۆمانانە هەمان تین و تاو و گەرم و گوڕی و لایەنی بانگەشەیی و پرۆپاگەندەیی رۆمانەکانی سەرەتایان نییە، زۆربەیان چیرۆکانی ئاشقانانەی هەست و سۆز ئامێزن، ساند لەم رۆمانانەشدا وەکو دەروونناسێکی باڵادەست و کانگای روحی کاراکتەرەکانی دەپشکنێ. باشترین رۆمانی ئەم بواری بریتین لە: (جان دولا روش- ١٨٦٠)و (مارکی دوفیلمەر- ١٨٦١).

هەڵسەنگاندن:

خوێنەرانی ئەمرۆ کەمتر دەچنە سۆراخی رۆمانەکانی ساند. ئەم رۆمانانە لە رادەبەردە ناوچەیین. لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچەندە جۆرج ساند قوتابخانەیەکی دانەهێنا، لەسەردەمی خۆیدا کاریگەرییەکی یەجگار فرەی هەبوو. لەواری بڵاوکردنەوەی دادی کۆمەڵایەتی و یەکسانی ژناندا کاری زۆری کردووە، رۆمانەکانی کاریگەری قوڵیان لە سەر هزر و هزرینی روسەکانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم هەبوو. ساند، هەر چەندە زۆربەی بیرەکانی خۆی لە خەڵکانی

ترەوە وەرگرتووە، بەڵام شێوازە رەوان و سوار و جوانەکەی هی خودی خۆیەتی. راستە کە ساند هەندێ جار لەرادەبەدەر هەستیار و ئایدیالیستە، و بە جۆرێك لە کەچرەوی ئەخلاقی، وەکو ئاشقێنی و نێربازی بێ قەیدو مەرج تۆمەتبار کراوە، بەڵام لە باری نووسەرییەوە دڵسۆزە و نووسینەکانی پڕن لە هاوسۆزی و هاودەردی.

ساند ئەوەی رەخنەگرانی فەرەنسی لە رۆمانێکی دەخوازن، واتە سنووری جیاکەرەوەی نێوان دیتنی جدی و ورد، و خەیاڵ و خەیاڵپەروەری رووت نیشان دەدات.

## رۆمانی میژوویی

یەکێك لە کۆڵەکە بنەڕەتییەکانی رۆمانتیزم لە هەڵاتنە لە ژینگە و زەمانی هەبوو، و یەکێك لە بەهەشتە مەوعودەکانی ئەم هەڵاتووانەش رابردووی دوورە. جا بە پێی ئەم پرەنسیپە رۆمانی میژوویی بەسەرهاتی قارەمانانی رۆژگارانی رابردوو دەگێڕێتەوە کە ئەمە لەبەر چاوی خەیاڵ و خەیاڵپەروەری فەرەنسیی سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا یەجگار جوان و لەبەر دڵان بوو. رۆمانەکانی سێر والتر سکۆت-ی بابی چیرۆکانی میژوویی و رۆمانتیکی سەدەی نۆزدەیەم، تەرجەمەی زمانی فەرەنسی کران و بوون بە نموونە و سەرمەشقی رۆمانانی میژوویی. رۆمانی (شەهیدان)ی شاتۆبریان-یش دەورێکی زۆری لە دروستبوونی رۆمانی میژووییدا هەبوو. رەنگە یەکەمین رۆمانی میژوویی تەواو، (پێنجەمی مارس- ١٨٢٦)ی ئالفرید دوو ڤینیی بێ. لە نووسەرانی ناوداری ئەم جۆرە رۆمانانەدا دەبێ ناوی مریمە، هۆگۆ و ئالکساندەر دۆمای باوك ببرێ.

## هۆزان

دوای رەخنە توندەکانی مالرب (لە سنعەتکاری، موبالەغەبێژی و پەیڕەوکردنی یەك شێوازی تایبەتی لە هونەر یان ئەدەبیاتدا) گیان و سەلیقەی لیریکابێژی لە فەرەنسادا مردبوو. هەوڵی رۆمانتیکەکان بۆ بوژانەوە و زیندووکردنەوەی سۆزپەروەری و دەروونگەرایی دووبارە گیانی وەبەر خستەوە. (هزرینی شاعیرانە- ١٨٢٠)ی لامارتین بوو بە یەکەمین کۆمەڵە هۆزانی لیریکی کە لە رۆژگاری شنیە بە دواوە گوتراوە.

<u>ئالفونس لویس- ماری دولامارتین ١٧٩٠- ١٨٦٩):</u>

لامارتین لە ماکۆن کە شارێکی بۆرگوندییە، لە خێزانێکی ئەرستۆکراتی کۆن لە دایك بووە. پاش قۆناغی منداڵیەتی کە لە ناز و نیعمەتدا بەسەری برد، بۆ خوێندن چوو بۆ فێرگەی

یەسوعیان لە بلی. ئەوجا ماوەی چوار ساڵان بێکار کەوتە موتاڵا و خوێندنەوە. ئەوسا بە سەفەرێکی کورت چوو بۆ ئیتاڵیا، پاش گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا ماوەیەك لە گاردی پاشایەتی لویسی هەژدەیەمدا خزمەتی کرد و پاشان بوو بە ئەندامی دەستەی نوێنەرایەتی سیاسی فەرەنسا لە ناپولی. لامارتین لە ساڵی ١٨١٦دا دڵبەندی ئەڤینی مەدام جولی شارل بوو، کە ساڵی دواتر مرد. ئەم ژنە ئیلهامبەخشی گەلێك لە شیعرەکانی بوو. لامارتین لە ساڵی ١٨٢٠دا بەیتی (هزرینی شاعیرانە)ی بڵاوکردەوە کە دەم و دەست بووە مایەی پەسندی جەماوەری خەڵك. لە ساڵی ١٨٢٩دا بوو بە ئەندامی ئەکادیمیا (کۆڕی زانیاری) فەرەنسا. پاش کەوتنی شارلی دەیەم کارە سیاسییەکەی خۆی تەرك کرد و لێبڕا کە ڕێگەی ئەنجوومەن بگرێتە بەر، هەوەڵجار سەرکەوتنی بەدەست نەهینا، بەڵام لە ساڵی ١٨٣٣دا بە ئەندامی پەرلەمان هەڵبژێردرا و تاساڵی ١٨٤٨دەورێکی سیاسی زۆری بینی.

لامارتین دژی حکوومەتی بۆرژوازی لویس فیلیپ بوو. پاش شۆڕشی شوباتی ساڵی ١٨٤٨ بۆ ماوەی سێ مانگ بوو بە سەرۆکی حکوومەتی کاتی، و لە کۆمیتەی جێبەجێ کردندا، کە لە جیاتی حکوومەت دامەزرا، ئەندام بوو، بە هۆی ڕێبازی میانڕەوانەیەوە، هەردوو باڵی ڕاست و چەپ-ی شۆڕشگێڕان خێرا لێی دوور کەوتنەوە.

بۆ گەیشتن بە سەرۆکایەتی کۆمار لەگەڵ لویس ناپلیۆن بۆناپارتدا کەوتە ڕکابەری، لێ سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا و بە یەکجاری سیاسەتی تەڵاقدا. لامارتین کە کەسێکی هەمیشە دەست بڵاو بوو، لە ئەنجامدا تووشی زۆر گێرمە و کێشەی دارایی بوو و لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا هەموو کاتی خۆی بە نووسینەوە -بۆ بڵاوکراوەکان و دابینکردنی بژێوی -بەسەر برد.

بەرهەمەکانی:

لامارتین لە ئەدەبیاتدا شیعرەکانی: بە کتێبی موقەدەس، ڕۆسۆ، سن پییر، شاتۆبریان، پترارك، تاسۆ، میلتن، نوسیان و یانگ کاریگەر بووە. لە نووسینەکانی خۆیدا باسی مەزهەب، سروشت و ژن دەکات، کەچی شاتۆبریان-ی هاوعەسری وی دەربارەی مەزهەب، سروشت و خۆی دەنووسێت، لامارتین لەلایەکەوە، وەکو شاتۆبریان، هەر سێ ئەم ناوەڕۆکانە لەیەك بەرهەمدا ناوێتە دەکات. مەزهەبی لامارتین لە چاو مەزهەبی شاتۆبریاندا ئاڵۆزتر و زەبت و ڕەبتی کەمترە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئایدیالیست تر و قووڵتریشە و هەندێ جار بەلای فرە خوداییدا دادەکێشێ. لامارتین لە وەسفەکانیدا هیچ کاتێ سوود لە هەموو ڕەنگەکان نابینێ، بەڵکو پتر حەزی لە ڕەنگی ڕەش، سپی و کەوەییە. لەلایەکەوە هەمیشە حەز دەکات شتانێك وەسف

بکات کە وەکو هەور، با، یان شەپۆل لە شەپۆلدان و بەرزەفڕیدا بن، بلیمەتی وی لەمەدایە کە دەست دەداتە هەر شتێکەوە لایەنە مەتریالسیتییەکەی لێ دەرەوێنێتەوە. زۆربەی شیعرە لیریکییەکانی لامارتین دەربڕی ئەڤینی ئاسمانی و پاك و بێ ڕتوشن، و زۆربەیان شەقلێکی وڕینەیی ماخۆلانییان پێوەیە.

تایبەتمەندییە هونەرییەکانی هۆزانێن لامارتین بریتییە لە ڕەوانی، هەمەجۆری پەیڤ، سواری و ئاسانی، خۆڕسکی، خۆش ریتمی دەربڕین، و درێژەدان بە ڕێچکەی ڕاسین، و شاعیرانی لاوانەوە لە سەدەی هەژدەیەمدا.

گرنگترین کۆمەڵە شیعری لامارتین ئەمانەن: (هزرینی شاعیرانە- ١٨٢٠)، (هزرینی نوێ- ١٨٢٣)، (هاوئاهەنگی شاعیرانە و مەزهەبی- ١٨٣٠)، (جوسلین- ١٨٣٦)، (کەوتنی فریشتەیەك- ١٨٣٨)و (بیرەوەری شاعیرانە- ١٨٣٩) باشترین غەزەلی لامارتین (دەریاچە)یە کە لەو شیعرەدا، شێتی، ئەشق و ستایشی تەبیعەت ئاوێتەی یەکدی دەکات، شیعرێکی دیکەی (عیسا لەسەر سێدارە)یە کە شاعیر لە وێدا خۆشەویستی خۆی بۆ جولی شارل لەگەڵ باوەڕە ئایینییەکانی خۆیدا گرێ دەدات، و (ئاوازی ئەڤین) کە دەربارەی هاوسەرەکەیەتی. (جوسلین) چیرۆکێکی شیعری درێژە کە خۆشەویستی و ئەشقی بێ گەرد و پاکی کەشیشێك دەرهەق بە کیژۆڵەیەك دەگێڕێتەوە، (کەوتنی فریشتەیەك) بەیتێکی داستانی درێژە ((١١ هەزار بەیتە)) کە ئەشقی فریشتەیەك دەرهەق بە ژنێکی ئاسایی لەتیرەی بەشەران، دەگێڕێتەوە. لە ئەنجامدا فریشتەکە دەبێ بە بوونەوەرێکی مرۆڤانی. ئەم بەیتە زۆر سەرکەوتوو نییە.

پەخشانەکانی:

لامارتین چەند بەرهەمێکی بە پەخشان نووسیوە لەوانە: (ڕۆفائیل- ١٨٤٩)، و (گرازیلا- ١٨٥٢) دوو ڕۆمانن تەقریبەن بەشێوەی ئۆتۆبیۆگرافی، ڕۆفائیل، ڕەنگدانەوەی ئەشق و خۆشەویستی شاعیرە بۆ مەدام شارل، و گرازیلا، پەردە لەڕووی پەیوەندی شاعیر بە کیژۆڵەیەکی جگەرە فرۆشەوە، هەڵدەداتەوە. (دەربڕینی نهێنییەکان- ١٨٤٩)و (دەبڕینی نهێنییە نوێیەکان- ١٨٥١) پڕ بە مانای وشە دوو ئوتوبیوگرافین. (مێژووی جیروندنییەکان- ١٨٤٧) ڕاپۆرتکی زیندووە، بەڵام ناموعتەبەرە، کە وێنەی چەمکێکی شۆڕشی فەرەنسا دەگرێت، ئەم کتێبە لە ڕوودانی شۆڕشی ساڵی ١٨٤٨دا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو.

هەڵسەنگاندن:

راوبۆچوونی رەخنەگرانەی جۆراوجۆر دەربارەی لامارتین هاتوونەتە دەربڕین. ژمارەیەك لە رەخنەگران لەسەر ، زۆر بلێیی، سستی، ئالۆزی و فیشاڵبازی سەرزەنشتیان کردووە، بەڵام زۆریش پڕسۆزی، تەبیعەت، بەزەیی، سادەیی، خۆش تۆنی و ریتمداری زمانەکەیان ستایش کردووە. ماتیو ئارنولد، لامارتینی بایەخدار نەدەزانی، بەڵام بەلای سانت بوف و فاگەوە بایەخێکی مێژوویی گرنگی هەبوو. لامارتین جارێکی دیکە باوی بە غەزەلخوانی لە فەرەنسا، و لەسەردەمی خۆیدا دایەوە، گوتیە دەربارەی لامارتین دەڵێت: "لامارتین هەر شاعیرێك نەبوو بەڵکو خودی شیعر بوو".

(ئالفرید ڤیکتۆر کونت دوڤینیی ١٧٩٧- ١٨٦٣):

ڤینیی لە لاش، لە تورن لە دایك بوو، ماوەی چواردە ساڵان بە پلەی ئەفسەری لە سوپادا خزمەتی کرد، لە ساڵی ١٨٢٧دا وازی هێنا و بە هەموو هێز و توانایەوە خۆی بۆ ئەدەبیات تەرخانکرد. یەکەمین کۆمەڵە شیعری لە ساڵی ١٨٢٢دا بڵاوبووەوە و لە ساڵی ١٨٢٦شدا لە ژێر سەرناوی (هۆزانێن کۆن و نوێ)دا بە چاپ گەیی. لە هەمان ساڵدا رۆمانی (پێنجەمی مارس)ی بڵاوبووەوە. پاش ئەوە چەند شیعرێکی دیکەی دانا، و دوو شانۆنامە و چەند چیرۆکێکی نووسی. لە ساڵی ١٨٢٨دا لەگەڵ ژنێکی ئینگلیزیدا بە نێوی (لیدیا بانبری) زەماوەندی کرد، کە هیچ کاتێك لەگەڵیا رێك نەبوو. ڤینیی دوای چەند ساڵێك دڵبەند و شەیدای خانمی هونەرمەند و ئەکتەر (ماری دورڤاڵ) بوو، بەڵام بێ وەفایی و بەرەڵڵایی خانمی نێوبراو ژیانی لە شاعیر تاڵ کرد. لە ساڵی ١٨٤٥دا بوو بە ئەندامی ئەکادیمیا. دووجاریش هەوڵیدا ببێ بە ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتیمانی، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. ڤینیی لە دەوروبەری ساڵی ١٨٤٨دا لە ماڵە هاوینەکەی خۆیدا لە ئانگولم[١٠] کونجی قەناعەتی گرت، و لە دوای نەخۆشییەکی دوور و درێژ هەر لەوێندەر مرد.

بیرەکان:

ڤینیی، بە پێچەوانەی زۆربەی شاعیرانی رۆمانتیکی فەرەنسییەوە، هزرڤانێکی بیرقوڵ و تازەگەرە.. ماك و رەگێکی رەشبینی، گۆشەگیری، و رەواقی تەبیعەتی تێدایە. بەخۆی دەڵێت ((بەخەمەوە لەدایك بووە))، و ناکامی و فەشەل لە سوپا، لە ئەڤین، و ولە سیاسەتیش ورەی پێ بەر نەداوە. ((ڤینیی ئایدیالیستێکی نائومید و رەشبینە کە دنیا بە ئاوێتەیەك لە چاکە و لەو خراپە دەزانێ، کە خراپە هەمیشە بەسەر چاکەدا زاڵە، و لەڕاستیدا لەم خراوترین جیهانە

مومکینەدا، هەموو شتێك روو لە خراپییە)) لەم جۆرە دنیایەدا هیچ کەسێك و هیچ شتێك چاکەخواز یان جێگەی متمانە نییە. کۆمەڵی مرۆڤ یا گەوجن یا ریاکارن. ((ژنان هەمیشە جۆرە دەلیله "١١" یەکن))، سروشت نەك دایك، بەڵکو گۆڕی مرۆڤە، و تەنانەت خواش یا خراپەخوازە یا نابینا، کەڕولاڵە. شاعیر، کە کەسێکی بلیمەتە مەحکوم بە تەنیایی و خەمە. بە هەر حاڵ ڤینیی بە هیچ جۆرێك شاعیرێکی بەگلەیی و زاری نییە، پێی وایە کە "دەبێ رەنج بدەی و بمریت و هیچ نەڵێیت"، و ئەم تەسلیم بوون و رازی بوونە زادەی غروور و هوشیاری ئەوە، چونکە چاکدەزانێ کە بەرەڤانی و مقاوەمەت بێ سوودە، تەنیا تروسکە ئومێدێك لە پشت هەوری رەشبینیی ئەوەوە بەدی دەکرێ: خودایەکی واقیعی هەیە، کە خوای قەڵەمڕەوی ئەندێشە ئەبەدییەکانە، و لەوێدا روحە گەورەکان گەنجینانی لەبن نەهاتوو بەدەست دێنن.

بەرهەمەکانی:

هۆزان:

ڤینیی جۆش و خرۆشی رومانتیکێکی تەواو عەیاری نییە.

ئەو فرەوێژی و رواڵەتپەروەری باوی ناو رۆمانتیکەکانی وەلاوەنا، و وێڕای ئەوەی لە ژینگە و هاماجێکی خەمیندا دەژیا، خەمینی ئەو کەمتر لە شاتۆبریان لایەنی فەردی و شەخسی هەبوو. شیوەنی ئەو تەنیا بۆ خودی خۆی نەبوو، بۆ هەموو تیرەی بەشەر بوو.

شێوەی ڤینیی بەجۆرەیە کە هەوەڵجار حەقیقەتی فەلسەفی هەڵبژێرێ و پاشان لە رێگەی دەربرینی رەمزی یان مەجازییەوە بیگێڕێتەوە وەکو چۆن لە موسادا، یاسادانەری گەورەی رەمزی تەنیایی بلیمەتە. شیعرەکانی ڤینیی کورت، سەنگین و مشتومالدراون. ڤینیی لە چاو زۆربەی شاعیرانی رۆمانتیکەوە کەم بەرهەمە ئەو خۆی تەنیا سێ کۆمەڵە شیعری بچووکی بڵاوکردەوە: هۆزانان- ١٨٢٢-، نیلوا- ١٨٢٤، و هۆزانێن کۆن و نوێ- ١٨٢٦، (چارەنووسان)ـەکەی لە دوای مردنی لە ساڵی ١٨٦٧دا چاپ بوو.

رۆمان و حیکایەتەکانی:

ڤینیی لە ساڵی ١٨٢٦ی پێنجەمی مارس-ی نووسی کە یەکەمین رۆمانی مێژوویی فەرەنسییە. بە چاولێکەری والترسکۆت، هەندێ هەوڵی تاڕادەیەك ناسەرکەوتوویدا تاوەکو داب و نەریت و خووخدە و هەلومەرجی ژیانی سەردەمی لویسی سیانزەیەم سەرلەنوێ وێنەبگرێتەوە. بەڵام بە پێچەوانەی سکوت-ەوە حەقیقەتی مێژوویی و کەسایەتی ریشیلۆی بە هەند ناگرێ. چوارچێوە و سکێچی رۆمانەکە بریتییە لە ململانێی ئەم کاردینالە و نەجیمزادەیەکی لاو کە

دەخوازێ لەگەڵ ماری دوگونزاگدا زەماوەند بکات. ستیلو- ۱۸۳۲ کۆ چیرۆکێکی سێ چیرۆکییە کە بویەری خەمناکی سێ شاعیری لاو دەگێڕێتەوە، کە لە بەهاری ژیاندا مردن: تۆماس چترتون، ئاندریەشنیە "۱۲" ، و نیکولا گیلبرت "۱۳" (شاعیری بەدبەختی ئاخر و ئۆخری سەدەی هەژدەیەمی فەرەنسا)، (کۆیلایەتی و عەزمەتی سوپایی- ۱۸۳۵) کۆ چیرۆکێکە دەربارەی ژیانی سەربازان، کە فیداکارییان و سۆز و بەزەیی دەخاتە دلانەوە و نەفسکوژی پاکییان دەبێتە مایەی ستایشی خوێنەر.

شانۆنامەکانی:

ڤینیی جگە لەوەی دوو شانۆنامەی شەکسپیری بۆ سەر شانۆ (شایلۆك ۱۸۲۸، و قولەڕەشی ڤینیسی۱۸۲۹) ئامادە کرد، سێ شانۆنامەی رەسەنیشی نووسی، مارشالی ئانکر- ۱۸۳۰، شانۆنامەیەکە لەمەڕ رووداوێکی سەرەتاکانی سەدەی هەڤدەیەم کە دەسەلاتی چارەنووس بەرجەستە دەکات و وێنەدەگرێت. شانۆنامەی دووەمی کۆمیدیای (لەترس خەلەسیو)ە کە لە ساڵی ۱۸۳۳دا دانراوە، شانۆنامەی سێیەم تراجیدیای چترتون- ۱۸۳۵ــە کە باشترین شانۆنامەی ڤینییە، لەم تراجیدیایەدا بە وردی ژیانی شاعیرێکی لاوی ئینگلیزی، کە دوای شکست لە واری ئەدەبیات و نەڤیندا خۆکوژی دەکات، دەخاتە بەر وردبینی و شیکردنەوەوە. چترتون رەمزێکە لەمەڕ شاعیرانی شەهیدە کە بە هۆی بلیمەتییەوە مەحکوم بە تەنیایی و شکست کۆمەڵگە ناتوانێ لێیان تێ بگات.

هەڵسەنگاندن:

ڤینیی لەوارێن رۆماننووسی، چیرۆکبێژی و شانۆنامەنووسیدا مەحبوبیەتێکی ئەوتۆی نییە، و شیعرەکانیشی هیچ کاتێ مایەی پەسندی عەوامی خەڵك نەبووە، بەڵام ئەو خوێنەرانەی کە لە سادەیی و رووگرژی و رەشبینی ئەو بێزار نین، و ئەوانەی کە رێز لە بنەماکانی کلاسیك، هاوشێوەسازی زیندوو، بیری تازە و راستگۆیی هزری دەگرن، هەمیشە بە خۆشەویستییەوە یادی دەکەنەوە.

(ڤیکتۆر ماری هۆگۆ ۱۸۰۲- ۱۸۸۵):

هۆگۆ لە بزانسون "۱٤" لە دایك بووە، باوکی میری سوپای ناپلیۆن بوو، کە خێزانەکەی لەگەڵ خۆیدا بۆ ئیتالیا برد، و لە ئەسپانیا ئاکنجی بوو، کوڕەکانیشی لەلای وی مانەوە. لە دوای شەڕی واترلۆ، ڤیکتۆر بۆ پاریس گەڕایەوە. بە هۆی غەفلەت و خەمساردی دایك و باببیەوە خوێندنی تەواو نەکرد. لێ ڤیکتۆر کتێبی زۆری خوێندەوە (بەتایبەتی بەرهەمەکانی رۆسۆ و شاتۆبریان)و لە دەوروبەری سیانزە ساڵیدا شەیدای ئەدەبیات بوو.

لە چوارده ساڵیدا تراجیدیایەکی نووسی و سێ ساڵ دواتر گۆڤارێکی ئەدەبی گرتە ئەستۆ، لە ساڵی ١٨٢٢دا لەگەڵ ئادل فوشەردا زەماوەندی کرد و یەکەمین دەفتەرە شیعری خۆی بڵاوکردەوە، لە تەمەنی بیست ساڵیدا بوو بە بابایەکی موحافەزەکار و لایەنگری رژێم و دەسەڵاتی پاشایەتی، بەڵام بەرەبەرە بەلای سیستەمی میللیدا بایدایەوە و لە ساڵی ١٨٣٠دا بوو بە لایەنگری پرجۆش و خرۆشی ئازادی و دیموکراسی. رۆمان و شانۆنامە و دیوانە شیعرەکانی لە ماوەی ساڵانی ١٨٢٢و ١٨٤٠دا چاپ و بڵاوبوونەوە، متمانە بە خۆبوونی وی و بەرەڤانییە بەناوبانگەکەی لە تیۆری و بۆچوونی رۆمانتیکەکان، لە ساڵی ١٨٤٠دا گەیاندیانە پاپەی پێشەوای رۆمانتیکی فەرەنسا. هۆگۆ لە ساڵی ١٨٤١دا بە ئەندامی کۆڕی زانیاری فەرەنسا قەبووڵ کرا. لە نێوان ساڵانی ١٨٤٣- ١٨٤٨دا تاڕادەیەك لە ئەدەبیات دوور کەوتەوە و لەو ماوەیەدا رۆڵێکی رامیاری فرەی بینی و بوو بە یەکێك لە رابەرانی دیموکراتەکان.

بەربەرەکانی کردنی ناپلیۆنی سێیەم و ئیمپراتۆری دووەم بووە مایەی دوورخستنەوە و نەفی کردنی، و لە ساڵانی ١٨٥٢- ١٨٧٠دا لە برۆکسل، جرزی و گرتریدا ئاکنجی بوو. پانزە ساڵی دوایی تەمەنی لە پاریسدا بەسەر برد، و وەکو پیرێکی گەورەی ئەدەبیاتی فەرەنسا مایەی سەربەرزی و رێز و حورمەت بوو.

بەرهەمەکانی:

هۆگۆ لە وڵاتەکەی خۆیدا بە شاعیرێکی باڵادەست دەژمێردرێ، و لە دەرێی فەرەنسادا وەکو رۆماننووس ناسراوە. وێڕای ئەمەش لە رۆژگاری خۆیدا بە شانۆنامەنووسی بەناوبانگ بوو. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی شانۆنامەکانی لە جوملەی کەمبایەخترین بەرهەمێن ئەون، هۆگۆ لە هەر سێ ژانری هۆزان، رۆمان، و شانۆنامەدا پڕ بە مانای وشە رۆمانتیکە، وا باوە کە لەلاویدا گوتویەتی کە: "حەز دەکات یا شاتۆبریان بێ یان هیچ کەس نەبێ"، و یەکەمین ئیلهامبەخشی وی شاتۆبریانە.

شیعرەکانی:

لەو روانگەیەوە کە شاعیر حەقیقەت بە فیراسەت بە دیدێکی باڵاتر لە خەڵکانی دی دەرك دەکات، و لەو پێودانگەوە کە پەیامی شاعیر بریتییە لە رێنوێنی کردنی مرۆڤان بەرەو پاکی و بێگەردی و رووناککردنەوەی هزر و بیران، رۆڵێی پەیامبەر ئاسای هۆگۆ بە چاکی دەردەکەوێ. نێوەرۆکی هۆزانەکانی وی پتر ئەو بابەتانەن کە لە رۆژگاری شاعیردا و لە فەرەنسادا بابەتی رۆژ و وەخت بوون، بەتایبەتی مەسەلەێن رامیاری و کۆمەڵایەتی، وەکو حکوومەتی پاشایەتی،

حکوومەتی جەماوەری و میللی و هەژاری... بابەتێن دیکەی وەکو ڕووداوانی مێژوویی، سروشت، ژیانی خێزانداری، ئەڤین و منداڵێتیش بەلای هۆگۆوە گرنگی تایبەتی هەیە.

گەورەترین قەریحەی شیعری هۆگۆ لە بواری بەرزە خەیاڵی و ڕەوانبێژی دایە. خەیاڵ و خەیاڵپەروەری وی بە شێوەی جۆراوجۆر دەردەکەوێ: لە هەمەجۆری و تازەیی وێنەکانیا، لە توانای شەخسیەتسازی و دیدی ئەوا، و بەتایبەتی لە توانای ئەفسانەسازی ئەوداو لە دەسەڵات و توانایدا بەسەر تەکنیکی چیرۆکڤانیدا، هۆگۆ مامۆستای هونەرە ڕەوانبێژییەکانە. دەوڵەمەندی وشەی هۆگۆ زۆر سەیرە، ئاشقێنی لەگەڵ وشەدا دەکات، بەتایبەتی وشەی قەبە و ئاوازە و ئەو شێوە رونبێژی و جوانکارییانەی کە بەردەوام بە کاریان دێنێ بریتییە لە: وشەی لێکدارو، هەڵگێڕانەوەی بابەت، گونجانی سیفەت، تەرسیع بەند و تیباق.

ئەوەی لە شیعرەکانی هۆگۆ، کۆکراوەتەوە بریتییە لە بیست و پێنج دەفتەر (دیوان)ی شیعری، هەندێ لە گرنگترین ئەم دیوانانە لە سەردەمی ژیانی شاعیردا بڵاوبوونەتەوە، (چامە و سروودەکان ١٨٢٦و ١٨٢٨) تایبەتە بە ڕووداوە سیاسییەکان، ستایشی ناپلیۆن، پەیامی شاعیر و منداڵێتی. (ڕۆژهەڵاتەوانی- ١٨٢٩)، کۆمەڵە وێنە و دیمەنێکی خەیاڵی ڕووتە دەربارەی ڕۆژهەڵات کە هۆگۆ هەرگیز پێی تێ نەناوە. (گەڵای خەزان- ١٨٣١) کۆمەڵە شیعرێکی، شاعیر گوتەنی کانگەی دڵە دەربارەی سروشت، چارەنووسی مرۆڤ، مرۆڤدۆستی، و ناسکی و جوانییەکانی منداڵیەتی، (ئاوازەکانی ئێواران- ١٨٣٥) کە زیاتر باسی دیموکراسی، بوربۆنەکان، ناپلیۆن دەکات.

(یاداشت- ١٨٥٦) بریتییە لە شەخسی ترین شیعرێن هۆگۆ کە دەریا، مەرگ، ستەمی کۆمەڵایەتی، ئایدیال و ئومێدان، و ئەزموونانی ڕابردوو ئیلهام بەخش و سەرچاوەیەتی، و (ئەفسانەی قەرنان- سێ بەرگە: ١٨٥٩، ١٨٧٧، و ١٨٨٣) کۆمەڵە شیعرێکی زیندووی داستان ئامێزی دراماتیکی و لیریکا فۆرم و شێوەیە، کە ڕەنگدانەوەی باوەڕی هۆگۆیە بە پێشکەوتنی مرۆڤ وەکو لە میانی ڕۆژگارانەوە دەبینرێ و بە زۆر بە لوتکەی شیعری هۆگۆ دێنە ژماردن.

رۆمانەکانی:

هۆگۆ نووسەری رۆمانانی رۆمانتیکی ڕووداوان و رۆمانانی کۆمەڵایەتییە، و هەندێ جار هەردوو جۆرەکە ئاوێتە دەکات. لەواری دەروونناسیدا بێ توانایە، بەڵام لە وێنەگرتن و نیشاندانی ڕابردوودا نیگارکێشێکی باڵادەستە و، رۆمانەکانیشی وەکو شیعرەکانی، دڵبەندی

ئـەو بـە رەنگـەکان، و سـنعەتە رەوانبێژییەکانـەوە دەنـوێنێ و نیـشاندەدا، لـە رۆمانـە کۆمەڵایەتییەکانیدا جارێکی دیکە حاڵەتە پەیامبەرانی و کەشیش ئاساییەکە لەخۆ دەگرێت.

(نۆتردام دووپاری- ١٨٣١) و (بێنەوایان- ١٨٦٢) گەورەترین رۆمانی هۆگۆن.

نۆتردام دوپاری: رۆمانێکە لەمەڕ پاریسی سەدەی پانزەیەم، پڕە لە وەسفی زیندوو، کڵێسای گەورە- کە بە شا قارەمانی رۆمانەکە ناو دەبرێ- پانۆراما و دیمەنی رۆمانەکـە پێـك دێـنێ و بەسەر سەرانسەری رۆمانەکەدا زاڵـە. پلـۆت و نەخـشەی رۆمانەکـە بـە دەوری ئیـسمرالْدا-ی کێوەلی گەنجدا دەسوڕێتەوە کە چوار پیاو لەسـەر ئـەو دەکەونـە رکابـەری یـەکتری: پـییر-ی شاعیر، جاهان-ی کەشیشی گەندەڵ، فوبوس-ی ئورستۆکرات و کـازیمودو-ی قـەموری نـاقوس ژەن. جگە لە فۆبۆس، ئیدی ژیانی هەر سیانەکەی دیکە بە مردنێکی دڵتەزێن کۆتایی دێ.

بێنەوایان: لێکۆڵینەوەیەکی تێر و تەسەلە (لە هەزار و نۆسەد و هەفتا لاپەڕەدا) دەربـارەی کاریگەریی ستەمی کۆمەڵگە لەسـەر چەوسـاوان. قارەمـانی چیرۆکەکە کۆنـە مەحکومێکـە بەناوی جان ڤالجن (کە بە تاوانی دزینی یەك کولێرە نۆزدە سـاڵ حەپـسی بـە کـاری قورسـەوە کێشاوە. ژیانێکی نوێ دەست پێدەکاتـەوە)و دەگاتـە ئەوپـەڕی کامـەرانی و سـەرکەوتن. لـەم حاڵەدا بە ئاشـکرا کردنـی ناسـنامەی خـۆی وەکـو تاوانبارێـك، دەبێتـە مایـەی رزگـاربوونی کەسێکی بێ تاوان، و بەخۆیشی دەرفەتی هەڵاتن دەدۆزێتەوە، و لـە ئەنجامـدا بـە ئاسـوودەیی چاوان لێك دەنێ، چونکە دەزانێ هەوڵەکانی وی بوونەتە مایەی بەختەوەری کوزێت-ی کیژی.

ئەم رۆمانە، وێڕای کاراکتەرسازییە لەڕادەبەدەر سەرڤە سـەرڤەکەی و رەمزییـەت و پلۆتـە زۆر ناواقیعییەکـەی نموونەیەکـە لـە بـەهرەداری و توانـای هۆگـۆ لـە نیـشاندانی تیۆرییـانی کۆمەڵایەتی و، هەمیشە ناوبانگێکی زیندووی هەبووە.

(کرێکارانی دەریا- ١٨٦٦):

چیرۆکێکی دڵگیرە کە جەنگی هەمیشەیی مرۆڤ لەگەڵ تەبیعەتدا وێنە دەگرێ، (ئەو پیاوەی پێدەکەنێ ١٨٦٩) ژیان و داب و نەریتی ئینگلیزەکان لە رۆژگاری خانەدانی ستوارتدا دەداتـە بەر تەنز و ریشخەن، و (نـەودو سـێ- ١٨٧٢) رۆمـانێکی مێژوویـیـە کـە باسـی یـەکێك لـە رووداوەکانی شۆڕشی فەرەنسا دەکات.

شانۆنامەکانی:

پێشەکییەکەی هۆگۆ بۆ (کرومویـل- ١٨٢٧) لەڕاسـتیدا بـە بەیاننامـەی جیابوونـەوەی شانۆنامەنووسانی رۆمانتیکی فەرەنسی لە یاسا و رێساکانی کلاسیك دەژمێردرێ. هۆگـۆ لـەم

پێشەکییەدا هەندێ پرەنسیپ و رێسایان بۆ شانۆنامەنووسی دادەنێ: شـانۆنامە دەبـێ هـەموو لایەنەکانی ژیان وێنەبگرێ –جوانی و کرێتی، شادی و خەم، چاکی و خراپی، هەموویان لە پـاڵ یەکدا وەکو چۆن لە ژیانی واقیعیـدا هـەن وا بیانخاتـە بـەر چـاو، کاراکتـەرەکان دەبـێ تـاکی مرۆڤانی و ئاڵۆزبن، زەمینە مێژوورییەکان، جل و بەرگ، داب و نەریت، و شەقڵی ناوچـەیی لـە روانگەی مێژووییەوە دەبـێ جێـی بـاوەڕ بـن، یـەکێتی کـار دەبـێ رەچـاو بکـرێ، بـەڵام دوو یەکێتییەکەی دیکە دەستکردن و دەبێ پـشتگوێ بخـرێن. هۆگـۆ زۆربـەی ئـەم بیرۆکانـەی لـە شەکسپیر و شلگل ـەوە وەرگرتـووە، بـەڵام پێـشەکییەکەی وەکـو بەیاننامـەی درامانووسـانی رۆمانتیك کاریگەرییەکی زۆری هەبووە.

کرومویل، شانۆنامەیەکی خودی (زاتی) درێـژە.. فـۆرم و قـاڵبێکی دیـاریکراوی نییـە، و قابیلی نمایشکردن نییە. لـەم شـانۆنامە هـەفتا و پێـنج دیمەنییـەدا، هۆگـۆ بـە بەرزەفڕییـەوە تێدەکۆشێت سەرانسەری قۆناغی کرومۆیل لە ئینگلیستاندا نیـشانبدات و بەرجەسـتە بکـات. پلۆتی شانۆنامەکە دەربارەی دوعاخوازی کرومویلە لە ئاورەنگ پاشایەك.

<u>(هرنانی- ١٨٣٠):</u>

باشترین شانۆنامەی هۆگۆیە، زۆر کۆپلە و بەندی لەسـەر بـەحری درێـژ و دوو بـەیتی یـان چوارینەی قافیەداری لەخۆ گرتووە. چیرۆکێکی میلودرامییـە، و کاراکتـەرەکان هـەموویان لـە شێوەی نموونەی رۆمانتیکی دا پیشاندەدرێن. پلـۆتی دراماکـە تایبەتـە بـە ململانێـی بـەینی هرنانی (ریگری دڵتەنگ) و سایەداری (قیم) ماشوقەکەی (دون ری گـومز). رکـونی و قـین لـە دڵی گومز دەبێتە مایەی بەڵا بو هەمووان. سەرکەوتنی ئەم شانۆنامەیە، درامـای رۆمـانتیکی گەیاندە لوتکەی سەرکەوتن.

<u>(ری بلاس- ١٨٣٨):</u>

دووەمین شانۆنامەی سەرکەوتووی هۆگۆیە، شا قارەمانی شـانۆمانەکە خزمـەتکارێکی دەم تەڕی زمانلوس کە دەگاتە لوتکەی دەسەڵات، تا ئەو رادەیەی کە مەلیکەی ئەسپانیا دڵبەنـدی ئەشقی ئەو دەبێ، لە ئەنجامدا، هەوڵ و تەقەلای پیاوێکی خوێرِیلە و هەرزە و تاڕادەیەك عەیب و خەوشەکانی خۆی، دەبنە مایەی کەوتن و رووخانی، و "پەند و عیبرەتی ئەخلاقی ئـەم کـارە ئەوەیە: کەسێك کە نانی سواڵی خوارد، هەمیشە دەستی درێژە".

شانۆنامەکانی هۆگۆ، وەکو زۆربەی دراما رۆمانتیکییەکان، بۆ رۆژگاری ئەمڕۆ بایـەخێکی کەمیان هەیە، لـە شـانۆنامەکانی ئـەودا هەمیـشە پێـشنیازێکی کۆمەڵایـەتی یـان سیاسـی

دەخرێتەڕوو، پلۆت و نەخشەی شانۆنامەکان بە زۆری بۆ سەرگەرمی و وەختگوزەرانییە، و قارەمانەکان بەشێوەی سادە و سەرەتایی وێنە دەگیرێن، تەنانەت دیمەن ئارایی و شەقلی خۆمالیشیان دەستکردە. ئەم شانۆنامانە نەحەقیقەتی مرۆڤانی پێویستیان تیایە و نەحەقیقەتی مێژوویی تەواو، تا زەوق و سەرنجی خەڵکی رۆشنبیر راکێشن، جوانی ئەم شانۆنامانە لە دروستکردنی لەرزە دەرونی و غافلگیرییەکان و لە فریوبازی شێوازەکانیاندا پەنهانە، بەگوتەیەکی دیکە، میلودرامای مرۆڤی بلیمەتن، گەورەترین نیجابیەتی شانۆنامەکان چۆنیەتی خەیاڵی بەرز و درەخشانی، و توانای سەیر و توند سۆزەکانە.

هەڵسەنگاندن:

ڤیکتۆر هۆگۆ توانایی بلیمەتێکی گەورە، و گیانێکی مرۆڤانی ئاسایی هەیە، ناکرێ چاوپۆشی لە هەڵە و کەم و کوڕییەکانی وەکو مرۆڤ، بکرێ و ئەو کەم و کوڕی و هەڵانە بە کەم بگیرین، چونکە هەڵەو کەم وکوڕییەکانی لەگەڵ خودی بەرهەمەکانیا ئاوێتە بوون... راستە کە هۆگۆ نە بیرێکی روونی هەیە و نەرەسەن و داهێنەر، راستە زەوق و بەهرەی تەنز و ستایشی نییە، راستە لە ئەندازە بەدەریش خۆویست و خۆپەرستە (وای هەست دەکرد کە دەبێ شاری پاریس لە نوێ بەناوی ئەوەوە ناو بنرێ!). راستە کە خراپترین رەوت و رەوشی بزووتنەوەی رۆمانتیکی بە تەواوەتی لە دراماکانی ئەودا نیشاندەدرێ، هەروەها دروستە کە رۆمانەکانیشی لەڕووی گونجانی مەودای چیرۆکڤانی، یەکێتی و حەقیقەت نمایی، و کاراکتەرسازی لوجیکییەوە، پڕن لە کەم وکوڕی و نوقستانی. هەروەها راستە کە شیعرەکانی هەندێ جار پڕن لە سەنگەلایی موبالەغەکاری کەم قوڵی، پەریشانی، و لادانی جۆراوجۆر، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، پرۆفیسۆر داودن، هۆگۆ (رەنگە هێندێك زێدەڕۆییشی تیابێ) بە گەورەترین شاعیری لیریکی فەرەنسا دەزانێ، و بە گەورەترین شاعیری دەزانێ کە تا ئێستا ئەدەبیات لە داوێنی خۆیدا پەروەردەی کردووە. هۆزانێن هۆگۆ، زێدەباری خەوش و کەم وکوڕییەکانیشی، هەندێ جار رەنگدانەوە و دەنگدانەوەی ئەستاتیکای کلاسیك، باڵا دەستی، و بەهرە و توانای وەسف و وەسفکارییەکی بێ هاوتایە. هۆگۆ وەکو شاعیر، دوو بەهرەی گەورەی تێدایە:

خەیاڵی زیندووی نائاسایی و دەرکی ریتم و ئەوای وشە. وشە بەلای ئەوەوە هێزی زیندوون، هەستی شاعیرانە وێنە و پەیڤ دادەهێنێ، و وێنە و پەیڤ هزر و بیر دادێنێ، هۆگۆ مامۆستای هەموو هارمونییەکانی شیعرە... هەندێ جار فلوتژەنێکی تەنیایە و زۆر جار رابەر و لێدەری ئەواژەنانە. مەحاڵە کەسێك حەزی لە شیعر بێ، و شیعرە باشەکانی ئەو بخوێنێتەوە، بەرەبەرە

نەیەتە جۆش و خرۆش، جۆش و خرۆشێکی وەها کە هەڵە و کەم وکورپیەکانی لەبەرچاو بشارێتەوە... هەر ئەمە ئەزموونی شاعیر و مەحەکی شیعرە و بەس.

((لویس چارلس ئالفرد دوموسیە ١٨١٠- ١٨٥٧)):

موسیە لە پاریس لە دایك بووە، لە هەژدە ساڵیدا پەیوەندیی بە کۆڕ و یانەی هۆگۆوە کرد، لە ساڵی ١٨٣٠دا یەکەمین کۆ شیعری (چیرۆکانی ئەسپانیا و ئیتاڵیا)ی بڵاوکردەوە. لەوە بە دواوە رەموودەی بایرون بوو، و بەچاولێکەری ئەو، کەوتە تەوس و توانج گرتن لە بێهودەییەکانی رۆمانتیکەکان، موسیە لە ساڵی ١٨٣٣دا لەڕادەبەدەر ئاشق و دڵبەندی ئەڤینی جۆرج ساند بوو، و لەگەڵ ئەودا بۆ ئیتاڵیا چوو.

پەیوەندی گەرم و گوڕی ئەو جووتە لە دوو ساڵ پتری نەخایاند. ساند دەستی دەگەڵ پزیشکێکی ڤینیسیدا تێکەڵ کرد، و موسیە تەنیا و نائومێد رووی کردە بادەنۆشی و رابواردن، و لە ئەنجامدا لە تەمەنی چل و حەوت ساڵیدا مرد. بویەر و بەسەرهاتی ئەڤینی موسیە و ساند، هەر چەندە بووە مایەی بەڵا و نسیبەت بۆ موسیە، لەگەڵ ئەمەشا ئەم ئەڤینە لە بەشی سەرەکی ژیان و شیعرەکانیدا رەنگی داوەتەوە..

بەرهەمەکانی هۆزان:

هەموو شیعرەکانی موسیە دوو دەفتەریان گرتۆتەوە بەناوی: (هەوەڵین هۆزانان ١٨٢٩-١٨٣٥) و (هۆزانێن نوێ ١٨٣٦- ١٨٥٢). (چیرۆکێن ئەسپانیا و ئیتاڵیا- ١٨٣٠) لە کۆ شیعری هەوەڵین هۆزانان ، ئەمە جۆش و خرۆشی تەبعێکی لاو، سەررێژ لە موبالەغەبێژی و رەشبینی بایرونانە، موسیە پاش پەیوەندییەکانی دەگەڵ جۆرج ساند بوو بە شاعیرێکی پوختە و مەنگ بەڵام رەشبین و نائومێد. چوار (شەوانە) بەناوبانگەکەی کە بە باشترین شیعری وی دەژمێردرێ، رەنگدانەوە و دەنگدانەوەی هەمان نائومیدییە. لە (شەوی مانگی مایس- ١٨٣٥)و (شەوی دیسامبەر- ١٨٣٥)دا هاوار لە دەستی رەنج و داماوی خۆی دەکات. لە (شەوی مانگی ئاب- ١٨٣٦)دا تۆزێ ئومێد پەیدا دەکات، و لە (شەوی ئۆکتۆبەر- ١٨٣٧)دا تاڕادەیەك هێور دەبێتەوە و ئۆقرە دەگرێ، لە شیعری (بیرەوەری)دا ئەم فکرۆکەیەی کە بیرەوەری جوان تەنانەت لە پاش مردنی خودی ئەڤینیش هەر بە زیندوویەتی دەمێنێ، تەسەلای موسیە دەدا...

چیرۆکە پەخشانەکانی:

موسیە چەند چیرۆکێکی پەخشانی نووسیوە کە درێژترین و باشترینیان بەناوی (ئیعترافی منداڵێکی سەدە ١٨٣٦)یە. لەم چیرۆکەدا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ جۆرج ساندا دەردەبڕێ.

شانۆنامەکانی:

موسیە کە شانۆنامەی (شەوی ڤینیسیا- ١٨٣١)کەی لە قەڵەمڕەوی شانۆدا بووبوو بە هاوتای ناکامی، رووی کردە نووسینی ئەو درامایانەی کە تەنیا بۆ خوێندنەوە لەبار بوون، زۆربەی ئەم بەرهەمانە لە نێوان ساڵانی١٨٣٣و ١٨٣٧دا لە گۆڤارێکی فەرەنسیدا بڵاوبوونەوە، و لە ساڵی ١٨٤٠دا لە کتێبێکدا بە چاپ گەیی. بەڵام لە ساڵی ١٨٤٧دا هەندێ لە کومیدیاکانی نمایش کران و لەوە بە دواوە نمایشکردنیان هەمیشە پێشوازی لێکراوە.

دراماکانی موسیە سێ جۆرن:

*١- کۆمیدیای هەستاری، لەسەر شێوازی شەکسپیر لەوانە: (فانتازیۆ) و (ئەوەی کیژۆڵان خەونی پێوە دەبینن).*

*٢- کۆمیدیای ئەرستۆکراتی، لەسەر شێوازی ماریوو، کە زیاتر کۆمیدیانی پەند دەگرێتەوە، واتە ئەو کۆمیدیایانەن کە لەسەر بناغەی پەندێك رۆنراون، لەوانە: (دەرگاهەم دەبێ کراوە بێ و هەم داخراو)، (مرۆڤ لەگەڵ ئەڤیندا گەمە ناکات)، کە رەنگدانەوەیەکی ئاشقێنی موسیە و جۆرجساندە، لەم شانۆنامەیدا کە زەحمەتە بتوانرێ بە کۆمیدیا دابنرێ، قارەمانی چیرۆکەکە کە لە ماشۆقەکەی تۆراوە، لەگەڵ کیژە گوندییەکدا دەست تێکەڵ دەکات، ماشوقەکەی غیرە دەیگرێ. کیژە گوندییەکە لەناکاو دەمرێت، و ئیدی دڵدار و دلبەر بە خەمناکی لێکدی جیادەبنەوە.*

*٣- تراجیدیا: بەناوبانگترین تراجیدیای موسیە، لورانتزچو-یە. چیرۆکی کاراکتەرێکی لە جۆری هاملێتە، کە ئیلهام لە رینیسانسەوە وەردەگرێ. قارەمانی شانۆکە لێدەبڕێ کە حاکمی دکتاتۆری فلورانسا چاك بکات بەڵام گەندەڵی و نالەباری حاکمەکە، ئەمیش بەرەو گەندەڵی و لەناوچوون دەبات.*

هەڵسەنگاندن:

موسیە تاقە شاعیری رۆمانتیکی فەرەنسییە کە تەبیعەتێکی خۆش و حەنەکچیانەی هەیە، هەندێ لە شیعرەکانی سەرەتا و ژمارەیەکی زۆری کۆمیدیاکانی پڕن لە شۆخی و حەنەکانی زیندوو. ناوبانگی موسیە پتر بەندە بە شیعرەکانییەوە. لەگەڵ ئەمەشا لەم قەڵەمڕەوەدا روانین و دیدی تەنگ و سنووردارە. موسیە بەپێچەوانەی زۆربەی رۆمانتیکەکانەوە، عەلاقەمەندی بە تەبیعەت، مرۆڤپەروەری و پێشکەوتنی مرۆڤایەتی نیشان نادات. لە دوا ڤینیی-یەوە دەروونگەراترین شاعیری رۆمانتیکی فەرەنسییە، و رەنگە یەکێك بێ لەو شاعیرە زۆر کەمانەی

کە لە کانگەی دڵەوە و بەوپەڕی بێ ریاییەوە خۆشی و ناخۆشی ئەڤین وەسف دەکات. موسیە هەر چەندە لە پرەنسیپ و بنەما هونەرییەکانىدا ورد نییە، بەڵام راستگۆیی و قووڵی هەستەکانی، کەم و کورییە هونەرییەکانی دادەپۆشێ... جۆش و خرۆش، روح سووکی هەستەوەری، جوانیپەرستی، قووڵبینی، زیندوویەتی، رەوانی و زمانپاراوی، و جوانی پەیڤەوانی بەگرنگترین تایبەتمەندی موسیە دەژمێردرێن.

## شانۆنامە

درامای کلاسیك تاوەکو پاش رووخانی ناپلیۆنی یەکەمیش لە فەرەنسادا باوبوو. درامای رۆمانتیك لە ژێر کاریگەریی قووڵی تراجیدیای مێژوویی میللەتاندا بووە بەتایبەتی شانۆنامەکانی شەکسپیر و شیلەر، هەروەها لە ژێر کاریگەری میلۆدرامای کۆنی فەرەنسی، رۆمانانی مێژوویی، بەتایبەتی بەرهەمەکانی والتر سکۆت، و زاڵبوونی رۆمانتیك بەسەر هەموو یاسا کلاسیکەکانەوە، بووە. بۆچوون و تیۆریانی شانۆیی رۆمانتیکەکان وەکو چۆن ڤیکتۆر هۆگۆ لە پێشەکەی کرومویلدا باسی کردووە، پێشتر خراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بە هەر حاڵ، ئاماژە بە شانۆنامانی سێ کەس لە چوار شانۆنامەنووسەکەی ئەو رۆژگارە دراوە، واتە هۆگۆ، ڤینیی و موسیە، ئەفەری چوارەمیان ئەلکساندەر دۆمایە..

(ئەلکساندەر دۆما-ی باوك ١٨٠٢- ١٨٧٠):

لە ڤی یر کوترە چاوی بە دنیادا هەڵهێناوە. بابی یەکێك بووە لە فەرمانەدەکانی سوپای ناپلیۆن و دوو رەگەیەکی سپی و رەش بوو. دۆما لە تەمەنی بیستساڵیدا بۆ پاریس چوو و ماوەیەکی کەم لە خزمەتی دۆك دورلیان ماوەتەوە و پاشان لێبراوە لە پێناوی دابینکردنی بژێوی خۆیدا خەریکی نووسین بێ. چونکە بە منداڵی خوێندنێکی رێك و پێك و بەردەوامی نەبوو، ئیدی بە پێویستی زانیوە کتێبانی زۆر دەربارەی بابەتێن هەمە جۆر بخوێنێتەوە. یەکەمین شانۆنامەی سەرکەوتوو ئامێزی: (هنری سێیەم و دەربارەکەی- ١٨٢٩) بوو. دوای ئەوە چەندین شانۆنامە و رۆمانی نووسی، و پارە و پولێکی زۆری بەدەست هێنا، لێ هەمووی بەبادا، لە ئەنجامدا بەوپەڕی دەستکورتی کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی:

دۆما بە یەکێك لە نووسەرە پڕ بەرهەمەکانی جیهانی ئەدەب دەژمێردرێ. قەوارەی بەرهەمەکانی سێ سەد دەفتەری ئەستورە، بەشێ لەم بەرهەمانەی، خۆی گوتەنی لە

(کارخانەدا) کە مەبەستی لە ژمارەیەك هاوکاری کرێگرتە بوو، نووسراوە. دۆما لە ئەمریکادا وەکو رۆماننووس دەناسن، بەڵام زۆربەی رەخنەگران، شانۆنامەکانی زۆر لە رۆمانەکانی بە باڵاتر دەزانن..

شانۆنامەکانی:

شانۆنامەکانی دۆما، کە زۆربەیان بە پەخشان نووسراون، دوو جۆرن:

١ - *شانۆنامانی تەماشایی- مێژوویی، کە پڕن لە دیمەنێن موبالەغە ئامێز.*

٢ - *شانۆنامانی شەخسی بە جۆش و خرۆشی رۆمانتیکی، باشترین نموونەی شانۆنامانی جۆری یەکەمی (هنری سێیەم و دەربارەکەی- ١٨٢٩)یەتی کە مێژوویەکی تراجیدی شایستە و ئاوێتە بە حەسادەت و تاوانکارییە. (ئانتون- ١٨٣١) یەکێکە لە نموونەکانی شانۆنامانی شەخسی کە لەوێدا قارەمانی چیرۆکەکە، ژنێك دەکوژێت لە پێناوی گێڕانەوەی ئابڕو و شەرەفی لە دەست چووی.*

باشترین شانۆنامەکانی دۆما خۆش بونیاد و خەیاڵ ئەنگێزن، بەڵام هەمان خەسلەتی میلۆدراماکانی هۆگۆیان هەیە، و لە باری شیکردنەوەی دەروونییەوە بە هەمان ئەندازە لاوازن. دۆما خاوەنی هەستی دراماتیکی، بەهرەی داهێنانی بوێرەرین جۆشدار، راشکاوی، شێوازی روون لە پێشڤەبردنی پلۆت و دیالۆگانی ورد و کورتی سەیرە. لەگەڵ ئەمەشدا هیچی لەمەڕ روحی ئینسانی پێ نییە بۆ گوتن.

رۆمانەکانی:

رۆمانەکانی دۆما، باشترین نموونەی رۆمانی سەرکێشی و نهێنی ئامێز لە ئەدەبیاتی فەڕەنسیدا بە دەستەوە دەدەن.

سەرچاوەی ئەم رۆمانانە یا بیرەوەرییە یا مێژوود، بەڵام دۆما بێ دوودڵی و پرینگانەوە دەستکارییان دەکات تاوەکو چیرۆکی جەماوەریان لێ دروست بکات.

قارەمانانی رۆمانەکانی بریتین لە خەڵکانی زۆر سادە و ساکار و شێوازێکی لاوازی هەیە، هەروەها رمودەی وردەکاری میلودرامییە، و کاتێ کە لە مێژوودا شتێکی بۆ بابەتێك دەست ناکەوێ، بێ سێ و دوو بەخۆی دروستی دەکات، و لە ئەنجامدا زۆربەی بەرهەمەکانی بەپێی مەحەکی ئەدەبی لە ئاستێکی نزمدا دەگیرسێنەوە. لەگەڵ ئەمەشدا هیچ کاتێ چیرۆکبێژێکی لەو باشتر نەبووە، لە یەکەم لاپەڕە و تا کۆتایی چیرۆکەکە دەزانێ کە چۆن سەرنجی خوێنەران بۆ لای ئەوەی کە دەیەوێ رابکێشێت و بیانخاتە حاڵ و هەوای رووداوانی جوانەوە.

بەناوبانگترین رۆمانانی دۆما ئەمانەن: سێ تفەنگدار (هەشت بەرگە- ١٨٤٤)، (بیست و هەشت ساڵ دواتر- ١٨٤٥)، (ڤیکۆنت براجیلون- ١٨٤٧) کە درێژەی یەکترن، (کونتی مونت کریستو (١٨٤٤-١٨٤٥)و (گوڵاڵەی رەش- ١٨٤٥).

## کورتە چیرۆکان

لە سەدەکانی ناڤیندا فابیلو لە واری پەرەسەندن و خەملینی چیرۆکی کورتی شیعریدا بایەخێکی زۆری هەبوو. لە رۆژگار و قۆناغی رێنیسانسدا زۆر پەخشانە چیرۆکی کورت، بە چاولێکەری رۆمانە کورتەکانی ئیتالیا هاتنە نووسین، لە سەدەی هەڤدەیەم و هەژدەیەمدا ئەم جۆرە بەرهەمانە لەگەڵ زەوقی خەڵکیدا کۆک نەبوون، لەم قۆناغەدا جگە لە فابیلەکانی لافونتین و کونتە فێرکارییەکانی ڤۆلتیر، شیعر، شانۆنامە و بەرهەمی درێژی پەخشانی بازاڕیان گەرم بوو. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا کورتە چیرۆك بۆ ئەدەبیاتی فەرەنسا گەڕایەوە. ئەم چیرۆکانە زیاتر ئەفسانە و حیکایەتی نائاسایی، فانتازی یان راز ئامێز بوون. لە ساڵانی ١٧٩٤و ١٨١٥دا زاویەدو میستر (١٧٩٤- ١٨٥٢) چەند کورتە چیرۆکێکی سۆز بزوێنی دەربارەی بەدبەختی مرۆڤ نووسی..

ڤینیی، موسیە، مریمە و بالزاك-یش هەندێ پەخشانە چیرۆکی کورتیان نووسی. سێ چیرۆکنووسی ناوداری دیکەش هەبوون کە: شارل نودیە ١٧٨٠- ١٨٤٤، جیراردو نیرڤال ١٨٠٨- ١٨٥٥، و تیوفیل گوتیە بوون، گوتیە زۆر لەو دووانەی دیکە مەنشورتر بوو.

<u>تیوفیل گوتیە ١٨١١- ١٨٧٢):</u>

لە تارب هاتۆتە دنیاوە، بەڵام لە سێ ساڵییەوە لە پاریس ژیاوە. هەوەڵجار لە بواری نیگارکێشیدا خۆی جەرباند، بەڵام پاشان رووی کردە شاعیری.

گوتیە لە ساڵی ١٨٣٠دا بوو بە یەکێك لە لایەنگرە جددییەکانی تیۆری و بۆچوونی رۆمانتیکی هۆگۆ -هەڵبەتە ئەوەندەی پەیوەندی بە ئەستاتیکا وە بێ- هەمیشە خۆی لە سیاسەت و پرسە کۆمەڵایەتییەکان دوور دەگرت. گوتیە لە ساڵی ١٨٤٠دا چووە سەفەر و سەرانسەری ئیتالیا، جەزایر و رۆژهەڵاتی نزیك گەڕا، لە دوا ساڵەکانی نیوەی کۆتایی تەمەنیدا رووبەڕووی نەداری و دەستکورتی بووەوە و ناچار هەموو کاتی خۆی بۆ نووسینی کورتە چیرۆك، رۆمان، رەخنەی ئەدەبی و سەفەرنامە، بۆگۆڤاران تەرخان کرد. ئەنجام لە نوییدا کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی:

بەرهەمەکانی سەرەتای گوتیە خراپترین هەڵەکانی قوتابخانەی رۆمانتیکی دەنوێنن ، بەڵام گوتیە خۆیشی بەرەبەرە تا ساڵی ١٨٣٣ پەی بە زۆربەی کەم و کوڕییەکانی لە ڕەشنووسە سەرەتاییەکانی خۆی بردبوو، لە ساڵی ١٨٣٥دا تیۆری (هونەر بۆ هونەر)ەکەی بە روونی گەڵاڵە بوو—پاشان پارناسینە فەرەنسییەکان پەسندیان کرد و کاری کردە سەر بزووتنەوە جوانیناسییەکەی والترپاتر.

کورتە چیرۆکەکانی:

کورتە پەخشانە چیرۆکەکانی گوتیە، وەکو چیرۆکەکانی نودیە و نیرڤال، سەروساختیان دەگەڵ مردن و ترس، بابەتی نائاسایی و سەیر و غەریبدا هەیە، ئەم چیرۆکانە لە دوو کۆمەڵدا کۆکراونەتەوە:

چیرۆکان- ١٨٤٥، و رۆمان و چیرۆکان- ١٨٥٧...: جەنازەی ئاشق، شەوی کلیوپاترا، ئەمفال و پێی مومیاکراو لە جوملەی باشترین کورتە چیرۆکەکانی گوتیەن. ئەم چیرۆکانە دەربرینێکی روون و زیندوویان هەیە پڕن لە گیانی حەنەکبازی.

رۆمانەکانی:

رۆمانەکانی گوتیە هەمان خەسڵەت و تایبەتمەندی کورتە چیرۆکەکانیان هەیە. (مادموزیل دوموپن- ١٨٣٥) بەناوبانگترین رۆمانی ئەوە کە لەوێدا کیژۆڵەیەك، وێڕای ئەوەی کە خۆی بە شێوەی پیاو گۆڕیوە، دەتوانێ پیاوێك شەیدای خۆی بکات. لە پێشگوتاری ئەم رۆمانەدا گوتیە دەکەوێتە شەرحی دید و بۆچوونی خۆی لەمەڕ (هونەر بۆ هونەر).

شیعرەکانی:

شیعرەکانی سەرەتای گوتیە تەواو لە پەخشانەکانی سەرەتای دەچن. بۆ نموونە (ئالبیرتوس- ١٨٣٢) چیرۆکێکی ترسناکە دەربارەی ژنێکی جادووگەر و گۆڕانی سیما و شێوەی ئەو. باشترین هۆزانین گوتیە لە دیوانێکدا بەناوی (گەوهەر نیشانی و میناگەری) کۆکراونەتەوە کە بریتییە لە شیعرە لیریکییە کورتەکانی و قەسیدە و چامە وەسفییەکان، و گەواهی ئەوەیە کە گوتیە بەر لە شاعیری ، نیگارکێش بووە. لەم دیوانەدا فلچەی شێوەکار و ئەسکەنەی پەیکەرتاش جێی خۆیان بۆ قەڵەمی شاعیر چۆڵ کردووە، لە راستیدا هەر شیعرێکی گەوهەرێکی پرشنگدار و جەلایی دراوە. (قەڵای بیرەوەری)، (کاری دەستان) و (فانتازیای زستان) لە باشترین هۆزانێن ئەم دیوانەن.

هەڵسەنگاندن:

پێگەی گوتیە لە سەرای ناودارانی ئەدەبیاتی فەرەنسیدا زۆر بەرز نییە، بەڵام پایەدارە. بایەخی مێژوویی ئەو بەندە تیۆری (هونەر بۆ هونەر) دەگەڕێتەوە. گوتیە هونەر بە خوڵقێنەری جوانی دەزانێ، جا ئەم جیاکردنەوەی هونەر لە پرسە فەلسەفی، کۆمەڵایەتی و مەزهەبییەکان، هەندێ لە رەخنەگرەکانی وروژاندووە کە بە بیانووی تەنگی دید و هەژاری بیر و ئەندێشەوە بە توندی بیخەنە بەر رەخنە و رەخنەلێگرتن، ئیجابیاتی هونەری گوتیە بریتییە لە: پاڵاوتەیی وشە و پەیڤان، هەستیاری بەرز لە ئاستی رەنگەکاندا، و پوختەیی شێواز، ئەم ئیجابیاتانە وایانکرد (ئەمیل فاگە) ئەوە رابگەیەنێ کە گوتیە "دەیزانی چۆن بە جوانی ڤیکتۆر هۆگۆ، و باشتر لە هەموو نووسەرانی دیکەی ئەو سەدەیە بنووسێت".

## مێژوو

هەر چەندە مێژوو عادەتەن ناچێتە خانەی بەرهەمێن ئەدەبییەوە، هەندێ لە نووسراوە مێژووییەکانی فەرەنسای سەدەی نۆزدەیەم لەڕووی ئەدەبییەوە هەندە پڕ بەهان کە شایستەی ئەوە هەن ئاماژەیەکیان بۆ بکرێ. خۆشەویستی نیشتیمان، کە لە سایەی شۆڕش و جەنگەکانی ناپلیۆندا دڵانی دەهانیە جۆش و خرۆش، سەرهەڵدانی حیزبێن سیاسی، و لایەنگری رۆمانتیکەکان لە رابردوو، لەو فاکتەرە هەرە گرنگانە بوون کە هانی لێکۆڵینەوەی مێژووییان دەدا..

پرۆفیسۆر باتلەر "[١٥]"-ی مێژوونووسی ئەدەبی فەرەنسی، مێژوونووسانی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیە دەکات بە سێ دەستەوە:

١- قوتابخانەی رۆمانتیکی یان وەسفی:

ئامانجی ئەم قوتابخانەیە داهێنانی چیرۆکی زیندوو و پڕجۆش و خرۆش بوو لە سەرچاوەێن مێژووەوە. ئەندامانی سەرەکی ئەو قوتابخانەیە جوزیف فرانسوا میشو ١٧٦٧- ١٨٣٩، نووسەری مێژووی جەنگەکانی سەلیبی (١٨١١- ١٨٢٢)و ئوگوستین تیری (١٧٩٥- ١٨٥٦)ی ناسراو بە "باوکی مێژووی هاوچەرخی فەرەنسا" بوون. دوو کتێبی تیری بەم ناوانە (مێژووی فەتحی ئینگلیستان بە دەستی نۆرمانەکان- ١٨٢٥)و (شەرحی بویەرەکانی قۆناغی مرونژیەکان- ١٨٤٠) لەبەردەستدان..

٢- قوتابخانەی فەلسەفی و سیاسی:

ئەم قوتابخانەیە لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە بە زەبری وردکردنەوە و شیکردنەوە و شرۆڤەکردنی رووداوەکانی رابردوو، هۆ و ئەنجامەکان دیاری بکات. لە ناو گەورەترین میژوونووسانی ئەم قوتابخانەیەدا دەبێ ناوی فرانسوا گیزۆ (١٧٨٧- ١٨٧٤) ناو ببرێ کە دانەری کتێبی میژووی شارستانییەتی ئەوروپا (١٨٢٨- ١٨٣٠)، و کتێبی میژووی فەرەنسایە (١٨٢٨- ١٨٣٠) هەروەها فرانسوا مینیە (١٧٩٦- ١٨٨٤)ی دانەری کتێبی دوو بەرگی میژووی شۆڕشی فەرەنسا (١٨٢٤). میژوونووسانی دیکەی سەر بەم قوتابخانەیە ئەمانەن: ئادولف تیر ١٧٩٧-١٨٧٧ی دانەری کتێبی دە بەرگی میژووی شۆڕشی فەرەنسایە (١٨٢٣- ١٨٢٧)، و ئالکسی دو تاکوڤیل (١٨٠٥- ١٨٥٩)ی نووسەری کتێبی (دەربارەی دیموکراسی ئەمریکا ١٨٣٦-١٨٣٩)و کتێبی (رژێمی کۆن و شۆڕش- ١٨٥٦).

٣- قوتابخانەی تازەکردنەوەی ژیانی رابردوو:

جول میشلە (١٧٩٨- ١٨٧٤)ی گەورەترین میژوونووسی سەردەم، دوا ئامانجی میژووی بە ژیاندنەوەی رابردوو دەزانی.

و(میژووی فەرەنسا ١٨٣٣- ١٨٦٧)ی لە بیست و حەوت بەرگدا نووسیوە، کە بەناوبانگترین میژووی چیرۆکڤانی رۆمانتیکی سەدەی نۆزدەیەمە، و نیشانەی نیشتیمانپەروەری ئەو، خەڵك دۆستی و خەیاڵی زادەی دڵسۆزی و هاوخەمی ئەوە.

## رەخنەی ئەدەبی

لە سەردەمی رێنیسانس بە دواوە گەلێك لە گەورە نووسەران راوبۆچوونی خۆیان دەربارەی ئەمەی کە ئەدەبیات چییە یا دەبێ چۆن بێ دەربڕیوە و زۆر کتێبیان دەربارەی نەقدی بەرهەمی ئەدەبی نووسیوە، وێڕای ئەمەش تەنیا لە سەدەی نۆزدەدا رەخنە بەشێوەی پیشەو هونەر دەرکەوت. لە رەخنەی ئەدەبیدا فۆرم و شێوەی جۆراوجۆر باوبووە.

فرانسوا ڤیلمەن (١٧٩٠- ١٨٧٠):

وەکو هردر لە ئەڵمانیادا، شەیدای رەگ و ریشەێن میژوویی قاڵب و فۆرمە ئەدەبییەکانە، لە ریزی پێشەوەی ئەو رەخنەگرانەیە کە کەوتوونەتە توێژینەوەی پراکتیکی ئەدەبیاتی میللەتان داوە.

سن مارك جیراردن (١٨٠١- ١٨٧٣)ی سیاسەتوان و ئەدیبی فەرەنسی بایەخی تایبەتی بەلایەنە سایکۆلۆژی و ئەخلاقییەکانی ئەدەبیات داوە و یەکەمین کەسە کە لێکۆڵینەوەی لەسەر گۆڕانی ژانری ئەدەبی ئەنجامداوە.

شارل ئوگوستین دو سنت بوف (١٨٠٤- ١٨٦٩):

سەنت بوف گەورەترین رەخنەگری ئەدەبی فەرەنسییە. هەوەڵجار حەزی لێ بوو ببێ بە شاعیر بەڵام پاشان بۆی دەرکەوت کە بەهرە و توانای لە بوارێکی دیکەدایە. نزیکەی سێ ساڵان (١٧٢٧- ١٨٣٠) پەیوەندی قووڵی لەگەڵ ئەنجوومەنەکەی ڤیکتۆر هۆگۆدا هەبوو و بە خۆیشی بابایەکی رۆمانتیکی تۆخ بوو. پاشان بەرە بەرە لە رۆمانتیزم دوور کەوتەوەو خۆی دایە خوێندنەوە و موتاڵا دەربارەی مەزهەب، بەتایبەتی کالونیزم، یانسنیزم، میتودیزم و کاتولیسیزمی میانەڕەو.

بەرەنجامی ئەم خوێندنەوە و موتاڵایە کتێبێك بوو بە نێوی (مێژووی پور- رویال ١٨٤٠-١٨٦٠). سنت بوف درێژەی بە چالاکییە ئەدەبییەکانی خۆشی دا و لە ماوەی ساڵانی ١٨٣٠-١٨٤٨دا زۆر گوتاری رەخنەیی بۆ بڵاڤۆکەکان نووسی. ئەم گوتارانە پاشان لە ژێر سەرناوی (سیمایانی هاوچەرخ ١٨٦٩- ١٨٧١و (سیمایانی ئەدەبی ١٨٦٢- ١٨٦٤دا کۆکرانەوە. جگە لەم دوو کتێبە دوو کۆمەڵە وتاری بەناوبانگی هەیە لە ژێر سەرناوانی (گوتارەکانی دووشەممە ١٨٥١- ١٨٦٢ و (دووشەممە نوێیەکان ١٨٦٣- ١٨٧٠). بەشێوەیەکی گشتی کۆی نووسراوە رەخنەییەکانی دەگاتە چل و هەشت بەرگ، چەند شیعرێك و رۆمانێکیشی نووسیوە.

رێبازی رەخنەیی سنت بوف جیاوازی ئاشکرای لەگەڵ رێبازی رەخنەیی ماتیو ئارنولد-ی دۆستیدا هەیە، لە کاتێکا ئارنولد تەنیا یەك مەحەك بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمێکی ئەدەبی بەکار دێنێ، سنت بوف بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمێکی ئەدەبی پەنا دەباتە بەر شیکردنەوەی ژینگە، مەسەلەی بۆماوەیی، و مێژوو کە بە فاکتەری گرنگ و کاریگەر لە واری داهێنانی بەرهەمی ئەدەبیدا دێنە ژماردن.

# ژێدەران:

١- لایپزیگ: ئەم شەڕە لە شاری لایپزیگ-ی ئەڵمانیای رۆژهەڵاتدا، لە نێوان لەشکرییانی نەمسا و رووسیا و پروس لەلایەك و ناپلیۆن بوناپارت لەلایەکی دییەوە روویدا و نزیکەی ١٢٠ هەزار کوژراو و بریندداری لێکەوتەوە.

٢- ئەلب- Elba: دورگەیەکی نزیکی توسکانە لە ئیتالیای ناوەندی.

٣- واترلۆ: ئەم شەڕەش لە نێوان لەشکریانی ناپلیۆن لەلایەك و هاوپەیمانان لەلایەکی دی لە گوندی واترلۆی باشووری برۆکسل روویدا.

٤- سانت هیلانە: دورگەیەکە لە ئۆقیانووسی ئەتلەس دا، و یەکێك بوو لە کولونییەکانی بەریتانیا.

٥- بۆربۆن: بنەماڵەی پاشایەتی فەرەنسا بوون، کە ناوەکەی خۆیان لە قەڵای بۆربۆنەوە لە بوبونە-وەرگرتووە. ئەم قەڵایە بارەگای ماڵباتێکی بەهێز بوو کە نەوە و یەکێك لە ئەرستۆکراتەکانی سەدەی نۆیەم بوون بە ناوی ئادمار. دامەزرێنەری خانەدانی بۆربۆن کوڕی شەشەمی لویسی نۆیەم پاشای فەرەنسا بوو بە نێوی روبر.

٦- مەزرای بروك: کۆمەڵەیەکی ئەزموونی سوسیالیستی بوو کە لە شارێکی باکووری ویلایەتی ماساچۆ دامەزرا و لە ماوەی ساڵانی ١٨٤١- ١٨٤٧دا برەو و رەونەقی هەبوو، ئەم مەزرایە هی کۆمپەنیەکی هاوبەش بوو کە ٢٤ بەشی تێدابوو، و هەر یەکێك لە ئەندامانی مەزراکە کاریان دەکرد تا پێداویستییەکانی کۆمەڵەکە دابین بکەن.

٧- ئیمیگرە: لە مێژووی فەرەنسادا، ناوی سەڵتەنەتخوازانێکە (لایەنگرانی رژێمی پاشایەتی) کە لە ساڵی ١٧٨٩ و ساڵانی دواتردا لە فەرەنسا رەڤین و پەنایان بۆ ئەڵمان و سویسرا و بەریتانیای مەزن و وڵاتانی دیکەی ئەورووپا برد.

٨- گوتیك: (پەیوەندی بە گوتەکانەوە هەیە کە یەکێك بوون لە قەومە کۆنەکانی ئەڵمان) ئەمە شێوازێك بوو لە بواری تەلارکاریدا کە لە سەدەکانی دوانزەوە تا شانزەیەم لە ئەورووپای رۆژئاوادا باوی بوو.

٩- فرانتس فون لست (١٨١١- ١٨٨٦):

پیانۆژەن و ئاوازدانەرێکی گەورەی مەجەڕی بوو.

١٠- ئانگولم: شارێکە لە رۆژئاوای فەرەنسا لە باکووری رۆژهەلاتی بوردۆ.

١١- دەلیلە- Delilah:

ژنێکی سۆزانیە کە شەمشونی پاڵەوان و داوەری بەنی ئیسرائیل ئاشقی بوو، و فەلەستینییەکان تەفرەیاندا کە رازی هێز و توانای شەمشون کەشف بکات. دەلیلە بۆی دەرکەوت کە هێزی وی لە قژە درێژەکەیدایە، و قژەکەی بری و شەمشون کەوتە دەستی دوژمنان.

١٢- ئاندریە شنیە (١٧٦٢- ١٧٩٤): شاعیرێکی فەرەنسییە.

١٣- نیکولا گیلبرت (١٧٥١- ١٧٨٠): شاعیرێکی فەرەنسییە.

١٤- بزانسون: شارێکی رۆژهەلاتی فەرەنسایە.

# ئەدەبیاتی فەرەنسا
# لە سەردەمی
# ریالیزم، ناتورالیزم، و سیمبولیزمدا
## (١٨٤٢- ١٩٠٠)

سەرەتایەکی مێژوویی:

لە ساڵی ١٨٥١دا کە لویس ناپلیۆن ئیمپراتۆرییەتی دووەمی راگەیاند، حەزی دەکرد شکۆ و هەیبەتی رۆژگاری ناپلیۆنی یەکەم بۆ فەرەنسا بگەڕێنێتەوە. ئەم پیاوە کە تامەزرۆی توانا و ئیحتوباری نێودەوڵەتی بوو، وڵاتی گیرۆدەی سێ شەڕی دەرەکی کرد: جەنگی کریمە ١٨٥٤-١٨٥٦، جەنگی خۆیبوونی ئیتاڵیا ١٨٥٩-١٨٦٠، و جەنگی مەکزیك ١٨٦٣- ١٨٦٧ کە هیچ یەکێکیان خێرێکی فەرەنسای تیا نەبوو. سیاسەتی ناوخۆی لویس تارادەیەك سەرکەوتوو بوو.. ئەوزاری پەیوەندییانی چاك کرد، نرخی پۆستە و گەیاندنی بڕییەوە، دوو پێشانگای نێونەتەوەی (١٨٥٥و ١٨٦٧) کردەوە، و کەوتە فراوانکردن و نۆژەنکردنەوەی شاری پاریس. بازرگانی و سەنعەتیش پەرەی سەند و رەونەقی پەیداکرد، بەڵام ئەنجام سیستەمی کارخانەیی بووە مایەی کێشمانەکێشی نێوان سەرمایە و کار.. جەخت کردن لەسەر سەرکەوتنە ماددییەکان، تیۆریانی جۆراوجۆری پەرەسەندن و حەتمیەتی زانستی و لایەنگری لە میتۆدی زانستی، لەو فاکتەرانە بوون کە ئایدیالیزم و کاروباری مەعنەوی و روحانی لە گەشەکردن و پەرەسەندن خست. جەنگی کارەساتباری فەرەنسا-پروس لەساڵی ١٨٧٠دا کۆتایی بە تەمەنی ئیمپراتۆرییەتی دووەم هێنا و سیستەمی کۆماری سێیەم راگەیەنرا.. میللەتی فەرەنسا دوای

ئەو شکستە زۆر بەخێرایی وەزع و حاڵی ماددی خۆی چاك کردەوە، لە ماوەی سێ ساڵاندا زۆربەی پردەکان، ڕێگاکان، و تەلار و خانووە وێرانەکانیان چاك و ئاوەدان کردەوە و غەرامەتی قورسی جەنگیشیان دایەوە، لە کاتێکدا کە پر وسەکان بەتەمابوون فەرەنسا تا ٢٠-٣٠ ساڵ بە ئیفلیجی بهێنێتەوە.

جەنگ کاریگەرییەکی کەمی بەسەر ڕەوتە هزرییەکانەوە هەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ کە ڕەشبینی زادەی مەتریالیستی، حەتمیەتی زانستی، ڕەوشتی پۆزەتیفیزم و نەمانی ئایدیالیزمی قوڵتر کرد. لە ماوەی ساڵانی ١٨٧٥ و ١٨٨٥دا فەلسەفەی نەفی گەرایی شوپنهاوەری ئەڵمانی کاریگەرییەکی زۆری پەیدا کرد. ئەوسا بەندۆڵەکە بەرەبەرە بەلایەکی دیکەدا لار بووەوە. گەشبینی هیگل، فیختە و برگسون-یش بەرەبەرە برەوی پەیدا کرد و سەرنجانەی بەلای خۆدا ڕاکێشا، و بیروباوەڕی نیتشە دەربارەی ڕزگاری لە ڕێگەی ویستی هێز ئامێزەوە ئۆمێدێکی تازەی بەمرۆڤ بەخشی.

گەڕانەوە بۆ ئایین کە تەقریبەن دەرهاوێشتەی حەتمی هەر جەنگێکی گەورەیە، لە فەرەنسادا لە ئەنجامی ململانێی نێوان حکومەتی ئازاد و میللی لەلایەك و کڵێسای موحافەزەکار و تەقلیدی لەلایەکی دییەوە ماوەیەك دوا کەوت. کاتولیکەکان ترسی ئەوەیان هەبوو کە حکومەتی تازە دەسەڵاتی کڵێسا کەم بکاتەوە، و ترسەکەشیان نابەجێ نەبوو، چونکە ئازادیخوازان لەبیری ئەوەدا بوون کە ئایین و دەوڵەت لێکدی جیابکەنەوە. دوای چەند هێرشێکی بێ ئەنجامی دوو لایەنە، ئەوە بوو دۆزی بەناوبانگی دریفوس"١" هاتە پێشێ و مەسەلەو پرسەکان قەیران و تەنگژەیان لێکەوتەوە. بویەر و دریفوس لەڕووی ئەو ئەنجامە درێژخایەنەوە کە لێی کەوتەوە شایستەی بایەخ پێدانی تایبەتییە.

شەپۆلی دژایەتی کردنی نەژادی سامی (ئانتی سیمیتیزم) کە سەرانسەری نەمسا و ئەڵمانیای گرتبووەوە، بەرە بەرە فەرەنساشی دەگرتەوە. ئەم دوژمنکاری و دژایەتییە لەلایەن کاتولیکانی کۆنەپەرست و بازرگانانی بەرژەوەندپەرستەوە، کە چاویان بەسەرکەوتنە بازرگانییەکانی یەهوودییاندا هەڵنەدەهات، خۆش دەکرا، لە ساڵی ١٨٨٤دا ئالفرید دریوفۆس-ی ئەفسەری جولەکە نەژاد-ی سەرکردایەتی سوپای فەرەنسا بە تۆمەتی خیانەتی- فرۆشتنی بەڵگەنامانی نهێنی سوپایی بەسەرکردایەتی سوپای ئەڵمانیا- دادگایی و مەحکوم کرا. سەرەنجام دوای دوانزە ساڵ لە باس و لێکۆڵینەوە و پاش دوو دادگایی دیکە، دریفۆس بە تەواوەتی تەبرێ بوو (١٩٠٦)..

بەرائەتی دریفوس نەك هەر بۆ لایەنگرانی دادپەروەری بەسەرکەوتنێکی گەورە دەژمێـردرا، بەڵکو بۆ ئەو ئازادیخوازانەش کە مکوڕ بوون لەسەر کەم بوونەوەی دەسەڵاتی کڵێسای کاتولیـك بایەخی هەبوو.

یەکێك لە ئەنجامـە راسـتەوخۆکانی دۆزی دریفـۆس، لـە ئیحتوبارکـەوتنی لایـەنگرانی کڵێسا و پاشان جیابوونەوەی دین و سیاسەت بوو لـە یەکـدی، لـە سـاڵی ١٩٠٥دا. پـاش تەبرێ بوونی دریفوس دژایەتی ئایین- بەتایبەتی دژایـەتی کردنـی ئـایینی کاتولیـك- لـە فەرەنسادا تەشەنەی کرد.

نۆرینێکی گشتی:

لێکۆڵنەوە لە ئەدەبیاتی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمی فەرەنسا تارادەیەکی زۆر باسی چوار "ئیزم"ـە: ریالیزم، ناتورالیزم، پارناسیانیزم و سیمبولیزم.

لە دەوروبەری ساڵی ١٨٤٢دا قاڵب و فۆرمە کۆنەکانی رۆمـانتیزم کـە لـە مـاوەی دەیـەی چوارەمی ئەم سەدەیەدا زاڵ بوو، بەرەو نەمان دەچوو، هەر چەندە هۆگۆ و چەند کەسێکی دیکە تا ساڵانی دواتریش هەر لە سەر گوتنی هۆزانی رۆمانتیکی بـەردەوام بـوون. ریـالیزم، کـە لـە ساڵی ١٨٣٠ەوە کەم و زۆر هاتبووە مەیدان، ئێستا لە چـەند سەرچاوەیەکەوە هێـز و برشـتی وەردەگرت: یەکەم لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران و هونەرمەندانی —عادەتەن دەسـتبەتاڵ و دەستکورت-ی زەوق و سەلیقە جیاوازەوە، کە لە گـەڕەکی لاتـین-ی پاریـسدا قـەرەج ئاسـا دەژیان، گاڵتە بە پوچەڵی دزێوی بۆرژوازی و رەشبینی زادەی خۆپەرستی رۆمانتیکەکان دەکرا، و دووەم لەلایەن کاریکاتوریستان و نیگارکێشانی قوتابخانەی باربیزون"[٢]"ەوە کاردانەوەیەکی زۆر لە هەنبەر زیـری و لـە واقیـع هـەڵاتنی نیگارکێـشانی قوتابخانـەی رۆمانتیـك نیـشان دەدرا، هونەرمەندانی باربیزۆن بۆ وەدەست هێنانی تیمە و ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی خۆیان روویان کردە دیمەکانی فەرەنسا و ژیانی سادە و ساکار.

لە ساڵی ١٨٥٠ بە دواوە ریـالیزم دەبـێ بـە دوو لقـەوە: یەکـەم، ریـالیزمی هونـەری کـە قوتابخانەی (هونەر بۆ هونەر) داکۆکیکارە لێـی، تیوفـل گوتیـە یەکێکـە لـە ئەنـدامانی ئـەم قوتابخانەیە، و دەتوانرێ فلوبیر و شاعیرانی قوتابخانەی پارناس-یش لە هەمان خانەدا دابنـرێن. دووەم (ریالیزمی نیمچە زانستی یان ناتورالیستی) کە ئەمیل زولا-ی پێشەوای ناتورالیستەکان وەکو فورمول و یاسایەکی زانستی نوێ، لە مەیدانی ئەدەبیاتدا داکۆکی لێـدەکات، نـاتۆرالیزم لە مەیدانی دەستنیشان کردن و قامك دانان لەسەر چەپەڵی و کرێتییەکان کە بێ پـەروا و بـە

وردی وەسفیان دەکات، یەك دوو هەنگاوان لە ریالیزمی سەرەتایی هێوەتر دەڕوات. جا لەم بارەیەوە نوکتەیەك هەیە کە دەڵێت: "مرۆڤی ریالیست بە بێڵچە دەڵێت بێڵچە، ناتورالیست دەڵێت کەچە بێڵی کۆنەی نەحلەتی".

سەیرە کە بویەرە سوپاییەکانی ئەم نیو سەدەیە کاریگەرییەکی زۆر کەمی بەسەر ئەدەبیاتەوە هەبوو، تەنانەت جەنگی فەرەنسا- پروس-یش فەرامۆش کراوە و تەنیا موپاسان، زولا و ئالفونس دودە رەوتەنیانە ئاماژەیان بۆ کردووە. ئەوەی بووە مایەی سەرنج و بایەخپێدان رێبازە فەلسەفییەکان، ململانێی ئابووری و بەتایبەتی دۆزی دریفوس بوو، کە چەند بەرهەمێکیان دەربارە هاتە نووسین.

ژانرە ئەدەبییە سەرەکییەکانی ئەم قۆناغە بریتین لە: مێژوو، رەخنەی ئەدەبی، رۆمان، کورتە چیرۆك، هۆزان و شانۆنامە.

## مێژوو

### (ئێرنیست رنان ١٨٢٣- ١٨٩٢):

بە دیارترین مێژوونووسی سەردەم دەژمێردرێ، گرنگترین بەرهەمی بریتین لە:

١- *پرەنسیپەکانی مەسیحییەت (١٨٦٣- ١٨٨١) کە حەوت بەشە، لە بەشی یەکەمدا، ژیانی عیسا (١٨٦٣) هەموو رووداوە میتافیزیکی و موعجیزە ئاساکان رەت دەکاتەوە، هەوڵ دەدات راپۆرتێکی باوەڕپێکراو دەربارەی عیسا وەکو مرۆڤ نیشان بدات.*

٢- *مێژووی قەومی ئیسرائیل (١٨٨٨- ١٨٩٢) کە مێژووی نەژادی جولەکە تا لە دایك بوونی عیسا لەخۆ دەگرێت. رنان کە بابایەکی مەسیحی تەقلیدی نییە، باوەڕی وایە کە هەموو ئایینەکان بەشێك لە حەقیقەتیان تێدایە و دەبێ لەم رووەوە بخرێنە بەر باس و ڤەکۆڵین. رنان لەڕووی راستگۆیی هزری و شێوازی جوانی وەسفکارییەوە جێگەی ستایشە.*

## رەخنەی ئەدەبی

سنت بوف تاوەکو مردنیش تەقریبەن لە نووسین بەردەوام بوو (بڕوانە چەند لاپەڕەیەکی پێشوو).

دووەمین رەخنەگری گەورە ئیپۆلیت ئادولف تێن-ە (١٨٢٨- ١٨٩٣)، هەمان رێبازی سنت بوف (کە لە رەخنەی ئەدەبیدا فاکتەرێن تەبیعی: ژینگە و بۆماوەیی و مێژووی

لەبەرچاوە) دەگرێتەبەر و بە شێوەی یاسا و ڕێسای وردتر بەکاریان دێنیٚ لـە هەڵسەنگاندنی دەقێکی ئەدەبیدا. بە بۆچوونی تن، ڕەخنەگر دەبێ نـەژاد، ژینگـە، گوشـارە کۆمەڵایەتییـە ڕاستەوخۆکان، فاکتەرە کەلتووری و فەلسەفی و بەهرە و توانـا ناوازەکـانی هـەر نووسـەرێك ڕەچاو بکات. (مێژووی ئەدەبیاتی ئینلگلیستان ١٨٦٤- ١٨٦٩)ەکەی تن کە پێنج بەرگـە، هێشتاش بە کتێبێکی پەسندو بەنرخ دەزانرێ. کتێبی (لافونتین و حیکایەتەکانی- ١٨٦٠) و کتێبی تەواو نـەکراوی (بونیادەکـانی فەڕەنـسای هاوچـەرخ ١٨٧٦- ١٨٩٤) لـە بەرهەمـە بەنرخەکانی دیکەی "تن"ن.

ئیمیل فاگە- ١٨٤٧- ١٩١٦) کە ڕەخنەگرێکی دیکەی فەڕەنسییە پێی وایە کە "ئـەرکی ڕەخنەگر وا دەخوازێ کە دید و ڕوانینێکی بەرین و دڵسۆزانەی لەمەڕ زۆرشتان هەبێ، و وەکـو شرۆڤەکار کار لە نێوان نووسەر و خوێنەرانیدا بکات."

## ڕۆمـان

لە سـاڵی ١٨٤٢دا ڕۆمـان وەکـو گـرنگترین ژانـری ئـەدەبی ناوبـانگی دەرکـرد، ڕۆمـانی ڕۆمانتیکی گۆن-یش بەرە بەرە لە ئیحتوبـار کـەوت، و ڕۆمانـانی ڕیالیـستی کـە لـە ژیـانی زەمانەوە ئیلهامی وەردەگرت بەرەبەرە بایەخی پەیدا کرد تا لە ئەنجامدا جێگەی بۆ نـاتورالیزم خۆش کرد. ڕێچکەی جیاواز لە بەرهەمەکانی ئالفونس دودە و ئوسیماندا ئاشکرا دەبێ.

کاردانەوەی مرۆڤ دەرهەق بە مەسەلەکانی ژیان و بابەتێن مەعنەوی و میتـافیزیی بـە دوو شێوەی جیاواز دەردەکەوێ. یەکێکیان خۆدزینەوەیە لەو مەسەلانە و فەرامۆش کردنیانە جڵەوی خۆ بە دەستی خەیاڵ و فانتازیا و هەستێن ئاڵۆز بسپێرین تا بـەرەو شـوێنێکی ترمـان بکـێش بکات- بەرەو سروشتی دەرەوە، بەرەو ڕابردووی دوور، بـەرەو شـوێنانی دوورە دەسـت، یـا بـۆ دەڤەرێن خـەونان. ئەمـە ڕێگەیەکـە ڕۆمـانتیزم دەیـبڕێ. دووەمیـان ئەوەیـە کـە ڕووبـەڕووی واقیعەکان ببینەوە و هەوڵبدەین هەموو ئەو شتانە بدینین کە دەبێ بدینرێن، با تاقەتبەر، کرێت و دزێو، و بە ئێش و ئازاریش بێ. ئەمەشیان ڕێگەی ڕیالیزمە. لە ساڵانی ١٨٣٠ یـان ١٨٣٥ ژمارەیەك لە نووسەرانی فەڕەنسی لەوەی کە بەڕای ئەوان بە مامەڵەی درۆینەی ڕۆمانتیکـەکان لەگـەڵ ژیانـدا، دادەنـرا. بێـزار بووبـوون. ڕیالیـستەکان، دژی دەروونگـەرایی، فانتازیـا و ئایدیالپەروەری، هەڵاتن لە واقیع، و تەم و مژ خولقێنییە لەنکاوەکانی ڕۆمانتیزم وەسـتانەوە و

کەوتنە دەربڕینی بابەتی غەیرە شەخسی، و بیرونگەرایی، نزیك بوونەوە لە واقیع و وردەکارییەکانی ناو ژیانی واقیعی.. جا ئەمانە بۆ دۆزینەوەی واقیع و وێنەگرتنی واقیع پەنایان وەبەر زەمانی ئێستا، کاروبارە سواوەکان، زانستان و وەبەر ماددەگەرایی و تەنانەت رەشبینی-ش برد... هەڵبەتە ئەمان (ریالیستەکان) دژی لایەنگری رۆمانتیکەکان لە مرۆڤ دۆستی، ریفۆرمی کۆمەڵایەتی و دیموکراسی، نەبوون.

گەلێك لە ریالیستانی فەرەنسی هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی رۆمانتیکەکانیان وەکو خۆی هێشتەوە، و ژمارەیەکیش لە نووسەرانی بەرجەستەی رۆمانتیك-ی وەکو جۆرج ساند، مەیلی ریالستیانەیان هەبوو. یەکەمین سێ کەڵە نووسەری ریالیست بریتی بوون لە بالزاك، ستندال و مریمە.

ئونۆرە دو بالزاك ١٧٩٩- ١٨٥٠:

پێشەنگی ریالیزمی تازە، لە شاری تور لە بنەماڵەیەکی بۆرژوا لە دایك بوو. بۆ خوێندن، لە زاگەی خۆی چووە کۆلیژی ڤاندوم، بەڵام زیاتر بەلای روحگەرایی، خەوی هیپنۆتیزم "٣" و ئامۆژگارییەکانی مەزهەبی سودنبرك "٤" دا دایدەکێشا، لە ساڵی ١٨١٦ەوە تا ١٨١٩ لە یەکێك لە نووسینگەکانی مافی پاریسدا کەوتە کار فێر بوون، واتە شاگردی دەکرد. پاشان لە بەر خاتری ئەدەبیات وازی لەو شوێنە هێنا. باقی تەمەنی وی بە قەرزداری و دەستکورتی تێپەڕی، بە جۆرێك هەمیشە ناچار بوو بۆ رزگاری لە چنگی خودان قەرزان شوێنگۆڕکێ بکات. بالزاك زۆری بیر لە دەوڵەمەندبوون کردەوە بەڵام بێ سوود بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵی ١٨٤٥ بە دواوە وەزع و حاڵی دارایی راست بووەوە و لە سایەی بەرەکەتی کتێبەکانییەوە دەرامەتێکی باشی هاتە دەست، لە ساڵی ١٨٥٠دا لەگەڵ کۆنتێسەیەکی دەوڵەمەندی هۆڵەندیدا بەناوی مەدام هانسکا زەماوەندی کرد، بەڵام دوای چەند مانگێك بەهۆی نەخۆشییەکی دڵەوە کۆچی دوایی کرد.

بالزاك پێکاتەیەکی سەیری هەبوو، تێکەڵەیەك بوو لە مرۆڤێکی ئایدیالپەروەر و لە هەمان کاتدا ماددی. لە لایەکەوە خەیاڵێکی بەهێز و رۆمانتیکی هەبوو، و یەجگار شەیدای کاروباری نهێنی ئامێز و غەیبیات بوو، لەلایەکی ترەوە یەکجار ئاشقە ماددە، بەتایبەتی پارە و پول بوو زەین و بیرێکی زیندووی هەبوو بەتایبەتی لە واری وردەکارییاندا، سێ ئارەزووی گەورەی هەبوو: لەرووی ماددییەوە خۆشگوزەران و دەوڵەمەند بێ، شۆرەت و نێوبانگ پەیدا بکات، و مەحبوبی ژنان بێ بێوچان و یەك پشووکاری بۆ هاتنەدی ئەو سێیچ خۆزیایەی دەکرد. چەندین

هەفتەی یەك لە دووی یەك هەر شتی دەنووسی، و مەگەر بۆ سووكە خەوێك دەستی لە نووسین هەڵبگرتایە.. توانای لافاوئاسا و خۆجۆش و سەرسامكەر لە تایبەتمەندییە دیارەكانی ئەو بوو، ئەو توانا و جوڵە و پشوودرێژیی و جوڵەیەی لەوەدا هەبوو كە تا ئێستا لە دنیای چیرۆكنووسدا هاوتای نەبووە.

بەرهەمەكانی:

بالزاك لە هەوەڵین ساڵانی نووسەرایەتی خۆیدا كۆمەڵێكی زۆری شیعر و دەقی ئەدەبی و شانۆنامەیەكی نووسی كە لەو زەمانەدا بەڕاستی نەبوونە مایەی سەرنج و بۆ ئەمڕۆكەش هەر لە بیر چوونەتەوە. بالزاك و ناوبانگی بەدوو زنجیرە بەرهەمیەوەیە: چیرۆكانی پێكەنیناوی و كۆمیدیای مرۆڤانی.

چیرۆكانی پێكەنیاوی -١٨٣٣:

كۆمەڵێك كورتە چیرۆكە لەسەر شێواز و فۆرمی رابلێ... بەشێكی زۆری ئەم چیرۆكانە ناشیرین و نارەوانن، هەڵبەتە شۆخی و تەوس و نوكتەكانیان ئەگەرچی زۆرن، بەڵام پەسندن.

كۆمیدیای مرۆڤانی- ١٨٢٩- ١٨٤٨:

شێوە و ناوەرۆك:

بالزاك هەرچەندە تاوەكو پێش ساڵی ١٨٣٠ چەند رۆمانێكی سەركەوتووی نووسیبوو، بەڵام لە ساڵانی ١٨٣٠- ١٨٣٤دا بوو كە نەخشەیەكی روونی بۆ خۆی دارشت و لێبڕا شەرح و شرۆڤەیەكی تێروتەسەل لەمەڕ هەموو ژیانی فەرەنسەوییان بنووسێت... رێك وەكو چۆن دانتی لە كۆمیدایای خواییدا دانیشتووانی سەرانسەری دەڤەرەكانی دۆزەخ و بەرزەخ و بەهەشت وێنە دەگرێ، بالزاك-یش لە كۆمیدیای مرۆڤانی دا هەر هەموو جۆرە بنیادەمەكانی جیهان —یا بەلای كەمەوە فەرەنسا —وێنە دەگرێ. بالزاك هەوەڵجار بەتەمابوو هەر هەموو رۆمانەكانی- ئەوانەی كە پێشتر نووسیبوونی و ئەوانەی بەتەمابوو بیاننووسێت- لە زنجیرە چیرۆكی تەواوكەری یەكدیدا لە ژێر سەرناوی تۆژینەوەی داب و نەریتاندا بخاتەڕوو. لە ساڵی ١٨٣٥دا بڕیاریدا دوو بەشی دیكەش بە ناوانی تۆژینەوەی فەلسەفی، و توێژینەوەی شیكاری بۆ بەرهەمی یەكەم زیاد بكات. لە ئەنجامدا و لە ساڵی ١٨٤١دا ئەم سێ بەشەی پێكەوە كۆ ناو نا كۆمیدیای مرۆڤانی.

بالزاك نەوەدو پێنج عینوانی (بەرهەم) داهێنراوەكانی خۆی لە كۆمیدیای مرۆڤانیدا كۆكردەوە و بە تەمای داهێنانی پەنجا و پێنج بەرهەمی دیكەش بوو، كە تەمەن مەودای

ئەدا... هەڵبەتە ئەوەی کە فریاکەوت و نووسی لە چوار ملیۆن وشە پترە و زیاتر لە دوو هەزار کاراکتەر یا کەسایەتی لەخۆ دەگرێ، جا لەمانە نزیکەی پێنج سەد کاراکتەریان لە پتر لە یەك چیرۆکدا دەردەکەون. هەندێ لە چیرۆکەکانی بالزاك کورتە چیرۆکن، هەندێکیان کورتە رۆمانن (نۆڤلێت) و هەندێکیان رۆمانی تەواون.

بەشی یەکەمی ئەم زنجیرە چیرۆکانە (توێژینەوەی داب و نەریتان) بریتییە لە شەش فەسڵ:

١- دەربارەی ژیانی شەخسی:

کە دەربارەی حاڵ و ئەحواڵی خەڵکی بورژا و بەتایبەتی سۆز و جۆش و خرۆشی لاوانە، چیرۆکانی کۆلۆنێل چابر-١٨٣٢ ، و بابەگۆریۆ- ١٨٣٤ لەم گرووپەن.

٢- دەربارەی ژیانی ویلایەتی:

ئەو چیرۆکانە لەخۆ دەگرێ کە سەروساختیان دەگەڵ ئەڤینی پاك و بێگەرد و هیواو ئاواتی خەڵکی ویلایەتەکانی فەرەنسادا هەیە، واتە لەگەڵ ناوچە هەندێ دوورەکاندا، ئوجینی گرانده-١٨٣٣ باشترین نموونەی ئەم فەسڵەیە.

٣- دەبارەی ژیانی پاریسی:

لێرەدا هەندێ چیرۆکان لەمەڕ ژیانی خەڵکی پاریس دەگێردرێنەوە. هەندێ چیرۆکی ئەم فەسڵە ناوەڕۆکی دان و سان و دەسیسەکارییان هەیە. کیژی هاپۆ بت-١٨٤٦ و کوڕی هاپۆپون-١٨٤٧ دوو چیرۆکی سەرەکی ئەم فەسڵەن.

٤- دەربارەی ژیانی سیاسی:

٥- دەربارەی ژیانی سوپایی:

بالزاك لەم دوو فەسڵەدا هەوڵدەدا (( زەوق و بەرژەوەندی جەماوەر، حەرەکەی ترسناکی دەزگای کۆمەڵایەتی، و پێکادانی بەرژەوەندی خاس و عام بەرجەستە و شرۆڤە بکات. چیرۆکی بەسەرهاتی ئالۆز- ١٨٤٤ لە فەسڵی چوارەمدا و (شوئانەکان — ١٨٢٩ ) لە فەسڵی پێنجەمدا نیشان دەدرێ.

٦- دەربارەی ژیانی دێهاتی:

بالزاك لەم فەسڵەدا دیمەنی ئارامی گوندی لە بەرانبەر دیمەنی چیرۆکەکانی دیکەیدا لەمەڕ ژیانی پڕ هەراو هوریای شاریدا وێنە دەگرێ، بەڵام هەوڵدەدا ئەوە نیشان بدات کە تەبیعەتی بەشەری، دڵبەندییەکانی ئادەمیزاد، و خەبات و ململانێی مرۆڤانی لە هەموو شوێنێکدا وەکو یەکن، دکتۆری گوند- ١٨٣٣، کەشیشی دێ- ١٨٣٩، و جووتیاران- ١٨٤٤ لە چیرۆکانی ئەم فەسڵەن.

لە بەشی دووەمی ئەم زنجیرە چیرۆکانەدا، واتە (توێژینەوە فەلسەفییەکان) بالزاك هۆکاری پەیدا بوون و دروستبوونی سیستەمی کۆمەڵایەتی رۆژ دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. چیرۆکی پێستی خۆشە کراو- ١٨٣١ و سرافیتا ١٨٣٤- ١٨٣٥ لە خانەی ئەم بەشەدان.

لە بەشی سێیەمی ئەم زنجیرە چیرۆکانەدا، واتە (توێژینەوە شیکارییەکان). بالزاك لێرەدا خۆی لە قەرەی بنەمایەك دەدات کە بە زەمینەی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان دادەنرێ. ئەم بەشە (فیزیولیوجیای زەوجین)- ١٨٣١ کە پتر لە نامە دەچێت تا لە رۆمان لەخۆ دەگرێ.

رێباز و شێواز و جۆری مامەڵەکردن:

بالزاك، بۆ خوڵقاندنەوەی رووداوەکان، بە زۆری چیرۆکەکانی بە زەمینەسازییەکی دوور و درێژ و تاقەتبەر دەست پێدەکات –هەڵوێست نووسی، مێژووی کۆمەڵایەتی، سەربورنووسی یا وەسفکاری تەواو- هەندێ جار سوود لە تەکنیکی "دەستپێکی رووداو لە ناوەڕاستی چیرۆکەکەوە" پێدەبینێ پاشان دەگەڕێتەوە بۆ پێشەکییە دوور و درێژەکەی خۆی. زۆر جاران لە بابەت دەردەچێت تا بۆچوونەکانی خۆی شەرح و شرۆڤە بکات یا قەناعەت بە خوێنەرانی بکات. زۆربەی کات لە زمانی یەکەم کەسەوە چیرۆکەکانی دەگێڕێتەوە.

بالزاك لەو رۆمانانەدا کە باسی تاقم و دەستەی کۆمەڵایەتی و ژینگەی کۆمەڵایەتی دەکات، پلۆت و نەخشەی ئاڵۆز و بە پێچ و پەنا بەکار دێنێ، بەڵام لە رۆمانانی شەخسیەتدا، پلۆت و نەخشەی سادە بەکار دێنێ، و هەندێ جار لە کاراکتەرسازیدا بە نیشاندانی لە رادەبەدەری تایبەتمەندییەکانی کاریکاتۆر دەخوڵقێنێ. بە زۆری سوخەتێکی تایبەتی لە قارەماندا هەیە کە لە هەموو سوخەتەکانی دیکەی زەقترە و هەر ئەمەش بەرەو نابوتی دەبات، وەکو چۆن فیداکاری بابەگۆریۆ لە ئەنجامدا دەبێتە مایەی جۆرێك بێ موبالاتی و چاوپۆشی کردن لە تاوان، ئاڵتوندۆستی گراندە دەگاتە رادە و مەرزی شێتی، بەغیلی و حەسوودی کوری هاپو بت دەبێتە مایەی ریسوا بوونی.

زاکیرەی بە قوەت بەڵام نەجێی متمانە، یارمەتی بالزاك دەدات لە تۆمارکردنی دنیایەك جوزئیاتی- تەقریبەن زیادە- بالزاك نەك هەر کاراکتەر و کەسەکان بەڵکو شتەکانیش بە وردترین و بابەتیانەترین دەربڕین وەسف دەکات.. وەسفی جوزئیات، کە هەندێ جاریش لەگەڵ بابەتەکەدا هەڵناکات، عادەتەن لەڕووی دروست کردنی کاریگەرییەوە زاڵە. زۆر لێهاتووانە شتەکان و شوێنەکان دەخاتە خزمەتی بەرجەستەکردنی قارەمانەکانییەوە. دیارە ئەم

وردکردنەوەیە لەگەڵ تەکنیکی گێڕانەوە بە زمـانی یەکـەم کـەس، جـۆرە واقیعیـەتێك لـەلای خوێنەر بەرجەستە دەکات کە لەبەرهەمێن ئەدەبی دیکەدا زۆر کەمە.

هەر چەندە ریالیزم خەسڵەتی زاڵی بەرهەمەکانی بالزاکە، رەگەز و توخمی رۆمانتیکیـشیان زۆرە: لەوانە بویەر و رووداوانی میلـۆدرامی و نائاسـایی، هەسـتەوەری، قارەمانـانی مەنـد و مەنگ و سەیر و غەریب، تاکگەرایی، فانتازیا، لاف و گەزاف و مەتەڵ ئـامێزی... خەسـڵەتە ریالیستییەکانی بریتین لە: "حەقیقەتجۆیی، ماددەگەرایی بە شێوە جیاوازەکـانی، گۆشـەنیگای زانستی، قەواڵە و بەڵگەنامانی ورد و دروست، فرە زانیاری مەوسوعی، رێبازی دیموکراتیـك، و پەیوەندی و کەلکەڵەی کۆمەڵایەتی فراوان".

کورتەی رەخنەکان:

بالزاك وەکو هونەرمەندێك کەم وکورِی زۆری هەیە: "شێوازەکەی خراپـە... زمانەکـەی... بێ فۆرم و شێوەیە، نارێکوپێکە و شەقڵی تایبەتی خۆی نییە، نووسینەکانی بەرهەمی پیاوێکی یەجگار زیرەك و سەرناسە، زۆر بـە توانایـە.." خەوشیـشی زۆرە: فیـشاڵبازی، بـێ شـەرمی، رەقی، توندرِەوی، درێژدادڕی، یەکنەوایی تاقەتبـەر، خۆدزینـەوەی نابـەجێ، پێکـەوە بەسـتن و نۆبەکاری نەگونجاو و تەنانەت بێهودە جوزئیاتی ریالیستیانە و رووداوانی غـەریب و خـەیاڵی.. ئەو زیاتر بەلای دزێوی و غەمدا مایلە، و لە بەرجەستەکردنی ئەسـتاتیکا، جـوانی، ناسـکی، مەعنەویات و رازانەوە کاریدا بێ توانایە.

لەگەڵ ئەمەشدا بالزاك بە یەکێك لە گەورەترین —لەوەشە گـەورەترین بـێ- رۆماننووسـانی فەرەنسی دەژمێردرێ... جوڵە و توانا و دەوڵەمەندی زانیاریی ئەو ئەفسانەییە، "هـەر هـەموو فەرەنسای لە چوارچێوەی لاپەرەی بەرهەمەکانیا بەرجەستە کردووە و لـەوێوە تـەزووی ژیـان و جوڵە دەیانگرێتـەوە". بـالزاك "دەچـێتە سـۆراخی هـەموو کەسـێك: پزیـشکان، مافناسـان، کەشیشان، رۆژنامەنووسان، هونەرمەندان، کاسبکاران، بانقـداران، بازرگانـان، فەرمانبـەران و خزمەتکاران لە ژینگەی تایبەتی خۆیاندا دادەنرێن و بە گوێرەی پێداویستییەکانی ئەو ژینگەیە تەمەشا دەکرێن".

"کاریگەری بالزاك سنوور یـا کۆتـایی نییـە، بـە ئاسـانی فـۆرمی ئەفـسانەی گـۆری و بەرینترین فۆرمی ئەدەبی لە رۆمانی تازە خولقاند". کاریگەری بالزاك نەك هەر لە فەرەنسا، بەڵکو لە ئینگلیـستان، ئەڵمان، و ئەمریکاشـدا زۆر گـەورە و سـەرسـامکەر بـووە. فلـوبێر،

موپاسان، زۆلا، جۆرج هاولز و هنری جیمز تەنیا چەند نموونەیەکی کەمن لەو نووسەرانەی کە زۆر قەرزارباری بالزاك-ن.

ستندال (١٧٨٣- ١٨٤٢):

ناوی راستەقینەی: ماری -هنری بیل-ە. لە شاری گرنوبل چاوی بە دنیا هەڵیناوە و قۆناغی منداڵیەتی لە هەمان شاردا بە کلۆلی و خەمینی بەسەر بردووە، تا ساڵی ١٨١٢ لە سوپای ناپلیۆندا خزمەتی کرد، پاشان بۆ ئیتاڵیا چوو، ساڵانی ١٨١٤- ١٨٢١ی لەوێندەر قەتاند. ئەوسا بە هۆی ئەوەی کە پەیوەندی بە نیشتیمانپەروەرانی ئیتاڵیاییەوە کردووە، لەو وڵاتە دەرکرا. لە ساڵی ١٨٣٠دا جارێکی دیکە وەکو کونسوڵی فەرەنسا بۆ ئیتاڵیا گەڕایەوە و تاساڵی ١٨٤١ لە هەمان پۆستدا خزمەتی کرد. لە فەرەنسا کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی:

ستنداڵ دوو کتێبی دەربارەی مۆسیقا و ئاهەنگسازان، کتێبێکی دەربارەی مێژووی نیگارکێشی ئیتاڵیا، نامەیەکی لەمەڕ ماهیەتی ئەڤین و گوتارێکی رەخنەوانی دەربارەی شەکسپیر و راسین نووسیوە، لەگەڵ ئەمەشدا، ئەمڕۆ بە یەکێك لە سیما دیارەکانی جیهانی رۆماننووسی دەژمێردرێ، ناوبانگی وی بەندە بە دوو رۆمانە مەنشوورەکەیەوە: سوور و رەش، و دێڕی پارم.

سوور و رەش ١٨٣١:

بەناوبانگترین رۆمانی ستنداڵە. قارەمانی چیرۆکەکە، واتە جولین سورل (کە تاڕادەیەك خودی نووسەرە)، پاش گەڕانەوەی بوربۆنەکان بۆ سەر حوکم، لە سەربازی بێزار دەبێ و جلە سوورە سوپاییەکانی بەجبەی رەشی کەشیشێك دەگۆڕێتەوە. سورل لاوێکی لەخۆرازی، لوتبەرز، رەشبین و خۆسەر و بێ ریشە، لەگەڵ دوو ماشوقەدا ئاشقێنی دەکات -کە ماشوقەی دووەم هۆیەکە بۆ پێشڤە بردنی مەبەست و مەرامە پایەخوازییەکانی. لە ئەنجامدا ماشوقەی یەکەم بویەرەکە بۆ ماشوقەی دووەم کەشف و ئاشکرا دەکات، و سورل بڕیاری کوشتنی دەدات، سورل بە خۆیشی لە ئەنجامدا بە مەقسەڵە عیدام دەکرێ، (شیکردنەوە و تۆژینەوەی دەروونی و بەرجەستەکردنی کەسایەتی سورل لەم چیرۆکە یەجگار جوان و دڵگیرە. ستنداڵ هۆکارەکانی ئەڤین و حەسوودی و نەفرەتی مرۆڤی بەوپەڕی وەستایەتییەوە وەسف کردووە).

دێری پارم- ١٨٣٩:

ستندال لەم رۆمانەدا بویەری (فابریس دل دۆنگۆ، جولین سورلی ئیتالیایی) لەناو جەرگەی دەسیسە و پیلانگێڕییەوە دەگێڕێتەوە. وەسفی جەنگی واترلۆ لە دیمەنە جوان و بەرجەستەکانی چیرۆکەکەیە.

شێوازی ستندال:

ستندال چەند رۆمانتیکە، ئەوەندەش ریالیستە. هەڵبژاردنی ناوەڕۆکەکانی -جەنگانی زیندوو و روون، تاوان، پیلانگێڕی، و جۆش و خرۆش و هەڵچوونان- سیمایەکی رۆمانتیکی پێ دەبەخشن، جگە لەمە، پلۆت و نەخشەی رۆمانەکانی میلۆدرامین، و قارەمانەکانی "پیاوانی ریزپەڕن کە لە مەوقیعی ریزپەڕیدا.. لەگەڵ خەونەکانی خۆیان دەژین... لەلایەکی دیکەوە، بە شیتەلکردنەوە و شیکاریی وردی دەروونیی قارەمانی رۆمانەکانی، بە شێوازی وشك و ناشەخسییەوە، بە ئاوڕدانەوەی لە پاژکاریی، نووسەرێکی ریالیستییە.

پروسپر مریمە ١٨٠٣- ١٨٧٠:

مریمە باوکی فەرەنسی و دایکی ئینگلیزییە و لە پاریس لە دایك بووە. ماوەیەك لە قوتابخانەی کۆلیجی شارلمانی خوێندی و پاشان کەوتە خوێندنی ماف، چەند جارێك کاری دەوڵەتیی لە ئەستۆ گرتووە، لەوانە پۆستی سیناتۆری و پشکنەر و سەرپەرشتیاری گشتی بەرهەمێن مێژوویی. مریمە دۆستی ستندال و هەروەها دۆستی ئوجینی بانۆی ئیمپراتۆری فەرەنسا دەژمێردرا. مریمە بە لە ساڵی ١٨٤٣دا بوو بە ئەندامی کۆڕی زانیاری فەرەنسا.

مریمە یەك شانۆنامە، چەند شیعرێك، و کۆمەڵێك نامە بۆ نەناسێکی ( لە ساڵی ١٨٧٣دا بڵاوبووەتەوە) نووسیوە. کە یەجگار جوانە و جۆرە مکاشەفەیەکی نەفسە. مریمە ناوبانگی بە رۆمان و چیرۆکانییەوەیە. (رووداوەکانی سەڵتەنەتی شارلی نۆیەم- ١٨٢٩) رۆمانێکی مێژوویی بەهادارە بەشێوەی رۆمانەکانی سێروالترسکوت نووسراوە. سکێچ و پلۆتی رۆمانەکە دەستکرد و خەیاڵییە، بەڵام زەمینەکەی وێنەگرتن و نیشاندانێکی راستگۆیانەی ئاخر و ئۆخری سەدەی شازدەیەمە. (ماتیوفالکن- ١٨٢٩) رۆمانێکە هەست و نەستی توندی خەڵکی دوڕگەی کورس نیشان دەدات، و (کولومبا-١٨٤٠) چیرۆکێکە دەربارەی کینەکێشی خەڵکی کورس: قارەمانی چیرۆکەکە کە ژنە برایەکەی خۆی هان دەدا کە دوژمنە خوێنییەکەیان بکوژێ.

مریمە وەکو ستندال (کە مایەی ستایشی ئەوە) و بالزاك، کەسایەتییەکی قۆناغی راگوزاری رۆمانتیزم بۆ قۆناغی ریالیزمە. دڵبەندی وی بە بویەرێن هەستۆکی، زبری، شەقڵی ناوچەیی، و زەمینەی مێژوویی رۆمانەکانی، سیمایەکی رۆمانێکی پێ دەبەخشن. بەڵام وەکو داودن دەڵێ:

((خودبینی و زاتیەتی قوتابخانەی رۆمانتیك لە مریمەدا بەشێوەیەکی ناوەژوو رەنگ دەداتەوە. ئەم خۆپەسندییە زادەی خۆهەڵکێشان و موبالەغە نییە، بەڵکو جۆرە باڵابوونێکی تەحقیرئامێزە.)) وی لە موبالەغە و روتەڵگەرایی بێزارە . بابەتگەری تەواو، کورتبڕی و هەڵبژاردنی وشەێن دانسقە، شێوازی ئەو دیاری دەکەن. مریمە لەسەر سەرزەنشت دەکەن ((بێدەنگی و نارامییە نازاردەرەکەی)) بەلام ستایشی (دەرەکی کەسایەتی مرۆڤانی، وەسفی سنووردار، بەلام وەستایانەی دیمەنان، خوردکردنەوەو چوونە بنج و بناوانی هۆکارەکان. توانای وێنەگرتنی کارە نە باوەکان، دڵگیری، شکۆ و سام و هونەری سادەی چیرۆکڤانی)وی دەکەن.

گوستاف فلوبێر ١٨٢١- ١٨٨٠:

لە روین هاتە دنیاوە. بابی پزیشك بوو، و ئەو کەش و هەوا پزیشکەوانیەی کە گۆستاف تیایدا گەورە بوو، کارێکی فرەی لە سەر بەرهەمەکانی بەتایبەتی مەدام بوڤاری هەبوو، لە دەساڵییەوە سەوداسەری ئەدەبیات بوو، هەر چەندە لەسەر داوای بابی لە ساڵی ١٨٤٠وە تا ساڵی ١٨٤٥ مافی خوێند، بەلام سەرکەوتنی لەو وارەدا بەدەست نەهێنا. لە ساڵی ١٨٤٦ بەدواوە لە کرواسەی نزیکەی روین ژیا. لە ساڵی ١٨٤٩دا تاقە سەفەرێکی بۆ میسر و رۆژهەلات کرد. فلۆبێر لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا تووشی جۆرە نەخۆشییەکی پەرکەم و فێی هاتبوو کە رۆژ بە رۆژ کەسیرەی دەکرد، رەنگە زادەی کاری زۆری نووسەراتی بووبێ، کە زۆر بێرەحمانە خۆی بۆ تەرخان کردبوو، لە ئەنجامدا کوت و پڕ بە سەکتەی دڵ مرد.

بۆچوون، رێباز، و تەکنیکی فلوبێر:

فلۆبێر تەبیعەت و سروشتێکی رۆمانتیکی هەبوو. لە هەموو شتێکی بۆرژوایی و ئاسایی بێزار بوو. حەزی لە هەمووشتێکی توند، نەباو، زیندوو بزێو دەکرد. شەیدا و دڵبەندی شاتوبریان، هۆگۆ و گوتیە بوو، و بالزاکی لە سۆنگەی شێوازە بێ سەروبەرەکەیەوە بە نووسەرێکی (دەرەجە دوو) دەزانی. لەگەڵ ئەمەشدا، بۆچوون و تەکنیکی ئەدەبی وی تەواو ریالیستییە، و تیمە و ناواخنی بەرهەمەکانی پتر دەشوبهێنە سەر تیمە و ناوەرۆکی ناتورالیستەکان.

فلۆبێر هەمیشە خۆی بەوەفاداری سێ پرەنسیپی سەرەکی لە ئەدەبیاتدا دەزانی:

١- *وردی لە دیتن و نیشاندانی قەواڵە و بەڵگەنامەێن پڕ ئیحتوبار. دەڵێن جاری وا هەبوو کە چەند هەفتە چاوەنواری دەکرد تا تریفەی مانگ بەسەر سوچی باخێکەوە ببینێ، و ئەوسا یەکسەری هەموو وردەکارییەکان بخاتە سەر کاغەز، یەکێك لە هۆیە سەرەکییەکانی*

*سەفەرەکەی بۆ باکووری ئەفریقیا لە ساڵی ١٨٩٤دا ئەمە بوو کە راپۆرتێکی دروست لەسەر کارتاژی کۆن (لە سالامبو)دا بە دەستەوە بدات.*

*٢- شێوازی غەیرە شەخسی: فلوبیر زەینگەرایی رۆمانتیکەکانی پەسند نەدەکرد، حەزیدەکرد چیرۆکەکانی بە شێوەیەکی بابەتیانە و زیندوو دراماتیکی دەرببڕێ.*

*٣- ووردی لە وشە، فلوبیر یەکێك بوو لە داکۆکیکارانی (ووردی لە وشە)، باوەڕی وابوو کە تەنیا یەك وشە هەیە پڕ بە پڕی مەبەستەکەی نووسەر بێ، هەر وشەیەکی دیکە جێی بگرێ ئەو مەبەستە بە ووردی و تەواوی ناگەیەنێ.*

لەم رووەوە، وادیارە فلوبیر لە هەر رۆماننووسێکی دیکە پتر ئازاری چەشتووە و عادەتی رەخنە لەخۆگرتنی هەبووە، دەڵێن فلوبیر چەندین رۆژی بە نووسینی یەك رستەوە دەبردە سەر. گەواهی ئەم گوتەیەش ئەوەیە کە بۆ هەر رۆمانێکی چەند ساڵێکی تەمەنی خۆی تەرخان دەکرد (بۆ وێنە سالامبو-ی بە شەش ساڵ نووسیوە). بۆیە چەندێتی بەرهەمەکانی لە چاو خۆیا کەم بوو.

<u>بەرهەمەکانی:</u>

<u>مەدام بوڤاری- ١٨٥٧:</u>

"گەورەترین رۆمانی قەرن"، چیرۆکێکی تەقریبەن ریالستی پەتییە کە حەماقەت و گوناحە مەیلەو رۆمانتیکییەکانی ئیمابوڤاری وێنەدەگرێت. ئەم قارەمانە ژنە وەسواس و هەستیار و کەمێ عامییەی رۆمانەکە -کە هاوسۆزی و هاودەردی خوێنەر نابزوێنێ- نۆرمانیەکی بۆرژوا تەبیعەتە، ئەو نموونەیەی کە فلوبیر باشی دەناسی... ئەو سەودای بریق و باق و ئەشقەی کە لەسەری ئیمادایە، لە مێردەکەی، کە دکتۆرێکی جددی دێهاتییە، بێزاری دەکات و کاری دەگاتە زینا و لە ئەنجامدا خۆی دەکوژێت. پرۆفیسۆر رایت دەڵێت کە مەدام بوڤاری "لەوەیە گەورەترین چیرۆکێك بێ کە سەدەی نۆزدە دای هێناوە... و راستگۆیانەترین وێنەیەکە کە تا نهۆ دەربارەی بۆرژوازی فەرەنسی گیراوە".

<u>سالامبو- ١٨٦٢:</u>

((شکستی شکۆمەندانە))ی فلۆبیرە لەواری دووبارە خولقاندنەوەی دیمەنەکانی کارتاژی کۆن -ئەو شارەی کە بەڕاستی شتێکی زۆری دەربارە نازانین. هەم هەڵبژاردنی ناوەڕۆك و هەم وەسفە رەنگینەکانی ئەم چیرۆکە رۆمانتیکین- پلۆتی چیرۆکەکە بە دەوری تەوەری دڵبەندی سالامبوی کیژی هامیلکار بارکای (شای کارتاژ)و کاهینەی پەرستگەی تانیت"[٤]، بە ماتۆ- سەربازی

لیبیایی بەکرێگیراودا دەسوڕێتەوە، لەم ڕۆمانەدا وردەکارییە مێژووییەکان، چیرۆکەکە دەکەنە ژێرەوە و زەمینەی چیرۆکەکە لە ڕووداوەکان گرنگتر دەنوێنێ -یا فلوبێر گوتەنی ئەم ((پایە بەردینە بۆ پەیکەر لە ڕادەبەدەر گەورەیە)). ئەم ڕۆمانە بە شکست دەژمێردرێ، چونکە ((بینایەکی مێژووییە کە زیاتر قوتکراوەی زانست پەروەرییە تا هەستی ئینسانی)).

فێرکرنی عاتیفی- ١٨٦٩:

لە چیرۆك و بەسەرهاتی فردریك مورۆ-ی (هاوتای پیاو)ی ئیمابوڤارییە. مۆرۆ پیاوێکی لاوی هەستیارە کە بێهودە لە کۆمەڵێك ریسکی عاشقانەدا دەیەوێ کەش و هەواو هاماجی ڕۆمانسان (چیرۆکانی ئەڤینداری سەرکێشانە و سوار چاکی سەدەکانی ناڤین) زیندوو بکاتەوە. ئەم سەرکێشییانە لە ئەنجامدا بە خۆکوژی کۆتاییان نایەت. بەڵکو (بەمیان حاڵییەکی تاقەتبەر) کۆتاییان دێ، کە لە ڕوانگەی فلوبێرەوە لە باری خەمبارییەوە هیچی لە مردن کەمتر نییە.

وەسوەسەی قەشە ئانتوان- ١٨٧٤:

فلوبێر لەم ڕۆمانەدا، وەکو سالامبو، هەوڵدەدات بە ئاوێتە یەك لە زانست و خەیاڵ واقیعگەرایی بئافرێنێ. قارەمانی ڕۆمانەکە زاهیدێکی سەدەی سێیەم یان چوارەمە کە ئەسیری غایلە و وەسوەسەی ئەهریمەن و شەیتان دەبێ.

دڵساف:

چیرۆکێکە لە کۆ چیرۆکێکی سێ چیرۆکی- ١٨٧٧، کە "وەفاداری گەرمی" ژنێکی دێهاتی کەودەنی خەڵکی نورماندی بە نێوی فلیستیە، دەرهەق بەو ماڵباتەی کە خزمەتیان دەکات، دەگێڕێتەوە. (دوو چیرۆکەکەی دی بریتین لە: ئەفسانەی قەشە جولینی میوانپەروەر، و هرودیا).

ڕەخنە و لێکۆڵینەوە:

فلوبێر هەرچەندە لە ئاستی ڕۆشنبیری و فرە زانیاری و چالاکی بالزاکدا نییە، بەڵام لە ئاستێکی بەرزی هونەری ئەوتۆدایە کە بالزاك قەت بە دەستی نەهێنا. نارەوانی و کەم و کوڕی بەرهەمەکانی فلوبێر زادەی ڕارایی بێ ئەندازەی وییە لە ڕەچاو کردنی پرەنسیپە هونەرییەکاندا.. نووسینەکانی گەرم و گوڕ نین، و ئەوە نیشان دەدەن کە نووسەر بەندە و گوێڕایەڵی شێوەی مامەڵە و تەکنیکە، زۆر زەحمەتە کەسێك کە ڕستە ناسك و بێ عەیب و پەیکەر ئاساکانی فلوبێر بخوێنێتەوە و چەندین جار خۆزیا نەخوازێ کە کاشکێ هەندێ لەو شادی گەرم و گوڕییەی بالزاك وێڕای بێسەروبەری زمانەکەی، لە نووسینی فلۆبێردا هەبووایە.

وردکردنەوەی لەرادەبەر لە ناسکی چیرۆکەکانی فلۆبیر کەم دەکاتەوە. وەکو چۆن لە دڵگیری و جوانی رۆمانەکانی بالزاك-ی کەم کردۆتەوە. دوا قسە ئەوەیە کە زەمینە و مەداری بەرهەمەکانی فلۆبیر سنووردار و تەنگە: تەنیا لەگەڵ دوو جۆرە چیرۆکدا سەروکاری هەیە —ئەو چیرۆکانەی کە وەزع و حاڵی ئۆمانییەکانی چینی خوارەوەی کۆمەڵگەی سەردەم دەگێڕنەوە، و ئەوانەی کە وێنەی رووداو و بویەرە کۆنەکانی مەملەکەتانی بێگانە دەگرن... دەربڕینی پوختە، خەیاڵی بەرز، توانای لەرادەبەدەری وەسف، کاراکتەرسازی بێ وێنە لە نموونە جۆراوجۆرەکانی خەڵکی، و بەهرەی رەخنەگریی تەنز و تەوسئامێز، لە ئیجابیاتەکانی بەرهەمی فلۆبیرن، "یەکێکە لەو نووسەرانەی کە زۆر کەس لە خۆی دەرەوێنێتەوە، لە تێگەیشتنی زۆر کەسا جێی نابێتەوە، لەوەشە هەرگیز نەبێتە مایەی پەسندی جەماوەری خەڵك، بەڵام بێگومان هەمیشە مایەی ستایش و سەرسامی کەسانێك دەبێ کە دێنە مەیدانی رەخنە و هەڵسەنگاندنی ئەدەبییەوە... وی هاوسەنگی گەورەترین پەخشاننووسانە".

فلۆبیر کاری کردۆتە سەر موپاسان، زۆلا و دوودە.

<u>ئەمیل زۆلا ١٨٤٠- ١٩٠٢:</u>

لە پاریس و لە خێزانێکی هەژاری دەستکورت لە دایك بووە. بابی ئەندازیارێکی ئیتاڵیایی بوو. ئەمیل زۆر کەمی خوێندووە، ئەویش پتر لە مەیدانی زانستدا بووە تا لە مەیدانی ئەدەبیاتدا بێ. بۆ ماوەیەك وەکو فەرمانبەر لە وەشانخانەیەکدا کەوتە کار، و پاشان عینوانی رۆژنامەنووسی وەرگرت، پاشان لێبڕا ((لە دەوروبەری ساڵی ١٨٨٠))، دا هەموو کاتی خۆی بۆ ئەدەبیات تەرخان بکات. لە هەمان ساڵدا لە میدان"[٦]"دا ئاکنجی بوو، و تا ساڵی ١٨٩٨ بە نیمچە گۆشەگیری ژیا. ئەوسا بۆ پاریس گەڕایەوە تا لە دۆزی دریفوسدا بەشداری بکات، وتارێکی بەو بۆنەیەوە لە ژێر سەرناوی (من مەحکوم دەکەم- ١٨٩٨) بڵاوکردەوە کە بووە مایەی دوورخستنەوەی کاتی وی بۆ ئینگلیستان. لە ئەنجامدا و لە ناکاودا (لە ئەنجامی گیرانی لولەی سۆپا و بڵاوبوونەوەی غاز) خەفە بوو، و مرد.

<u>بۆچوون و رێبازی وی:</u>

عادەتەن زۆلا بە دامەزرێنەر و پێشەنگی ناتورالیزمی فەرەنسا دەزانن. زاراوەی ناتورالیزم لە داهێنانی خودی زۆلایە، و بۆیە ئەو ناوەشی هەڵبژاردبوو چونکە رێبازی زۆلا هەمان رێبازی باو و باکار براوی مەیدانی زانستە سروشتییەکان بوو. ئەم رێبازە ناوێتەیەکە لە دیتن و تۆمارکردنی ورد و وەسفی دیاردە مرۆڤانییەکان بەو شێوەیەی کە لە تەبیعەتدا هەن و بە دوور

لە هەر دەستکاری و دەست تێوەردانێکی مرۆڤ، و بە میتۆدی ئەزمونگەری باو و بەکاربراو لە زانستاندا، واتە رۆماننووس دەبێ لە ژیانیشدا، وەکو تاقیگە، هەست و سۆزەکانی مرۆڤ بخاتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە، و بەگوێرەی میتۆدی ئەزموون و دیتنی زانستی بکەوێتە وەسف و نیشاندانی رووداو و کاراکتەرەکان. زۆلا، لە ئەنجامی خوێندنەوەی کتێبی (سەرەتاکانی پزیشککگەری ئەزموونی)ی نووسینی کلود برنار، ئەو رێچکە و رێبازەی بە دەست هێنا، و بۆچوونی خۆی لە کتێبی (رۆمانی تەجریبی- ۱۸۸۰)دا پیشان دا. رێبازی ئاسایی و باوی خودی زۆلا ئەمەیە کە رۆمانەکانی بەپلۆتی چیرۆك یان هەندێ لە قارەمانەکانی دەست پێناکات، بەڵکو بەو (برگە ژیانە)) دەست پێدەکات کە دەیەوێ بەرجەستەی بکات. ئەوسا چەند قارەمانێکی گونجاو هەڵدەبژێرێ و چەند خەسڵەتێکی سادە بە هەر یەکێکیان دەبەخشێت. لەواری شیکردنەوەی قارەمانانی چیرۆکەکانیا سەرەتایی ترین جۆری دەروونناسی بەکاردێنێ. وا باوە کە زۆلا روحی بەشتان بەخشیوە و روحی لە مرۆڤان وەرگرتووەتەوە. هەمیشە ئەو (برگە ژیانە) هەڵدەبژێرێ کە کرێت و پیسە، و وێنەیەکی ناوێتە بە رەشبینی بەرجەستە دەکات کە بە یەکێك لە خەسڵەتە تایبەتییەکانی ریالیستان و ناتورالیستان دەژمێردرێ.

بەرهەمەکانی زۆلا:

روگون- ماکار ۱۸۷۱- ۱۸۹۳:

زنجیرە رۆمانێکی بیست بەرگییە و زنجیرە چیرۆکە گەورەکانی بالزاك وەبیر دێنێتەوە. دەڵێن ئەگەر چیرۆکەکانی بالزاك یەك (کۆمیدیای خوایی)یە... ئەوا هەقە زنجیرە رۆمانەکانی زۆلا ناو بنرێ (کۆمیدیای حەیوانی)... "..... چونکە زۆلا نەك هەر مرۆڤ بە حەیوانێکی پاشکۆی ئارەزووەکانی خۆی دەزانێ، بەڵکو رووداوەکانی ژیانی خێزانێك لە تاکە بودەڵە و رووخاوەکان دەگێڕێتەوە" —تێکڕای زنجیرەکە هەوڵدەدات تا بەشێوەیەکی گشتی وێنەیەکی فەرەنسای رۆژگاری ئیمپراتۆرییەتی دووەم بنوێنێ، و بە شێوەیەکی تایبەتی راپۆرتێك لەمەڕ ژیانی ئەندامانی جۆراوجۆری ((حەڵاڵزادە و حەرامزادە))ی ماڵباتی روگون- ماکار بگێڕێتەوە. هەر ریوایەت و گێڕانەوەیەك قارەمان بە جۆرێکی هاوپەیوەست بە ژینگەی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، کە بەردەوام لە کێشمانەکێش دان لە گەڵیان، نیشان دەدات. لەم رۆمانانەدا، جۆری ژیانی گەلێك لە پیشەوەران و خودان کاران وێنە دەگیرێت: ئاسوموار (۱۸۷۷)، چیرۆکی ژیانی کرێکارێکی ئاساییە کە مەستی و بادەنوشی بەرەو وێرانی و گەندەڵی دەبات. ناتا (۱۸۸۰) وێنەی ئافرەتێکی سۆزانی نیشان دەدات، جەرمینال (۱۸۸۵) باسی ژیانی دژواری

مەعدەنچیان و مانگرتنەکانیان دەکات، زەوی (١٨٨٨) لە ژیانی جووتیاران و گوندییانەوە هەڵدەهێنجرێ، و کەوتن (١٨٩٢) -کە هەندێ جار بە شاکاری وی دادەنرێ، چیرۆکێکە دەربارەی جەنگی فەرەنسا- پروس.

رۆمانەکانی دیکەی:

زۆلا پاش نووسینی زنجیرە چیرۆکی مەزنی روگون- ماکار، چیرۆکی سێ بەشی (سێ شار ١٨٩٤- ١٨٩٨)ی نووسی، کە دەسەڵاتی کەشیشانی کاتولیك لە لورد "٧"، روم و پاریس نیشان دەدات. نەخشەی چیرۆکێکی چوار بەرگی بەناوی (چوار ئینجیل- ١٨٩٩- ١٩٠٣)شی دارشت، بەڵام دەرفەتی نەبوو کە تەواوی بکات تەنیا سێ بەشیانی نووسی: (بەبرشتی)، کە داخ و کەسەرێکە بۆ خۆکوژی نەژادی، "زەحمەت" کە داکۆکی لە چاك کردنی وەزع و حاڵی هونەرمەندان دەکات، و (حەقیقەت) کە لە دۆزی دریفۆسەوە هەڵێنجراوە، (دادوەری)ش کە قەرار بوو چوارەمین بەشی ئەم زنجیرەیە بێ.

هەڵسەنگاندن: (نرخاندن):

زۆلا هونەرمەندێکی کەم مایەیە، نەخشە و پلۆتی رۆمانەکانی زۆربەی کات دەشوبهێتە سەر زنجیرە پەردەیەکی نیگارکێشی کە پەیوەندییان لەگەڵ یەکدیدا سست و لاوازە، ئەم بونیادسازییە تاسە و چاوەڕوانییەکی کەم لە چیرۆکاندا چێدەکات، بۆیە زۆربەی ئەم رۆمانانە تاقەتبەرن. ئەم مەسەلەیەش کە زۆر لەو گەندەڵی و گەندەڵکارییانەی کە لە رۆماناندا پیشان دەدرێن، چیتر مەسەلەی باوی زەمانەنین، رۆمانان بێ گیان و بێ نموودتر دەکەن. قارەمانەکانی بە زۆری نموونەیین یا نوێنەری یەك چینن، و هیچ کاتێك لە شێوەی تاکی مرۆڤانی ئاڵۆز و مایەی سەرنجدا دەرناکەون، وەسفەکانی لە ئەندازە بەدەروردن و لە دوا ئەنجامدا تاقەت بەرن. زیندووترین وێنەیەك کە زۆلا دای دەهێنێ دیمەنێن بزوتن و جم و جۆڵ و جۆش و خرۆش و هەڵچوونی جەماوەری خەڵکە، کە ئەم وێنانە هەندێ جار دەگاتە لوتکەی عەزەمەت، لەگەڵ ئەمانەشدا، خوێنەر زۆربەی کات هەستدەکات کە زۆلا وەکو پێویست کەرەستە و بابەتەکانی بەردەستی هەرس نەکردووە.

مەسەلەی ئەخلاق لەنووسینەکانی زۆلا و بە درێژایی هەشتا ساڵ مایەی باس و لێکۆڵینەوە بووە. زۆلا، کرێتی و ناشیرینیانی یەجگار زۆر وێنە دەگرێ، بەڵام هیچ کاتێ جوانی و دڵگیرییان پێ نابەخشێ، بەڵکو داروخان و کرێتی گەورەتر و بەرجەستەتر پیشان دەدات تا بە جۆرێ هەستی مرۆڤان بهاروژێنێ کە هەرچی کرێت و ناشیرینێك هەیە لەنێوی بەرن، زۆلا لە

واری ڕێگە خۆشکردنی باسی ڕاستەوخۆ و بێ پەردەی هەموو مەسەلەکاندا ڕۆڵێکی هەبوو، ئەو مەسەلانەی کە زۆربەیان پێشتر وەکو (یاساغ) لە باسی وەکو دەڵێن مونەدەبانەدا وەدەر دەنران.

ئالفونس دودە ١٨٤٠- ١٨٩٧:

دودە، لە نیم، لەپرڤانس هاتە دنیاوە، منداڵیەتیی بە هەژاری بردە سەر، لە هەشت ساڵیدا لەگەڵ خانەوادەکەیدا بۆ لیون چوو و لەوێ چووەتە بەر خوێندنی سەرەتایی. لە ساڵی ١٨٥٧دا بۆ پاریس چوو، و لە ساڵی ١٨٥٨دا بوو بە سکرتێری تایبەتی دۆك دومورنی (زڕبرا و وەزیری ناپلیۆنی سێیەم). یەکەم بەرهەمی شیعری وی لە هەمان ساڵدا بڵاوبووەوە. دودە لە ساڵی ١٨٦٥ بەدواوە بە تەواوەتی خۆی بۆ ئەدەبیات تەرخان کرد. هەر چەندە دودە بە بڵاوبوونەوەی (تارتارن دو تاراسکون- ١٨٧٢) ناوبانگی پەیدا کرد، بەڵام هیچ کاتێك بۆ ئەندامیەتی ئەکادیمیای فەرەنسا هەڵنەبژێردرا.

تایبەتمەندییەکانی دودە:

دودە بەلای زۆربە بە نووسەرێکی ناتورالیزم دەزانرێ، و گومانی تێدا نییە کە پەیڕەویی شێوازی ئەمپرسیونیستی و شێوەی دیکومینتی ناتورالیستەکانی دەکرد. بەڵام تەبیعەتی گەرم، حەنەکچیاتی، بزێو، بەخشندە و میهرەبانی وی لە ڕێچکە و ڕێبازە بابەتی و شیکارییەکانی زۆلای دوور دەخاتەوە. دودە لەڕووی ناسکی و مجامەلە و مەداراوە لە دیکنز نزیك دەبێتەوە،و لەڕووی تەکنیکی ئەو دوو-سێ ڕۆمانەی کە لە دوا ساڵانی تەمەنیدا نووسیونی، هەم قەرزارباری دیکنزە و هەم تاکری.

بەرهەمەکانی:

زۆر جار گوتویانە کە خەیاڵ و خەیاڵدانی دودە تەنیا زەین و زاکیرەی بوو. سەرچاوەکانی وی دیتنەکانی خۆی و ئەو زانیارییانە بوون کە لە ئەنجامی خوێندنەوە دەربارەی خەڵکی و بارودۆخەکان بە دەستی دەهێنا، لەبەر ئەمە بە دزی ئەدەبی (بەتایبەتی لە دیکنز و تاکری)یەوە تۆمەتباریان کردووە گوایە سیمایەکی حەیابەرانەی دۆستەکانی خۆی (بەتایبەتی دۆك دومورنی) لە ژێر پەردەیەکی ناسکدا کێشاوە و وێنە گرتووە.

چیرۆکێن حەنەك ئامێز و بەزەیی ورووژێن:

گەلێك لەم چیرۆکانە باسی وەزع و حاڵی خەڵکی هەژار و زۆرلێکراو دەکەن، بەتایبەتی ئەم کەسانەی کە دودە لە پروڤانسدا ناسیوونی. هەندێ لەم چیرۆکانە کەم تا زۆر ژیاننامەی خوێن. چیرۆکی (شتێکی بچووك- ١٨٦٨) -کە زیاتر لەگەڵ دیڤید کاپرفیلد-ی دیکنزدا بەراورد

دەکرێ- بیرەوەرییە خەمناکەکانی منداڵیەتی دودە دەگێڕێتەوە. (تارتارن دوتار راسکون- ١٨٧٢)، رۆمانێکی کۆمیدییە دەربارەی تارتارن-ی خەڵکی تاراسکون کە خۆی بە گێڕانەوەی چیرۆکی سەیری بەسەرهاتەکان و لاف و گەزافی دلێرییەوە گرتووە. (تارتارن لەسەر ئالپ- ١٨٨٥) پاشماوە و درێژەی بەسەرهاتی تارتارنە (کە رۆژگارێك پیرە شێرێکی کوێری رامی لە جەزایر راو کردووە، بابەتەکە لە قاڵبی چیرۆکێکی سەیردا دەربارەی شەڕی خۆی دەگەڵ شێرێکی دڕندە و ترسناکدا دەگێڕێتەوە تا ئیحتوباری زیاتر بۆ خۆی پەیدا بکات). (نامەکان- ١٨٦٦) کۆ چیرۆکێکی جوان و باشن دەربارەی ژیانی گوندەکانی پروڤانس. (کەشیشی کوکونان)و (قاتری پاپا) لە باشترین چیرۆکی ئەم کۆ چیرۆکەن.

رۆمانێن رەفتاران:

دودە رۆمانی رەفتارانی زۆری نووسیوە، کە رووداوی زۆربەیان لە پاریسی رۆژگاری نووسەردا روو دەدەن. ژمارەیەك لەم رۆمانانە وەکو رۆمانی ناتوڕالیستەکانە، و هەندێکی دیکەیان هێرشن بۆ سەر کەسایەتییانی جۆراوجۆر. ئەم رۆمانانە بەتێکڕایی وێنەیەکی بەرجەستەی پاریسی ساڵانی ئیمپراتۆرییەتی دووەم و دەیەکانی هەوەڵی کۆماریی سێیەم دەنوێنن. بەناوبانگترین رۆمانی ناو ئەم رۆمانانە بریتییە لە: (نابوب- ١٨٧٧، کە سیمای دۆك دوو مورنی، سارا برانا "٨" و چەند کەسایەتییەکی بەرجەستەی دیکە وێنە دەگرێت (لەم رۆمانەدا کەسێکی دێهاتی کە لە تونسدا سامانێکی مۆڵی پێکەوە ناوە، بۆ پاریس دەگەڕێتەوە، و لەوێندەر دەبێ بە قوربانییەکی پیلانگێڕان و مشەخۆران). (نومارومستان) ١٨٨١) رۆمانێکی سیاسییە کە سەرکەوتنەکانی بابایەکی پروڤانسی زیرەك، بەرزە فڕ، بێپەروا لە مەیدانی سیاسەتدا دەردەبڕێ و باسی خەباتی وی دژی (باکووری پیاوکوژ) دەکات. ئەم کتێبە لەڕووی بەراوردکردنی کەسایەتیانی باکورو باشووری فەڕەنساوە جوانە. (سافۆ- ١٨٨٤) وێنەیەکی ناتوڕالیستانە بەڵام بەزەیی ورۆژێنە لەمەڕ سۆزانییەکی فەڕەنسی. و (جاویدان- ١٨٨٨) کە تەنزێکی توندە دەربارەی ئەکادیمیای (فەڕەنسا)و هەندێ ئەندامی تایبەتی ئەو دەزگایە.

هەڵسەنگاندن:

ئەگەر قەرار بێ کە دودە لە جوملەی ناتوڕالیستان دابنرێ، بە جورئەتەوە دەتوانرێ بگوترێ کە لە هەر روویەکەوە لە هەموویان بە نموودترە. دەربڕین و ئینشای وی لە چاو برایانی گنکور "٩" دا کە لە پێشڕەوانی ناتوڕالیستانی زانستی بوون، زۆر سادەترە و ریتم و ئاهەنگی

پەخشانی وی لە چاو زۆلادا، کە پێشەوای ناتورالیستان بوو، توندتر و ئازادترە. ئەمە جگە لەوەی کە دوودە هەستێکی لێوان لێو لە شۆخیبازی هەیە، و دەرکێکی دروستی دەربارەی مەودا و رەهەندەکانی چیرۆك هەیە. زێدەباری ئەمەش دوودە هەندێ تایبەتمەندی شەخسی و مرۆڤانی هەیە کە لە وانی دیدا کەمتر بەرچاو دەکەون. "ئەو ئەخوێنساردی موپاسانی هەیە، ئەرەقی زۆلا، نە ئەگونجان و ئەبانی برایانی گنکور". لە "نێو ئەم نووسەرانەدا ، دوودە لە زۆر رووەوە لەلای کۆمەڵگەی ئەنگلۆ —ساکسۆنی پەسندترینیانە".

## کورتە چیرۆك

گی دو موپاسان (هنری رینێ ئالبیرت) ١٨٥٠- ١٨٩٣:

لە شاتو دو میروماسنیل، لە نورماندی لە خێزانێکی چینی خوارەوەی ئەرستوکراتان لە دایك بووە. ساڵانی هەرزەکاری لەروین بەسەر بردوو زۆری حەز لە وەرزشی وەکو بەلەمرانی و راوە ماسی کردووە. ماوەیەك لە جەنگی فەرەنسا —پروسدا بەشداری کرد، پاشان کارێکی لە وەزارەتی دەریاوانیدا بەدەست هێنا، لەساڵانی ١٨٧٣- ١٨٨٠دا لە موریدان و دڵبەندانی فلۆبیر بوو و لەوەوە فێری شێوەی نووسین بوو. یەکەم بەرهەمی سەرنجڕاکێشی وی چیرۆکی (قەڵەو — ١٨٨٠) بوو کە بە هۆیەوە دەرفەتی بژێوی لە رێگەی نووسینەوە بە دەست هێنا و ئیدی هەموو ژیانی خۆی وەقفی ئەدەبیات کرد. موپاسان لە ساڵانی ١٨٨٠- ١٨٩٢ چەند رۆمانێك و نزیکەی سێ سەد کورتە چیرۆکی نووسی. کاری بەردەوام و رابواردن سەلامەتییان خستە مەترسییەوە و ئیدی لە ساڵی ١٨٨٥ بەدواوە بیری مردن هەمیشە ئازاری دەدا. رۆژ بە رۆژ بیر و هۆشی سەنگلاتر دەبوو لە ساڵی ١٨٩٢دا تەقریبەن شێت بووبوو، ئەنجام لە ساڵی ١٨٩٣دا لە ریڤیرادا و بەهۆی ئیفلیجی تەواوەوە گیانی سپارد.

شێواز، تەکنیك و تۆن:

موپاسان هیچ تیۆرییەکی هونەری نووسراوی نییە. و تا سەر پابەندی شێوازی ریالیستی فلوبیر بوو، بەڵام بەلای درێژنووسی، رێبازی رۆمانتیکی، و بێزاری فلوبیر لە بورژوازیدا نەچوو. وێرای هەندێ رەگەز و توخمی ناتورالیستی کە لە دوا چیرۆکەکانی موپاساندا بەرچاو دەکەوێ، یەکێکە لە نووسەرە هەرە ریالیستییەکانی فەرەنسا، شێوازی وی تەواو غەیرە شەخسی و درامییە.

موپاسان وەکو فلوبیرە باوەڕی بەتینی بە ((وشەی گونجاو)) هەیە، دەربڕین و ئینشای وی نەك هەر ورد و ناسکە، بەڵکو کورت، سروشتی، بتەو، و بە زۆری دڕکەدارە.

((بونیادی بەرهەمی موپاسان دوو خەسڵەتی بەرجەستەی هەیە: پاشەکەوت لە وشە و زمان، کە تەنیا خاڵە زەرورییەکان دەربارەی قارەمانان، ڕووداوان، و نەشونما و پەرەسەندنی چیرۆکەکە ناو دەبات، جوڵە بەرەو پێش کە لەودا مەنتیق لەگەڵ ئەوپەڕی سادەییدا دەبێ، خێرایی دراماتیکی، کە لە بەهرە ناوازەکانی موپاسانە، لەمەدایە.

چیرۆکەکانی موپاسان، وەکو بەرهەمی زۆربەی ریالیستان و ناتورالیستان لێوان لێون لە نائومێدی و تاڵی، و نووسەر بە خۆیشی زۆری حەز بە بەرجەستە کردنی گەندەڵی و هەرزەییەکانە، هیچ کاتێك عەوداڵی خەیاڵ یان هەست نییە، بەڵکو شانازی بەوەوە دەکات کە تەنیا ئەو شتە وەسف دەکات و دەگێڕێتەوە کە بە خۆی دیتوویەتی:

بەرهەمەکانی:

چیرۆك و رۆمانەکانی موپاسان دەشێت بە گوێرەی نێوەڕۆکیان بکرێن بە شەش دەستەوە.

١- دەربارەی نورماندی:

نزیکەی چواریەکی بەرهەمەکانی مۆپاسان سەروکاریان لەگەڵ ژیانی گوندییان و خەڵکی بورژوای نورماندیدا هەیە. بچووکی، نەزانی، ملهوڕی، تەنگبینی و گیانی پڕهەڵچوونی وان وێنە دەگرن. لەوانە: (پەرداخی بچووك)، چیرۆکی سەرمایەدارێکە کە پیرەژنێك فێری شەرابنۆشی دەکات تا زووتر بمرێ و ئیدی نەتوانێ هاوکاری بژێوی ساڵانە لەو وەربگرێ. چیرۆکی (ژیانێك- ١٨٨٣)، ئەمە رۆمانێکە دەربارەی تەنیایی جان، کە کیژێکی هەستیار و ئایدیالیستی خەڵکی نورماندییە، و دۆستەکانی بە فەرامۆشکردنی ئازاری دەدەن و ورد و خاش دەکەن. جولین-ی مێردی پەیمانی هاوسەری پێشێل دەکات، هەوەڵجار پەیوەندی دڵداری لەگەڵ روزالی-ی کارەکەری جاندا دەبەستێ، و ئەوجا لەگەڵ دۆستێکی گیانی بە گیانی ئەودا. جان پەی دەبات کە باب و دایکیشی کەسانێکی داوێن پیس و زیناکار بوونە و خەمبارتر دەبێ، لە ئەنجامدا پل-ی کوڕی جان-یش دەرهەق بە دایکی بێ میهری دەکات، و لە پێناوی ژیان لەگەڵ ژنێکی قەحپەدا هەموو شتێك فیدا دەکات، لە کۆتاییدا وەفاداری روزالی، و کیژە چکۆڵەکەی پل، کە جان بە فەرزەندی قەبووڵی کردووە، دەبنە تاقە دڵخۆشی وی لە ژیاندا.

چیرۆکی "ژیانێك" بە رواڵەت ژیانی ژنێکە و دەگێڕێتەوە، بەڵام کاریگەری ئەم چیرۆکە لە سنووری ژیانی ژنێك هێوەتر دەڕوات و ژیانی مرۆڤ و بێهودەیی هەموو خەونە مرۆڤانییەکان بەرجەستە دەکات.

٢- دەربارەی جەنگی فەرەنسا- پروس:

چەندین چیرۆکی موپاسان باسی رەفتاری پروسییەکان دەگەڵ فەرەنسییەکاندا دەکەن کە باشترینیان: (قەڵەو- ١٨٨٠)، (زیندانیان)، و (دوو دۆست)ـە.

٣- دەربارەی ژیانی بورژوازی لە پاریس:

باشترین کورتە چیرۆکی ئەم دەستەیە (کە عادەتەن بە پوختەترین کورتە چیرۆکی دەزانن کە تا ئێستا هاتۆتە نووسین) ((گەردانە))ی ناوە کە تەژی رووداو و بویەری کوت و پڕ و لەنکاوە. مەدام لوزال ئەو گەردانەیەی کە بە ئەمانەت هێناویەتی ون دەکات، ساڵانی ساڵ کار دەکات تا بەهای گەردانەکە پڕ بکاتەوە، ئاقیبەت جوانی، تەندروستی و شادی خۆی لەبەین دەبا، لە دوا ئەنجامدا بۆی دەردەکەوێ کە گەردانە ونبووەکە قەڵب بووە.

٤- دەربارەی کۆمەڵگەی چینی باڵای پاریس:

چیرۆکەکانی ئەم دەستەیە بە زۆری دەربارەی فێڵ و فەندی ژنانە. دۆستی باش (بل ئامی- ١٨٨٥) چیرۆکێکە دەربارەی کەسێکی نۆکیسە و پایەخواز.

٥- دەربارەی سەفەر:

موپاسان بابەتی ئەم چیرۆکانەی لە سەفەرەکانیا بۆ ئەفریقیا و ئیتاڵیا کۆکردۆتەوە. چیرۆکە دڵدارییەکانی موپاسان لە خانەی ئەم دەستەیەدان. چیرۆکی (جول رومن) لە ریڤیرادا روو دەدا. (لەبەر هەتاو -١٨٨٤، و ژیانی بیابان نشینی) دوو چیرۆکی دیکەی ئەم دەستەیەن.

٦- دەربارەی شێتی و میتافیزیقیا:

موپاسان لەم چیرۆکانەدا ئەو ترس و نیگەرانییانە دەگێڕێتەوە کە لە کاتی نزیکبوونەوەی لە شێتی، بەسەر خۆی هاتوون، (ترس، هورلا، پیاوی شێت و جەنازە) بە باشترین چیرۆکانی ئەم دەستەیە دەژمێردرێن.

هەڵسەنگاندن: (نرخاندن):

مەیدانی کاری موپاسان سنووردارە، بەڵام لەم سنوور و ئاقارەشدا هەرگیز نووسەرێك پێشی نەکەوتووە. بەهرە و توانایەکی هونەری وردی هەیە کە بالزاك ئەو بەهرەیەی نییە، و تاڕادەیەکیش توانا و بەهرەی بالزاك-ی لە واری خولقاندنەوەی واقیعدا هەیە، نووسینەکانی

موپاسان "پەرداختێکی واقیعیانەی زۆلانەیە لەگەڵ ژیانی سەردەمی تازەدا"، ژ- پلیسیە دەڵێت: "لەم زەمینەیەدا کاری ویدا روونی و رەوانی و شەفافیەتێکی وەهای هەیە کە خوێنەر بەبێ حزووری نووسەر، بە خۆی رووداوەکان دەبینێ".

## هۆزان:

لەساڵی ١٨٥٠ بە دواوە شیعری فەرەنسی، وەکو پەخشانی ئەم وڵاتە کەم هەستیارتر، بابەتی تر و غەیرە شەخسی تر بوو. تەنانەت شاعیرانی رۆمانتیکی-ش، لەوانە هۆگۆ، مەوزوعیەتی زیاتریان بەکاری خۆ بەخشی. تیوفیل گوتیە، کە دەستی لە دانانی شیعری شێتانە و خەیاڵبازانە شۆردبوو، دیوانێکی هەندێ هەڵبژاردە و وەسفی بەناوی گەوهەر نیشانی و میناگەری لە ساڵی ١٨٥٢دا بڵاوکردەوە. تێودور دوبانڤیل "١٠"-ی دۆستی، کە شەیدا و دڵبەندی رستە و دەربڕینی ئاهەنگدار و مۆسیقی و تۆنی زمان بوو، کۆمەڵە بنەما و رێسایەکی بەهاداری لە مەیدانی وەزن و قافیەدا خستەروو. شیعرەکانی وی، وەستایانە و مکومن بەڵام لە توخم و رەگەزێن مەعنەوی و خەیاڵی خاڵی بوون. گوتیە و بانڤیل پردی نێوان قوتابخانەی رۆمانتیك و پارناس-ن.

پارناسیان:

لە ساڵی ١٨٦٦دا بڵاڤۆکێك لە ژێر سەرناوی (پارناسی هاوچەرخ، کۆمەڵە شیعرێکی نوێ) بڵاوبووەوە. ئەم بڵاوکراوەیە شیعری گوتیە، بانڤیل، شارل لوکنت دولیل، فرانسوا کوپە، شارل بودلێر، سولی پرودوم، پل ڤارلین و ستیفان مالارمیە-ی لەخۆ گرتبوو. وشەی پارناسیان، لە هەوەڵەوە بە شیعری هەر یەکێك لە هاوکارانی ئەم کۆمەڵە دەگوترا، پاشان بەناماژەوە بۆ شیعرێن لوکنت دولیل، کوپە، پرودوم و جوزەماریا ئیریدیا بەکار هێنرا. ئەم چوارە زیاتر جەختیان لەسەر ئەقڵ دەکردەوە تا لەسەر هەست، وەکو ناتورالیستەکان لە هەوڵی پێکەوە گرێدانی میتۆدەکانی زانستێن تەجریبی و شیعر بوون. هەموو ئەوانە باوەڕیان وابوو کە شیعر دەبێ غەیرە شەخسی بێ، لە پێناوی حەقیقەتدا بجەبتێ، و کەماڵی شێوە و فۆرم بکات بە مەبەست و ئامانج.

شارل ماری رنە لوکنت دولیل ١٨١٨- ١٨٩٤:

لوکنت دولیل پێشەنگی شاعیرانی پارناس بوو، ئەو پێشەکییەی کە بۆ (قەسیدە کۆنەکان-١٨٥٢) خۆی نووسی، بوو بە بەیاننامەی تاقمی پارناسەکان. وی شاعیرێکی نائومێد و رەشبین

بوو و داخی بۆ دزێوی و گەوجی ئەوروپای رۆژ دەخوارد. بۆیە زۆربەی شیعرەکانی هەڵاتنە لە واقیع، و بۆ نێوەرۆك و تیمەکانی خۆی چاو دەبڕێتە یۆنانی کۆن، رۆژهەڵات، فینلاند و رۆژهەڵاتی دوور. دولیل لە رەنگاندنی دیمەنەکاندا وەستایە. دیارترین تایبەتمەندی وی لە هەنبەر تایبەتمەندی رۆمانتیکەکاندا، "خەیاڵی کۆمەڵایەتی" و باوەڕ بوون بە زانستێن تازەیە. لە دوای (قەسیدە کۆنەکان- ١٨٥٢) بەناوبانگترین کۆمەڵە شیعرێن وی بریتین لە (شیعرو شاعیرانە- ١٨٥٤، قەسیدەێن بەربەری- ١٨٦٢، قەسیدەێن خەمین- ١٨٨٤، و دواهەمین قەسیدە- ١٨٩٥). بێ چەند و چون لوکنت دولیل بۆ ماوەی بیست ساڵان رچە شکێنی شیعری فەڕەنسی بووە.

جوزە- ماریادو ئیریدیا ١٨٤٢- ١٩٠٥:

لە موریدانی پابەندی لوکنت دولیل بوو. تاقە کۆ شیعری وی (سەرکەوتنەکانە- کە لە ساڵی ١٨٩٣دا کۆکراوەتەوە)، ئەم کۆ شیعرە بریتییە لە هەژدە غەزەل و شیعرێن مەوزوعی کە ژیانی رۆژگاری کۆن، سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی تازە وێنە دەگرێ.

رنە فرانسوا ئارمان سولی پرودوم ١٨٣٩- ١٩٠٧:

لە هەوەڵێن شاعیرانی دەستەی پارناس بوو، بەڵام لە ئەنجامدا لێیان دوور کەوتەوە. (لە هەوەڵەوە شیعری هەستیار و پڕ جۆش و خرۆشی دەگوت، بەڵام دڵبەندی وی بە فەلسەفەوە بەرەو ئارمانە مەوزوعییەکانی تاقمی پارناسەکانی برد، گرنگترین بەرهەمی وی قەسیدە فەلسەفیەکانیەتی بەناوی (عەدالەت- ١٨٧٨، و سەعادەت- ١٨٨٨)، بەرهەمەکانی دیکەی بریتین لە (بەڵایەکان- ١٨٦٦، تەنیاییەکان- ١٨٦٩و بەند و هۆزانن- ١٨٦٥) پرودوم لە ساڵی ١٩٠١دا یەکەمین خەڵاتی ئەدەبیی نۆبلی وەرگرت).

فرانسوا کوپە ١٨٤٢- ١٩٠٨:

لە هەوەڵەوە لەگەڵ پارناسەکاندا بوو، لێ پاشان لێیان جیا بووەوە. (شۆرەتی کوپە بەندە بەو قەسیدانەوە کە بۆ هەژارانی گوتوون و بە "شاعیری کەوتووەکان" ناسراوە. یەکێك بوو لە پەیڕەوانی لوکنت دولیل و شێوازە سادەکەی لەوەوە وەرگرتووە. دوو کتێبی (- ١٨٧٢ و دەفتەری سور ١٨٧٤) باشترین شیعری ئەویان لە خۆ گرتووە. کوپە بە کورتە کۆمیدیا و دراما شیعرییەکانیشی بەناوبانگە، لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا رۆمانی (خزمەتکاری دەغەزار- ١٨٩٥)ی لەسەر بنەمای ئەزموونە مەزهەبییەکانی خۆی نووسی، کوپە لە ساڵی ١٨٨٤دا بوو بە ئەندامی ئەکادیمیای فەڕەنسا.

شارل پیر بودلێر ١٨٢١- ١٨٦٧:

لە پاریس هاتە دنیاوە، هەمیشە شاعیرێك بوو "یاخی لە بەرانبەر کۆت و بەندی خێزانی، لە بەرانبەر بنەما ئایینییەکان، لە بەرانبەر هەر جۆرە رێباز یا رەفتارێکی رێز ئامێز". زۆر زوو ئەو میراتییە کەمەی کە لە بابییەوە بۆی مابووەوە بەفیڕۆدا و گیرۆدەی قەرز و دەستکورتی و پەیوەندی حەرام و بەد ئەنجام بوو. لەوە بە دواوە لە رێگەی نووسینی رەخنەی هونەری، رۆژنامەنووسی، و وەرگێڕانی چیرۆکە کورتەکانی ئیدگار ئالن پۆوە -کە لە سەرانسەری ئەوروپادا بەناوبانگی کرد- بژێوی خۆی دابین دەکرد. بۆدلێر خوی دایە خۆشگوزەرانی و رابواردنێکی لە رادەبەدەر و سەلامەتی خۆی خستە مەترسییەوە، و هەر لە پێناوی ژیاندا چوو بۆ بەلجیکا، لەوێندەر سووکە جەڵتەیەك لێی دا و زمانی لەگۆ کەوت، ئەوجا بۆ پاریس گەڕایەوە و لەوێندەر کۆچی دوایی کرد.

بۆدلێر شاعیرانی پارناس بە سیمبولیستەکانەوە گرێ دەدا، واتە مەودای پەیوەندانی ئەو دوو رێبازە ئەدەبییە بوو. ئەویش وەکو پارناسییەکان -کە بە گوڵە تازەکانی بەدی- ١٨٦٦) خۆی لە بڵاوکراوەکەی ئەواندا بەشداری کرد- زیاتر جەختی لەسەر حەقیقەتجۆیی و فۆرم دەکردەوە تا لەسەر بابەت. هەڵبەتە وەکو سیمبولیستەکان دەروونگەرا بوو حەزی لێ بوو پەیوەندی نێوان هۆکاری هەستە جیاوازەکان بەرجەستە بکات، و مانای پەنهان و رەمزی ئەودیوی شتە مەوزوعییەکان کە نیشانەی ئەو مانایانەن، بدۆزێتەوە و کەشف بکات، بۆدلێر لە خەمی شرۆڤەو راڤەی ئەندێشەیەك دا نییە، بەڵکو لە خەمی دروست کردنی ئەنگێزەدایە لە زەین و هزری خوێنەردا.

دیوانە شیعرەکەی (گوڵێن بەدی- ١٨٥٧) یادی ئالن پۆ و سوین برن لە زەیندا زیندوو دەکاتەوە، واتە ئەو دووانە وەبیری خوێنەری دێنێتەوە. شیعرەکانی ناو ئەم دیوانە رەنگدانەوەی حاڵەتە روحی و دەروونییەکانی شاعیرن، و لە یەك ئاستدا نین، هەندێکیان بە شێوەیەکی حەقارەت ئامێز باسی پەشیمانی دەکەن، و هەندێکی دیکەیان کفر گۆیانەن و روحێکی شادی بەدی ئامێزیان تیایە. گەلێك لەم شیعرانە ماکیان لە بێزاری، مەرگ، بەرەڵلایی، گەندەڵی دەروونبینی، رەقی و غەرابەتدایە، رەنگدانەوە و دەنگدانەوەی هەستە تازە و سەیرەکانی شاعیرن.

شیعری بۆدلێر لەڕووی مۆسیقاوە بەرز و لەباری وێنەی خەیاڵییەوە دەوڵەمەندن، وێڕای هەستیاریی و دەرونگەرایی، بنەماکانی کلاسیکیش رەچاو کراون و لەواری فۆرم و شێوەدا لە کەماڵی هونەرییدان. "وا باوە کە رەوتی شیعری هاوچەرخی فەرەنسا لە بۆدلێرەوە دەست پێدەکات".

## سیمبولیستەکان (ڕەمزییەکان)

بزووتنەوەی سیمبولیستی فەرەنسا لە ساڵانی ١٨٧٠- ١٩٠٠ کاردانەوەیەك بوو بەرانبەر بەریالیزمی ڕاستەوخۆ و توندڕەوانەی فلوبێر و مۆپاسان. ناوی ئەم بزووتنەوەیە لەم واقیعەوە دێ کە پێشەوایانی بزووتنەوەکە ڕەمزەکانیان بە شێوەیەکی نوێ بەکار هێنا: لە بری ئەوەی نووسینەکانیان ڕاشکاوانە و ڕوون نیشان بدەن، لە هەوڵی دەربڕینی ئاڵۆز و ڕاز ئامێزانەی هزر و هەست و سۆزەکاندا بوون، ئەو هزر و هەست و سۆزانەی کە بەشێوەیەکی ئاسایی نەدەهاتنە دەربڕین و نیشاندان، مالارمیە دەڵێت: "دەربڕینی ڕاز و نهێنی خەونان بە ئاماژە و هێمای ناڕاستەوخۆ، ڕەمز دەئافەرێنێ".

خانم باتلەر-یش ئاماژە دەکات کە ریفۆرمی بنچینەیی سیمبولیستەکان لەوەدا بوو کە شیعریان لە هەموو شتێك تەنیا لە ڕەگەزی مۆسیقی و مەعنەوی نەبێ، ڕووت کردەوە، ئەو ڕەگەزانەش تەنیا لەبەر خاتری بەهای تەلقینی بوو. ستراچی-ش دەڵێت: "ڤارلین و شاعیرانی هاوبیری وی، لە هەوڵی ئەوەدا بوون تا دەکرێ شیعری خالیسە و دەگمەن دابهێنن، ئاڵۆزی و ڕەمز و ڕاز و سۆزی مرۆڤانیی ئاوێتە بکەن، لە حەقیقەتی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا دوور بکەونەوە، و تا دەکرێ زیاتر شیعر لە مۆسیقا نزیك بکەنەوە...".

جا بەم پێیە دەکرێ تایبەتمەندییەکانی شیعری سیمبولیستەکان بە توانای ئیلقا و کاریگەری، زهنیەتگەرایی، پشتگوێ خستنی بونیادی دەستووری زمان، پابەندی بە توانای ئاهەنگداری وشەوە بزانرێ. لە کاتێکدا کە شاعیرانی پارناس بە پەیوەندی نزیکی نێوان شیعر لەلایەك، و نیگارکێشی و پەیکەرتاشی لەلایەکی ترەوە، قایل بوون، سیمبولیستەکان مۆسیقایان بەو هونەرە دەزانی کە زۆرترین پەیوەندی بە شیعرەوە هەبوو.

جگە لە ڤارلین، رامبو[١١]، و مالارمیە، کە بە پێشڕەوانی سیمبولیزم دەژمێردرێن، سیمایانی بەرجەستەی دیکەی بزووتنەوەی نێوبراو بریتین لە: (جان موریس ١٨٥٦- ١٩١٠، جول لافورگ ١٨٦٠- ١٨٨٧، فرانسوا ویلە گریفین ١٨٦٤- ١٩٣٧، و هنری دورنیە ١٨٦٤- ١٩٣٦)، کە سیمبولیان لە شیعردا بەکار هێنا. لە ڕۆماننووسانی سیمبولیست جوریس کارل ئویسمان ١٨٤٨- ١٩٠٧، زمانێکی ئاسك و شێوەیەکی جوانی هەبوو، و لە درامانووسانیش موریس مەتەرلینگ ڕەمزییەتی هێنایە ناوشانۆوە.

پول ڤارلین ١٨٤٤- ١٨٩٦:

ڤارلین شاعیرێکی دەسباد و ئەهلی رابواردن بوو. هاوسەرەکەی لێـی جیـا بـووەوە، ڤـارلین رامبۆی مورید و باشترین دۆستی خۆی بەر گولله دا و بریینداری کرد. لەسەر ئەمە بـۆ مـاوەی ساڵ و نیوێك (١٨٧٣- ١٨٧٥) له مون زیندانی کرا. پاشان بۆ پاریس گەڕایەوە و تا مردن بـه دەستکورتی و کولەمەرگی لەم شارەدا ژیا.

شیعری ڤارلین بـه راز ئـامێزی، ناسـکی، موسـیقا، جـۆش و خـرۆش، دەروونگـەرایی و مالیخولیایی بەناوبانگە، هەندێ له شیعرەکانی رەنگدانەوەی عەیش و نۆش و بێ سـەروبەری شاعیرن، و ئەوانی دیکەی سەر رێژن له پەشـیمانی و خواناسـی مەزهـەبی، کـونترین دیوانـه شیعری وی (هۆزانێن کەیوانی- ١٨٦٦)یە، که کاریگەری پارناسیەکان و بۆدلێری پێوە دیارە، (کۆڕی دۆستایەتی- ١٨٦٩) کۆمـەڵێك وێنـەی جـوان و دلگـیر دەربـارەی ڤێرسـای سـەدەی هەژدەیەم دەگرێ، (گۆرانی خۆش- ١٨٧٠) کۆی بیست و شەش هۆزانەکە له زەماوەندی خۆی و موتەدو فلورڤیلەوە هەڵێنجراوە: (بەسەرهاتەکانی ئـەڤینێکی بێـدەنگ- ١٨٧٤) کۆمەڵـه شیعرێکی لیریکییە دەربارەی دڵتەنگی و بێزاری و نامۆیی خۆی له موتەدو فلورڤیل -که لـه ساڵی ١٨٧٠دا خواستبووی- داینـاوە. (ئـاوەز- ١٨٨١) "یەکێکـه لـه گـەورەترین کتێبـێن هۆزانین مەزهەبی له جیهاندا"، ئەمە رەنگدانەوەی مەیلی ناخی ڤارلینه دەرهەق به پرنـسیپ و بنەماکانی کلێسای کاتولیـك-ی روم، و شـیعرەکانی سـەردەمی زینـدانی شـاعیری لـەخۆ دەگرێ. هەندێ له شیعره بەناوبانگەکانی ڤارلین ئەمانەن: "هەیڤه شەو، ئاسمان بەسـەربانەوە، گۆرانی پاییزی".

جان ئارتور رامبو ١٨٥٤- ١٨٩١:

دۆست و موریدی ڤارلین بوو، و هەرچی شیعرێکی پێ بوو تا نۆزدە ساڵی هەمووی گوت، و لەوە بە دواوە هەرگیز شیعری نەگوت. پاش تێکچوونی لەگەڵ ڤـارلین-ی مامۆسـتایدا "چـەند ساڵێکی له پاریس و ئەوروپادا بەسەر بـرد و لـەم ماوەیـەدا زۆرکـاری وەکـو مامۆسـتایەتی، کرێکاری فیتەرخانـەی کەشتی، سـەربازی، وەرگێـڕی، مـاموری سـەربازگیری، ژمێریـاری و دیدەوانی راو-ی کرد". له سـاڵی ١٨٨٠دا چوو بۆ کەناری رۆژهـەڵاتی ئـەفریقیا و بـۆ مـاوەی یازدە ساڵان له حەبەشەدا خەریکی سەودا و کڕین و فرۆشتنی (قاوە، چەك، و کۆیلە) بوو.

شیعری رامبۆ لەڕووی ئاهەنگەوە له شیعری ڤارلین ناسکترە، بەڵام به هەمان ئەنـدازە توانـای ئیلقـایی و کاریگـەریی هەیـە، دیـارترین خەسـڵەتی شـیعری رامبـۆ بریتییـە لـه (رەنگـی

تۆن "Tone- color"[١٢])، سادەیی هزر، هەڵاتن لە دەستوور، سوود وەرگرتنی کەم لە شیعری ئازاد، دەربڕینی چڕ و ئاڵۆزاندنی بە ئانقەست، سوڕانەوە بە دەوری یەك خواستنی سەرەکیدا).

رامبۆ دوو دیوانی هەیە بە ناوی: "دەرەوشانەوە، وەرزێك لە دۆزەخدا" کە دیوانی دووەمیان ژیاننامەی سەردەمی پێگەیشتنی شاعیرە. قەسیدە بەناوبانگەکانی رامبۆ بریتین لە (بەلەمی مەست و سوناتەی ڤاوڵەکان).

## ستیفان مالارمیە ١٨٤٢- ١٨٩٨:

لە پاریس لە دایك بوو، و لە ئینگلیستان زمانی فەرەنسی بە دەرس گوتووەتەوە و لە فەرەنسا ئینگلیزیی گوتووەتەوە، کۆڕ یا یانەیەکی بەناوبانگی لە ماڵەکەی خۆیدا بە ناوی (سێ شەممە)وە دامەزراند، کە هەوادارانی قوتابخانەی سیمبولیزم و لەوێ دادەنیشتن و گفتوگۆیان دەکرد. جگە لەمە ئیدی ژیانی شاعیر لە گۆشەگیریدا بەسەر براوە، کەسایەتی مەحبوب و جوانی زمان و دەم و دووی مالارمیە، زۆر کەسی بۆ یانەی (سێ شەممە) راکێشا، و ئەویش پایەی رابەر و پێشەوای سیمبولیستەکانی بەدەست هێنا. مالارمیە، زۆر بە قوڵی لە ژێر کاریگەری هونەرمەندانی بەرلە روفائیلی[١٣]یەکان دا بوو، واتە بۆدلێر، ڤارلین، ئالن پۆ (کە مالارمیە هەندێ لە شیعرەکانی وی بۆ زمانی فەرەنسی وەرگێڕا). مالارمیە نەك هەر لە بەکار هێنانی وشەدا پاشەکەوت کار بوو، بەڵکو پشتیوانی لە ئاڵۆزی نووسین دەکرد، و بە کردەوە گوێی بە بونیادی دەستووری زمان نەدەدا، لە روانگەی ئەوەوە (شیعر بۆ عەوامی خەڵك دەبێ مەتەڵ ئاسا بێ، و بۆ ئەهلی هونەر و مەحرەمانی راز وەکو مۆسیقا تایبەتی بێ)، مالارمیە "لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە شیعر لە هەر شتێکی ماددی و هەست پێکراو داماڵێ، و هەست و ئەندێشەکانی ئەودیوی ئاناگایی بە هێمایانی ناراستەوخۆ، لە رێگەی دەنگ و وێنانەوە بەرجەستە و ئاشکرا بکات، کە هەر ئەمەش بووە بە هەوێنی ئاڵۆزی و تەمومژاوی کردنی شیعر و پەخشانی وی". تەقریبەن هەر شیعرێکی مالارمیە بە دەوری تەوەری یەك وێنە یا خواستنەوە دەسوڕێتەوە، و کۆمەڵێك وێنەی لە دەور چێ دەبێ، تا ئەندێشە سەرەکییەکە بەرجەستە بێ و بەیێ.

چەند کەسێك لە پەیڕەوانی مالارمیە (بەتایبەتی جول لاڤورگ و گوستاف[١٤]کان) بەلای شیعری ئازاددا دایانکێشا، کە تارادەیەك لاسایی کردنەوەیەکی شیعری ئازاد-ی والت ویتمن بوو.

گرنگترین دەفتەرانی پەخشان و شیعری مالارمیە بریتین لە: (پاش نیوەڕۆی یەك فۆن[١٥] - ١٨٧٦) (کە سروودێکی (گۆرانی) شوانکارەییە و ئیلهامبەخشی دبوسی[١٦]یە لە دانانی

پێشەکی گۆرانییەکدا بە هەمان ناونیشان)، (هەڵبەست و پەخشان- ١٨٩٣) کە کۆمەڵە شیعرێکی سەردەمی لاوی شاعیرە، ورێنە- ١٨٩٧) کتێبێکە بە پەخشان و بۆچوونە ئەستاتیکییەکانی مالارمیە دەر دەبڕێت.

## شانۆنامە

درامای ڕۆمانتیك تەمەنێکی کورتی هەبوو، و لە هەرەتی برەویش دا لە نێو بۆرژواکان، شۆڕشگێڕەکان، و دیموکراتەکاندا ڕەواجێکی ئەوتۆی پەیدا نەکرد. هەر شان بە شانی درامای ڕۆمانتیك، کۆمیدیای ڕەفتاران لە ساڵی ١٨٥٠ بە دواوە بەردەوام بوو، و زیاتر ڕەواجی پەیدا کرد. پاشان سێ جۆرە درامای دیکە بوون بە باو: کومیدیای سووکەڵە یان ڤودڤیل، درامای ناتورالیستی، و درامای سیمبولیستی.

## کۆمیدیای ڕەفتاران

ئوگوستین ئوجین سکریب ١٧٩١- ١٨٦١:

سکریب نزیکەی چوار سەد شانۆنامەی نووسی، کە زۆربەیان بە هاوکاری شانۆنامەنووسانی دیکە بوو. لەسەرەتاوە بە نووسینی شانۆنامەی فارس و چوارینەی تەنزئامێز دەستی پێکرد، ئەوجا رووی کردە کۆمیدیای ڕەفتاران لە جۆرێکی جدیتر، بەڵام هەر شاد. شێوەی شانۆنامەنووسینی سکریب، بەتایبەتی لەڕووی بونیادی پلۆت و نەخشەی درامییەوە وەستایانەیە، بەڵام شانۆنامەکانی هزرو شێوازیان تێدا نییە، جگە لە توانای دیتنی سەرڤە سەرڤە چ شتێکی دیکە نیشان نادات. لە دانانی شیعری ئۆپرایی-شدا دەستێکی باڵای هەبوو. بەناوبانگترین شانۆنامانی وی بریتین لە: (بیست و پێنجەمین ساڵی زەماوەند- ١٨٢٧، ڕەفاقەت- ١٨٣٦، و پەرداخی ئاو- ١٨٤٢).

ئیمیل ئوجیە ١٨٢٠- ١٨٨٩:

ئوجیە چەند شانۆنامەیەکی مێژوویی نووسی، کە بەناوبانگترینیان: (سەرکێش- ١٨٤٨، و فلوت ژەن- ١٨٥٠)یان ناوە. بە هەر حاڵ شۆرەتی ئوجیە بەندە بە کۆمیدیاکانییەوە (کۆمیدیای ڕەفتاران). لە کۆمیدیای گابریلدا ڕەخنە لە هەستیاری بوونی ڕۆمانتیکەکان و هەرا و هەنگامە و هەڵچوونی دەستکردیان دەگرێت، لە (زاوای جەنابی بواریە)- ١٨٥٤دا

وێنەی کابرایەکی بۆرژوای نۆکیسە دەگرێت. لە کۆمیدیاکانی ئوجیەدا ململانێی نێوان پارە و ئابرو هەوێنی رووداوەکانی چیرۆکی شانۆنامە پێکدێنێ.

ئەلکساندەر دوما-ی کور ١٨٢٤- ١٨٩٥:

کوڕی رۆماننووسی بەنێو بانگ ئەلکساندەر دۆما-ی باوك بوو. دۆما تەقریبەن لە هەر شانۆنامەیەکیدا دەرسێکمان فێر دەکات- دەرسێك کە یەکێك لە کاراکتەرەکان وەکو پەیڤداری نووسەر دەری دەبڕێ. یەکەمین شانۆنامەی سەرەکی دۆما (لادام ئوکا میلیا- ١٨٥٢)یە کە بابەتەکەی بەسەر هاتی ژنێکی سۆزانییە کە بە بەرەکەتی خۆشەویستی پاك دەبێتەوە. (هەندێ لە شانۆنامەکانی دیکەی دۆما، کە پتر فێرکاری و رەمزین ئەمانەن: نیوەی جیهان- ١٨٥٥، کوڕی حەرامزادە- ١٨٥٨، و ژنێکی سەیر- ١٨٧٦. دۆما لەم بەرهەمانەدا هێرش دەکاتە سەر ئەخلاقیاتی رۆمانتیك و تەقەدوسی ئایی چینی بۆرژواو، و بە خۆی لە شێوەی مامۆستایەکی ئەخلاقی سەختگیر و وشکە موقەدەس دەردەکەوێ).

ڤیکتۆرین ساردو ١٨٣١- ١٩٠٨:

ساردۆ نزیکەی هەفتا شانۆنامەی نووسی کە لە چوار خانەی جۆراوجۆردا دەگیرسێنەوە:

١- *کۆمیدیای دەسیسە و پیلانگێڕی وەکو پارچە کاغەزان- ١٨٦١.*
٢- *کۆمیدیای رەفتاران، وەکو دۆستانمان- ١٨٦١.*
٣- *کۆمیدیای رامیاری وەکو رباگا- ١٨٧٢.*
٤- *شانۆنامەی مێژوویی، وەکو نیشتیمان- ١٨٦٩، ئەفرەت- ١٨٧٥، و لاتوسکا- ١٨٨٧، ساردۆ مامۆستای دیمەن ئارایی و تەکنیکی دراماتیکییە، کۆمیدیاکانی، هەر چەند کەم هەوێنن، بەڵام زیندوو و زیرەکانەن.*

## کۆمیدیای سوکەڵە یان ڤۆدڤیل

لەسەردەمی ئیمپراتۆرییەتی دووەمدا کۆمیدیای سوکەڵە باوترین شێوەی درامابوو. بەناوبانگترین نووسەری ئەم جۆرە کۆمیدیایە ئوجین لابیش ١٨١٥- ١٨٨٨ بوو کە (بە هاوکاری کەسانی دیکە) شەپقەی حەسیری دەستکردی ئیتالیا- ١٨٥١ و شاکاری، سەفەری ئاغای پریشون- ١٨٦٠ی نووسی. هنری میاك ١٨٣١- ١٨٩٨و لودڤیك هالەڤی ١٨٣٤- ١٩٠٨ دوو نووسەری دیکەی مەیدانی کۆمیدیای سوکەڵە بوون کە بە هاوکاری یەکدی ژیانی

پاریسی- ١٨٦٧، و خشەخش- ١٨٦٩و مارکیزە چکۆل- ١٨٧٤یان نووسی. دوا جار دەبێ ئاماژەیەك بۆ ئیدوارد پایرون ١٨٣٤- ١٨٩٩ بکرێ کە بە شانۆنامەی تەنزئامێزی (دنیا مرۆڤ بێ تاقەت دەکات- ١٨٨١) کە دەربارەی ناز و نوزی ژنانە، شۆرەت و ناوبانگی دەرکرد.

## شانۆنامەی ناتورالیستی

ناتورالیزم هەوەڵجار لە رۆماندا و پاشان لە شانۆنامەدا دەرکەوت. لە شانۆنامەشدا تەمەنی شکۆفایی کورت بوو. تاقە نووسەرێك کە شانۆنامە ناتورالیستییەکانی شایانی باس بن، شانۆنامەنووسی بالاّ دەست هنری بیك ١٨٣٧- ١٨٩٩یە کە تەنزێکی تاڵ و توندی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا لە دیمەن ئارایيدا کەم شارەزایە، کاراکتەرسازی وی یەکنەوا و تاقەتبەرە، گفتوگۆکانی تاقەتبەر دەنوێنن، ئەو برگە ژیانەی کە بەشێوەیەکی بابەتی وێنەی دەگرێ، دزێو و تاقەتبەرە. باشترین شانۆنامەی: میشیل پوپەر- ١٨٧٠، قەلان- ١٨٨٢، و ژنی پاریسی- ١٨٨٥یان ناوە.

## شانۆنامەی سیمبولیستی

ڤیە دولیل ئادام ١٨٣٨- ١٨٨٩:

کە لە سەرەتادا شاعیرێکی رەمزی بوو، و پاشان هەندێ چیرۆکی نووسی کە چەمکی مەعنەوی و رەمزییان لە پشتەوە هەبوو. باشترین شانۆنامەی ئەو بریتییە لە: ئیلین- ١٨٦٣، شۆرش- ١٨٧٠، و دنیای نوێ- ١٨٨٠، دنیای نوێ باسی خەباتی ئەمریکایە لە پێناوی جیابوونەوە و رزگار بوون لە ئینگلیستان (دراماى خەیاڵی ئاکسل- ١٨٩٠ یەکێکە لە شانۆنامەکانی دیکەی ئەو).

موریس مەتەرلینگ ١٨٦٢- ١٩٤٩:

مەتەرلینگ پێشەوای گەورەی شانۆنامانی رەمزییە. لە گنت- شارێکە لە باکووری رۆژئاوای بەلجیك -لە دایك بوو. زۆر بەرهەمی لە پاش بەجێماوە: (شازادە خانم مالین- ١٨٨٩، نابینا- ١٨٩٠، پلیاس و ملیزاند- ١٨٩٢، کە دبوسی ئاوازێکی ئۆپرایی لەسەر دانا بالّندەی شین- ١٩٠٩، کە رەنگە بەناوبانگترین شانۆنامەی وی بێ، مردن- ١٨١٣، و موجیزاتی قەشە ئانتوان- ١٩١٩) زۆربەی ئەم شانۆنامانە لە مێژوو و ئەفسانانەوە سەرچاوە

دەگرن، ئەم شانۆنامانە بە ناسکی، خەیاڵ و غـەریبی، خـەمی نـەدیار سـادەیی و رەمزییـەتی لەسەر بناغە و بنەمای ئـەخلاقی و سـایکۆلۆژی رۆنـراو ناوبانگیـان دەرکـردووە. مـەترلینگ نووسینی زۆریشی دەربارەی ئەدەبیات، سروشت، و مردن هەیە، (ژیـان و گـوڵان- ۱۹۰۷، لـە بەردەم خوادا- ۱۹۳٤، و دنیایەکی تر- ۱۹٤۲) بە گرنگترین ئەو نووسینانە دەزانرێن.

# ژێدەران:

١- ئالفرید دریفوس- Alfred Dreyfus (1859- 1935).

٢- باربیزون- Barbizon: ڕێبازێکی شێوەکارییە کە لەنێوان ساڵانی ١٨٣٠- ١٨٧٠دا بـرەوی هـەبوو، ناوەکەی لە ناوی گوندی باربیزون-ی نزیکی جەنگەڵی فونتن بلو (لە باکووری فەرەنسا) وەرگیراوە. تاقمێـك لـە شێوەکاران کە تاقمی سی کەسەیان پێ دەگوترا دەچوون بۆ ئەو گوندە و دیمەنە سروشتییەکانیان ڕەسم دەکرد، و ئەمانە ڕێبازی باربیزون-یان هێنایە ئاراوە، ئەمانە لـە کارەکانیانـدا، بـە کلاسـیکی و ئیتاڵیاییـەکانی ئـەو سەردەمەی نیگارکێشیان ڕەفز دەکرد و خوازیاری دیتنی ڕاستەوخۆی تەبیعەت و سروشت بوون.

٣- خەوی هیپنوتیزم یا خەواندنی موگناتیسی، کـە بـۆ یەکـەمجار فردریـك ئـانتون مـسمر-ی پزیـشکی ئەمساوی لە ڤیەنا لە ساڵی ١٧٧٥دا سوودی لێوەرگرت.

٤- عەمانوێل سودنبرگ ١٦٨٨- ١٧٧٢:

فەیلەسووف و حەکیمی سوێدییە. ئەو دەیگوت کە تەنیا عیسا خوایە و دەستەواژەکانی کتێبی موقەدەس پڕن لە مانای نهێنی ئامێز کە دەبێ پەی بە چەمك و ماناکانیان ببرێ، پەیڕەوانی سـودنبرگ پـاش مردنـی وی ڕێکخراوی کڵێسای ئورشەلیمی نوێیان هێنایە ئاراوە.

٥- تانیت- Tanit:

ئیزەد بانۆی کارتاژە، و هاوسەری هامونە.

٦- میدان- Medan:

شارێکی ئەندەنووسییە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سومەترە.

٧- لورد- Lourdes:

ناوچەیەکە لە باشووری ڕۆژئاوای فەرەنسا.

٨- سارا برنار: ناوی خوازراوی روزین برنار-ی خانم ئەکتەری ناسراوی فەرەنسی ١٨٤٤- ١٩٢٣.

٩- برایانی گنکور: دوو برای رۆماننوسی بەناوبانگی فەرەنسین لە سالآنی ١٨٢٢- ١٨٩٦، و ١٨٣٠- ١٨٧٠دا ژیاون.

١٠- تیۆدور دو بانڤیل (١٨٢٣- ١٨٩١):

شاعیر و نووسەرێکی فەرەنسییە.

١١- هەندێ لە مێژوونووسانی ئەدەبی ڤارلین و رامبۆ بە خودانی رێبازی دارووخان- Decadents لە قەڵەم دەدەن و فەرق لە نێوان ئەوان و رێبازی مالارمیە، واتە رەمزییەکان دەکەن، بە هەر حاڵ ئەو شێوانەی کە ئەم دوو تاقمە بەکاری دێنن هێندە لە یەکترەوە نزیکن، کە ئەم فەرق و جیاوازییە زۆر جار ناکەوێتە بەرچاو.

دکادنەکان باوەڕیان بە ئازادی هونەر هەبوو، و لەبەرهەمەکانیاندا ئیلهامیان لە ئازادی هونەر و سۆز و گودازی ناخۆش و خەمینی مرۆڤانی وەردەگرت. ئەوانە بیروباوەڕ و داب و نەریتە ئاساییەکان و ئەخلاقیاتی پەیوەندی سێکسی-یان بە ئاشکرا رەفز دەکرد و لەگەڵ دەوروبەر و ژینگەدا ئەبان بوون. تایبەتمەندێتی بەرهەمەکانی وان بریتییە لە توێکاری بەسوێی سۆزە مرۆڤانییەکان و بابەتە ناباو و شەهوانییە پەشێو و توندەکان.

١٢- رەنگی تۆن- Tone- color:

شێوەیەکە لە داهێنانی سیمبولیستەکان و بریتییە لە قاییل بوون بە رەنگ بۆ وشە و پەیڤان، بۆ وێنە رەنگی رەش بۆ ئانومێدییە، سپی بۆ گەشبینییە و..... هتد.

١٣- رۆفائیلییەکان: ناوی کۆمەڵە شاعیر و نیگارکێشێکی ئینگلیزە کە لە ساڵی ١٨٤٨دا لە دەوری یەکدی خڕبوونەوە دژی ئەو بارودۆخەی کە هونەری ئینگلیستانی تێدابوو، ئەمانە کاری شێوەکارانی ئیتاڵیایی پێش روفائیل-یان بە سەرچاوەی ئیلهامی خۆ دەزانی.

١٤- گوستافکان: ١٨٥٩-١٩٣٦ شاعیرێکی رەمزی فەرەنسییە.

١٥- فۆن: لە ئەفسانانی رومی کۆندا، پاسەوانی خودا ئاسای مەزراکان بوو.

١٦- دبوسی: ١٨٦٢-١٩١٨ موسیقازانێکی فەرەنسی بوو کە پەیوەندی نزیکی لەگەڵ بزاڤی سیمبولیزمدا هەبوو.

# ئەدەبیاتی فەرەنسا
# لە
# سەدەی بیستەمدا

سەرەتایەکی مێژوویی:

"نەو ریالیزم" و گەشبینی کە لە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٠دا دەست پێدەکات، لە ماوەی چواردە ساڵی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هەمان گوڕ و تینی هەیە. فەلسەفەی برگسون و نیتشەش دەگاتە لوتکەی نەشونما و گەشەکردن، ئەم قۆناغە، قۆناغی بڵاوبوونەوەی کۆلۆنیان، و پەرەسەندنی ناسیونالیزم، و نیشتیمانپەروەریشە.

بەڵام لە ساڵی ١٩٠٥دا ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانیا لە تەنجە"[١]" جوێن بە فەرەنسییەکان دەدات، و بەجۆرە نیشانەکانی ناکۆکی نێوان ئەڵمانیا و فەرەنسا ئاشکرا دەبێ، لە ساڵی ١٩١١دا ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی جدی تر لە ئەغادیر"[٢]" روو دەدا. و لە ئەنجامدا لە ساڵی ١٩١٤ تۆفانێك بەسەرا دێ کە ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمان نابووت دەکات و فەرەنسا بەرەو وێرانی دەبا.

ماوەی نێوان جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم قۆناغی بێزاری و نائومێدی، چەوسانەوە و بەدگومانییە، پێکادان و نەبانی بیروباوەڕە سیاسی و ئابوورییەکان دەبێتە باعیسی بێ قەراری زیاتری دەوڵەت، و هەوڵ و تەقەلای ژیاندنەوەی واقیعی سوپایی ئەڵمانیا، خەلکانێکی ئاشتی خوازی دژ بەو ژیاندنەوە سوپاییە دەخولقێنێ، بەتایبەتی کە هیتلەریش لە ساڵی ١٩٣٣دا دەگاتە دەسەلات، لەم قۆناغەدا فەلسەفەی کار-ی ویلیام جیمز و دەروونناسی زیگموند فرۆید"[٣]"، زۆر بە قوڵی کار لە هزرین و بیری فەرەنسییان دەکات.

ساڵانی پاش کۆتایی دوایەمین ململانێ، وەکو قۆناغی دوای جەنگی جیهانی یەکەم، سەردەمی نائارامی، بێزاری و ترس- بەتایبەتی ترس لە رووسیا و کۆمونیزمە.

نۆڕینێکی گشتی:

گەلێك لە نووسەران و شاعیرانی ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەیەم لە سەدەی بیستەمیشدا لەسەر داهێنانی خۆ بەردەوام بوون. ناتورالیزم و سیمبولیزم لەمێژ بوو روو لە نەمان بوون، بەڵام هیچ قوتابخانەیەکی نوێ جێی نەگرتبوونەوە. هەڵبەتە هەندێ رێباز و قوتابخانان-ی وەکو نەو رۆمانتیزم، ڤیتالیزم "٤"، دینامیزم "٥"، فوتوریزم، و چەند قوتابخانەیەکی دیکە کەم دابێژێك برەویان پەیدا کرد، بەڵام هیچ یەکێکیان ئەوەندەیان بایەخ پەیدا نەکرد، کە سەردەمێکی تازە لە مێژوودا بکەنەوە. بە هەر حاڵ دەکرێ هەڵوەستە لەسەر چەند رێچکەیەك بکرێ. یەکەم، لە سەرەتای سەدەدا جۆرە گەشبینی، ناسیونالیزم، نیشتیمانپەروەری، و ئەکتیڤیزمێکی "٦" باوی ئەم قۆناغە تارادەیەك رەوتی ئەدەبیات دیاری دەکات. لەو ساڵانەدا ژمارەیەك لە نووسەران روویان کردە عیرفان و مەزهەب. لە ماوەی هەر یەکێك لە دوو جەنگی جیهانی ژمارەیەك بەرهەمی بایەخدار لە واری جەنگ و دەربارەی جەنگ هاتنەنووسین، رەشبینی و بێبەشی و بێ مرادی گەلان لە ئەدەبیاتی پاش هەر جەنگێکدا رەنگی دایەوە. لە سەدەی بیستەمدا دوو رێبازی پایەداری دیکەش هاتنە ئاراوە و پەسند کران.

١- *روو کردنە دنیای ناوەوەی زەین و ویژدانی ناخودئاگا.*

٢- *زۆربوونی پێشداوەری و دڵبەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی.*

یەکێك لە نوێترین قۆتابخانە هونەرییەکان قوتابخانەی سوریالیزم "٧"-ە لە (ئەدەبیات و شێوەکاریدا) کە پشت بە نائاگایی (لاشعور) دەبەستێ. (پەیڕەوانی ئەم راپەڕینە هەمیشە جەخت لەسەر کۆمەڵە بنچینە و پرەنسیپێك دەکەن کە لە جیهانی خەون و خەیاڵیان نزیك دەکاتەوە و لە جیهانی راستی و واقیعی دووریان دەخاتەوە).

بزووتنەوەیەکی دیکە کە کاریگەرییەکی قوڵی بەسەر ئەدەبیاتەوە هەبوو، ئەگزیستانسیالیزمە کە جان پۆل سارتەر بە پێشەنگی گەورەی ئەو رێبازە دەژمێردرێ، ئەم رێبازە لەسەر بناغە و پایەی پوچی جیهان، ئازادی تەواوی ویست، و توانای مرۆڤ لە خولقاندنی چارەنووسی خۆیدا، رۆنراوە. (هزرڤانانی ئەم رێبازە پێیان وایە کە بوون لە پێشەوەیە نەك ماهیەت، چونکە مرۆڤ لە کرۆکی ماهیەتدا خاوەنی هیچ جۆرە سروشت و خوویەکی خۆرسك نییە، بەڵکو لەو شتانە دروست بووە و پێکهاتووە کە لە ((جیهانی بوونەوە)) بە دەستی هێناوە).

## شانۆنامە

وەکو پێشتر ئاماژەی بۆکرا مەتەرلینگ لە سەدەی بیستەمدا رەمزییەتی هێنایە ناو جیهانی شانۆنامە نووسییەوە. جگە لەمە سێ جۆرە شانۆنامەی دیکەش کە لە سەدەی نۆزدەمەوە سەریان هەڵدابوو، لە سەدەی بیستەمیشدا هەر رەواجیان هەبوو —شانۆنامەی مەزهەبی، شانۆنامەی رەخنەیی- کۆمەڵایەتی و شانۆنامەی نە و رۆمانتیك.

## شانۆنامەی مەزهەبی

پۆل کلودیل ١٨٦٨- ١٩٥٥:

شانۆنامەنووس و سیاسەتوان بوو (ماوەیەك سەفیر باشی فەرەنسا بوو لە وڵاتە یەکگرتووەکان)، یەکێك بوو لە پەیڕەوکارانی شێوازی ئەدەبی رامبۆ و مالارمیە، کە شێوازێکی تەرکیبی، پەیوەستە، چڕ و کورتە. شانۆنامەکانی کلودیل زمانێکی پەخشانی وەزنداریان هەیە، و دەکرێن بە چەند بەشێکی چەند بەندییەوە. لە واری شیعردا باوەڕی وابوو کە تەنیا شاعیر بوونەوەران دەرك دەکات و بەهزری مرۆڤانییەوەی گرێ دەدا.

ناوەڕۆکی دڵخوازی وی بریتییە لە (ناپایەداری سەرکەوتنە دنیاییەکان و جوانییەکان و مەسەلەی کۆنترۆڵ کردنی نەفس.ـە، لەڕاستیدا، درامای کلودیل ستایشێکی کۆشش و کار و چالاکییە، هەروەها ستایشی مەزهەبی کاتولیکە).

باشترین شانۆنامەی کلودیل بریتییە لە: (سەری زێڕین- ١٨٩١، گۆڕینەوە- ١٨٩٤، ئەو مژدەیەی کە بە مریەم گەیی- ١٩١٢، ئاگامەمنون- ١٩١٢، و نانی وشك- ١٩١٧).

کلودیل گەلێك شیعری مەزهەبی پڕ جۆش و خرۆشیشی داناوە، کە "هۆزانێن تاراوگەی- ١٨٩٥"ی وی ناوبانگێکی تایبەتی هەیە.

## شانۆنامەی (رەخنەیی- کۆمەڵایەتی)

کاریگەری ناتورالیستان، ئەلکساندەر دۆمای کوڕ، ئیمیل ئوجیە، و هنریك ئیبسن بەسەر شانۆنامانی رەخنەیی —کۆمەڵایەتییەوە، کە لە ساڵی ١٨٩٠ بەدواوە دەگەشەێتەوە و پەرە دەسەنێ، ئاشکرایە. نووسەرانی ئەم جۆرە شانۆنامانە، شانۆیان بە مینبەر و سەکۆیەك دەزانێ بۆ باس و گفتوگۆ دەربارەی دۆز و کەجرەفتارییە باوەکان. درامای رەخنەیی- کۆمەڵایەتی دەبن

بە دوو دەستەی سەرەکییەوە: شانۆنامانی سایکۆلۆژی و شانۆنامانی فەلسەفی یان سیوسیولۆجی. دیارترین نوێنەرانی شانۆنامانی سایکۆلۆژی بریتی بوون لە: (جورج دو پورتوریش ١٨٤٩- ١٩٣٠، فرانس دوکوری ١٨٥٤- ١٩٢٨، و هنری باتای ١٨٧٢- ١٩٢٢). دیارترن نووسەرانی شانۆنامانی فەلسەفی و سیوسیولیوجی-ش ئەمانە بوون: (فرانسوا دوکورل، ئوجین بریو ١٨٥٨- ١٩٣٢، و شارل ویلدراگ).

## شانۆنامەی نەو رۆمانتیك

درامای نەو رۆمانتیکی فەرەنسایی سالآنی ١٨٩٠- ١٩١٥ کە کاردانەوەیەك بوو لە هەنبەر ناتورالیزم و رەشبینی و نائومێدی، بوو بە مایەی پەسندی ئاشقانی شانۆ، ژمارەیەك لەم شانۆنامانە کۆمیدی بوون، هەندێکیان مێژوویی، و بڕێکیان تراجیدی بوون. شانۆنامە رەمزییەکانی مۆریس مەتەرلینگ لەرووی لوجیکییەوە دەچنە خانەی شانۆنامانی نەو رومانتیکەوە. سیما دیارەکانی دیکەی ئەم جۆرە درامایانە لە: (هنری دوو بورنیە ١٨٢٥- ١٩٠١، فرانسوا کوپە ١٨٤٢- ١٩٠٨، و ئەدمون روستان ١٨٦٨- ١٩١٨) بوون.

ئەدمون روستان ١٨٦٨- ١٩١٨:

روستان شانۆنامەنووسێکە هەمیشە شاعیر و، باشترین بەرهەمی لیریکی، قارەمانی و خەیاڵییە. مەداری زمانی وی یەجگار دەوڵەمەندە، لە واری داهێنانی رووداو و هەڵوێستی سۆزداری توند و لوتکانی شکۆداردا مامۆستا بوو. هەروەها لە داهێنانی "بەندی مێژوویی، دیمەنێن پڕجۆش و خرۆشی ئاشقانە، حازر وەڵامی، و داهێنانی دیمەنی بەزمیی وروژێن دا" بە توانا بوو. دوو شانۆنامەی بەنێوبانگی روستان: (سیرانۆ دو برجراك- ١٨٩٧، و بێچوە هەڵۆ- ١٩٠٠)یان ناوە.

سیرانۆ دو برجراك راپۆرتێکی دراماتیکییە دەربارەی ژیانی درامانووس و رۆماننوسێکی سەدەی حەڤدەیەم. سیرانۆ ((ئاشقێکی بەرزەفڕ و فیشاڵباز و شەقاوەیە، کە لە هەر کارێکدا، لە قەشمەربازییەوە تا گیانبازی، بە توانا و باڵا دەستە)) ئەو کە چارەیەکی ناشیرینی هەیە (کەپوو گەورەکەی بووە بە نموونە)و ناتوانێ دڵی رۆکسان بەدەست بێنێ، کۆمەڵێك نامەی دڵداری بۆ دەنووسێت، بەڵام نەك بە زمانی خۆیەوە، بەڵکو بە زمانی کریستیانی خوازیاری رۆکسانەوە. ئەم نامانە دەبنە مایەی ئەوەی کە کریستیان لەگەڵ رۆکساندا زەماوەند بکات. کریستیان پاش ماوەیەکی کورت لە شەڕێکدا دەکوژرێ، بەڵام سیرانۆ تاکو دەمی مردن ئەو رازە لە دڵی خۆیدا

دەپارێزێ. ئەنجام لە کاتی سەرە مەرگدا، نهێنییەکەی بۆ رۆکسان ئاشکرا دەبێ و شانۆنامەکە بە شێوەیەکی دلگیر و پڕ هەست و سۆز کۆتایی دێت.

شانۆنامەی بێچوە هەڵۆ ئەگەرچی لە درامای سیرانۆ لاوازترە، لەگەڵ ئەوەشدا پەسند و لەبەردڵانە، ئەم درامایە چیرۆکی بەزەیی ورووژێن-ی کوڕ و میراتگری ناپلیۆنی یەکەم دەگێڕێتەوە کە ڤیکتۆر هۆگۆ ناوی بێچوە هەڵۆی لێنابوو. ئەو کە هەوەسی شۆرەت و دەسەڵاتی لە کەللە دابوو، ساڵانێکی دوور و درێژ هیچی دەرباری بەسەرهاتی بابی نەدەزانی، کاتێ کە رووداوەکانی بۆ ئاشکرا بوو، لە دەرباری نەمسا هەڵات و کەوتە بیری پیلانگێڕان، بەڵام سڕەکەی ئاشکرا بوو و بە وەزع و حاڵێکی ناخۆش گیانی لە دەست دا.

## رۆمان

رۆمان بە دەوڵەمەندترین ژانری ئەدەبیاتی سەدەی بیستەمی فەرەنسا دەژمێردرێ. ئەو بەرهەمانەی کە لەم مەیدانەدا نووسراون ئەوەندە جۆراوجۆرن کە هەوڵدان بۆ ریزبەندی و پۆلین کردنیان دژوارە و رەنگە بێهودەش بێ. بە هەر حاڵ رەنگە بتوانرێ رۆمانانی ئەم سەردەمە بەسەر شەش دەستەدا دابەش بکرێ: رۆمانی سایکولۆژی، رۆمانی دەڤەرە دوورە دەستەکان، رۆمانی تەنز ئامێز، رۆمانی ئایدیالیستی، رۆمانی سیوسیولوجی و رامیاری و رۆمانی ژیاننامەیی.

## رۆمانی سایکۆلۆژی

هەڵبەتە رۆمانی سایکۆلۆژی دیاردەیەکی تازە نەبوو. شاتۆبریان هەندێ هەوڵی بۆ شیکردنەوەی هزر و هزرینی قارەمانانی رۆمانەکانی دەست پێکردبوو، بەڵام تەنیا ژمارەیەکی کەم لە رۆماننووسان (لە هەمووان دیارتر ستندال و سن بوون) رێچکەی وییان گرتەبەر، و لە ئەنجامدا بورجیە گیانێکی تازەی خستەبەر رۆمانی سایکۆلۆژی.

<u>پول بورجیە ١٨٥٢- ١٩٣٥:</u>

بورجیە لە شاری ئەمیان-ی باکووری فەرەنسا لە دایك بوو، ماوەیەك پزیشکیی خوێند، بەڵام لە ساڵی ١٨٧٣دا لێبڕا لە جیاتی پزیشکگەری نووسەرایەتی بکات بە پیشە.

خوێندن و زانیارییە زانستییەکانی کاریگەرییەکی قوڵیان لە سەرکەوتنی رۆمانە سایکۆلۆژییەکانیدا هەبوو. دەتوانرێ رۆمانەکانی بورجیە بکرێن بەدوو دەستەوە. رۆمانەکانی

هەوەڵی (١٨٨٥- ١٨٨٩) ڕەشبینانەن، بارودۆخی ڕوحی مرۆڤ شی دەکەنەوە. (مەتەڵی غەمنەنگیز- ١٨٨٥، تاوانی ئاشقانە- ١٨٨٦، و ئاندریە کرونلی- ١٨٨٧) لە جوملەی ئەو ڕۆمانانەن. بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی مورید لە ساڵی ١٨٨٩دا گۆڕانکارییەکی قوڵی لە هزرینی بورجیەدا دەرخست. پەیوەندی و دڵبەندییەکی زۆری لەگەڵ مەسەلە ئایینییەکانا پەیدا کرد، و پاشانیش بەگەڵ مەزهەبی کاتولیك کەوت، لەوە بەدواوە ڕۆمانەکانی پتر شەقڵی ئەخلاقی و فێرکارییان وەرگرت و کەوتنە بایەخدان بە ڕەگەزە مەعنەوییەکانی ئەنتولوجی مرۆڤ، لە دیباجەی ڕۆمانی (سەرزەمینی بەڵێن پێ دراو- ١٨٩٢)دا ئەم بوچوونەی خۆی دەربڕیوە کە. "شیکردنەوەی ژیانی دەروونی و ئەخلاقی دەبێ شان بە شانی شیکردنەوەی ژیانی ڕواڵەتی و کۆمەڵایەتی ئەنجام بدرێ"، ڕۆمانی (ویستگە- ١٩٠٢)ی وی کە لەوێدا بۆچوونەکانی خۆی بەکار هێناوە، چیرۆکی خێزانێك دەگێڕێتەوە کە ڕووبەڕووی کارەساتێکی حەتمی دەبێتەوە، چونکە لە داب و نەریتی نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی، و مەزهەبی خۆی دوور کەوتووەتەوە.

مارسیل پروست ١٨٧١- ١٩٢٢:

پروست لە ئوتوی، لە دەوروبەری پاریس هاتە دنیاوە. بابی دکتۆر و نووسەر بوو، و دایکی ژنێکی دەوڵەمەند و ڕۆشنبیر بوو. مارسیل هەر چەندە منداڵێکی لاواز و تەنگەنەفەسی بەردەوامی لەگەڵ بوو، قۆناغی خوێندنی ئامادەیی تەواو کرد و پاشان چووە زانکۆی پاریس و کارنامەی خوێندنی زانکۆیی وەرگرت. پاش ئەوەی ماوەیەکی کەمی لە خزمەتی سەربازیدا بەسەر برد، لە پاریس ئاکنجی بوو، و بەرەبەرە لەگەڵ ناوەندی ڕۆشنبیران و یانە و تەلارە کەلتوورییە باوەکانی ڕۆژدا هاتووچۆی پەیدا کرد. لەم ساڵانەدا وەختی خۆی لە شانۆ، کڵێساکان، و لەگەڵ کیژانی گەنجدا بەسەر دەبرد و چیرۆکە دڵدارییەکانی لایەنگری زۆریان هەبوو. لە ساڵی ١٩٠٦ بەدواوە تەنگە نەفەسییەکەی و حەساسییەتە توندەکەی بە گەرد و تۆز، بە هەرا و زەنا و بۆن، وای لێکرد تا خۆی لە ژوورێکی بێ ئامێزی هەوا گۆڕکێ زیندانی بکات. "زۆربەی هەڤدە ساڵی دوایی تەمەنی، بە جلی خەوەوە، بە مل پێچەوە، بە گۆرەوییەوە، بە دەستکێش و کلێتەوە لە ناو جێگادا بەسەر برد. کە لە جێگەش هەڵدەستا چ لە ماڵەوە و چ لە دەرەوە فەروە و پوستینێکی ڕێ ڕێی لەبەر دەکرد". ئەگەر بە دەگمەن بچوویاتە سەردان و دیدەنی دەرەوە لە سەعات دوو یان سێی بەرەبەیاندا ئەم کارەی دەکرد، و لەم کاتانەدا دەچووە سەردانی دۆستەکانی —هەڵبەتە ئەگەر بە خەبەر بوایەن- هەموو بەرهەمە گرنگەکانی پرۆست لە قۆناغی گۆشەنشینی ویدا هاتوونەتە نووسین، لە ڕۆژی مردنەکەیدا ١٨/ نۆڤامبەر/١٩٢٢ خەریکی پێداچوونەوەی شارانی دەشت (سودوم و گومورا) بوو.

بەرهەمەکانی پروست کاریگەری ستندال، بالزاك، ئاناتول فرانس، برگسون و جان راسکین، نیشان دەدەن.

نێوبانگی پرۆست بەندە بە رۆمانی (گەڕان بە دووی زەمانی لە دەست چوودا)، رۆمانێکی زنجیرەییە "٨"، کە لە پازدە بەرگدا چاپ بوو، ئەم رۆمانە حەوت بەشی هەیە:

١- *رێگەری سوان- ١٩١٣*
٢- *لە سایەی کیژۆڵان و گوڵاندا- ١٩١٨*
٣- *رێگەی گرمانت- ١٩٢٠- ١٩٢١*
٤- *سودوم و گومورا ١٩٢٠- ١٩٢١*
٥- *یەخسیر- ١٩٢٣*
٦- *ئالبەرتینی هەڵاتوو- ١٩٢٦*
٧- *زەمانی دۆزراوە- ١٩٢٨*

رۆمانی زنجیرەیی (گەڕان لە زەمانی لە دەست چوو) تارادەیەك کۆمیدیای مرۆڤانی بالزاك و زنجیرەی رۆگۆن –ماکار-ی زۆلا وەبیر دێنێتەوە، ناوەڕۆکی رۆمانەکە دارووخان و هەرەسی ئەخلاقی کۆمەڵگەی فەڕەنسی و هەڵوەشانەوەی ئیمتیازاتی چینایەتییە.

پرۆست لە چیرۆکەکەیدا سێ چینی کۆمەڵگە وێنە دەگرێ: ئەرستۆکرات (ماڵباتی گرمانت)، بورژوازی (سوان و هاوشێوەکانی)، و تازە دەوڵەمەندان (ماڵباتی ورد و رەن)، و ئەم چینانە لە رێگەی ژن و ژنخوازییەوە پەیوەندی لەگەڵ یەکدا پەیدا دەکەن، پرۆست، مارسیل-ی (قارەمانی رۆمانەکە کە لە زۆر رووەوە نموونەیەکی خودی نووسەر خۆیەتی) بۆ کۆڕ و مەجلیسی هەر یەکێك لەم سێ چینە دەنێرێ و بەم رێگەیە یەکێتییەکی هونەری پتر بە رۆمانەکە دەبەخشێت. لە زۆربەی ئەم بەشەدا باسی بەسەرهاتی دڵداری مارسیل و پەیوەندی وی بەشێوەکاری، مۆسیقا و ئەدەبیاتەوە دەکات و رووداوەکانی سێ چارەکی کۆتایی ژیانی وی دەگێڕێتەوە.

یەکێك لە دیارترین مەیدانەکانی کاری پرۆست، شێوەی دەروونزانی ئەوە. ئەویش وەکو برگسون، باوەڕی وایە کە "دەرکی راستەوخۆی واقیع... کۆڵەکەی هەموو زانستەکانە...و باشترین ئەوزاری ئێمەش نە ئەقڵە و نە شعور، بەڵکو شهودی خۆبەخۆی باتینییە" جا لەم رووەوە پرۆست. پشت بە زاتییەت و تەداعیاتی لاشعور دەبەستێ، کە زۆرجار لە رێگەی ناوێکەوە یا هاندەرو هۆکارێکەوە کە بە لاشعوردا ختورە دەکات بە تازەبوونەوەی یەك

بیرەوەری چەندین بیرەوەرییانی دیکە تازە دەبنەوە. بەم پێیە، "پەیوەندی بەربڵاوی هەست و ئەندێشان تانوپۆی ئەم رۆمانە پێکدێنێ، و نموودێکی بابەتی بە تۆڕی زەینی ناناسایی نووسەر دەبەخشێت".

جا ئەم پرۆسەیە، رۆمانێکی بێ شێوە، دوور و درێژ، و زۆرجار یەکنەواوی هێناوەتە ئاراوە، زێدەباری ئەمەش، پرۆست، بە رێچکەی نەئەخلاقی خۆی و بەرجەستە کردن و نیشاندانی گەندەڵی و بەدکاری، ژمارەیەك لە خوێنەرانی دەتۆرێنێ و بێزار دەکات.. بەڵام جوانی و دڵگیری کارەکانی تەنیا لەلای دەستەیەکی دیاریکراوە کە لەڕووی وردی دەروونشیکاریی و ریزپەڕی قارەمانەکانەوە رێز لە بەرهەمەکانی دەنەن.

## رۆمانی دەڤەرە دوورە دەستەکان

**پیرلوتی ١٨٥٠-١٩٢٣:**

(ناوی راستەقینەی جولین ڤویو)ە. بەرهەمی پیرلوتی باشترین نموونەی رۆمانی وەسفییە، وەسفی دەڤەرو ئاواییە دوورەکان. سەفەرەکانی لوتی لەو ساڵانەدا کە ئەفسەری هێزی دەریایی فەڕەنسا بوو، کەرەستەی بەرهەمە وەسفییەکانی بۆ فەراهەم کرد. "توانا و بەهرەیەکی فرەی خودادادی لە خولقاندنەوەی هەست و سازانی دیمەناندا هەیە: پیرلوتی کە هەستگەرایەکی تەواوە دەچێتەوە سەر رێچکە و رێبازی برناردن دوسن پییر و شاتۆبریان" لوتی نووسەرێکە زەینیەتگەرا و سەر بە بزووتنەوەی ئەمپرسیونیزم"[٩]. مەزهەب، ئەخلاق، و فەلسەفەی بەلاوە مەبەست نییە، لە رۆمانەکانیدا گوێ بە پلۆت و کاراکتەرسازیش نادات. لوتی شەیدای لەزەتە نەفسانییەکانە، و چاك هەست بە ناپایەداری لەزەتانیش دەکات، لەبەر ئەمە، گیانی خەمینی و پەستی سێبەری خستۆتە سەر بەرهەمەکانی. دیمەنی رۆمانەکانی پتر وڵاتانی جۆراوجۆری بێگانە و نامۆیە: زەماوەندی لوتی- ١٨٨٠، لە تاهیتی، ئیۆی برام- ١٨٨٣ و ماسیگری ئایسلەندی- ١٨٦٦ لە بریتانی، و ئاکام- ١٩٠٦ لە تورکیا، و مەدام کریزانتیم- ١٨٨٧ لە جاپۆن روو دەدەن، (بەرە و ئەسفەهان- ١٩٠٤، یەکێکە لە سەفەرنامەکانی لوتی) لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەم و ساڵانی پاشتردا چەند بەرهەمێکی دژی ئەڵمان نووسی.

# رۆمانی تەنزئامێز

## ئاناتول فرانس ١٨٤٤- ١٩٢٤:

(ناوی راستەقینەی جاك ئاناتول تیبو)یە. رۆماننووس، شانۆنامەنووس، شاعیر، رەخنەگر و کورتە چیرۆکنووسە. فرانس لە پاریس لە دایك بوو و لەم شارەدا چووەتە بەر خوێندن، لە ساڵی ١٨٧٦ بە عینوانی کتێبداری (سکرتێر و بەرپرسی کتێبخانە) ئەنجوومەنی سینا هەڵبژێردرا. هەر چەندە تاوەکو پێش ساڵی ١٨٨١یش زۆر هۆزان و بەرهەمی رەخنەیی بڵاوبووەتەوە، بەڵام بە بڵاوبوونەوەی (تاوانی سیلوستر بونار) لە هەمان ساڵدا ناوبانگی پەیدا کرد، فرانس لە ساڵی ١٨٩٦دا بوو بە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسا. دوو ساڵ لەوەدوا مەسەلەی دریفوس، ئەوی کە بووبوو بە فەیلەسووفێکی گۆشەگیر، گۆڕی بە پیاوی مەیدان، چەندین بەرهەمی دەربارەی بەرەڤانی لە ئازادی نووسی و بەرەو سوسیالیزم و کۆمۆنیزم دایکێشا، فرانس لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا هەوەڵجار نیشتیمانپەروەرێکی بە جۆش و خرۆش بوو، بەڵام پاشان بەرەو ئاشتیخوازی دایکێشا. لە پاش جەنگ لە موڵکەکەی خۆیدا لە نزیکی تور گۆشەگیریی هەڵبژارد.

زۆربەی مێژوونووسانی ئەدەبیات دوودڵن لەوەی کە فرانس لە ریزی رۆماننووساندا دابنەن. ئەو کەسێکی هونەردۆست و فەنپەروەرە. "لە مامەڵەکردنیا لەگەڵ ژیاندا، سەبر و ئاڵۆزی مونتنی، جەبرگەرایی تین، و رەشبینی و نائومێدی رینان ناوێتە بە یەکتر دەکات، و گاڵتە بە هەر هەموو ئەو هەوڵ و کۆششانە دەکات کە لە مەیدانی خواناسی، میتافیزیقا، و زانستدا بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی رەها ئەنجام دەدرێن". بەردەوام روانین و بۆچوونەکانی دەگۆڕێ، رەنگە تەنیا لەواری فەلسەفەی ئەپیکۆری خۆی و لایەنگری لە جوانیناسیدا نەگۆڕیێ. ئەدەب و نەرمی، ئیرداگەری و زمانبازی، و گیانی تەنز و تەوس و حەنەکچیاتی لە تایبەتمەندییەکانی بەرهەمی ئەون، فرانس هەندێ جار پەنا وەبەر هەجوی توند دەبات و لە تەوس و توانجدا موبالەغە دەکات و لە دنیای بەزەیی و هاوخەمی دوورەپەرێزە شەیدای شەتەحیاتبازی و دروستکردنی دەستەواژەی ناکۆکە.

لە شێواز و ستایلی فرانسدا "وەزنی خۆش ئەوا، جوانیی وێنەیی، و زەوق و سەلیقەی فەرەنسی لە مەیدانی شێوازی رستەسازیدا، بە جۆرێکی وەستایانە تێکەڵ و ئاوێتەی یەکدی بوون".

**گرنگترین بەرهەمی فرانس:**

**١- تاوانی سیلوستر بونار- ١٨٨١:**

لەم بەرهەمەدا بونار، کە کەونارا ناسێکی پیری میهرەبانە، کچۆڵە هەتیوەکەی (لە چاپەکانی دواتردا بووە بە نەوە) ماشوقەکەی رۆژگاری لاوی خۆی دەرفێنێ. کچۆڵەکە لە قوتابخانە ناخۆشەکەی رزگار دەکات. لەم کەین و بەینەدا دەردەکەوێ کە سەرپەرشتیاری (قیم)ی یاسایی کچۆڵەکە پیاوێکی کلاوچییە. بونار لە تۆمەتی مرۆڤ رفێنی تەبرێ دەبێ، کچۆڵەکە دەکەوێتە سایەی سەرپەرشتی ئەوەوە.

**٢- تایس- ١٨٩٠:**

چیرۆکی پافنوتیوس-ی رەبەنی لاو و تایسی سۆزانی جوان، دەگێڕێتەوە. پافنوتیوس، تایس دێنێتە سەر ئایینی مەسیحییەت، بەڵام بە خۆی لەبەر ئەوەی لەڕووی سێکسییەوە مەیلی دەچێتە سەر، روحی دەلەوتێ و دەبێ بە دۆزەخی. ماسنە-ی ئاهەنگسازی فەرەنسی (١٨٤٢-١٩١٢) ئۆپرای تایسی لەسەر ئەم چیرۆکە داناوە.

**٣- پارێزەری یەهودا، لە کۆمەڵەی سەندوقی سەدەفی یە، ١٨٩٢:**

چیرۆکێکی کورتە کە فرانس دەوری مێژوویی فەرامۆشکاریی پونتیوس"١٠" پیلاتوس، بە نەفەسێکی تانە ئامێزەوە دەگێڕێتەوە.

**٤- مێژووی هاوچەرخ**، بەرهەمێکی زنجیرەیی یە لە چوار رۆماندا: **ئارونی گردشگا-١٨٩٧**، داهۆڵ- ١٨٩٧، موستیلەی یاقوت- ١٨٩٩، و ئاغای برجەرە لە پاریسدا- ١٩٠١. دوو چیرۆکەکە دوایی باسی مەسەلەی دریفۆس دەکەن، و هەر چوار رۆمانەکە لە پیلانگێری و دەسیسەکارییەوە هەڵێنجراون. فرانس لە زمانی ئاغای برجەرەی گوتەبێژی وییە، کەشیشان، سەربازان، و سەڵتەنەتخوازان، و ژنانی مەکرباز و پیلانگێڕ بەر تانە و تەشەر و ریشخەن دەدا.

**٥- دورگەی پنگونیان- ١٩٠٨:**

لەم چیرۆکەدا رەبەنێکی پیری نیمچە نابینا، دورگەیەکی پڕ لە پنگونیان کەشف دەکات، و وا دەزانێ ئەوانە مرۆڤن، ئەم رۆمانە مەجازێکی تەنزئامێزە دەربارەی پەرەسەندنی مرۆڤانی، و نزیکەی چارەکێکیشی بۆ مەسەلەی دریفۆس تەرخان کراوە.

**٦- خواوەندانی تینوو- ١٩١٢:**

لەم بەرهەمەدا بێ میهری مرۆڤ لە سایەی دەسەڵاتی زەبر و زەنگ لە ماوەی شۆڕشی فەرەنسادا، بە زمانێکی تەنزئامێز وێنە دەگیرێت.

٧- ياخى بوونى فريشتەكان- ١٩١٤:
تەنزيكە دژی مەسيحييەت، و لەم چيرۆكەدا كۆمەڵە فريشتەيەك لە ژيانی ئاسمانی وەڕەز دەبن و بۆ پاريس دادەبەزن.
(هەندێ لە بەرهەمە بەناوبانگەكانی ديكەی فرانس بريتين لە: كتێبی دۆستەكەی من — ١٨٨٥، گوڵەزەمەقی سوور- ١٨٩٤، و باغی ئەپيكور- ١٨٩٤).
ئاناتول فرانس لە نووسيندا، پەيرەوی داب و رێساكانی كلاسيك دەكات. زمانەكەی ريتمدار، خۆش، زيندوو و ئەكتيف، و ليوان ليو لە ريشخەنە). زۆربەی رەخنەگران بە گەورەترين نووسەری رۆژگاری خۆی و بە سوڵتانی پەخشانی فەرەنسی دەزانن.
ئاندريە پول گيوم جيد ١٨٦٩- ١٩٥١:
(جيد رۆماننووس، رەخنەگر، خاتيرەنووس و شانۆنامەنووس بوو، لە باپێكی پرۆتستان و لە دايكێكی كاتوليك بووە. لە ساڵی ١٨٩٣دا سەفەری ئەفريقيای باكووری كرد. لە جەزائيردا تووشی نەخۆشی سيل بوو. ماوەی نەقاهەتەكەی بووە مايەی ئەوەی قەدری ژيان بزانێ، و دوای ئەوە بە گەرم و گوڕی كەوتە كاركردن. خوانە زەمينييەكان- ١٨٩٧ بەری كاركردنی ئەم قۆناغەی ژيانی وييە. جيد لە ساڵی ١٨٩٥دا بۆ فەرەنسا گەڕايەوە و، مادلين رەوندۆ-ی پورزای خۆی خواست).
شۆرەتی جيد بەندە بە سێ كتێبی: دەساوێزان- ١٩٠٥، دەساوێزانی تازە- ١٩١١، پێكادانەكان- ١٩٢٥، و هەروەها بە رۆمانەكانييەوە. لەم رۆمانانەدا هێرش دەكاتە سەر بۆچوونانی توند لەواری ئايينی و ئەخلاقيدا. (دژە ئەخلاق- ١٩٠٢)، تاڕادەيەكی بيوگرافی خودی نووسەر و بەرەڤانييەكانی وييە لە ئازادی تاك و ئازادی هزر. لە (گەلی- ١٩٠٩)دا هێرش دەكاتە سەر تەنگبينی پرۆتستان، (سكەسازان- ١٩٢٥) كە بە شاكاری جيد دەژمێردرێ، سكاڵانامەيەكە دژی كەسانێك كە ئەخلاقی نادروست بڵاودەكەنەوە- ئەوانەی كە رێساكانی ئەخلاق دەشێوێنن، ئەم رۆمانە چيرۆك و بەسەرهاتی پياوێك دەگێڕێتەوە كە حاڵ و ماڵی خۆی تەرك دەكات، لەبەر ئەوەی پێی وايە بە بيژييەتی لە دايك بووە..
(هەواڵی رۆژگاران) كە ساڵانی ١٨٨٩- ١٩٣٩و ١٩٤٢- ١٩٤٩ دەگرێتەوە، بە يەكێك لە بەرهەمە گرنگەكانی جيد دەزانرێ. ئەم هەواڵانە بۆ جيد فۆرم و قاڵبێكی لەبار بوو بۆ دەربڕينی بيرە خێرا و سادە و هەنووكەييەكان كە دەبوايە بە پەلە بێنەنووسين. ئەم بەرهەمە لەو رووەوە كە دەربارەی وێنەگرتنی ديتنە جيوەييەكانی جيدە، زۆر بايەخدارە.

جید لە ساڵی ١٩٤٧دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت. جید لە ساڵانی ١٩٣٥- ١٩٣٦دا سەردانی روسیای کرد و ئەم سەردانە وای لێکرد تاڕادەیەکی زۆر لە کۆمۆنیزم سارد ببێتەوە، و ئەم ساردبوونەوە و نائومێدییەی لە کتێبی (گەڕانەوە لە سۆڤیەت- ١٩٣٦، و هۆی گەڕانەوە لە سۆڤیەت- ١٩٣٨)دا گێڕاوەتەوە.

جید کە وەکو نووسەرێکی خاوەن شێواز ناوبانگێکی پایەداری هەیە، کارێکی گەورەی کردۆتە سەر نووسەرانی لاوی فەڕەنسی.

## رۆمانی ئایدیالیستی

رۆمان رولان ١٨٦٦- ١٩٤٤:

رۆلان، رۆماننووس، شانۆنامەنووس، و مۆسیقازان، و بیوگرافی نووس بوو. لە کلامسی (لە بورگوندی) لە دایك بووە، لە پەیمانگای باڵای پاریس خوێندوویەتی و ماوەی چەند ساڵێك لە سوربۆن مامۆستای مۆسیقا بوو، لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا، ئاشتی خوازی و باوەڕی رۆلان بە پاراستنی بەرژەوەندی هەموو میللەتان، مەحبوبییەتی وی لە نێو برد، (لەگەڵ ئەمەشدا، رۆڵان فەلسەفەی ئاشتیخوازانەی خۆی لە کتێبی دەربارەی جەنگ- ١٩١٥دا پیشاندا)و پاشان لە سویسرادا ئاکنجی بوو و گۆشەگیریی هەڵبژارد. لە پاش وەستانی جەنگ بەلای کۆمۆنیزمی روسیادا دایکێشا. دوا ساڵانی تەمەنی پتر بە نووسینی کۆمەڵێك بەرهەم، لە واری مۆسیقا و ئاهەنگسازان و مەسەلە کۆمەڵایەتی- سیاسییەکان، بردە سەر.

ناوبانگی رۆلان بە بەرهەمە رەخنەییەکانی و ژیاننامەی مۆسیقازانەکانەوە-یە، کە دەکرێ ئاماژە بۆ کتێبی (گوتە و بتهوڤن- ١٩٣٠، و بتهۆڤن: قۆناغانی داهێنانی گەورە ١٩٢٨- ١٩٣٧) بکرێ.

شاکاری رۆلان، جان کریستف-ە (١٩٠٤- ١٩١٢) کە رۆمانێکی زنجیرەیی دە بەرگییە. لەم رۆمانەدا ژیانی روحی جان کریستف-ی ئاهەنگساز و مۆسیقازانی ئەڵمانی، لە ئاخر و ئوخری سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا دەگێڕدرێتەوە، کە بە ناچاری زێد و بومی خۆی تەرك دەکات و بە دووی بەختەوەریدا بۆ فەڕەنسا و سویسرا و ئیتاڵیا دەڕوات. سەردەمی خەمینی منداڵیەتی، دۆستایەتی و ئاشقێنی وی، خەبات و تێکۆشانی، و هەموو بویەرەکانی ژیانی و گۆڕانە روحییەکانی وی، لە رۆژی لە دایك بوونیەوە تاکو مردن، لە دە

کتێباندا دەخرێتە بەردەم خوێنەران. ئەم دە کتێبە: سپێدە، شەفەق، ئەوجەوان، یاخی بوون، بازاڕی سەری مەیدان، ئانتوانت، لەماڵەوە، دۆستان، بۆتەی ئاگرین و ڕۆژی نوێیان ناوە.

جان کریستف ئەخشە و پلۆتێکی کورتی هەیە، نووسەریان لەبەر گوێنەدان بە فۆرم درێژنووسی، سوود وەرگرتن لە شێوازی فێرکاری، و نەبوونی هەستی حەنەکبازی بەر ڕەخنە داوە، لەلایەکی ترەوە ئەم بەرهەمە زنجیرەییە لەبەر کەجییەتی ئەخلاقی و باوەڕی ئایدیالیانەی بەمەی کە لە ئەنجاما هەوڵی هوشیارانە بەسەر ماددەگەرایی، نزمی و پوچەڵیدا سەردەکەوێ، ستایش کراوە. ئەمە جگە لەوەی کە جان کریستف بۆچوون و جیهانبینییەکی فراوان و سەیر دەربارەی ژیان بە دەستەوە دەدات، و کریستفی قارەمانی ڕۆمانەکەش کەسایەتییەکی مرۆڤانی و خۆشەویستە.

(ڕۆمانی جان کریستف، ڕۆلآنی لە دنیای ئەدەبدا مەنشور کرد، و لە ساڵی ١٩١٥دا خەڵاتی نۆبڵی بە دیاریی بۆ هێنا).

لە شانۆنامەکانی ڕۆلآن دەبێ ئاماژە بە (گورگان- ١٨٩٨) بکرێ کە دەچێتەوە سەر مەسەلەی دریفۆس.

## ڕۆمانی سیوسیولوجی و سیاسی

<u>جورج دو هامیل ١٨٨٤- ١٩٦٦:</u>

ناوی ڕاستەقینەی دنیس تەڤەنن-ە. ڕۆماننوس و شانۆنامەنووس بوو. لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا وەکو جەڕاحی سوپا خزمەتی کرد، ئەزموونەکانی دوهامیل لەم قۆناغەدا، بیروبۆچوونەکانی وییان لەواری برایەتی و مەسئولیەتی کۆمەڵایەتیدا خەملآند و کردیان بە ڕۆماننووسێکی کارامەو پوختە.

هاوخەمی قوڵی دوهامیل لەگەڵ هاورەگەزانی خۆیدا لە دوو بەرهەمی بەهاداریدا ڕەنگی داوەتەوە. کتێبی (ژیانی شەهیدان- ١٩١٧) دڵسۆزی و میهرەبانی وی سەبارەت بە قوربانیانی جەنگ دەگێڕێتەوە، و (شارستانییەت- ١٩١٨)ەکەشی هێرشێکی توندە بۆ سەر (شارستانییەتێك) کە ئاقیبەت بە کوشتارێکی گشتی لەسەر ئاستی جیهان دەشکێتەوە.

ڕۆمانە چوار بەشییەکەی (ژیان و بەسەرهاتی سالاڤن ١٩٢٠- ١٩٣٢) درێژەی پەژارەی ئەوە دەرهەق بە بێدادی کۆمەڵایەتی. سالاڤن-ی قارەمانی چیرۆکەکە، کەسێکە

بودەڵە و نامەسئول، بەڵام لە هەمان حاڵدا مایەی سەرنج و لەسەر هەقە چوار بەشەکەی ڕۆمانەکە ئەمانەن:

(ئیعترافی نیوەشەو- ١٩٢٠، پیاوانی ڕاوەدوونراو- ١٩٢٣، دوو پیاو- ١٩٢٥، و جۆرنالی سالاڤن- ١٩٢٧) دوهامیل ڕۆمانێکی زنجیرەیی دیکەی هەیە بەناوی: (شەرحی ڕووداوەکانی پاسکیە ١٩٣٣- ١٩٤٤)، ئەم ڕۆمانە ژیانی فەرەنسای پێش جەنگی جیهانی یەکەم نیشان دەدات. چیرۆکەکە بە دەوری تەوەری خانەوادەیەکی بۆرژوازی دا دەسوڕێتەوە، و هەندێ جار ئەندامانی چینەکانی دیکەش دێنە ناو ڕووداو و دیمەنەکانەوە. زەمینەی چیرۆکەکە یەجگار بەرینە، سیمای چەندین قارەمان و بە درێژی وێنە دەگیرێ، بەڵام بە پێچەوانەی ڕۆمانی (ژیان و بەسەرهاتی سالاڤن)، ژیانی هیچ یەکێك لە قارەمانانی چیرۆکەکە بە قوڵی ناگێڕدرێتەوە. بە شێوەیەکی گشتی (شەرحی ڕووداوەکانی پاسکیە) لە ڕۆمانەکانی سالاڤن لاوازترە.

((خۆ بە یەکسان زانین لەگەڵ خەلکانی دیدا، بە نیوەی خەسڵەتە دیارەکانی دوهامیل دەژمێردرێ))، هەروەها دوهامیل بە (جۆش و خرۆش و خولیای ڕاز نامێزییەوە) —کە تارادەیەك دەشوبهێتە سەر جۆش و خرۆش و کەلکەڵەی ڕۆماننووسانی ر وسیای سەرەتاکانی سەدەی بیستەم- ناسراوە. بەرهەمەکانی سەرەتای دوهامیل بە هۆی هەستیاری و دووریان لە سەراحەت و پوختەیی بەر ڕەخنە کەوتوون. بەڵام لە ئەنجامدا بەرهەمەکانی ڕاشکاو ڕیالیستین، و حەساسییەت و نۆڕینی مەعنەوی، دەیخەنە ڕیزی گرنگترین ڕۆماننووسانی ئەم سەدەیەوە.

جول ڕۆمان ١٨٨٥- ١٩٧٢:

ناوی ڕاستەقینەی: لویس فاریگولە. (شاعیر و ڕۆماننوس و شانۆنامە نووسە. لە پەیمانگەی باڵای پاریسدا فەلسەفەی خوێند و ماوەیەکیش دەرسی گوتەوە، لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم دەستبەرداری مامۆستایەتی بوو، خۆی بۆ نووسین تەرخانکرد).

ڕومن لە ساڵی ١٩٠٨دا کتێبی (ژیانی دەستەجەمی) بڵاوکردەوە کە ڕەنگدانەوەی تیۆری (ئونانیمیزم)ی وی بوو- بە گوێرەی ئەم تیۆرییە کۆمەڵ یان خەڵك لە هەموو شتێك گرنگترە و تاك، تەنیا لە حاڵێکا شان و شەوکەت و ئیحتوبار پەیدا دەکات، کە ناوێتەی کۆمەڵ بێ و لە کۆمەڵدا بتوێتەوە. ڕومن لەم بۆچوونەدا هاوباوەڕی دو هامیلە.

ڕۆمانەکانی ڕومەن لە بەرهەمە فەلسەفییەکانیشی بە قەدر و ئیحتوبارترن، (شاری لە نوێ دروستکراو- ١٩٠٦) ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چۆن بیرێکی کۆمەڵایەتی شارێکی بچووك و بێ جووڵە بۆ کۆمەڵگەیەکی هۆشیار و ئاگادار پێشکەوتوو دەگۆڕێ. ڕۆمانی

(مردنـــی مرۆڤێـــك- ١٩١١) پەیوەنـــدی ســـفتی ژیـــانی مرۆڤـــان نیـــشاندەدا: مردنـــی ئەندازیارێکی پیر کار دەکاتە سەر ژیانی ژمارەیەك لە مرۆڤان. (لوسـیان- ١٩٢٢) باسـی وەزع و حاڵی ژنێکی جوانە کە دەیەوێ دەسەڵاتی خانەوادەیەکی بورژوا بەسەر ئەو پیـاوەدا کە ئەو خۆشی دەوێ تێـك بـشکێنێ. زنجیرە رۆمانـەکانی رومـەن کـە لـە ژێـر سـەرناوی (پیاوانی نیـاز چـاك ١٩٣٢- ١٩٤٦)دایـە کـۆی بیـست و حـەوت رۆمانـە، و بۆچـوون و تێورییە ئونانیمیستییەکانی وی شرۆڤە دەکـات. لـەم زنجـیرە چـیرۆکە مەزنانـەدا، رومـەن رووداوە گەورەکانی جیهانی ساڵانی ١٩٠٨- ١٩٢٠ وەسـف دەکـات. وێنـەی پـڕ بایـەخی کەسایەتییانی مەزنی مێـژوویی سـەردەم –وەکـو هنـری پوانکـارە"١١"، لـنین، ئیمپراتـۆر ویلهلمی دووەم، و مارشال پـتن"١٢" دەگـرێ. دەکەوێتـە قەرینەسـازی پـەیڤێن جۆراوجـۆر: سوپا، کلێسا، پانۆرامـای سیاسـی، جیهـانی پزیـشکی، ئـەکادیمیای فەرەنـسا، و هـەموو ناوەرکە ئاشناکانی ئەم رۆمانانە: (خۆشەویـستی، تـاوان، هەسـتی هـاودەردی، دنیـاداری، دۆستایەتی، شکۆداری مرۆڤانی گومناوو بێ هەوا، خۆپەسندی و لوتبەرزی دەسـەڵاتداران) هاوپەیوەست لەگەڵ یەکدا نیشاندەدا، نێـوەرۆکی ئـەم رۆمانانـە هێنـدە جۆراوجـۆرە (دوو بەرگیان تەنیا باسی جەنگی وردن دەکەن، دوو بەرگی دیکە چیرۆکێکی پۆلیسی دەگێڕنەوە) کە رەخنەگرێك دەڵێت: "هەر خوێنەرێك ، لەم کۆمەڵە رۆمانە باڵایـەدا بابـەتی دڵخـوازی خۆی دەدۆزێتەوە".

رۆمەن کۆمەڵێك شانۆنامەشی نووسـیوە. رەنگـە بـەناوبانگترینیان (کنـوك یاسـەرکەوتنی زانستی پزیشکی- ١٩٢٣، و دیکتاتۆر- ١٩٢٦) بێ.

((هەستی هاودەردی، سادەیی یا جۆرە کلاسیسزمێکی زانستی لە شێوازا و گرنگی دان بـە تەکنیك)) لە تایبەتمەندییەکانی بەرهەمێن رومەن-ن.

ئاندریە مالرۆ ١٩٠١- ١٩٧٦:

کـوڕی یـەکێك لـە نـاودارانی پاریـسییە. رۆمـاننووس، گوتـارنووس، ئارکولوجیـست، و فەیلەسووفی هونەر بوو. لە قوتابخانەی زمانانی رۆژهەڵاتیدا چینی و سانسکریتی فێر بوو.. لـە ساڵی ١٩٢٣دا بۆ هیندوچین رۆیی، و لەوێندەر کەوتە لێکۆڵینـەوە و توێژینـەوەی ئـارکولۆژی، پاشان خووی دایە سیاسەت، و پەیوەندی لەگەڵ یەك ملیۆن ڤێتنامیدا پەیدا کرد، و دواتـر لـە راپەڕینی ئازادیخوازی چیندا بەشداریکرد، (مـالرۆ لـە سـاڵی ١٩٣٩وە تـا ١٩٤٠ لـە شـەڕە ناوخۆییەکانی ئەسپانیادا، لە بەشی بەتالیۆنی ئالیدا خزمـەتی کـردووە. سـەرەنجام لـە سـاڵی

١٩٤٠دا یەخسیر بوو و خرایە زیندانەوە، بەڵام بۆ فەرەنسا هەڵات و لە بزووتنەوەی بەرگری میللیدا کەوتە چالاکی، لە ساڵی ١٩٥٨دا، واتە لە سەرەتای کۆماریی پێنجەمدا لە کابینەکەی دیوگۆلدا بۆ پۆستی وەزیری رۆشنبیری هەڵبژێردرا).

هەموو رۆمانەکانی مالرۆ، دەربارەی خەباتی کرێکاری و رامیارین، (فاتیحان- ١٩٢٨) بویەرەکانی چینی کۆتاییەکانی ١٩٢٠ بەرجەستە دەکات. (چارەنووسی بەشەر- ١٩٣٣) باسی شۆڕشی چین لە ساڵی ١٩٢٤دا دەکات. (رۆژانی توڕەیی- ١٩٣٥) هێرشە بۆ سەر نازیزم، و وەزع و حاڵی زیندانیانی سیاسی و ئۆردوگاکانیان لە ئەڵمانیادا شەرح و شرۆڤە دەکات. رۆمانی (ئومێد- ١٩٣٧) باسی شەڕی ناوخۆی ئەسپانیایە (١٩٣٦- ١٩٣٩) کە مالرۆ بە خۆی وەکو فڕۆکەوان بەشداریی تێیدا هەبووە.

(لە مەیدانی هونەر و ئەستاتیکادا دەبێ ئاماژە بۆ کتێبە سێ بەرگییەکەی مالرۆ ((سایکۆلۆژیای هونەر ١٩٤٨- ١٩٥٠)) بکرێ کە لە چەشنی خۆیدا بەرهەمێکی گەورەیە).

مالرۆ، لە وەسفی وەزع و حاڵی روحی قارەمانانی رۆمانەکانیا، کاتێ کە دەکەونە تەنگانەوە، وەستایە، مالرۆ هەست بە مەترسی پێکادانی گەورەی نێوان دوو هێزی سیاسی دەکات و لێهاتووانە ئەمە بە خوێنەران دەگەیەنێ.

## سەربورنامە

ئاندریە موروا (١٨٨٥- ١٩٦٧):

ناوی راستەقینەی: ئیمیل سالومن ویلهلم هرزوگ-ە.

(سەربورنامە نووس، گوتارنووس، و مێژوونووس بوو. لە جەنگی جیهانی یەکەمدا وەکو ئەفسەری پەیوەندی لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیستان هاوکاری کرد. لە ساڵی ١٩٣٩- ١٩٤٠دا ئەندامی ئاژانسی هەواڵی فەرەنسا بوو. لە ساڵی ١٩٤٣دا چوو بۆ جەزایر و پەیوەندی بە هێزەکانی فەرەنساوە کرد.

موروا بەو پلۆت و سکێچە پێکەنیناویانە بەناوبانگە کە دەربارەی کەسایەتیانی نموونەیی ئینگلیزی جەنگی جیهانی یەکەم دەیانکێشێت، و (بێدەنگی کولونێل برامبل- ١٩١٩) باشترین نموونەیانە. رەنگە بەناوبانگترین بەرهەمی موروا، سەربورنامەکانی وی بێ، بەتایبەتی ئاریل: ژیانی شیلی- ١٩٢٣ بێ، کە سەربورنامەیەکی رۆمانتیکی یا چیرۆکێکی

سـایکۆلۆژییە. (ژیـانی دیزرائیلـی- ١٩٢٧، بـایرون- ١٩٣٠، ڤـولتیر- ١٩٣٢، پروسـت- ١٩٤٩، ج. سـاند- ١٩٥٢، هۆگـۆ- ١٩٥٤، بـالزاك-١٩٦٥ و... هتـد) لـە جوملـەی ئـەو سەربوورنامانەن کە بە قەڵەمی مورروا هاتوونەتە نووسین، (ئـاو و هـەوا- ١٩٢٨) یەکێکـە لـە رۆمانـەکانی وی. (مێـژووی ئینگلیـستان- ١٩٣٧)، و ئـەدواردی هەفتـەم و سـەردەمی وی- ١٩٣٣) لە جوملەی کتێبە مێژووییەکانی ئەون. لە واری نامە رەخنەیی و فەلسەفییەکانیشیدا دەبێ ئاماژە بۆ (هونەری ژیان- ١٩٣٩) بکرێ. مورروا لـە سـاڵی ١٩٣٨دا بـوو بـە ئەنـدامی ئاکادیمیای فەڕەنسا).

## هۆزان

وەکو پێشتر ئاماژە کرا، قوتابخانەی سیمبولیزمی فەڕەنـسی، بەتایبـەتی لـەواری درامـا و هۆزاندا، تا سەدەی بیستەمیش هەر بەردەوام بوو. ژمارەیەك لـە سیمبولیـستانی دوادوایـی و هەروەها چەند شاعیرێکی سەرەتاکانی ساڵانی١٩٠٠ بە ئیلهامی گەشبینی، ئایدیالیزم و جۆش و خرۆشی زەمانە هەندێ بەرهەمیان نووسی.

لە پاش جەنگی ساڵانی ١٩١٤- ١٩١٨، تۆنـەکان خـەمینتر بـوون، بێـزاری و نائومێـدی بەسەر هۆزاندا —وەکو ژانرە ئەدەبییەکانی دیکە- زاڵ بـوو. حکوومـەت، سیاسـەت، مەسـەلە کۆمەڵایەتییەکان و جەنگ گەورەترین پانتایی و ناوەرۆکی شیعری فەڕەنسیان گرتەوە.. شیعری ئازاد و "پەخشانە شیعر"یش برەوی فرەی پەیدا کرد.

بە هەر حاڵ، ئەگەرچی ناتوانرێ پۆلینێکی وردی هۆزانی ئەم قۆناغە پیشان بدرێ، ئەوجاش دەتوانرێ شیعر بەسەر چوار گرووپدا دابەش بکرێ: شیعری سروشت، شیعری مەزهەبی، شیعری فەلسـەفی و شیعری جەنگ.

## هۆزانی سروشت

ئیمیل ڤیرهارن ١٨٥٥- ١٩١٦:

شاعیرێکی بەلجیکی بوو کە بە زمانی فەڕەنـسی شـیعری دەگـوت. ئـەم شـاعیرە شـەیدای هەوای ئازاد، دنیای ئازاد، هەتاو، باو باران بوو، و لە هەر شاعیرێکی دیکەی فەڕەنسی پتر لـە

وردزورس دەچوو.. ڤێرهارن ئاشقێنی دەگەڵ دیمەنەکانی فلاندر"١٣" و جوانی و رازاوەیی تەبیعەتدا دەکرد. بەڵام ئەشقی دیکەشی هەبوو. ئەویش وەکو ویتمن و سندبرگ، جوانی و ئیلهامی لە دنیای کار و کۆششی مرۆڤانەوە، لە هەرا و زەنای شارانەوە، لە دووکەڵی کارخانانەوە، و لە هەراو هەنگامەی بازاڕی ئەوانەدا دەبینی و وەردەگرت... زیندوویەتی و بزێوی و رەقی تەبیعەت دەیهێنایە حاڵ و وەجد، هەم جۆش و خرۆشی بازاڕ و بازرگان، هەم ژیانی شەخسی تاك و هەم جوانی ژنان، دەیانهێنایە جۆش و خرۆش.

شیعری ئازادی ڤێرهارن شیعرێکی نائاساییە و لەسەر بنەمای کورتی و درێژی نیوە بەیتەکانی رۆنراوە. لە کێشی شیعری ویدا کۆتایی نیوە دێڕەکان ریتمێکی تایبەتی هەیە.

ئەم شاعیرە سوودی زۆر لە شێوەی سیمبولیستەکان و تەداعی مانا و بەکارهێنانی ئەو وشانەی کە دەنگی تایبەتی دروست دەکەن وەردەگرێت، رەنگە گەورەترین خەوشی ڤێرهارن زیری لەڕادەبەدەر بێ. لەگەڵ ئەمەشدا، هەستی پڕجۆشی بێ ریا، بزاڤی زمان، کورتی و کورتبڕی، و دەوڵەمەندی پەیڤەکانی دەیخەنە ریزی شاعیرانی گەورەوە.

ڤێرهارن پتر لە بیست کۆمەڵە شیعری هەیە: (هێزێن ئاژاوەگێڕ- ١٩٠٢، یەکەمین هەست- ١٩٠٤، شکۆی دووچەنانە- ١٩٠٦، و کێڵگە گەنمی بە شەپۆل- ١٩١٣) لە گرنگترین ئەو کۆ شیعرانەن.

<u>فرانسیس جام ١٨٦٨- ١٩٣٨:</u>

جام، تەبیعەت بە رەنگدانەوە و ئاوێنەی باڵانمای خوا دەزانێ، و لەم بارەیەوە هەم شاعیرێکی مەزهەبییە و هەم شاعیری تەبیعەتە. زۆرجار لەگەڵ قەشە فرانسیس ئاسیزی دا بەراوردی دەکەن، و وەکو (خواوەندی کشتوکاڵان کە رێچکەی فیرقەی فرانسیسیانی گۆڕیوە) ناوی دەبەن. جام لە بنەڕەت دا شاعیری گوند و گیانلەبەرانی مەزرایانە و لەزەت لە هەموو شتێکی گوندییاتی وەردەگرێت، بێ ئەوەی عەودالی رەنگدانەوەی حاڵ و هزری خۆی لە تەبیعەتدابێ.

هۆزانێن شوانکارەیی جام بە سادەیی بەناوبانگن، لە جوانترین کۆ شیعری وی دەتوانرێ ناوی: (لە نوێژی بەیانییەوە تا نوێژی شەو- ١٨٩٨، و خەمی گوڵان- ١٩٠١) ببرێ.

<u>پول فور ١٨٧٢- ١٩٦٠:</u>

شاعیری تەبیعەتی ئیل دو فرانس بوو کە پاریس بە مەڵبەندی دەزانرا.

ئەشقی وی بۆ سروشت سادە و بێ ئارایشتە، وەکو ڤیرهـارن، لـەزەت لـە هـەموو شـتێکی درەخشان و بەهێز و زیندوو دەبینێ، "وی نموونەی کونجکاوترین شـاعیرانە- لـە هـەمان کاتـدا خۆڕسك وردبین، سادە و سەرو وریا، بێ ریاو بە ئاوەز، و بە بەر و مسامەحەکارە".

هۆزانەکانی فور قافیەدارن، بەڵام زۆری حەز لەوەیە هەر بەندێکی شیعرەکانی وەکـو پارچـە پەخشانێك بنووسێت. شۆرەتی فور بـەو هەڵبەسـتانەوەیە کـە لـە ژێـر سـەرناوی (هەڵبەسـتی فەرەنسی)دا و بە سی بەرگ و لە چەند بەشێکدا، لە ساڵی ١٩١٢ بەدواوە بڵاوبوونەوە.

## هۆزانی مەزهەبی

شارل پیگی ١٨٧٣- ١٩١٤:

لە ئورلیان چاوی بە دنیا هەڵهێنا، و لەناو جەرگەی کار و باوەڕە ئایینییەکانی جاندارکدا پەروەردە بوو، و جاندارك بەلای ئەوەوە ئاوێنەی فەرەنسا و ئایینی کاتولیك بوو. پیگـی لـە رووە عیرفـانی و خواناسـییەکەیەوە شـاعیرێکی سـەدەکانی ناوەڕاسـتە. شـیعرە نیمـچە داستانییەکانی یا (مەتەڵ ئاساکانی) دەربارەی جاندارك بە پەخشانێکی ئاهەنگـداری وەهـا گوتووە کە کەمتر فۆرمی بەیت پەیدا دەکات، ئەم شیعرانە هەر چەندە دووبارە، نـەگونجاو، و هەندێ جار بە ئاووتـاو دەنـوێنن، بـەڵام هەنـدێ بەنـدی بـەرز و مـەزنیان تیایـە (زۆربـەی بەرهەمەکانی پیگی یەکەجار لە بڵاوکـراوەی دەفتـەرانی پـانزە رۆژەدا ١٩٠٠- ١٩١٤ کـە خۆی دایمەزراندبوو، بڵاو بوونەوە).

## هۆزانی فەلسەفی

پول ڤالیری ١٨٧١- ١٩٤٥:

یەکێك بوو لەلایەنگرانی وەفادار و گەرم و گوڕی مالارمیە و لە یاوەرانی بزاڤی رەمزییەت بوو، کە لە دوای مەرگی مالارمیە بۆ ماوەی بیست دانە ساڵ تاقـە شـیعرێکی نـەگوت. لـە ساڵی ١٩١٦ دا و بەهاندانی ئاندریە جید، و لە کاتێکا کـە شـەیدای زانـست بـوو، دووبـارە دەستی بە شیعر گوتن. کردەوە، شیعرەکانی ئەم قۆناغەی کە لە (میتافیزیکی بیرکارییـەوە ) ئیلهام وەردەگرێ، تاڕادەیەك کاریگەری لیوناردو دافینچی-یان پێوەیە. ڤـالیری بـاوەڕی وایـە کە شیعر پوختەترین و نایابترین هونـەرە و جگـە لـە خـودی خـۆی (واتـە خـودی شـیعر) چ

ئامانجێکی دیکەی نییە. وەکو مالارمیە، هەوڵدەدات پاکی و بێگەردی و جۆش و خرۆش و هەست بە پەیڤ و وشە باوەکان ببەخشێت، و نێوەڕۆکی ئاڵۆز و بە تەمتومان لە ڕێگەی ڕەمز و هێما و ئاماژەوە بەرجەستە بکات. بنەما و ڕەوتی ڕەمزییانەی ڤالیری، وەکو حەزف، مەجاز، گەردانی نوقستان، زۆرجار شیعرەکانی دەئاڵۆزێنێ، وێڕای ئەمەش هەندێ کەس بە یەکێك لە شاعیر و نووسەرە مەزنەکانی ئەدەبیاتی هاوچەرخی فەڕەنسای دەزانن. ڤالیری جگە لە شیعر بە گوتارە فەلسەفی و ئەدەبییەکانیشیەوە بەنێوبانگە (ئەم گوتارانە لە پێنج بەرگدا و لە ژێر سەرناوی پەراگەندەکان- ١٩٢٣دا کۆکراوەتەوە. کۆ شیعری "جوانییەکان- ١٩٢٢" لە شیعرە باشەکانی ڤالیرییە).

## هۆزانی جەنگ

لویس ئاراگۆن ١٨٩٧- ١٩٨٢:

(لە سەرەتادا لە لەلایەنگرانی دادیزم"[١٤]" بوو) و پاشان بوو بە یەکێك لە ڕابەرانی بزافی سوریالیزم، و لە ساڵی ١٩٣٠دا پەیوەندیی بە حیزبی کۆمۆنیستەوە کرد. لە دووەم جەنگی جیهانیدا بەشداری کردو یەخسیر بوو، بەڵام فیراری کرد و بوو بە یەکێك لە ڕابەرانی بزووتنەوەی بەرەڤانی ژێرزەمینی (نهێنی). جەنگ، خۆشەویستی و ڤیان، سروشت، و باوەڕ بوون بە ئاینده، نێوەڕۆکی بنەڕەتی شیعرەکانی پێکدێنن، شیعرەکانی ساڵانی جەنگی، لە کۆ شیعری "ئاراگۆن، شاعیری بەرگری فەڕەنسا- ١٩٤٥دا" کۆکراونەتەوە. بە هەر حاڵ ئاراگۆن لە هەوەڵەوە بە هۆی ڕۆمانەکانییەوەو پاشان بە هۆی ئەو بەرهەمانەیەوە کە بە مەبەستی وێنەگرتنی گشتی کۆمەڵگەی فەڕەنسا نووسینی، ناوبانگی دەرکرد. (بەرهەمە باشەکانی وی لە شیعرا دڵشکاو- ١٩٤١، و ئاگربازی- ١٩٢٠، لە ڕۆماندا هەفتەی پیرۆز- ١٩٥٨، و دێهاتیی پاریس- ١٩٢٦، لە نووسیندا، خەسڵەتەکانی ستایل و شێواز- ١٩٢٨)ـە شایانی باسن.

## کامۆ و سارتەر

ئالبێرت کامۆ ١٩١٣- ١٩٦٠:

کامۆ لە ماڵباتێکی هەژار لە جەزائیر هاتە دنیاوە (منداڵیەتیی بە دەستکورتی و هەژاری ڕابوارد، لە جەزائیر خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی تەواو کرد، بەڵام بە هۆی نەخۆشی دەردە

باریکەوە نەیتوانی بەشی ((فەلسەفە)) لە زانکۆ تەواو بکات. کامۆ لە جەزایردا کاری جۆراوجۆری کردووە و لە ئەورووپاشدا ماوەیەك خوی دایە رۆژنامەنووسی، شانۆ، دەرسگوتنەوە، و کاری چاپ و بلاوکردنەوە. لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا لە رێکخراوی بەرگری فەرەنسادا دژی ئەلمانیانی داگیرکەر کەوتە چالاکی. کامۆ لە سالّی ١٩٥٧دا خەلاّتی نۆبلی ئەدەبیاتی وەرگرت.

کامۆ رۆماننووس، شانۆنامەنووس، وتارنووس، و لە هەموو ئەوانە زیاتر مامۆستای ئەخلاق بوو، سەرەنجام لە سالّی ١٩٦٠دا بە هۆی رووداوی ئۆتۆمبیلەوە گیانی لە دەست دا.

نامۆ- ١٩٤٢:

رۆمانێکی بە قوەتی کامۆیە، و نیشانە و بەلّگەی توانا و بەهرەداری کامۆ و وەستایەتی و مامۆستایەتی وییە لە مەیدانی هونەری مولتەزیم و شێوەی چیرۆکنووسی بە ئانقەست سادەدا. ئەم رۆمانە دەربڕی دید و جیهانبینییەکی عاتیفی بەربلاوە سەبارەت بە پوچی و بێهودەیی هەولّ و تەقەلای زەینی مرۆڤ بۆ روونکردنەوەی جیهانی لە روون کردنەوە نەهاتوو، بە وشەی ئینسانی.

تاعوون- ١٩٤٧:

رۆمانێکی دیکەی کامۆیە، بە دژە مەسیحی ترین بەرهەمی ئەو دەژمێردرێ. لێرەدا جەخت لە سەر بێعەدالەتی مەسیحییەت دەکرێت، بە بەلّگەی بە قوربانی بوونی بێگوناحان، وەکو چۆن بە مردنی منالێك کە دەبێتە قوربانی تاعون، نیشاندەدرێ. رووداوەکانی چیرۆکەکە شایەدییەکە لەسەر ئەو زەبر و زەنگ و زۆرداررییەی بەسەر شاری ئورانداسەپێنراوە، و بەلّگەیەکە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم باوەڕەی کە لە کاتی تەنگانە و بەلاّ و مەینەتیاندا زیاتر خەسلّەتە پەسند و باشە مرۆڤانییەکان بەرجەستە دەبن تا خەسلّەتە دزێو و ناشیرین و خراپەکان. هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی ئەم بەرهەمە بریتین لە: پێچانەوە و شاردانەوەی بەردەوامی حەقیقەت لە شێوازی وەسفکاریدا، سوودوەرگرتنی ورد لە زاراوەێن کارگێری و زمانی فەرمی، زۆری بە ئانقەستی وشەێن کۆن و سواو، و بەکارهێنانی شێوەی مەجازی بە مەبەستی بەرجەستەکردنی ترسی تەواو لە یەك رووداوا.

کەوتن- ١٩٥٦:

(رۆمانی سێیەمی کامۆیە کە لێرەدا نۆرینی تەواوی خۆی بۆ مرۆڤ و زەمانی خۆی دەگێڕێتەوە. هەر هەموو چیرۆکەکە بریتییە لە قسەکانی کابرایەك کە رۆژێ لە رۆژان ئەوقاتی

سکالآیان بووە و نووکە بە خۆی دەڵێ قازی تۆبە کردو. ئە و وێنە و نموونەیەکی تەنزئامێزە لە ڕۆشنبیرانی باڵی چەپی کە لەنێو تیۆرییانی ئەهلیستیدا سەرگەردانن).

شانۆنامە گرنگەکانی کامۆ بریتین لە:

کالیگولا- ١٩٣٨، بەدحاڵی بوون- ١٩٤٣، ئابلوقە- ١٩٤٨، و دادپەروەران- ١٩٥٠.
کالیگۆلا، ناسنامەی کامۆیە وەکو نووسەرێکی لاوی خەمین، بار و خۆڕسك، و پڕجۆش و خرۆش و زیتەڵ و بزێو (ئەم شانۆنامەیە درکە و کینایەیە کە دەربارەی دوو ئیمپراتۆری شێت واتە هیتلەر و مۆسولینی. کامۆ لەم شانۆنامەیەدا ئەهلیزم بە کۆتاییە وێرانکەرەکەیەوە دەهونەرێنێ و بەرجەستە دەکات). بەد حاڵی بوون، میلۆدرامایەکە کە ڕووداوەکانی لە گوین نین. لە تایبەتمەندییەکانی ئەم شانۆنامەیە ئەو چڕی، کورتبڕی، سادەیی، و کول و کوڤانەیە کە سێبەری بەسەردا کێشاوە. لەم بەرهەمەشدا مەسەلەی پوچی و بێهودەیی دەخرێتەڕوو. شانۆنامەی دادپەروەران، وێڕای ڕاستگۆیی و ئامانجدارییەکەی، درێژ، گوتاری، خاو و ناپوختەیە، نموونەیەکە لە شێوازی کامۆ بۆ سادەکردنەوەی لە رادەبەدەری وێناو بیران.

گرنگترین بەرهەمی ناچیرۆکی کامۆ بریتین لە:

ئەفسانەی سیزیفۆس- ١٩٤٢ ،کە کۆمەڵە گوتارێکی فەلسەفییە دەربارەی پوچی و بێهودەیی. کتێبەکە بە باسێك دەربارەی خۆکوژی دەست پێدەکات و پاشان باسەکە دێتە سەر بابەتی یاخی بوون، کە باوەڕی کامۆ گرنگترین فەزیلەت و نایاب ترین خەسڵەتی ئادەمییە). و مرۆڤی یاخی- ١٩٥١ (ئەمەشیان گوتارێکی فەلسەفییە کە چەمکی یاخی بوون لە هەنبەر چەمکی مێژوویی- سیاسی شۆڕشدا دەخرێتەڕوو).

جان پول سارتەر ١٩٠٥- ١٩٨٠:

فەیلەسووف، گوتار نووس، ڕۆماننووس، ڕەخنەگر، شانۆنامەنووس و کورتە چیرۆك نووس بوو، سارتەر لە پاریس لە دایك بوو، لە پەیمانگای باڵای پاریسدا فەلسەفەی خوێند (١٩٢٤-١٩٢٨) لە لیون"١٥"، و لوهاڤەر"١٦" دەرسی گوتووەتەوە. پاشان بۆ ماوەی دوو ساڵان لە بەرلین و فرایبورگ"١٧"دا خەریکی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە بووە، لە کاتی کەوتنی فەرەنسادا لە ساڵی ١٩٤٠دا ئەسیری ئەڵمانییەکان بوو و خرایە زیندانەوە. پاش ئازاد بوون لە ساڵی ١٩٤١دا بۆ نیشتیمانی خۆی گەڕایەوە و جارێکی دیکە کەوتەوە دەرس گوتنەوە و لە بزووتنەوەی بەرگری دژ بە ئەڵمانیانی داگیرکەر چالاکانە کەوتە کار. سارتەر لە ئەنجامدا

لەبەر خاتری رۆژنامەنووسی دەستبەرداری دەرس گوتنەوە بوو و لە سالّی ١٩٤٦دا گۆڤاری زەمانێن نوێی دامەزراند.

یەکەمین رۆمانی سارتەر (رشانەوەیە) کە بە زۆری بە شاکاری وی دەزانرێ، ئەم بەرهەمە لە شێوەی بیرەوەری دەروونی رۆژانەی پیاوێکی سەلّتدایە. ئەم رۆمانە، کە رەنگە بە هەق ناوی وتارێکی فەلسەفی لێ نرابێ، زیاتر کەلّکەلّەکانی سارتەر، جگە لە پەیوەندییە سیاسییەکانی — واتە ئازادی، بێزاری و نائومێدی، کەسایەتی بورژوازی، ماهیەتی ئەندێشە، ئاوەز و زەین، هونەر، دیاردەناسی- ئاشکرا دەکات. گرنگترین بەرهەمی ئەدەبی سارتەر کۆمەلّەمەیەکە لە ژێر سەرناوی رێگەکانی ئازادی(١٩٤٥)، کە چوار رۆمانی بەم ناوانە لەخۆ گرتووە: (تەمەنی ئەقلّ- ١٩٤٥، مۆلّەت- ١٩٤٥، عەزابی روح- ١٩٤٩، و رۆمانی ناتەواوی دوا دەرفەت) سێ رۆمانی یەکەم بەریز ئەورووپای بەر لە جەنگ، قەیرانی مونیخ، و کەوتنی فەرەنسا لە دووەم جەنگی جیهانیدا بەرجەستە دەکەن. هەر سێ رۆمانەکەش خەلکانێك دەخەنە ژێر تۆژینەوە کە لە رای گەیشتن بە کەمالّ و بوونی خۆدا ئیختیار و ئازادی خۆیان تەنید یان نەفی دەکەن. دوودلّی و زەمان فاکتەری سەرەکین لە خولّقاندنی (ماهیەت)ی تاکدا. دیوار-١٩٣٩ ، کۆمەلّە کورتە چیرۆکێکە دەربارەی شەڕی ناوخۆی ئەسپانیا. شانۆنامەکانی سارتەریش هەر لەسەر هەمان تیمە و ناوەرۆکن، واتە ئازادی، مەسئولیەت، و قارەمانگەرایی ناوەرۆکی بەرهەمە شانۆییەکانی پێکدێنێ. مەگەزان- ١٩٤٣، لە شێوەی شانۆنامەی یۆنانیدایە (لەم شانۆنامە سێ پەردەییەدا مەسەلەی ئیختیار و ئازادی مرۆڤ خراوەتەڕوو، و مرۆڤ مەحکومە بە ئازادی و بەرپرسە لە کارەکانی خۆی). (سۆزانی ئابرومەند- ١٩٤٦ شانۆنامەیەکە کە ژیانی ژنێکی قەحپە لە باشووری وڵاتە یەکگرتووەکان نیشان دەدا.

دەستە پیسەکان- ١٩٤٧، شەیتان و خوا- ١٩٥١، و نیکراسوف- ١٩٥٩، چەند شانۆنامەیەکی دیکەی سارتەرن).

سارتەر نوێنەری جۆرە ئەگزیستانسیالیزمێکە کە دەکەوێتە نێوان روحگەرایی و مەعنەوییەتی مەسیحی و ماددەگەرایی مارکسییەوە، (و تارادەیەك ئیلهامی لە مارتین هایدگەری فەیلەسووفی ئەلّمانییەوە وەرگرتووە).

سارتەر هەولّدەدا لەبەرهەمەکانیا ئەم مەسەلەیە شەرح و شرۆڤە بکات کە: چ خوایەك لە گۆڕێدا نییە بۆیە مرۆڤ دێتە دنیایەکی بێهودەوە کە جگە لە خودی خۆی (مرۆڤ) چ مەبەست و ئامانجێکی نییە، و مرۆڤ هیچ نییە جگە لەوەی کە خۆی لە خۆیی دروست دەکات. بەلّام مرۆڤ

نیشانەیەکی دیاری هەیە، مرۆڤ جۆری ئیختیاری بەدەستە، ئازادی هەڵبژاردنی هەیە. ئازادە لەوەی کە ژیانی خۆی بە دڵی خۆی بجولێنێ و ئاراستەی بکات، بێ ئەوەی بە تەمای خوایەکی نەبووبێ یان بە ئومێدی ماهیەتێکی مرۆڤانی نەبووبێ... بە هەر حاڵ وەی بوری ژێرخانی فەلسەفەی سارتەر پێکدێنێ، واتە ((بوون بەر لە ماهیەتە)). جا بە گوێرەی ئەو پرەنسیپە و ئەمەی کە بەشەر بوونەوەرێکە بە خۆی سپێردراوە و جگە لە کرداری خۆی هیچی تر نییە، سارتەر مرۆڤ بە بەرپرس و جڵەوداری خۆی دەزانێ. واتە مرۆڤ خۆی لە خۆی بەرپرسە.

(یەکەمین بەرهەمی گرنگی سارتەر لە مەیدانی فەلسەفەدا بوون و نەبوونە- ١٩٤٣، ئەمە گوتارێکە (خیتاب) دەربارەی دیاردەناسی دنیای بوون. سارتەر لەم کتێبەدا رایگەیاندووە کە مرۆڤ ((جۆش و خرۆش و کەلکەڵەیەکی بێهودەیە))و پەیوەندییەکی لە نێوان ئەم هەزرەی کە ژیانی ئادەمی بێ مەبەست و بێ ئامانج و بێهودەیە، لەگەڵ ئازادی رەهای مرۆڤ و مەسئولیەتی بەشەر لە هەڵبژاردندا، دروست کرد.

ئەگزیستانسیالیزم و هومانیزم- ١٩٤٦ بەرهەمێکی دیکەی سارتەرە کە کورتە و پوختەیەکی چڕ و پڕ تەواوی فەلسەفەی وی بە دەستەوە دەدات، کتێبێکی گرنگی دیکەی وی رەخنە لە ئەقڵی دیالکتیك- ١٩٦٠ی ناوە کە سارتەر دەربارەی پێکەوە گرێدانی مارکسیزم و ئەگزیستانسیالیزم نووسی، بابەتی سەرەکی کتێبەکە نیزاع و ململانێی لە حەتمی نێوان بەشەرانە.

سارتەر بەهرە و توانایەکی سەیری دیتنی هەیە، بەڵام تەسەور و وێنایەکی لێڵ و نادروستی لەمەڕ بوون و هەرەسهێنانی هەمەلایەنە و سیستەماتێکی بەها مرۆڤانییەکان هەیە... جوانی و دڵگیری بەرهەمەکانی لە شێوازە هونەرییەکەیدایە، نووسەرێکی راشکاوە و بە زمانی خەڵکی خوێنەر دەدوێنێ، بە زمانێکی تەڕی لە زاراوەی خەڵکی کۆڵان و بازاڕ، زمانێکی زیندووی بەرجەستە، دڵگیر، ئامیرانە و سەرریژ لە وێنە.

# ژێدەران:

١- تەنجە: مینایەکە لە باکووری مەراکش، لە تەنگەی جەوەڵ تاریق.

٢- ئەغادیر: بەندەرێکە لە باشووری رۆژئاوای مەراکش، لە رەخی ئوقیانووسی ئەتڵەس.

٣- زیگموند فروید ١٨٥٦- ١٩٣٩:

خەڵکی نەمسایە، دامەزرێنەری قوتابخانەی سایکۆلۆژییە.

٤- ڤیتالیزم- Vitalism:

تیۆرییەکە پێی وایە کە ژیان بۆ خۆی دیاردەیەکە و لەسەرووی دیاردە فیزیکی و کیمیاییەکانەوەیە کە لە ئۆرگانیزمی بەدەندا حسییەت پەیدا دەکات و لەراستیدا دیاردە حسییەکان رێك دەخات و بەڕێوەیان دەبات. لایەنگرانی ئەم پرەنسیپە باوەڕیان وایە کە چالاکی و کاری ئۆرگانیزمی بوونەوەری زیندوو بۆ بەرجەستە کردن و نیشاندانی هێزی ژیانە، ئەم تیۆرییە دژی تیۆری میکانیزمە کە ژیان بە زنجیرە کار و کردەوە و کاردانەوەیەکی فیزیکی و کیمیایی دەزانن.

٥- دینامیزم- Dynamism:

رێبازێکە لە پێچەوانەی میکانیزم، میکانیزم بە مانای جێگیری و خامۆشی و نەگۆڕی یاساکانی جیهانە، و لایەنگرانی ئەم رێبازە لەو باوەڕەدان کە ئەوەی لە رابردووی جیهاندا رووی داوە، بە گوێرەی ئەو یاسایانەی کە بەسەر ئەم جیهانەدا فەرمانڕەوایە، لە ئایندەشدا روو دەدا.

٦- ئەکتیڤیزم- Activism:

تیۆرییەکە (فەلسەفەیەکە) کە پێی وایە پرەنسیپی بوون، چالاکییە، کارە.

٧- سورریالیزم- Surrealism:

سورریالیزم لە ساڵی ١٩٢٤دا و لەگەڵ بڵاوکردنەوەی (بەیاننامەی سورریالیزم)دا لەلایەن شاعیری فەرەنسی ئاندریە بریتونەوە ئیدی رەسمیەتی پەیدا کرد و هاتە ئاراوە. مەبەست و ئامانجی ئەم قوتابخانەیە

بریتییە لە دەربڕینی هەستێك یان هزرێکی خاڵیـــە، کە هیچ جۆرە زەمینەیەکی هزری پێشوەختە یان وابەستەگییەکی زەینی، و هیچ جۆرە ملاحەزەیەکی ئەخلاقی یان هونەری و ئەدەبی و ئەستاتیکی نەیخولقاندبێ، و کاری تێنەکات، بە گوتەیەکی دی دەکاتە نیشاندانی خەون و خەیاڵاتی ئازادی بەدەر لە هەر کۆت و بەندێك، بەو شێوەیەی کە لە کاتی خەون دیتندا لەگینە، واتە بەدەر لە هەر جۆرە دەخالەت و ئاراستەکارییەکی ویست و دوور لە هەر جۆرە هەستێکی شەرمکردن و گوناح.

٨- ڕۆمانی زنجیرەیی- Cycle Novel:

چیرۆکی زنجیرەیی، وەزع و حاڵی قۆناغی جیاوازی ژیانی یەك کەس، یەك ماڵبات، یان یەك تاقم و دەستە لە چەند بەش و بەرگێکدا دەگێڕێتەوە.

٩- ئەمپرسیونیزم- Impressionism:

لەواری شێوەکاریدا یاخی بوونە دژی قوتابخانانی کلاسیك و ئەکادیمی، ڕاوبۆچوونی پێشەوایانی ئەم قوتابخانەیە لەسەر ئەم بنەمایە ڕۆنراوە کە ڕەنگ و حاڵەتی شتان و هەروەها هەستی ئێمە دەربارەی ئەو شتانە، لە کاتی جیاوازدا دەگۆڕێن. جا لەبەر ئەمە شێوەکارێکی واقیعی دەبێ بەر لە هەر شتێك ناجێگیری و گۆڕانی ڕواڵەت و حاڵەتی شتەکان لە بەرهەمەکەی خۆیدا عەکس بکاتەوە... و بۆ ئەوەی باری سەرنج و یەکەم دیتن و دیتنی هونەری خۆی بپارێزێ دەبێ خۆی لە هەر هێڵ و هێڵکارییەکی ڕوون و ڕەوان بپارێزێ و خۆی لە هەر جۆرە دەستکاری و چاککردنەوەیەك دوور بگرێ و بەیەك نەفەس و یەك کەرەت کۆتایی بە کارەکەی بێنێ. شاعیران و نووسەرانی وەکو گوتیە، بودلێر، زۆلا، مالارمیە پشتیوانیان لەم قوتابخانەیە دەکرد.

١٠- پونتیوس پیلاتوس: ئەوقاتی ڕومی یەهودا بوو لە سەدەی یەکەمی پێش زایینداا کە عیسای دادگایی و مەحکوم کرد.

١١- هنری پوانکارە ١٨٥٤- ١٩١٢:

ماتماتیکزان و فیزیازانی ناوداری فەرەنسییە.

١٢- مارشال پتن ١٨٥٦- ١٩٥١:

مارشالی فەرەنسی و سەرۆکی دەوڵەتی ویشی بوو.

١٣- فلاندر: دەڤەرێکی ڕۆژئاوای بەلجیکا و باکووری فەرەنسایە.

١٤- دادایزم: بزووتنەوەیەکی (١٩١٦- ١٩٢٢) ئەهلیستی بوو لە واری ئەدەبیات و شێوەکاری ئەورووپادا. دروشمی ئەم بزووتنەوەیە (بێ شەکڵی موتڵەق) بوو.

پەیڕەوانی دادایزم هەر هەموو پێوەر و بنەما ئەستاتیکییەکانیان وەژێر پێوەنا... لە نووسین و هۆزانەکانی خۆیاندا وشە و بڕگەیان خۆیەخۆو بیّ گوێدان بە ماناکانیان بەکار دێنا، ڕستەکانیان هەندێ جار دەشوبهایە سەر قسەی نامەفهومی منالان. تریستان تزارا (١٨٩٦- ١٩٦٤)ی شاعیر و نووسەری فەرەنسیی ڕۆمانی زادە بوو.

١٥- لیون: ناوچەیەکی باکووری فەرەنسایە لە باکووری ڕۆژهەلاتی پاریس.

١٦- لوهاڤەر: بەندەرێکی باکووری فەرەنسایە.

١٧- فرایبورگ: شارێکە لە ڕۆژئاوای ئەلمان.

# بەشی سێیەم

# ئەدەبیاتی ئەسپانیا

# لە

# سەردەمی رینیسانس

# و چەرخی زێرینـدا

سەرەتایەکی مێژوویی:

زەماوەندی فەردیناند "١" ی پاشای ئاراگون لەگەڵ ئیزابیل "٢" ی مەلیکەی کاستیل لەساڵی ١٤٦٩، رووداوێکی خێر بوو بۆ ئەسپانیا. لە ئەنجامی ئەم ژن و ژنخوازییەوە هێزی هەردوو بنەماڵەی دەسەڵاتداری ئاراگۆن و کاستیل یەکیان گرت و لەساڵی ١٤٧٩دا حکوومەتی یەکگرتووی ئەسپانیا هاتە ئاراوە. فەردیناند و ئیزابیل پاش ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان قایم کرد، لە ساڵی ١٤٩٢دا غەرناتەی دوا قەڵای مورەکانیان (موسولمانان) گرت، و لە ساڵی ١٥١٥دا ناوار-یان لە چنگی فەرەنسییەکان دەرهێنا. دەسەڵاتی شاکان، ئەنجوومەنی یاسادان، و ئەرستۆکرات یەك لە دوای یەك دایانە کزی، کە لەساڵی ١٤٩٢دا کریستوف کولومبس کیشوەری تازەی ئەمریکای دۆزییەوە، هەموو سەرزەمینە کەشف کراوەکان بوون بە موڵکی پاشای ئەسپانیا، لە ئەنجامدا فەردیناند و ئیزابیل بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمنانی دەسەڵاتی پاشایەتی دا کەوتنە بەرەڤانی لە کێڵسای کاتولیك. لەساڵی ١٤٨٠دا دادگای کێڵسا (بۆ سزادانی کفرکردن و کافران) لەئەسپانیادا دامەزرا، و تاقیبی بێ رەحمانەی موسڵمانان و جولەکە دەستی

پێکرد. ئەوانە ناچار بوون یان وڵات بەجێ بێڵن یان بێنە سەر ئایینی مەسیح. سیاسەتی فردیناند و ئیزابیل ئەمە بوو: یەك خوا، یەك پاشا، یەك یاسا.

ئەم سیاسەتە لە سەردەمی پاشایانی دواتردا (شارلی یەکەم: ١٥١٦- ١٥٥٥، فیلیپی دووەم: ١٥٥٥-١٥٩٨، فیلیپی سێیەم ١٥٩٨-١٦٢١، فیلیپی چوارەم ١٦٢١-١٦٦٥، و شارلی دووەم ١٦٦٥-١٧٠٠) هەر بەردەوام بوو. و لەلایەکەوە زەخیرى بێ پایانی کیشوەری تازە ئەسپانیای دەوڵەمەند کرد، بەڵام لە هەمان کاتدا بووە هۆی ئەوەی کە ئەم کیشوەرە هەم پەرەسەندنی سەرچاوە سروشتییەکانی و هەم مکوم کردنی یەکێتی نەتەوەیی خۆی پشتگوێ بخات. لەلایەکی دیکەوە پاشایانی ئەسپانیا بە پێویستیان زانی زنجیرە شەڕێکی بەربلاو بە هۆی سیاسییەوە دژی فەرەنسا و ئینگلیستان، و بە هۆی مەزهەبییەوە دژی ئینگلیستان و هوڵەندا دەست پێ بکەن. ئەمە جگە لەوەی ئەسپانیاییەکان بەکردەوە لە سەرانسەری کەنارەکانی دەریای ناوەڕاستدا کەوتنە راوەدوونان و پەلاماردانی موسوڵمانان.

شارلی یەکەم، پێنجەمین شەڕی گەورەی خۆی دەست پێکرد. لە سەردەمی فیلیپی دووەمدا ئەسپانیا گەیبیە لوتکەی دەسەڵات و هێزی خۆی. بەڵام لە دوای شکستی ئارمادای[٣] لەشکان نەهاتوو (١٥٨٨) جەزرەبەیەکی وەها بەم وڵاتە کەوت کە ئیتر پشتی راست نەکردەوە. بەمجۆرە ئەسپانیا لەلایەنی سوپایی و ئابوورییە وە دایە کزی و بەرەو هەرەس و روخان چوو. لەسەردەم و سەروبەندی پاشایانی دواتریش وەزع و حاڵەکە هەر بەو داڕووخاوییە بەردەوام بوو.. پرتوغال، کە لە ساڵی ١٥٨٠دا کەوتبووە ژێر رکێفی ئەسپانیاوە، لە ساڵی ١٦٤٠دا سەربەخۆیی وەرگرت، و هۆڵەندا لە ساڵی ١٥٦٨ەوە رێگەی سەربەخۆیی خۆشکرد. لە ناوەندی سەدەی پانزەیەمدا کەلتووری رێنیسانسی ئیتاڵیا بەرەو ئەسپانیا هات. پاشایانی ئاراگون ساڵانێکی دوور و درێژ لە سیسیل و ساردنیا، و لە ساڵی ١٤٥٣ەوە لە ناپولی حوکمڕانیان کردبوو، لە ئەنجامدا سەربازانی ئاراگونی ( و لە ساڵی ١٤٦٩ش بەدواوە کاستیلییەکان) ئاشنایەتییان لەگەڵ زانستی تازەدا پەیدا کرد. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٤٢٩دا کۆمیدیای خوایی دوو جار و دیکامیرون یەك جار بۆ سەر زمانی ئەسپانیایی وەرگێردران، و لە ساڵی ١٤٨٠دا بەرهەمەکانی پترارك رەواجێکی زۆریان پەیدا کرد. فردیناند و ئیزابیل-یش هاندەر و پشتیوانی شاعیران و زانایان بوون. لە ساڵی١٤٧٤ هونەری چاپ هاتە ئەسپانیاوە. زۆر کتێبخانان لەم کیشوەرەدا دامەزران، زانکۆیانی تازە کرانەوە، و ئەرستوکراتان کۆشکەکانیان بە تابلۆیانی نیگارکێشی و بەرهەمی دیکەی هونەری رازاندەوە. لەم قۆناغەدا، ئیلیو ئانتو نیو دنبریخا (١٤٤٤-١٥٣٢)

بە دیارترین نوێنەری مرۆڤپەروەری ئەسپانیا، و خوان لویس ڤیڤویس (١٤٩٢-١٥٤٠) بە گەورەترین سیمای فەلسەفی وڵاتدا دەژمێردران.

کەلتوری ڕێنیسانس، کە لە ئیتاڵیا، فەڕەنسا، و ئینگلیستان گەیی بووە هەڕەتی گەشەکردن، لە ئەسپانیادا، وێڕای حەزی زۆر لە زانستی تازە، هیچ کاتێك ڕەونەق و ڕەواجی تەواوی پەیدا نەکرد. دەکرێ هۆکارەکانی بلاوْنەبوونەوەی ئەم کەلتوورە لەم خاڵانەدا کۆ بکرێتەوە:

*١- سپانۆلیزم [٤]، بەتایبەتی گیانی دژایەتی کردنی دەسەلاتی بێگانە.*

*٢- بێزاری خۆرسکی ئەسپانیاییەکان لە دەسەلات پەزێری.*

*٣- دادگای کلێسا، کە مرۆڤپەروەری و ئازادی بیری بە خەلکی ڕەوا نەدەبینی. دەزگای تەفتیشی باوەڕان ( دادگای کلێسا) ڕاپەڕینی ریفۆرمی ئایینی پروتستانی پەل بەست دەکرد و ڕێگەی هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی نەدەدا. بەلام لەناو کلێساوە هەندێ ریفۆرمی کەم و کورت ئەنجام درا.*

<u>نۆڕینێکی گشتی:</u>

ڕەوتی ئەدەبیاتی ئەسپانیایی تەقریبەن شان بەشانی ڕەوت و چارەنووسی سیاسی میللەت دەڕوات. ئەدەبیاتی ئەم وڵاتە لەسەرەتاکانی سەدەی شازدەیەمەوە دەچێتە پرشنگدارترین قۆناغ و سەردەمی خۆیەوە و دوای یەك سەدە، بەهۆی بەرهەمەکانی سێرڤانتس و لوپە دوگاوە دەگاتەلوتکەی بەرزی و شکۆ. ئەوسا دەکەوێتە سەرەولێژگەی هەرەس و داروخان و لە ناوەڕاستی سەدەی هەڤدەیەم دا ئیدی ڕولەتبازی و وشەبازی (گونگوریزم) [٥] تەنانەت لە بەرهەمی نووسەرانی گەورەش دا برەو دەسەنێ و بەرەو هەلدێری داروخان و هەرەسی دەبات. لەسەردەمی درەخشانی ئەدەبیاتی ئەسپانیادا گیانی هەلچووی مرۆڤپەروەری و هومانیزمی رینیسانس پێ بەپێی ر وحی ئارام و دلبەندی کەلتووری سەدەکانی ناڤین، پەرەدەسەنێ و دەخەملێ. هەمان ئەو سەدەیەی کە کالڤن و رابلێ لەفەڕەنسادا پێدەگەیەنێ، لەئەسپانیاش دا قەشەتریزای دانەری ڕۆمانی لازاریلوی تورمسی پێدەگەیەنێ. و هەندێ جار دوو روحی ناکۆك دەبێتە مایەی کێشمانەکێش لە بوونی کەسێکی وەکو سیرڤانتسدا.

ڕێنیسانس لە ئەسپانیادا، وەکو ئیتاڵیا و فەڕەنسا، نەك هەر دەبێتە مایەی حورمەت و ڕێزگرتنی یۆنانی کۆن و لاتین، بەلکو پشتیوانی لە نەشونما و بوژانەوەی دیالێکتە ناوچەییەکانیش دەکات. بۆیە دیالێکتی کاستیلی لە زەرفی ماوەیەکی کەمدا وەکو زمانی فەرمی و نەتەوەیی قەبووڵ دەکرێ.

نووسەرانی ئەسپانیایی، بە پێچەوانەی نووسەرانی ئیتاڵیایی و فەرەنسییەوە، پێیان ناخۆش بوو کە ژانرە ئەدەبییە کۆنەکان تەرك بکەن و روو بکەنە ژانرە کلاسیکەکانی وەکو داستان (مەلحەمە) و قەسیدە. هەڵبەتە کەسانی ریزپەڕیش هەبوون. باوترین ژانر و فۆرمی ئەدەبی لە سەردەمی زێڕیندا، چامە، غەزەل، رۆمانسی پەخشان، رۆمان و شانۆنامە بوو.

## هۆزان

## چامە- Ballad:

پێشتر ئاماژەیەك بۆ سەرهەڵدان و ناوەڕۆك و ئیجابیاتەکانی چامە کرا لەگەڵ ئەمەشا لەبەر ئەوەی چامە گەورەکان زۆربەیان پاش دەستپێکی قۆناغی رێنیسانس هاتوونەتە نووسین و دانان دەبێ لێرەدا چەند قسەیەکی دی بکرێ. لەو دوو هەزار چامە ئەسپانیاییەی کە ئەمڕۆکە لەبەر دەستدایە، ژمارەیەکیان لە دەستنووسە پەڕاگەندەکانی سەدەی چواردەمدا بوونە. یەکەمین کۆمەڵەی گەورە (کتێبی چامەکان) بوو کە لە دەوروبەریساڵی ١٥٥٠دا لە ئانتورپ بڵاوبووەوە، و دوای ماوەیەکی کورت، چەند چاپێکی تازە کرایەوە، لە هەمان ساڵدا (بڵاڤۆکی چامە جۆراوجۆرەکان) لە ساراگوسا بڵاوبووەوە. ئەم دوو کۆچامەیە زۆربەی چامە رەسەنە ئەسپانیاییەکانیان لەخۆ دەگرن. کۆ چامەکانی دواتر بەرهەمی ناودارانی وەکو سیرڤانتس و لوپەدوگا-یان لەخۆ گرتووە و بایەخی ئەم چامە و بەیتانە زیاتر لە لایەنە ئەدەبی و هونەرییەکانیاندایە.

## هۆزانی لیریکی

خوان بۆسکان ئالموگاڤیر ١٤٩٣- ١٥٤٢:

بوسکان "شۆڕشێکی شیعریی لە رێنیسانسی ئەسپانیادا دەست پێکرد". ئەم شاعیرە ئەرستۆکراتییە، لەسەر پێشنیازی ناڤاگرد-ی سەفیر باشی ڤینیس، وەزنی ئیتاڵیایی (بەتایبەتی شێوەی پترارك)ی لە شیعری کاستیلیدا تاقیکردەوە. شێوەی یازدە سیلابی ئیتاڵیایی هێنایە ناو شیعری ئەسپانیاییەوە، و سوودی لە بەندی هەشت نیوە بەیتی، سێ نیوە بەیتی، و فۆرم و قاڵبی غەزەل وەرگرت. هەروەها کتێبی (دەرباری)یەکەی کاستیلیونەی بە پەخشانێکی ئەسپانیایی جوان تەرجەمە کرد. هۆزانەکانی بۆسکان (کە لە ساڵی ١٥٤٣دا لە

لایەن بێوەژنەکەیەوە بلاوکرایەوە) گەرچی هەندێ شەقلی خودی و هونەری پێوەیە، بەلام هەول و کۆششی وی لەواری ناساندنی کێش و کەلتووری رێنیسانسی ئیتالیایدا، بایەخێکی بالا و زیندووی بۆ شیعری ئەسپانیایی هەبوو.

گارسیلاسود لاڤگا ١٥٠٣- ١٥٣٦:

شاعیر، سوپایی و دەرباری بوو. ئەو کە بە شاعیری بێ خەتا ناوبانگی دەرکردووە، شیعری زۆر کەمی گوتووە، بەلام ئەوەی کە لە پاشی بە جێماوە (سی و هەشت غەزەل، پێنج قەسیدە، سێ شیعری شوانکارەیی، دوو لاوانەوە، و یەك نامەیە) لە رادەی کەمالی رازاوەیی دایە، ناوەرۆکی سەرەکی هۆزانەکانی وی ڤیانە، و عادەتەن نەرمە خەمینییەك بەسەردا کێشاوە، بە هەر حال، هۆزانەکانی دلاڤکا هەر چەندە نە تازەن و نە دەولەمەندن لەرووی ناوەرۆکەوە (هەڤرکی شیعری پترارك دەکەن)، بەلام خودی لاڤگا باشترین نموونەی جەوهەر و روحی شیعری رێنیسانسی ئەسپانیایە و لەواری شێوە و فۆرمی شیعردا وەستا و مامۆستایەکی تەواوە.

فری لویس دلیون ١٥٢٧- ١٥٩١:

زۆر کەس دلیون بە گەورەترین شاعیری لیریکی ئەسپانیایی هەموو سەردەمەکان دەزانن. لە سالامانکادا مامۆستای ئیلاهییات بووە و ژیانێکی ئاسوودە و هێمنی هەبووە (تەنیا ئەوە نەبێ کە بۆ تۆمەتی بیدعەتکاری دراوەتە دادگا، بەلام تەبرێ بووە). لیون لە نێو سیماکانی رێنیسانسدا بێ هاوتایە، زانایەکی بێ هەوا و نووسەرێکی بەرییە لە خۆپەرستی، سادەیی، بەهرەدار و تواناداری هونەری، ئارامی، دلبەندی بە سروشت و دوورە پەرێزی شاعیرانی لاتینی تیابوو، لێ ڤیانی تەبیعەت لەلای وی هۆیەك بوو بۆ گەیشتن بەئامانجێك، -بە هزرینی ئایینی- دوو شیعری لیریکی و ئاشقانەی بەنێوبانگی وی: (شەوی مەنگ) و (ژیانی گۆشەگیری)یان ناوە.

لویس دلیون لە پەخشانیشدا دەستێکی بالای هەبوو. یەکێك لە بەرهەمە پەخشانییەکانی (کەیبانۆی تەواو- ١٥٨٣)ـە، کە وێنەی ژنێکی بە سەبر و بێ هەوا و کارامەیە. بەرهەمێکی پەخشانی دیکەی (ناوەکانی عیسایە- ١٥٨٣) گفتوگۆیەکە دەربارەی بابەتی مانای رەمزی ئەو ناوانەی کە لە ئینجیلدا بە حەزرەتی عیسا گوتراون. بە هەر حال سەنگینی، سادەیی، راشکاوی و وردی و وردکردنەوە لە تایبەتمەندییەکانی پەخشانی لیون-ن.

سان خوان دلاکروث ١٥٤٢- ١٥٩١:

گەورەترین شاعیری عارفی ئەسپانیاییە. بە ئیلهامی غەزەلەکانی سلیمان، زۆر وێنەی دەولەمەند و رەمزی داهێنا. ئیلهام و سەرۆی شاعیرانە و جەزبەی ئایینی لە بوونی کروشدا

ئاوێتەی یەکتر بوون. لەڕاستیدا روحی ئەو خودی شیعرە. بەناوبانگترین شیعری ئەو (شەوی تاریکی روح)ی ناوە.

## داستان (مەلحەمە)

ئەو میللەتانەی کە بە شێوەیەکی جدی کەوتنە ژێر کاریگەری ڕێنیسانسەوە، هەموویان کەم دابێژ روویان کردە داستان و داستان بێژی. لە ئەسپانیاشدا شاعیرانێکی چوون لو پەدڤگا، هەندێ داستانیان نووسی کە تیایا ئەوەندە سەرکەوتوو نەبوون. زۆربەی ئەم شاعیرانە لاسایی بواردو، ئاریوستو، تاسۆ-یا دەکردەوە و کەمتر لایان لە هۆمەر و ڤێرجیل کردۆتەوە. لە داستان نووسە گەورەکانی ئەسپانیا تەنیا لویش وات دکامونیش و ئەرسیلائی زونیگا، لێرەدا شایانی باسن.

<u>لویش واث دکامو ئینش ١٥٢٤- ١٥٧٩:</u>

شاعیری نەتەوەیی پرتوغالە، لە لیسبون لە دایك بوو. بابی خاوەن کەشتی و کەشتیوان و باپیرەی لە دەریاوانەکانی هاوسەفەر و هاوڕێی فاسکو دیگاما بوو لە سەفەری هیندا کامونینش ژیانێکی یەجگار تاڵی هەبوو: بە هۆی دڵبەندییەوە بە ماشوقەی پاشاوە ماوەیەکی لە ئاراوگەدا بردە سەر. لە شەڕی موسوڵماناندا چاوێکی کوێر بوو. هەموو سەروەت و سامانەکەی لە هیندا لە دەست دا، هۆزانەکانی نە شۆرەتیان بۆ پەیدا کرد و نە پارەیەکیان بە نسیبی کرد، و ئاقیبەت بە دەستکورتی مرد.

<u>لوزیاد- ٥٧٢:</u>

داستانێکە لە دە بەرگدا، دەربارەی سەفەری فاسکو دیگاما بە دەوری لوتەی ئومیدنیکدا بۆ هیند ١٤٩٦. عەیبی ئەم بەیتە بریتییە لە زیاد کردنی نەگونجاوی —تاڕادەیەك پێکەنیناوی- رەگەزێن داستانی فراوان (کە ڤێرجیل وە بیر دێنێتەوە) بەتایبەتی بەشداری کردنی خودایانی ئولەمپی لە رووداوەکاندا، یەکێك لەوانە قەرقەشەی بەردەوامی نێوان باکوس (دژی سەرکەوتنی دیگاما لە هیند)و ڤینوس (لایەنگری ئەو پرتوغالییانەی کە لە نەوەی رومییەکانن). دیگاما بە درێژایی کەنارەکانی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا رووبەڕووی دژواری و گرفتی جۆراوجۆر دەبێتەوە، بەڵام لە ئەنجامدا دەگاتە کالیکات"٦" ، لە وێندەر بە گەرمی پێشوازی لێدەکرێ، تا باکوس شازادە ملیندای دژ هاندەدا. تۆپە گەورەکانی گەلە کەشتییەکانی دیگاما

بەرپەرچی شازادە دەدەنەوە و شازادە هیچی پێناکرێ، و دیگاما و هاورێکانی کۆمەڵێك دیاری وەردەگرن و درێژە بە سەفەری خۆ دەدەن. ڤینوس-یش رێی دەریاوانەکان دەدا لە رێگەی خۆیانەوە بو پرتوغال سەردانی دورگەی شادی بکەن... ئیجابیەتی سەرەکی ئەم بەیتە، ئەو گیانی پڕجۆش و خرۆشە نیشتیمانپەروەرییەیە کە، ئەگەرچی لە سەرانسەری داستانەکەدا تیشکی داوەتەوە، بەڵام بە چڕترین شێوە لە گێڕانەوەی مێژووی پورتوغالدا (کتێبانی ٣و ٤) لەلایەن دیگاماوە بۆ شازادە ملیندا، بەرجەستە دەبێ.

ئالفونسو دئێرسیلای زونیگا ١٥٣٣- ١٥٩٤:

شۆرەتی ئێرسیلا قەرزارباری بەیتی لائارائیوکانا (١٥٥٥- ١٥٩٠)یە . بابەتی سەرەکی ئەم بەیتە درێژە (سی و حەوت بەشە) راپەڕینی خەڵکی خۆیی ئارائیوکانای شیلییە دژی هێرشبەرانی ئەسپانیایی. ئێرسیلا زۆر رووداوی ئەوروپای هاوچەرخی (وەکو شەڕی لپانتۆ، ١٥٧١) و بابەتی دیکەی ئەفسانەیی لەم بەتیەدا بەکارهێناوە. بە هەر حاڵ سوود وەرگرتن لە شێوە داستانییەکانی ڤێرجیلی و هۆمەری، زیانی زۆریان (وەکو لوزیادەکەی کاموئینشی) بەم بەیتە گەیاندووە. بەیتی لائارائوکانا گەرچی بەرهەمێکی سەیرە و زۆر توخم و رەگەزی جۆراوجۆری نەبانی تێادا تێکەڵ کراوە، بەڵام نووسەری داستانەکە یا بەیتەکە لە شەرح و شرۆڤەی دیمەنانی کیشوەرە تازەکە و شەڕەکانیا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. کاراکتەرسازییەکانی لەمەڕ قارەمانانی ئارائیوکانایی و ئەسپانیایی یەجگار بەرز و باڵایە. ئێرسیلا لەم بەیتەدا و لە وێنەگرتنی ئایدیالی خەڵکانی ئەمریکاییدا پێش شاتۆبریان و جیمزفنیمور و کوپەر کەوتووە.

## چیرۆکی پەخشانی

### رۆمانس:

رۆمانسی سوارچاکی:

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پەخشانە رۆمانس —چیرۆکی ئاڕادەیەك درێژ، کە بە شێوەیەکی ئایدیالی باسی سوارچاکی و کاری مەزنی قارەمانانی دەکات —لە ئەسپانیادا بوو بە باو. هەندێ لە رۆمانسەکان، وەرگێڕانی دەقا و دەقی بەرهەمە فەرەنسییەکان بوون. لە قۆناغ و سەردەمی رێنیسانسدا، گەلێك لە نووسەرانی ئەسپانیایی دووبارە روویان کردەوە فۆرمی رۆمانس و رۆمانسێکی یەجگار زۆر لە سەدەی شانزەیەمدا بڵاوبوونەوە.

زۆربەی ئەم بەرهەمانە شکۆداری ئارمانجێن وەکو ئادابزانی، بە هەڵوێستی، دلاوەری، و وەفاداری دەگێڕنەوە. قارەمانی ژن لەم چیرۆکانەدا عادەتەن ژنێکی گەنجی بێ مێردە (قارەمانی ژن لە رۆمانسە فەرەنسییەکاندا ژنێکی مێرددارە).

سکێچی قاڵبی رۆمانسەکان خەیاڵی و موبالەغە ئامێزن، ئەم سکێچ و پلوتانە، لە شەڕی قارەمان لەگەڵ سوارچاکانی دیکەدا، لەگەڵ جانەوەران، دێوان و جادووگەراندا پێک دێ، و بە تەبیعەت قارەمانی رۆمانس هەمیشە لە شەڕدا سەرکەوتوو دەبێ و پاشان ئەڤینی خۆی بۆ ئەو ژنە دەردەبڕێ کە شەڕەکەی لە پێناودا کردووە.. ئەم رۆمانسانە وێڕای ئەو هەموو موبالەغەکارییانەی کە تیایاندایە، کە لە دۆنکیشۆتدا تەوسیان پێکراوە، بۆ خوێنەرانی سەردەمی رێنیسانس سەرگەرمکەر بوون، بوونە مایەی بەردەوامی ئارمانجێن سوارچاکی.

ئامادیس گول:

کە لە ساڵی ۱۵۰۸دا بە هیمەتی مونتالڤو"۷" بە چاپ گەیی، بەناوبانگترین رۆمانسی ئەو زنجیرە رۆمانسانەیە کە لەسەر ژیانی ئامادیس گول نووسراون. هەروەها لە نێو زنجیرە رۆمانسانی، پالمریندا، پالمرینی ئینگلیستان (۱۵٤۷-۱٥٤۸ ) لە هەر هەموویان بەناوبانگترە. سێیەمین رۆمانسی مەنشور (تیرانتی سپی-۱٤۹۰ )یە کە لەلایەن مارتورل"۸"، و دوگالبا"۹" وە دانراوە.

سەردەمی رۆمانسی سوارچاکی و دلاوەری لە دەوروبەری ساڵی ۱۷۰۰دا دابوویە کزی و لە تەواو بوون دابوو، و بلاوبوونەوەی لازاریلوی تورمسی و دۆنکیشۆت ئاوا بوونی سەردەمی رۆمانس و چیرۆکی سوارچاکی خێراتر کرد.

چیرۆکی شوانکارەیی:

رۆمانسی شوانکارەیی، کە بە هۆی ساناتسار و ئاسووە پەیدا بووبوو، لە ناوەندی سەدەی شازدە یەمدا لە ئەسپانیاشدا شۆرەتی پەیدا کرد. بەناوبانگترین و رەنگە باشترین رۆمانسی شوانکارەیی کە لە نیمچە دورگەی ئیبریا گوتراوە، دیانا (۱۵۵۹)ەکەی خورخیە (خونتمایر-ی پورتوغالی بێ، کە سەرچاوەی ئارکادیا-کەی فیلیپ سیدنییە رۆمانس و چیرۆکە سەرنج راکێشەکانی دی بریتین لە: (دیانای ئاشق- ۱٥٦٤، نووسینی پولۆ"۱۰"، گالاتیا- ۱۵۸۵، نووسینی سیرڤانتس، و ئارکادیا- ۱۵۹۸ نووسینی لوپەدوگا).

## رۆمان

جگە لە رۆمانسەکان (کە هەندێ لە شرۆڤەکاران بە رۆمانیان لـە قەڵـەم دەدەن) دوو جـۆرە رۆمانی سەرەکی، رۆمانی ئایدیالیستی و رۆمانی ریالیستی، لە ماوەی رێنیـسانس و چـەرخی زێڕیندا، لە ئەسپانیا هاتنە ئـاراوە. ئەمـە جگـە لـەوەی کـە دۆنکیـشۆت بەتـەنیا و بـەخۆی جۆرێکی تایبەتی هەیە کە لە کۆتایی ئەم بەشەدا قسەی لەسەر دەکرێ.

رۆمانی ریالیستی:

رۆمانی ریالیستی یەکەمجار لە کۆتایی سەدەی پانزەیەمدا لە ئەسپانیا پەیدا بوو و زۆریـش لە رۆمانی ئایدیالیستی پڕ بەهاترە.

رۆمانی مەیلەو شانۆیی:

"سلستینا" لە دەوروبەری سـاڵی ١٤٩٩دا بڵاوبووەتـەوە، ئـەم رۆمانـە بـە "ئیحتوبـارترین شاکاری پەخشانی ئەسپانیایی تا ئەو زەمانەیە"، نووسەر بە شێوەیەك کە (کتێبی ئەشـقی باشـی خوان روئیت) وەبیر دێنێتەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە مەبەستی ئەو لەم بەرهەمەدا نیشاندانی مەترسییەکانی ئەڤینی بێسەروبەر و هاونشینی خەڵکی خراپە، بـە لاوان، ئـەوە دەگێڕێتـەوە کـە چۆن سلـستینا، کە نیوەی سیحرباز و نیوەکەی تری دەلالی خۆشەویستییە کالیست و ملیبیا بەرەو ئەشقی حەرام دەبات. کالیستو لە کاتی بەجێهێشتنی قاتی سەرەوی نیشتنگەکەی ملیبیـا، و بـە دەم هەڵاتنەوە لە هێرشی ئەو پیاوانەی کە تاقیبی دەکەن، لە نەردەوان بەردەبێتەوە و دەمرێت، لە دوای ئەم رووداوە ماشوقەکەی لە تاوەرێکەوە خۆی هەڵدەدێرێ و دەمرێت.

ئاشکرایە کە پلۆتی چیرۆکەکە مایـەی دڵگـیری و جـوانی سلـستینا نییـە، راز و نهـێنی زندوویەتی نووسەری رۆمانەکە لـە کاراکتەرسـازییەکەیدایە. ئـەو پیرەژنـەی کـە رۆمانەکـەی بەنێوەوە ناونراوە، بوونەوەرێکە سەیر و سەرنج راکـێش -بوونـەوەرێکی شـەیتانییە، دوورە لـە هەر سۆز و سۆزدارییەك و بوونەوەرێکی شەڕانییە. کالیستۆ پڕاوپـڕی وشـەی ئاشـق ئاشـقە، و ملیبیـاش ئاڕادەیـەك نموونـەی ژنێکـی قارەمانـە. کاراکتـەرە خوێرییـەکانی رۆمانەکـەش- دەڵاڵەکان، قەحپەکان، سوپاییان، نۆکەران، زۆرداران و... هتد شایانی باسن.

سلستینا ناوبانگێکی گـەورەی پەیـدا کـردو، کـاری کـردە سـەر ئـەدەبیاتی پـاش خـۆی، بەتایبەتی بەرهەمی رۆماننووسان و شانۆنامەنووسانی وەکو سێرڤانتس، لوپەدوگا، و گەلەك لە نووسەرانی ئیتاڵیایی، ئینگلیزی و ئەڵمانی. مناندت یی پلایۆ"[١١]" سلستینا بە یەکێك لە سـێ

بەرهەمی گەورەی ئەدەبیاتی ئەسپانیایی دەژمێرێ (دوو بەرهەمەکەی دی دۆنکیشۆتی سیرڤانتس و کتێبی ئەشقی باشی خوان رونیت-ە).

رۆمانی دەربەدەران:

ئارنست مریمە رۆمانی دەربەدەران (پیکارسک- picaresque) بەمجۆرە پێناسە دەکات "رۆمانێکە کە قارەمانەکانی لە چینێکی تایبەتی لە گەجەر و گوجەر و وێڵ و دەربەدەرانن، خەڵکانێك کە بە دەسەندەی خەڵکانی دی دەژین، بە ئانقەست خۆ لەو دیوی مەرزی داب و نەریت و قەراردادەکانی کۆمەڵگەوە دادەنەن، و لە رێگەی حیلەبازی رووت، و لەبەر رۆشنایی خەیاڵێکی بە پیت و بێ ئامانجدا ژیان دەبورێنن". نورتاپ پێناسەیەکی فراوان تری بۆ ئەوە هەیە: "رۆمانی پیکارسك وێنەیەکی واقیعی ژیانی تاوانباران رەسم دەکات، و ئەم تاوانبارانە و فێڵ و دەهۆکانیان جوانی و گیرایی بە چیرۆکەکە دەبەخشێت". نموونەی جۆری رۆمانی پیکارسك سەربوری کەسێکی بەرەڵای فێڵباز (پیکارۆ)یە، رووداوەکانی ئەم جۆرە رۆمانە عادەتەن بە زمانی یەکەم کەسەوە دەگێڕدرێتەوە، و زنجیرەی رووداوی چیرۆکەکە پەیوەندییەکی لۆژیکی ئەوتۆیان پێکەوە نییە، لە رۆمانی پیکارسکدا کەمتر بویەری ئاشقانە دێتە پێشێ. و لەڕاستیدا ئەم جۆرە رۆمانانە کۆمیدی و تەنزئامێز و رەشبینانەن.

گرنگترین رۆمانێن پیکارسك ئەمانەن: ساتیریکون، لە نووسینی پترونیوس، کەری زێڕین، نووسینی ئاپولیوس، مورگانتەماجورە، لە نووسینی پولچی، و کەشتی گەوجان، کە شاکاری سباستیان برانت-ە. هەندێ لە رۆمانانی پیکارسك-ی دواتر، تەنانەت لەم بەرهەمانەش خۆشتر و دڵگیرین.

رۆمانی پیکارسکی ئەسپانیایی پتر لە سەد ساڵ هەر گەشاوە و لە برەدا بوو، و کاریگەریی ئیتاڵیا، فەرەنسا، ئەڵمان، و ئینگلیستان-یشی گرتەوە، نووسەرانی وەکو ناش (لە رۆمانی گەورەی رێبواری بەدشانسدا)، فیلدینگ، ئیسمالت، دیکنز و تاکری کاریگەری زۆری رۆمانی پیکارسك-یان بەسەرەوە بووە.

لازاریلوی تورمسی:

(ناونیشانی تەواوەتی: ژیانی پڕ هەوراز و نشێوی لازاریلو-ی خەڵکی تورمس-ە) ئەم بەرهەمە کە نووسەرەکەی نادیارە "[١٢]، یەکەمین رۆمانی گرنگی پیکارسك-ە کە لە ساڵی ١٥٥٤دا لە ئالکالا، بورگوس و ئانتورپدا بڵاوبووەتەوە. لازاریلوی ((دژە قارەمان)) و (کاراکتەری سەرەکی) کتێبەکە بابایەکی کڵاوچی دیارە کە وێنەگرتنی کەسایەتیی دەچێتەوە

سەر کەلتووری عەوامی خەلکی. لەم رۆمانەدا، لە سەرەتاوە باسی ئەسل و فەسل و لەدایکبوونی لازاریلو دەگێڕدرێتەوە (کە لاسایی کردنەوەیەکی هەجو ئامێزی ئەسەبنامەکانی سوارچاك و قارەمانەکانە لە رۆمانی ئایدیالیستیدا)، ئەوجا باسی رۆژانی برسییەتی، دەغەلبازی، تاوانکاری و فێلّ و فەرەجەکانی لە خەلکی، دەکرێت، و ئەنجام چیرۆکەکە بە بوژانەوەی دارایی لازاریلو و زەماوەندی دەگەلّ ماشوقەی کەشیشێکدا کۆتایی دێت. لەم چیرۆکەدا تەنز و توانجێکی زۆر دژی کەشیشان، بەتایبەتی دژی (پەرجونوێنی وان) هەیە.

رۆمانی لازاریلو-ی تورمسی زۆر زوو لە نێو خەلکیدا بلاّوبووەوە و لەلایەن کلێسای کاتولیکەوە خرایە لیستی کتێبە قەدەغە"١٣"کانەوە. چاپی پوختەکراوی ئەم کتێبە لە سالّی ١٥٧٣دا بلاّوبووەوە. لە سالّی ١٥٥٥و ١٦٢٠دا دوو کتێبی دی وەکو درێژەی ئەم رۆمانە چاپ کرا. لە فاسیلەی سالاّنی ١٥٩٠و ١٦٦٠دا چەند رۆمانی دیکە بە چاولێکەری رۆمانی نێوبراو هاتنە نووسین.

ماتیو ئالمان ١٥٤٧- ١٦١٠:

ئالمان، رۆماننووسێکی ئەسپانیاییە و نووسەری رۆمانی درێژی پیکارسك-ی گوتمان ئالفاراچەیە (بەشی یەکەم لە سالّی ١٥٩٩، و بەشی دووەم لە سالّی ١٦٠٥دا بلاّوبووەتەوە). ئەم چیرۆکە بیرەوەری بەرەلّلایەکی سڤیلی"١٤" دەگێڕێتەوە کە لەگەلّ زۆر بویەر و رووداوان یەخانگیر دەبێ. لە ژیاندا هەرچییەکی بێتە پێش دەیکات: شاگردی چێشتخانە، حەمالی، سەربازگیری، دەرۆزە، نۆکەری، لیبۆکی، گەوادی، دزی، بازرگانی، زانست پەروەری و ئەنجام زەماوەند لەگەلّ ئافرەتێکی میراتگری دەولّەمەنددا. سەرکێشی و دەربەدەرییەکانی بۆتولدو، فلورانس، روم، میلان، جەنەوا، ساراگوسا، مەدرید، ئالکالا و جارێکی دی بۆ سڤیل-ی دەبات. لە ئەنجامدا بە کاری قورس لە کەشتیدا مەحکوم دەبێ و دەکەوێتە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی.

ئەلّمان لە کۆتایی هەر بویەر و ماجەرایەکدا دەکەوێتە ئەنجامگیری ئەخلاقی-رەنگە لەبەر ئەوە بێ کە دەسەلاّت نەرەنجێنێ. بە هەر حالّ، ئەگەرچی چیرۆکەکە بۆ خوێنەری ئەمرۆکە هەندێ تاقەتبەرە، بەلاّم بۆ سەدەی هەڤدە، لەرووی باسکردنی بنەما ئەخلاقییەکانەوە، زۆر پەسند بووە. ئەلّمان (کە بە خۆی تارادەیەك بەرەلّلایەکی فێلّباز بوو) زانیارییەکی زۆری دەربارەی ژیان هەبوو، شێوازی وی سادە و جەماوەرییە، زانیارییە زمانەوانییەکانی دەولّەمەندن، گەلەك لە رەخنەوانان چیرۆکی گوتمان دئالفاراچە-کەی وی بە گەورەترین رۆمانی پیکارسکی ئەسپانی دەزانن.

ئالونسو جرونیمود سالاس باربادی یو (١٥٨١- ١٦٣٥):

رۆمانە بەنێوبانگەکەی باربادی یو ناوی کیژەکەی سلستینا، یان ئیلینای زیرەکـە (١٦١٢- ١٦١٤)، کە سەربور و بەسەرهاتێکە لەمەڕ "ژنێکی بەرەڵڵای حیلەباز" کە لە بری فێڵ کـردن لە ئاغایان و پارەداران بکات، فێڵ لە ئاشقانی خۆی دەکات.

لویس ڤیلزد گوڤارا ١٥٧٩- ١٦٤٤:

شۆرەتی ڤیلز دگوڤارا بە رۆمانی (شەیتانی لەنگ- ١٦٤١)ەوەیە کە رۆمـانێکی کۆمیـدیا ئامێزی پیکارسکە، ئەم رۆمانە بەسەرهاتی خوێنکارێك بەرجەستە دەکات کـە شـەیتانێك لـە نێو بوتڵێکدا ئازاد دەکات و شەیتانیش لە پاداشتی ئەم ئازادییەدا، وی بە ئاسمانـدا دەفـڕێنێ. لە کاتی فڕینەکەیدا و بە حـەواوە دیـەنانی جۆراوجـۆری ژیـان لـە شـوێنانی پـیس و لـە نـاو کۆشکاندا (کە لەسەر بانە روون و شەفافەکانەوە دیارە) تەمەشا دەکات. لوساژ، بە چاولێکەری ئەم بەرهەمە، رۆمانی شەیتانی لەنگ-ەکـەی خـۆی نووسـی، کـە لـەڕووی چـەمك و مانـاوە دەوڵەمەندە، لێ لە باری چنینی چیرۆکڤانییەوە شـاش و لاوازە، ڤیلـز د گوڤـارا لـە مەیـدانی شانۆنامە نووسیشدا بەناوبانگە، بەلای کەمەوە چوار سەد درامای نووسیوە، کە لـەو هـەمووە تەنیا هەشتا دانەیان ماونەتەوە. زۆربەی ئەم بەرهەمانە نێوەڕۆکی مێژووییان هەیە.

فرانسیسکۆ دکوی ڤیدۆنی ڤیلگاس ١٥٨٠- ١٦٤٥:

بە یەکێك لە گەورەترین رۆماننووسانی پیکارسك دەژمێردرێ، زیاتر بە چیرۆکی (بەسـەرهاتی ژیانی بوسـکن- ١٦٢٦) بەناوبانگـە. ئـەم کتێبـە چـیرۆکی پـابلۆ-ی گەجـەرە پیـاوی حیلـەباز دەگێڕێتەوە کە بە دووی هاوپۆلێکی دەوڵەمەندی خۆیدا بۆ ئالکـالا دەڕوات، و لەوێنـدەر دەسـت دەداتە هەر خراپەیەك. پەیوەندی بـە دەسـتەیەك لـە دزانـەوە دەکـات، و وا خـۆی دەنـوێنێ کـە ئیفلیجە، دەبێ بە ئەکتەر، و ئەنجام بۆ ئەمریکا دەڕوات. ڤیلکاس هیچ هەوڵێك بـۆ ئـەنجامگیری ئەخلاقی یـا خولقانـدنی کاراکتـەرێکی رەسـەن و حەقیقـەت نـا، نـادات، (بەسـەرهاتی ژیـانی بوسکن)ەکەی وی سەربور و چیرۆکی تاوانکارێکی زیرەکە، بەڵام رەشبین و خوێریلە و زبرە.

میگویل دسیرڤانتس ساناڤیدرا ١٥٤٧- ١٦١٦:

سیرڤانتس دیارترین سیمای ئەدەبیاتی ئەسپانیایی و یەکێکە لە گـەورەترین سـیماکانی ئەدەبیاتی جیهان. لە شاری ئالکالا هاتەدنیاوە، بابی پزیـشکێکی ناسـەرکەوتوو بـوو کـە بەردەوام شار بە شار دەگەڕا، تـا دەرامـەتی زیـاتر بەدەسـت بـێنێ، زانیـاری زۆر لەمـەڕ خوێندنی سیرڤانتس لەبەردەستدا نییە، رەنگە قوتابخانەی تەواو نـەکردبێ، بـەڵام گومـانی

تیا نییە کتێبی زۆری خوێندووەتەوە. لە سالّی ١٥٦٩دا چوو بۆ ئیتالّیا، و لە روم لە خزمەتی مالّباتی کاردینالّ ئاکواڤاڤیادا مایەوە. پاش یەك سالّ، چووە سوپاوە، دوای ماوەیەك لە شەڕی (لپانتۆدا- ١٥٧١) دلاوەرانە بەشداریی کرد. سیرڤانتس لەم شەڕەدا لە سێ شوێنەوە بریندار بوو، یەکێك لە زامەکان دەستی چەپی بۆ هەمیشە ئیفلیج کرد. لە گەڕانەوەیدا بۆ ئەسپانیا (١٥٧٥) دزانی دەریایی خۆی و براکەیان دیل کرد و لە جەزایردا وەکو کۆیلە فرۆشتیان. لە سالّی ١٥٨٠دا ئازادی خۆی کڕییەوە و بۆ مەدرید گەڕایەوە. لە سالّی ١٥٨٤دا ژنی هێنا، و کەوتە شانۆنامەنووسین، بەلاّم سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بە دەست نەهێنا، لە سالّی ١٥٨٧دا لە دەزگای دەولّەتدا وەکو ماموری بەڕێوەبەری کاروباران دامەزرا و بۆ ماوەی شەش سالاّن لەسەر ئەم کارە مایەوە. لە سالاّنی ١٥٩٤- ١٥٩٨دا بوو بە ماموری باج کۆکردنەوە و ژمێریار... لە ماوەی ئەم یانزە سالّەدا بە هۆی ڕەفتاری نایاسایی لە کارەکەیدا و بە هۆی کەم هێنانی پارە کۆکراوەکانەوە، چەند جارێك کەوتە زیندانەوە. وادیارە سیرڤانتس لە سالاّنی زینداندا (١٦٠٢- ١٦٠٣) دەستی بە نووسینی دۆنکیشۆت کردووە، لە سالّی ١٦٠٦وە تا مردنی لە سالّی ١٦١٦دا لە مەدریددا ژیاو، هەموو وەختی خۆی وەقفی نووسین کرد.

<u>بەرهەمەکانی سیرڤانتس:</u>

"دونکیشۆت یا دۆنکیخۆتە" (بەشی یەکەم، ١٦٠٥، بەشی دووەم: ١٦١٥).

<u>نووسین و بلاّوکردنەوەی دۆنکیشۆت:</u>

هیچ زانیارییەك لەمەڕ بەرواری سەرەتای نووسینی شاکارەکەی سیرڤانتس لەبەردەستدا نییە، نووسەر لە پێشەکی کتێبەکەیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دۆن لەو جۆرە مرۆڤانەیە کە "دەبێ لە زینداندا لە دایك بووبن" بەم قەرینەیە باوەڕی باو ئەوەیە کە سیرڤانتس لە سالّی ١٦٠٣دا، لەو کاتەدا کە زیندان بووە، دەستی داوەتە نووسینی ئەم ڕۆمانە. بە هەر حالّ نووسینی بەشی یەکەم لە سالّی ١٦٠٣ یان ١٦٠٤دا تەواو بووە و لە سالّی ١٦٠٥دا بلاّوبووەتەوە. سەرکەوتنی ئەم بەشە، کردیە کارێك کەسێك بە نێوی فرناندزد"[١٥]" ئاڤلاندا لێ ببڕێ بەشی دووەمەکەی بنووسێت (١٦١٤)، ئەم شتە وای لە سێرڤانتس کرد بکەوێتە پەلەکردن و بەشی دووەمی دۆنکیشۆتی تەواو کرد، و ئەم بەشە لە سالّی ١٦١٥دا بلاّوبووەوە.

ئامانج و چەمك:

تەقریبەن هەموو شرۆڤەكاران پێیان وایە كە ئامانجی سەرەكی سێرڤانتس لە نووسینی دۆنكیشۆت، لاسایی كردنەوەیكی رەخنەئامێز و هەجوئامێزی رۆمانسانی سوارچاكی بووە، و لەگەڵ پێشڤەچوونی رەوتی بەسەرهاتەكەدا، چیرۆكەكە تارادەیەك چەمك و مانایەكی قوڵتر و فراوانتر لەوە پەیدا دەكات كە لە سەرەتادا لە هزر و زەینی نووسەردا بووە. بەڵام ئەم چەمكە قوڵتر و فراوانترە دەربارەی چییە، ئەمە راوبۆچوونی جیاوازی لەسەرە، ژمارەیەك لە رەخنەگران ئەم رۆمانەیان بە هێرشێك بۆ سەر هەندێ كەسی تایبەتی (شارلی یەكەم، فیلیپی دووەم، لویولا"١٦" ) زانیوە. رەخنەگرێكیش ئاماژەی بۆ ئەوە كردووە كە ئەم بەرهەمە هەوڵێكە بۆ لێكدانەوە و شرۆڤەكردنی ماهیەتی شەیدایی (دۆنكیشۆت بۆ خوێندنەوە و موتاڵای كتێبانی سوارچاكی). رەخنەگرێكی دیكە ئەم كتێبەی بە ئیعترافنامەیەكی سێرڤانتس لەمەڕ ناكامی خۆی، زانیوە. چەند كەسێكیش بە جۆرە چیرۆكێكی مەجازییان داناوە، بەتایبەتی رەخنەگرێك ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە ئەم رۆمانە مەجازێكی رازئاسایە دەربارەی ماهیەتی ئەشقی خوایی و دولسینا-ی (مەحبوبی دۆنكیشۆت) شێوەیەكی دەستكاری كراوی دیڤینالوت-ە (نوری خوایی). هەندێكی دی لەو باوەڕەدان كە سێرڤانتس هاو رەئیی سانچۆ"١٧" یە كە گاڵتە بە خەیاڵپرسییەكانی دۆنكیشۆت دەكات، لە حاڵێكا كە رەخنەگرانی دیكە ئاماژەیان بۆ ئەوە كردووە كە سێرڤانتس خۆی بەهاوتای سوارچاكی رۆمانەكەی دەزانێ و دەكەوێتە ستایشی ((ئیمان و كەسایەتییەك كە لە پشت هەستی نەخۆشانەوە دەردەكەوێ)).

رەنگە ئەو بۆچوونەی كولریج لە حەقیقەتەوە نزیك بێ كە دەیگوت مەبەستی سێرڤانتس ئەوەیە كە (دوو رەگەز لە سروشتی ئینسانی، واتە روح و هەست، شیعر و پەخشان، لە قاڵبی قارەماندا بەرجەستە بكات). بێ چەند و چوون، سێرڤانتس تەنانەت ئەو كاتانەش كە گاڵتە بە سانچۆو كیشۆت-ش دەكات، هاوسۆزی لەگەڵ هەردووكیاندا دەكات و تارادەیەك خۆی بە هاوتا و یەكسان لەگەڵ هەریەك لەم دووانەدا دەزانێ. دوورە كە سێرڤانتس بە ئانقەست لە هەوڵی بەرجەستەكردنی شتێكدا بووبێ. رەنگە مەسەلەكە بەم جۆرە بێ كە: سێرڤانتس هاتووە لە رێگەی بیرۆكەی هەجۆی بێهودەییەكانی رۆمانسانی سوارچاكییەوە، وێنەی پیاوێكی هەژار و بێنەوای گرتووە كە بە هۆی خوێندنەوەی رۆمانسانی سوارچاكییەوە هۆش و گۆشی خۆی لە دەست داوە و، خۆی بە سوارچاكێكی ئاوارە زانیوە. لەبەر ئەمە سێرڤانتس وێنەی سانچۆ — دێهاتییەكی ساویلكە- وەكو كەسایەتییەك بەرانبەر بە دۆنكیشۆت دەگرێ. لەگەڵ

پێشڤەچوونی چیرۆکەکەدا، نووسەر تا ئەندازەیەك خۆی لەگەڵ سانچۆی واقیع پەروەر و کیشۆتی خەیاڵپەروەردا بەهاوسۆز و هاوبیر دەزانێ، و ئەم دووە پتر وەکو تەواوکەری یەکتر وێنە دەگیرێن تا وەکو هەڤرك و رەقیبی یەکتر. "ئەمانە نوێنەری دوو جۆرە ئەقڵ و ئەقڵیەتی مرۆڤانین- ئەوەی کە دەزانێ واقیعیەت چییە و ئەوەی کە دەزانێ واقیعیەت دەبێ چۆن بێ".

چیرۆکەکە:

دونکیشۆتی میانە ساڵ، ئەجیمزادەیەکی خەڵکی ویلایەتی لامانچا "١٨"یە، کە خوێندنەوەی لە ئەندازە بە دەری رۆمانسانی قارەمانی بەرەو شێتییان بردووە، و دەیەوێ واقیعیەت بەو وێنایانە بدات کە لەم رێگەیەوە لە هزر و زەینیدا جێگیر بوون. کۆنە زرێیەك لەبەر دەکات، سواری ئەسپێکی لە خۆی لەڕو لاوازتر دەبێ و، رێگەی سەرکێشی دەگرێتە بەر. ژنێکی خەڵکی ناوچەکە وەکو "خانمی ئازیزی خۆی" هەڵدەبژێرێ، و نازناو و لەقەبی ئەشرافی و ئەرستوکراتیانەی دولسینادل توبوسو-ی پێ دەبەخشێت، و هەر زوو دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ئەم ژنە، هەمان خانمی دڵخوازی ئەڤینی وییە کە دەبێ لە پێناویدا دلاوەری و قارەمانێتی بنوێنێ. دونکیشۆت دوای چەند بویەر و سەرکێشییەك، ئەفەرێکی دێهاتی بە نێوی سانچۆپانسا دەدۆزێتەوە و دەیکات بە پاسەوان و چەکداری خۆی. بەجۆرە دۆنکیشۆت پێ دەنێتە مەیدانی شەرە دلاوەرانەکانی خۆی: لە شوێنێکدا تووشی ئاشێکی با دەبێ و وا دەزانێ دێوێکی زەبەلاحە و لەگەڵی دەکەوێتە شەڕ، (لە شوێنێکی دی مێگەلە مەڕێکی لێ دەبێ بە قۆشەن و لەشکرێکی زۆر)... لە ئەنجامدا یەکێك لە دۆستانی دۆنکیشۆت، دەچێتە پێستی سوارچاکێکەوە و لە شەڕێکدا کە بە قازانجی خودی دۆنکیشۆتە بەسەریدا زاڵ دەبێ. قەول لە دۆنکیشۆت وەردەگرێ کە تا ماوەی ساڵێك واز لە پیشەی سوارچاکی بێنێ، بەڵام دۆنکیشۆت بە دڵی بریندار و شکاوەوە بۆ وڵاتی خۆی دەگەڕێتەوە، و دوای چەند رۆژێك دەمرێت.

شێواز و تەکنیك:

وەکو نورتاپ دەڵێت: "سیرڤانتس نەك یەك شێواز، بەڵکو چەند شێوازێکی هەیە. لە هاوسەنگی بەخشین بە دەربڕین و چیرۆکەکەی خۆیدا وەستابوو". شێوازی رۆمانەکەی زیاتر "سادە، ریالیستی، و زیندووە". بەڵام کاتێ کە دەیەوێ گاڵتە بە رۆمانسە کۆنەکان بکات، جۆرە ئاو تاو و کۆنییەك بە زمانی خۆی دەدات. هەروەها هەندێ جار زمانێکی بە تەنتەنە و پڕ سەنعەت و دەستکردی هەیە و هەندێ جار راست و رەوان و راشکاوە.

ئەمڕۆکە هەندێ لە بێ مویالاتییەکانی دۆنکیشۆت وا دێنە بەرچاو کە خەتای چاپکەری مەتنەکە بێ، بەڵام خودی سیرڤانتس-یش بەرپرسە لە زۆر لە ناکۆکی، غەفڵەت، نەگونجانی بابەتەکانی لەگەڵ رۆژگاردا.

پلۆتی رۆمانەکەی دونکیشۆت، کە لە چەند روویەکەوە دەشوبهێتە سەر پلۆتی رۆمانی پیکارسك (دەربەدەران) لە راستیدا لە ئاستی زنجیرە رووداوێك دایە، و بێ چەند و چوون دەتوانرێ بگوترێ کە سیرڤانتس بەر لەوەی کە دەست بە رۆمانەکەی بکات تەنیا پلۆتی چەند چیرۆکێکی لاوەکی (ئیپیزود) دارشتووە. چەند کورتە چیرۆکێکی ناپەیوەستیش خزێنراونەتە ناو چیرۆکە سەرەکییەکەوە.

دوو قارەمانە سەرەکییەکەی رۆمانەکە وەستایانە وێنە گیراون: دۆنکیشۆت نموونەی راستەقینەی وەفادارییە دەرهەق بە ئارمانج و مەبەست، هەڵبەتە وەفادارییەکی گومڕایانە، و سانچۆ پانسا، نموونەی ریالیستێکی زیرەکە بەڵام خەمسارده، قارەمانەکانی دیکەش لێهاتووانە بەرجەستە کراون، هەندێکیان زۆر تیپیکن، بەڵام هەموو جۆرە نموونەیەکیان لە نێواندا بەدی دەکرێ -کەشیش، خوێنکاری زانکۆ، قەحپە، شوان، خاوەن میوانخانە، ئەشراف و چەند نموونەیەکی دیکە کە لە ئەسپانیای سەدەی شانزەیەمدا ژیاون.

هەڵسەنگاندن:

جگە لەو شەرح و شرۆڤانەی کە باسی مەبەستی سیرڤانتس لە نووسینی دۆنکیشۆت دەکەن، تەقریبەن هەموو ئەو کەسانەی کە ئەم رۆمانە دەخوێننەوە نەك هەر بە رۆمانێکی سەرگەرمکەری دەبینن بەڵکو بە ((پەیامێکی شەخسی)) دەزانن. سیرڤانتس، وەکو شەکسپیر، نەك هەر وێنەیەکی تایبەتی خەڵکی زێدوبومی خۆی بە دەستەوە دەدات، بەڵکو سروشت و تەبیعەتی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی و لە هەر شوێنێکا بەرجەستە دەکات. لەم بارەیەوە دۆنکیشۆت خوشحالکردنی هەر خوێنەرێك لە هەر زەمانێك دا بەدەست دێنێ. "سیرڤانتس، وەکو کەسایەتییەکی جیهانی و مرۆڤانی هەموو سەردەمان و وڵاتان، بە هاوتای شەکسپیر و هۆمەر دەژمێردرێ و، دۆنکیشۆت لەگەڵ هاملێت و ئیلیادا سەر بە گەنجینەی ئەدەبیاتی جیهانە، مایەی لەزەتی زەینی هەمیشەیی هەموو میللەتانە".

بێگومان کاریگەری دۆنکیشۆت لە رادەبەدەر بووە. رەخنەگران لەم خاڵەدا هاوبیر و هاوڕان کە کەم کتێب وەکو دۆنکیشۆت لە پێشڤەچوونی چیرۆکی پەخشانیدا کاریگەر بووە. ئەم رۆمانە کە بۆ سەر زۆربەی زمانەکان وەرگێڕدراوە، نەك هەر کاری کرۆدتە سەر ئەدەبیات، بەڵکو

کاریگەری لەسەر سیاسەت، کۆمەڵناسی، و زانستی ئەخلاقیش هەبووە. ناتوانرێ بە شێوەیەکی تەقریبی و رێژەیی کاریگەریی ئەم رۆمانە دیاری بکرێ، بەڵام بە جورئەتەوە دەبێ بگوترێ کە هیچ رۆمانێکی دیکە ئەوەندە لە چاککردنی دنیادا سەرکەوتوو نەبووە.

بەهەرمێن بچووکتر:

رۆمانی دۆنکیشۆت بە جۆرێ بەرهەمەکانی سێرڤانتسی داپۆشیوە کە خوێنەری ئاسایی کەمتر وەسفیان دەژنەوێ. بە هەر حاڵ، سێرڤانتس جگە لە دۆنکیشۆت، زۆر بەرهەمی کەمبایەخ تری نووسیوە. هەندێ شیعریشی ماوە و لەبەر دەستدایە، کە جگە لە چەند غەزەلێکی بەرچاو، زۆربەی ئەوانی دیکەی لاوازن. سێرڤانتس حەزی لێ بوو کە درامانووسێکی گەورە بێ، بەڵام لە کۆی پتر لە سی شانۆنامەی وی، هیچیان لەسەر شانۆدا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. یەکەمین رۆمانی وی (گالاتیا- ١٥٨٥) بەرهەمێکی تاقەتبەرە. دوا رۆمانی وی (سەفەرەکانی پرسیل و سیگیسموند، (کە لە دوای مەرگی لە ساڵی ١٦١٧دا بڵاوبووەوە)، چیرۆکێکی ناشقانەیە، و وەکو گالاتیا یەك نەوا و تاقەتبەرە. (سەفەر بۆ پارناسوس- ١٦١٤) بەیتێکی ستایشی تەنزنامێز، مەجازی، و رەخنەییە دەربارەی نزیکەی سەد و پەنجا شاعیر، و لە ئەنجامدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەو دوانزە کورتە چیرۆکەی سێرڤانتس کە لە ژێر سەرناوی (چیرۆکانی نموونەیی- ١٦١٣) بکرێ، کە بە بۆچوونی هەندێ لە رەخنەگران، ئەگەر نووسەر بەرهەمی دیکەشی نەنووسیبایە، ئەم بەرهەمە نەمری دەکرد. ئەم چیرۆکانە لەرووی تۆن و تەکنیکەوە گەلەك جۆراوجۆرن. هەندێکیان رەق و واقیعبینانەن، ژمارەیەکیان ناسك، رۆمانتیك و خەیاڵ ئەنگێزن. و بە شێوەیەکی گشتی بەهرە و هێزی داهێنان، تیژی سەرنج و دیتن و وەسفی سێرڤانتس دەنوێنن. یەکێك لەم چیرۆکانە، (دان و سانی کسۆکان، حیکایەتی مونی پودیوی بەرێوەبەری قوتابخانەی دزان، دەگێڕێتەوە، گانچۆئیلۆ چەقەڵی وی "هیچ کاتێ رۆژانی هەینی دزی ناکات". یەکێك لە چیرۆکەکانی دیکەی ئەم کۆچیرۆکە، (زەوجینی فریو ئامێز)ە.

## شانۆنامە

کۆمەڵە بەڵگەیەك لەبەر دەستدایە ئەوە دەسەلمێنن کە لە ماوەی ساڵانی ١١٠٠و ١٤٠٠دا ژمارەیەکی زۆری شانۆنامە لە ئەسپانیادا نووسراون، ئەم بەرهەمانە دەبێ شانۆنامەی موعجیزە، رەمز و رازدار، و ئەخلاقی بووبن کە وێنە و نموونەیان لە هەموو وڵاتانی ئەورووپای

ڕۆژئاوایی هەبووە، و ئەمە جگە لەوەی کە لەگینە شانۆنامانی کورت و مێژوویی، شانۆنامانی دەمامکدار، شانۆنامانی بێ گفتوگۆ، و لەو جۆرانەش باو بوویێ.

بەڵام هیچ یەکێك لەم بەرهەمانە نەماوەتەوە. ئەوەی لە چەپۆکی ڕۆژگار دەرباز بووە چەند کۆپلەیەکی کورتی شانۆییە کە گومز "١٩" مانریك، لە ناوەندی سەدەی پانزەیەمدا، بە گوێرەی پێداویستییە کۆمەڵایەتی و مەزهەبییە تایبەتییەکان نووسیویەتی، بەڵام زەحمەتە بتوانرێ ئەم کۆپلانە بە شانۆنامە دابنرێن، لە ڕاستیدا دراما لە ئەسپانیادا نزیکەی سەدەیەك پاشتر سەری هەڵدا.

<u>خوان دل ئەنسینا ١٤٦٩- ١٥٢٩:</u>

ئەنسینا-ی ((دامەزرێنەری دراماى ئەسپانیایی)) شاعیر و موسیقازان بوو. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٤٩٢دا بەیتێکی شوانکارەیی دانا، کە سکێچ و پلۆتێکی کورتی شانۆیی بوو بە چاولێکەری گۆرانی و بەستە شوانکارەییەکانی فیرجیل. ئەنسینا، پاشان زۆر بەندی درامی دیکەی گوت، کە نیوەڕۆکی هەندێکیان ئایینی و، هەندێکیان نائایینی بوو. بە ناوبانگترینیان بریتیین لە: بەیتێن شوانکارەیی پلاسیدا و ڤیتوریانو، سێ شوان، کریستینو وفیبا، هەرای سەر شانۆ. گەرچی بەرهەمەکانی فیرجیل و پولیسانۆ سەرمەشقی شانۆنامەکانی ئەنسینا بوون، کەچی گوندییانی ناو شانۆنامەکانی وی بەهەمان شێوەزاری سادە و زبری خۆ قسەیان دەکرد، و ئەمە خۆی لە خۆیدا هەنگاوێك بوو بەرەو ریالیزم. هەرای سەر شانۆ، لەڕاستیدا شانۆنامەیەکی کۆمیدییە کە لەوێدا خوێنکاران گاڵتە بە دێهاتییانێك دەکەن کە لە بازاڕدا پیاسە دەکەن، ئیدی تووشی هەرایان دەکەن. "ئەنسینا درامای نەبردە ناو جەماوەری خەڵکەوە، بەڵام شەقڵە ئایینییەکەی لێ لابرد و لە نێو چینی دەوڵەمەندانا ڕەواجی پێ دا".

<u>بارتولەمە دتورس ناتارو (-؟.... ١٥٣١):</u>

تورس لە واری شانۆنامەنووسیدا لە ئەنسینا بەتواناتر و داهێنەرتر بوو. بە چاولێکەری تیۆرییەکانی هوراس، درامای پێنج پەردەیی کرد بە باو، و کۆمیدیای ریالیستی و کۆمیدیای ڕۆمانتیکی لێکدی جیا کردەوە. لە مەیدانی کۆمیدیای ریالیستیدا، (کۆمیدیای ئاشخانە)ی نووسی کە بەرهەمێکی تەنزئامێزە دەربارەی پەخشان و پەخشانکاری و گەندەڵی خێزانی کاردینالێك، کۆمیدیای میلیشیایی، شانۆنامەیەکە دەربارەی وەزع و حاڵی نالەباری ئیتالیا، کە هێزی میلیشیایی وێرانی دەکات. (سرافینا) باشترین کۆمیدیای تورس-ە، کە باسی ئەڤینی

ڕۆمانتیکی دەکات، و شانۆنامەی زەماوەند، کە ((یەکەمین شانۆنامەی عەبا و شمشێرە"[٢٠] لە ئەدەبیاتی ئەسپانیادا)).

## شانۆنامەنووسانی بەر لە لوپەدوگا

جیل ڤیسنتە ١٤٧٠- ١٥٣٦:

ڤیسنتەی شانۆنامەنووسی گەورەی پورتوغالی، ژمارەیەك شانۆنامەی کورت و مێژوویی، فارس، کۆمیدیا، وتراجید کۆمیدی نووسیوە، ئەم شانۆنامەنووسە بە ناسکی لیریکی، بە هەجوی ناجۆرییە کۆمەڵایەتییەکان، و میانڕەوی ئاینی بەناوبانگە. باشترین شانۆنامەی وی ((ئینزپریرا))یە کە بەسەرهاتی کیژێکی دێهاتییە کە دووجار شوو دەکات —شووی یەکەم بە سوارچاکێکی قۆز بەڵام بێ مویالات، و پاشان شوو بە پیاوێکی ساویلکەی دروستکار لە چینی خۆیدەکات.

لوپە درویدا ١٥١٠- ١٥٦٥:

رویدا بە "باوکی درامای نەتەوەیی ئەسپانیا" دادەنرێ. رابەری یەکەمین دەستە ئەکتەری گەڕۆك بوو، کە شانۆیان لە شارەکاندا پێشکەش دەکرد، رویدا بە بەندە کۆمیدی و هەجووە کورت یا فارسەکان-ی بەناوبانگە، کە بە شێوەیەکی گشتی پلۆتی کورتیان هەیە، بەڵام کەسایەتییەکانی قەراردادی و ئاشنان وەکو دێهاتی، دەلاك و قولە رەش، ئەو کەسایەتییانەی زیندووانە بەرجەستە کردووە، ئینشا و دەربڕینی رویدا زیندوو، شاد و جەماوەری و میللییە.

خوان دلاکویڤا ١٥٥٠- ١٦٢٠:

کویڤا-ی شاعیر و شانۆنامەنووسی ئەسپانیایی، کومیدیای چوار پەردەیی کردەباو. بە ئانقەست کەوتە دژایەتی کردنی سێ یەکێتییەکە (کات، شوێن، کار)، و لە رێگەی تەوزیفکردنی بویەرانی کۆنەوە، یەکەمین شانۆنامەی نەتەوەیی ئەسپانیایی نووسی.

لوپە فلیکس دڤگا کارپیو ١٥٦٢- ١٦٣٥:

دووەمین کەسایەتی گەورەی ئەدەبیاتی ئەسپانیایە. لە چینە هەژارەکانی کۆمەڵگەوە هەڵکەوت، و خوێنەوارییەکی فەرمی کەمی هەبوو، بەڵام تارادەیەك لاتینی، مۆسیقا، سەما و شمشێربازی فێر بوو، بەهرەمەندی زوو رەسی وی (لە دوازدەساڵیدا شانۆنامەیەکی نووسی) زۆر

زوو بووە مایەی شۆرەتی. لە ساڵی ١٥٨٥دا بەتین و تاو کەوتە شانۆنامە نووسین بۆ کۆمپانیای ژیر و نیمو ڤیلاکۆز، و دوای دوو ساڵ بە هۆی هەجووی خانەوادەی ڤیلاکوزەوە لە کاستیل دوور خرایەوە. لوپە چوو بۆ ڤالنتسیا، و درێژەی بە نووسینی شانۆنامەکاندا، لەوێندەر لەگەڵ کیژی ماڵباتێکی ناسراوی مادریدیدا رەڤی، و گیرۆدەی تورەیی ماڵباتی کیژەکە بوو. لە ساڵی ١٥٨٨دا لەگەڵ (ئارمادای لەشکان نەهاتوو)دا بەرەو مەیدانی شەڕ رۆیی، بەڵام بە سەلامەتی لە تالوکە دەرباز بوو، لوپە چووە لای دۆکی "٢١" ئالباو تا ساڵی ١٥٩٥ سەرگەرمی خزمەتی حەرەمسەراکەی ئەو بوو. ئەوسا بۆ مەدرید گەڕایەوە و خانوویەکی کڕی، و لەگەڵ کیژی کابرایەکی کۆمفرۆشی گۆشت و ماسیدا زەماوەندی کرد (هاوسەری یەکەمی مردبوو)، و دووچاری یەك زنجیرە بەسەرهاتی ریسوایی ئامێزی ئاشقانە بوو. جگە لەو شەش ساڵە (١٦٠٤-١٦١٠)ی کە لە تولدو بوو، باقی تەمەنی لە مەدرید بەسەر برد، لوپە لە ساڵی ١٦١٤دا بوو بە کەشیش، بەڵام ئەم پیشەیەش کۆتایی بە سەرکێشییە ئاشقانەکانی نەهێنا.

چل ساڵی ئاخیری تەمەنی بە نووسینی بێ وچانەوە بوراند. تەقریبەن هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن کە لوپە دڤگا ((پڕ بەرهەمترین شانۆنامەنوسی جیهانە))، و یەکێك لە رەخنەگرەکان دەڵێت کە "لە مێژووی جیهاندا هیچ نووسەرێك لەڕووی پڕکارییەوە ناتوانێ لە قەڵەمڕەوی بەرینی وی نزیك ببێتەوە"، جگە لە بیست و یەك بەرگ نووسینی غەیرە شانۆیی، ژمارەیەکی زۆری شانۆنامانیشی نووسی.

مونتالبان "٢٢"-ی ژیاننامەنووسی هاو عەسری وی، ئەو بە خاوەنی ١٨٠٠ کۆمیدیا "٢٣"، چوار سەد بەندی شانۆیی مەزهەبی بە ئیلهامی شانۆنامانی رەمز و رازداری سەدەکانی ناڤین، و ژمارەیەك نەخشە و سکێچی کورت، نێوان پەردە، و ... هتد دەزانێ. کەچی تەنیا چوار سەد و بیست و شەش کومیدیا، و چل و دوو بەندی شانۆیی مەزهەبی لە پاش بە جێماوە. لوپە بەخۆیشی بەشانازییەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ((پتر لە سەد کۆمیدیای نووسیوە کە ئەنجامدانی هەر یەکێکیان بیست و چوار سەعات دەخایەنێ)). ئەم بە بڕشتییە وایکردووە کە هاوعەسرانی لوپە، "ئوعجوبەی تەبیعەت" ناو بنەن.

**بەرهەمی ناشانۆیی:**

ئەگەر چی لوپە بە شانۆنامەکانی بەناوبانگە، لەگەڵ ئەوەش دا تەقریبەن خۆی لە مەیدانی ژانرە ئەدەبییە باوەکانی رۆژگاری خۆیدا، وەکو: (داستان، رۆمانس، رۆمان، هۆزانی لیریکی، و گوتاری شیعریی رەخنەیی) تاقی کردۆتەوە.

داستان:

بەرهەمە داستانییەکانی لوپە دڤگا بریتین لە داستانانی مێژوویی، مەزهەبی، رۆمانتیکی و کۆمیدی.

داستانە مێژووییەکان:

درا گونتیا (دریك-ی دزی دەریایی- ١٩٥٨) گێڕانەوەیەکی هەندێ سەربوری سەردەمی نووسەرە، و رەنگە شتێکی پتر لە تانە بێ دژی فرانسیس "٢٤" دریك (کە ناوی داستانەکە لە ناوی ئەوەوە وەرگیراوە)و دژی ئینگلیستانە.

ئۆرشەلیمی بەزیو- ١٦٠٩، چیرۆکی خەباتی ناکامی ریچارد "٢٥"ی شێردڵە، بۆ وەرگرتنەوەی سەرزەمینی موقەدەس لە سەلاحەدینی "٢٦" ئەیوبی، (ئەم داستانە لە رادەبەدەر بویەری ئاشقانە و بابەتی ئەفسانەیی تێکەڵاو کراوە، بەڵام چیرۆکە پەنامەیەکییە جوانەکان، و کاراکتەرسازییە وەستایانەکەی دلگیرییەکی تایبەتییان پێ بەخشیوە. و تاجی خەمین- ١٦٢٧، چیرۆکی ماری ستوارت دەگێڕێتەوە (و وەکو دراگونتینا، هێرشێکی توندە بۆ سەر ئینگلیستان).

داستانە مەزهەبییەکان: (ئیزیدرو- ١٥٩٩):

بەسەرهاتێکی دوور و درێژە دەربارەی ژیانی سان ئیزیدر و لابرادوری فریشتەی نیگابانی مەدرید، و (شوانانی بەیت "٢٧" لەحم- ١٦١٢) کە چیرۆکی حەزرەتی مریەم، حەزرەتی یوسف و حەزرەتی عیسا تا زەمانی هیجرەتیان بۆ میسر دەگێڕێتەوە.

داستانانی رۆمانتیك:

(جوانیی ئانجلیکا- ١٦٠٢)، لەڕاستیدا درێژەی ئورلاندوی تووڕەیە، کە بەیتێکی بەناوبانگی ئاریوستویە، ئەخشە و پلۆتی ئەم داستانە لاوازە و، چیرۆکی لاوەکیی زۆر، دەرچوون لە بابەت و، تیل نیشان و ئاماژەی زۆر بە بویەر و رووداوە ناوچەییەکان، ئاسیوی فرەی بەم بەرهەمە گەیاندووە.

داستانانی کۆمیدی ئامێز:

شەڕی گورپەکان- ١٦٣٤، داستانێکی کۆمیدی ئامێزە، تەژی درکەی زیرەکانە و هاوتاسازییە.

رۆمانس:

لوپە لە ساڵی ١٥٩٨دا، بە چاولێکەری شێوەی ئەدەبی باو، رۆمانسی شوانکارانەی ئارکادیا-ی نووسی. لەم رۆمانسەدا هەندێ چەمکی سەربوری خۆی و دۆستەکانی خۆی کە بوون

بە شوان و ژنە شوان، دەگێڕێتەوە. پلۆتی رۆمانەکە بە خاوی دەچێتە پێشێ، لە سەرانسەری چیرۆکەکەدا هەڵە و کەم و کورییە ئاساییەکانی رۆمانسی شوانکارەیی وەکو - هەستیاری، ئاماژەی زۆر بۆ بابەتێن کۆن و ئەفسانەیی، و بابەتی نەشیاو- دیارە.

رۆمان:

(دورتیا- ١٦٣٢)، رۆمانێکە بە شێوەی ئوتوبیوگرافی، دەربارەی سەربوردێکی رۆمانتیکی، کە لوپە ئیلهامی ئەم رۆمانەی لە ئەڤین و پەیوەندی نێوان خۆی و ئالینا ئوسوربوی ئەکتەرەوە وەرگرتووە. ئەم بەرهەمە زۆر لە ئارکادیا بالاترە، رووداوانی چیرۆکەکە سەرگەرم کەرن، گفتوگۆکان دلگرن، و جۆش و خرۆشە بێگەردەکەی وەستایانە هاتۆتە دەربڕین.

هۆزانی لیریکی:

لوپە "هەمیشە لە ریزی گەورەترین شاعیرانی لیریکی ئەسپانیاییدا دەبێ". لەڕاستیدا شاعیری هەموو جۆرە شیعرێکی لیریکی باوی سەردەمی خۆیەتی، غەزەل، شوانکارەیی، بەستە، قەسیدە، لاوانەوە و... هتد. هەندێ لەم شیعرانە جدین، و هەندێکی بۆ خۆشی و سەرگەرمین، ژمارەیەکیان مەزهەبی، و بڕێکیان نەمەزهەبین. لوپە جگە لە هۆزانێن لیریکی، لەمەیدانی نامە و گوتار و چامە بێژیشدا خۆی جەڕباندووە. وەستایی وی لەواری غەزەل، چامە، و کورتە شیعری لیریکیدا ئەنگوستی ناوێ. خۆڕسکی، سادەیی، و راشکاوی لە خەسڵەتەکانی هۆزانی لوپەن، و لایەنی رواڵەتبازی و سنعەتکاریشیان لە چاو شیعری هاوعەسرانی ویدا، زۆر کەمە.

گوتاری شیعریی رەخنەیی:

لوپە دڤگا لە ساڵی ١٦٠٩دا بەیتێکی لە قاڵبی شیعری یازدە سیلابی بێ قافیەدا بەناوی (هونەری تازەی کومیدیاسازی لەم چەرخەدا) هۆنییەوە کە نزیکەی چوار سەد نیوە بەیت بوو. لەم بەرهەمەدا شارەزایی خۆی لە دەستوور و رێسا کلاسیکییەکانی شانۆنامەنووسیدا نیشان دەدات، جەخت لەسەر ئەم رێسایانە دەکات- ئەوجاش وەکو پێویست و بە تەواوەتی پەیڕەوییان ناکات.

شانۆنامەی تازە (کۆمیدیای نوێ) کەدڵی عەوام خۆش دەکات، رێسای تایبەتی خۆی هەیە: تێکەڵکردنی رەگەزانی کۆمیدی و تراجیدی، ئازاد بوون لە کۆت و بەندی یەکێتییەکان، گونجانی زمان لەگەڵ کەسی قسەکەردا، پەرداغی شانۆنامە لە سێ پەردەدا و کردنەوەی گرێ لە ناوەڕاستی پەردەی سێیەمەوە، دڵەڕاوکێ و چاوەڕوانی، پیلان و دەسیسە، و سوود وەرگرتن لە

هەر جۆرە قاڵبێکی وەزندار لە هەر شانۆنامەیەکدا (غەزەل بۆ مەنەلۆگ و خۆدواندن، کێشی چامە بۆ گێڕانەوە، چوار بەند بۆ هۆزانێن ئاشقانە، و ..... هتد).

بەرهەمێن شانۆیی:

پۆلێن کردن:

مریە شانۆنامەکانی لوپە دڤگا بەسەر دوو سەرەکیدا پۆلێن دەکات:

١- *کۆمیدیاکان یا شانۆنامە سێ پەردەییەکان.*

٢- *شانۆنامانی تاك پەردەیی.*

گرووپی یەکەم شانۆنامانی مێژوویی، رۆمانتیك، ئەفسانەیی، شوانکارەیی و شانۆنامانی هەڵێنجراو لە کتێبی موقەدەس، ژیانی قەدیسان و شانۆنامانی عەبا و شمشێران لەخۆ دەگرێت.

شانۆنامانی تاك پەردەییش، بەندە شانۆییە مەزهەبییەکان، پێش پەردە نوکتە ئامێزەکان، و فارسانی کورت لەخۆ دەگرێ.

تایبەتمەندییەکان:

تایبەتمەندی شانۆنامەکانی لوپە دڤگا هەمان ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانەن کە لوپە لە بەیتی "هونەری نوێی کومیدیاسازی..."دا کەوتۆتە بەرگری لێیان، ئەمە جگە لەوەی کە "مەسەلەی شەرەف" واتە بابەتی هەڕەشە لە ئابڕووی پیاوێك یان پاکی و بێگەردی ژنێك-ی زۆر بەکار هێناوە. شانۆنامە مێژووییەکانی وی بە شێوەیەکی گشتی لەسەر بنەمای ئەو بابەتە ئەسپانیاییانە رۆناوە کە لە واریقاتنامە و چامەکانەوە وەرگیراون. شانۆنامانی عەبا و شمشێری وی بەو چیرۆکە رۆمانتیکییانە دەگوترێ کە پلۆتەکانیان تەواو ئاڵۆزە، هەڵەی هاوشێوەزانی، سیماگۆڕکێ و بەدحاڵی بوونیان تیابێ..

شانۆنامانی مێژوویی:

دەکرێ ئاماژە بۆ (روم لە خۆڵەمێشا- ١٦٢٩) وەکو نموونەیەك لە شانۆنامە مێژووییەکانی دوڤگا بکرێ، کە چیرۆکی نیرون-ی ئیمپراتۆر بەرجەستە دەکات (و ژێراوژێر ستایشی سنکا و لوکان دەکات لەبەر ئەوەی گوایە ئەسپانیایین، هەروەها ستایشی مەسیحییەت دەکات)، نموونەیەکی دیکە (جیهانی نوێیە- ١٦١٤) چیرۆکی دۆزینەوەی ئەمریکا لەلایەن کریستوف کولومبس و بەسەرهاتی گەڕانەوەی وی بۆ ئەسپانیا دەگێڕێتەوە (زۆربەی رووداوەکانی چیرۆکەکە لە "جیهانی نوێدا" روو دەدەن).

### شانۆنامانی رۆمانتیك:

یەكێك لە شانۆنامە رۆمانتیكییەكانی لوپە دڤگا (سزایبێ كینە كێشی- ١٦٣١)یـە كـە دەربارەی سەربوری ئەشقی لاوێكە لەگەڵ زڕدایكی خۆیدا، بابی سزاكە دیاری دەكات، كوڕەكەی ناچار دەكات تا زڕدایكەكەی بكوژێ، بێ ئەوەی ناسنامەی قوربانییەكەی خۆی بزانـێ، ئەوسـا بابەكە دەوروبەر لـە كوڕەكـەی هانـدەدا كـە بـە تـاوانی كوشـتنی زڕدایكەكـەی بیكوژنـەوە. شانۆنامەیەكی گرینگی دیكە (سەرچـاوەی مـەڕ)ە كـە بـە دەوری تـەوەری (دۆزی شـەرەف)دا دەسووڕێتەوە. دەوڵەمەندێكی خانەدان، كە حاكمی شارۆچكەی "سەرچاوەی مـەڕ"ە، كیـژێكی لاوی شارەكە فریو دەدا، هاوشارییانی كیژەكە، كە ئابروویان پایەماڵ كراوە، بە نێزە و سـونگی كابرای خانەدان دەكەن بە سەرەن و بێـژنگ، پاشـا بـە مەبەسـتی ناسـینی بكـوژ، دادپرسـێك دەنێرێ، بەڵام خەڵكەكە پشت دەدەن بە پشتی یەكەوە تا مەعلوم نەبێ كێ یان كام دەستە ئـەو كارەیان كردووە. پاشا كە بە مەسەلەكە دەزانێ هەموو خەڵكی شارۆچـكەكە دەبەخـشێ و بـە هەقیان دەزانێ كەبەرەڤانیان لە شەرەف و ئابڕووی خۆیان كردووە، خاڵی فەلسـەفی شانۆنامەكە، پتر لەمەی كە لە مەسەلەی لەسەر هەق بوون یا نەبوونی خەڵكەكەدا بێ، پتر لەمەدایە كە پاشا دەشێت تەسەڕوف بە سامان و تەنانەت ژیانی مرۆڤێكەوە بكات، بەڵام نـاتوانێ تەسـەڕوف بـە ئابڕوو و شەرەفییەوە بكات: چونكە شەرەف و ئابڕووی مرۆڤ بە روحییەوە بەندە.

### شانۆنامانی عەبا و شمشێر:

دڤگا دوو شانۆنامەی گرینگی لەم بوارەدا هەیە: "پۆلای مەدرید- ١٦٠٣) كە كـیـژێك بـە بیانووی وەرگرتنی دەرمانێكی گیراوە لە پزیشكێكی ساختە ( لە راستیدا دۆسـتی دڵدارەكـەی وییە) بابی فریو دەدات و بەدەم پیاسەكردنەوە، كەپزیشكەكە بۆی نووسیوە، دڵدارەكـەی خـۆی دەبینێ، "شـەوی جـەژنی سـانخان- ١٦٣١"، كـە لـەم بەرهەمـەدا دوو ژن، وێـڕای نـاڕەزایی براكانیان و كۆڵێك بەدحاڵی بوون، شوو بە دڵدارەكانی خۆیان دەكەن.

### هەڵسەنگاندن:

"هیچ یەكێك لە شانۆنامەكانی لوپـەدڤگا بـە تـەواوی خـراپ نـین، و هـیچ یـەكێكیانیش شاكاری تەواو نین".

تاسەمەندی وی بۆ خۆشحاڵ كردنی جەماوەری خەڵك و، بۆ نیشاندانی شانۆنامانی تـازە، بەرەو بێ مویالاتی، خۆ دووبارە كردنەوە و سـوود وەرنـەگرتن لـە مەوقعیەتـە تایبەتییـەكانی بردووە. ئەمە جگە لەوەی، كە لوپە لەبەر ئەوەی زۆری حەز لە بەخشینی سـەرگەرمی دەكـرد،

هەموو حەزەکانی دیکەی فیدای دڵگری چیرۆکەکە دەکات، بۆیە گوێ بە کاراکتەر سازی نادات، و کەمتر خۆی لە قەرەی مەسەلە قوڵ و ئەبەدییەکانی روحی ئینسانی دەدات.

وەکو دیارە هەندێ لە ئیجابیاتی کاری لوپە، پڕ بەرهەمی و دەوڵەمەندی سەرسامکەر، و توانای تاوتوێکردنی چەند بابەتی و فرە لایەنییە، "جیهانبینی شانۆیی ئەو" دەبێتە هۆی ئەوە کە هەموو بەرهەمەکانی، بە هەموو ئاڵۆزی و پەرێشانییەکیانەوە، زیندوو، جوڵەدار و تا هەندێ واقیعی بن. شێوازی وی، وێڕای پەلەکاری، تەقریبەن، بتەو، دڵگیر، جوان، رەوانە و پڕ بە پێستی پێویستی حاڵەکانە.

پڕکاری لوپە دڤگا رێك بە ئەندازەی ئەو پێشوازییەیە کە لەلایەن جەماوەی هاوچەرخی خۆیەوە لێی کراوە. دەمێك بوو کە لەسەر تەختەی شانۆدا پێشوازی وا لە هیچ کەسێك نەکرا بوو، و شانۆنامەکانی لوپە زۆر زوو لە ئیتاڵیا، فەرەنسا، و تەنانەت لە تورکیاشدا نمایش کران.

هەر چەندە لوپە هیچ رێچکە یان شێوەیەکی شانۆیی تازەی نەهێنایە ئاراوە، بەڵام ئەو زەوق و سەلیقەیەی هەبوو کە کاریگەرترین رێباز بدۆزێتەوە، توانا و بەهرەکانی ئەو دەرفەتەیان بۆ رەخساند کە تەقریبەن بە تاقی تەنیا بناغەی درامای نەتەوەیی ئەسپانیا دابڕێژێ. ((بایەخی لوپە دڤگا وەکو شانۆنامەنووس لەڕووی مێژوویییەوە لەمەدایە کە بەرنامەیەکی خستەڕوو کە تا گەڕانەوە بۆ کلاسیزمی نۆی لە سەدەی هەژدەیەمدا، لە ئەسپانیادا هەر باو بوو.))

<u>تیرسو دمولینا ١٥٧١-١٦٤٨:</u>

ناوی راستەقینەی: گابریل تلیز-ە یەکێکە لە گەورەترین پەیڕەوانی لوپە دڤگا. لە مەدرید لە دایکبوو و لە ((ئالکالا دئینارس"٢٨")) خوێندی. لە ساڵی ١٦٠١ بوو بە کەشیش. بە بۆنەی راپەڕاندنی کاروبار و ئەرکی کەشیشی خۆیەوە سەفەری زۆری کرد، لەمە بترازێ ئیدی ژیانی بە ئارامی چووە سەر. تیرسو، وەکو سیرڤانتس و لوپە دڤگا، خۆی لە زۆر بواری ئەدەبیدا تاقیکردەوە.

<u>بەرهەمی ناشانۆیی:</u>

((ڤیلاکانی تولدو-١٦٢٤)) کۆمەڵەبابەتێکی جوراوجۆرە (لاسایی کردنەوەی دکامیرونەکەی بۆکاچویە) کە لەوێ دا چەند دەوڵەمەندێك لە ڤیلاکانی خۆیانا هاتووچۆی یەکدی دەکەن و چیرۆك و حیکایەتان دەگێڕنەوە، شانۆنامان ئەنجامدەدەن، شیعران لەبەر دەخوێننەوە، و سەرگەرمی باس و خواسی فەلسەفی دەبن. لە بەشی سەرەکی ئەو بابەتانەدا بەرەڤانییەکی رەخنەیی لە "کۆمیدیای تازە"ی لوپە دڤگا دەکرێت.

بەرهەمی شانۆیی:

گرنگترین بەرهەمی تیرسۆ شانۆنامەکانیەتی کە گوتویانە دەگەنە پتر لە چوار سەد دانە، بەڵام تەنیا هەشتا و شەش دانەیان ماوەتەوە. زۆربەی ئەم شانۆنامانە لە حەوت کۆمەڵەدا بڵاوبوونەتەوە: سێ شانۆنامە لە کۆمەڵەی شکۆفەزار- ١٦٢٤، دوانزە دانە لە کۆمەڵەی دوازدە کۆمیدیای تازە-ی مامۆستا تیرسو دمولینا، بەشی یەکەم- ١٦٢٧، چوار دانە لە بەشی دووەمدا- ١٦٣٥، دوانزە دانە لە بەشی سێیەمدا- ١٦٣٤، دوانزە دانە لە بەشی چوارەمدا- ١٦٣٥، چوار دانە لە بەشی پێنجەمدا- ١٦٣٦، و سێ دراما لە کۆمەڵەی فێر بوونی شیرین- ١٦٣٥. بیست و نۆ شانۆنامەی دیکەش لە کۆمەڵەی جۆراوجۆردان.

تیرسۆ، وەکو لوپە دڤگا، شانۆنامانی مێژوویی، مەزهەبی، و عەبا و شمشێریشی نووسیوە.

شانۆنامانی مێژوویی:

یەکەمین شانۆنامەی مێژوویی تیرسۆ، ناوی "ژنی دوربین"ە کە هەندێ لە رەخنەگران بە باشترین شانۆنامەی مێژوویی ناو ئەدەبیاتی ئەسپانیایی دەزانن. لەم شانۆنامەیەدا، دوناماریا کە شابانۆیەکی بێوەژنە، بە دووربینی و لێزانی خۆی تەختی پاشایەتی بۆ فەردیناندنی کوڕی دەپارێزێ.

شانۆنامانی مەزهەبی:

"گومانکاری مەلعون" گەورەترین شانۆنامەی مەزهەبی، تیرسۆیە، باسی مەسەلە کەلامییەکانی ئیختیار لە بەرانبەر جەبر، و ئیمان لە بەرانبەر کاری چاکە دەکات. پاولو-ی عابید، بەهاندانی شەیتان کونجی گۆشەگیری بە جێدێڵێ و رووەدەکاتە ئەنریکو. کە دەبینێ ئەنریکو کەسێکی زۆردار و ئازاردەری ژێر دەستەکانی خۆیەتی، بە ناومێدییەوە، رێگری دەکاتە پێشە، لەم بەینە ئەنریکو ئارادەیەك تەقوا نیشان دەدات و خۆی لە کوشتنی پیرەمێردێك کە لە بابی دەچێ، دوور دەگرێ، بەڵام لە کاتی تورەییدا پیاوێکی تر دەکوژێ. ئیدی تۆبە دەکات و دەمرێت و دەچێتە بەهەشت. پاولو، هەمدیس بە فریوی شەیتان، نکولی لە رزگاری ئەنریکو دەکات، بە هۆی بێ ئیمانی خۆیەوە دەچێتە دۆزەخ.

شانۆنامانی عەبا و شمشێر:

"دون خیل-ی سەوز پۆش": ئەم کۆمیدیایە پلۆتێکی یەجگار ئالۆزی هەیە. خوانا، کە دڵدارەکەی دەستبەرداری بووە، خۆی دەکا بە پیاو و دلبەرە تازەکەی دڵدارەکەی پابەندی

ئەشقی خۆی دەکات. چەندین جار سیمای خۆی دەگۆڕێ و خێزان و خزمەتکار و دڵدارەکەی خۆی چەواشە دەکات و بە هەڵەیاندا دەبات.

فریوکاری سیڤیلا:

زۆر لە شانۆنامەکانی دیکەی تیرسۆ بەناوبانگتر و کاریگەرترە، نووسەر لەم درامایەدا کەسایەتی دون خوان (= دون جوان)ی بەو شێوەیەی کە لە جیهاندا ناسراوە، خولقاندووەتەوە. ئەم "فریوکارە" بنیادەمێکی هەڵە و هەرزە، دەستبڕ، قوماربـاز، کفر بێژە، کە پاش ڕەها کردنی ریزێك لە دڵشکاوان و ماڵوێرانان (ئەو لە ماوەی سێ پەردەی شانۆنامەدا چوار ژن دەخەلەتێنێ)، لە دیمەنێکدا دون گونزالو-ی بابی یەکێك لە دلبەرەکانی (کە لێبڕاوە کیژەکەی لە چنگی وی رزگار بکات) لە دوئیلدا دەکوژێ. پەیکەری بەردینی دون گونزالو کە پیاوێکی پایەدارە لەسەر گۆڕەکەی دادەنرێ. پاشان دون خوان کاتێ کە پەیکەرەکە دەبینێ، بۆ تەوس ریشی رادەکیشێ و بۆ شێو دەعوەتی دەکات، پەیکەرەکە دەعوەتەکە قەبوول دەکات و لە میوانداریییەکەدا ئامادە دەبێ، و ئەویش دون خوان بۆ شێو بۆ سەر گۆڕەکەی خۆی دەعوەت دەکات. دون خوان، هەر چەندە دۆستەکانی ئاگاداری دەکەنەوە، دەچێتە میوانی پەیکەرەکە لە گۆڕستانەکە، بەڵام لە ژێر چنگی پەیکەرەکەدا خەفە دەبێ و روحی دەگاتە بنکی دۆزەخ.

دیارترین خەسڵەتی دون خوانەکەی تیرسۆ. هەرزەیییە. دووەم خەسڵەتی وی —کە بە قەولی نورتاپ ئەوەندە نایەتە بەرچاو- بوێری ئەوە. وێڕای بێ ویژدانی خوان، و بێ باکی تەواوی وی، هێشتا لەڕووی هێزی بەشەری و میتافیزیکییەوە شایانی ستایشە.

ئەم شانۆنامەیەی تیرسۆ، زۆرترین کاریگەریی لە سەرانسەری ئەورووپادا هەبووە، گەلەك لە نووسەران و مۆسیقازانان لە ئایسلاندەوە تا ئیتالیا ئیلهامیان لە نێوەڕۆکی ئەم درامایە وەرگرتووە، لەوانە: مولیر، پروسپر مریمە، روستان، توریلا، شدول، بایرون، شاو و موتزارت.

هەڵسەنگاندن:

مناندز ئی پلایو، لەو باوەڕەدایە: "تیرسۆ لەڕووی توانای خولقاندنی کاراکتەران و بەرهەمهێنانی ژیانی شیعرییەوە لە هەر درامانووسێکی دیکەی ئەسپانیایی زیاتر لە شکسپیرەوە نزیکە". هەرچەندە ئەم ستایشە تاڕادەیەك زێدەڕۆیی پێوە دیارە، بەڵام بێ چەند و چوون تیرسۆ، لەڕووی ئەو دوو خەسڵەتەی سەرەوە کە مناندز تەنیا ئەوانەی باس کردووە لە لوپە دڤگا و کالدرون باڵاترە. "ڕەنگە بتوانرێ لە پلەی نێوان لوپە دڤگا و کالدروندا دابنرێ". بە هەر حاڵ تیرسۆ وێڕای گەن نووسییەکانیشی لەڕووی جۆش و خرۆش و زیندوویەتی،

کاراکتەرسازی، مروەت و مرۆڤپەروەری، و حەنەکبێژییەوە بە یەکێك لە چوار درامانووسی گەورەی ئەسپانیای سەدەی هەڤدەیەم "٢٩" دەژمێردرێ.

خوان رویزد ئالارکون ئی میندوزا ١٥٨٠- ١٦٣٩"

ئالارکون لە مەکزیك هاتە دنیاوە و، لە منداڵییەوە قەموور بوو. کە لە دوای ساڵی ١٦٠٦ بۆ ئەسپانیا چوو، تەنیا بیست شانۆنامەی نووسی، کە لە دوو بەشدا، لە ساڵی ١٦٢٨و ١٦٣٤دا بڵاوبووەوە.

بایەخی ئالارکون لەمەدایە کە ئەخلاقییات پەروەری و بە هەند گرتنی ئامانجی لە دراماى ئەسپانیاییدا کرد بە باو. و لەم رووەوە کاری کردۆتە سەر کومیدیانووسانی فەرەنسی، بەتایبەتی کورنی و مولیر.

شانۆنامەی (دیواریش گوێی هەیە) هێرشە بۆ سەر تۆمەت و بوختانان، دونائانا، کە گومانی بێ وەفایی لە میندۆ-ی دەزگیرانی دەکات، تاقمێك پێکدێنێ کە بەدزییەوە گوێ هەڵخەن تا دەستی میندۆی بوختانچی و بێوەفا بخەنەروو. لە کومیدیای (حەقیقەتی گومان لێکراو) هەر درۆ و دەلەسەیەك کە ئەشرافزادەی لاو و قۆز دەیهێنێتەوە، زیاتر دەیخاتە گێژاوەوە، تا لە ئەنجامدا دلبەرەکەی خۆی لە دەست دەدات و ریسوا دەبێ. کومیدیای ((درۆزن))ی کۆرنی، وەرگێرانێکی ئازادی ئەم شانۆنامەیە.

(دڵبەندی ئاشکرای ئالارکون بە ئەخلاقەوە، باری فەلسەفی ناوەرۆکی بەرهەمەکانی، بونیادی رێك و پێکی پلۆتەکانی، تەوزیفی میانرەوانەی رووداوانی جۆشدار و بایەخدانی بە ستایل و شێواز، کردویانەتە کارێك کە لەناو هەموو درامانووسانی سەدەکەدا بە کلاسیکترین نووسەر ((بەچەمك و مانا فەرەنسییەکەی وشە)) دابنرێ.)

پدرو کالدرون دلا بارکا ١٦٠٠- ١٦٨١:

کالدرون لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند لە مەدرید لە دایك بوو. لە ساڵی ١٦١٤وە تا ١٦٢٠ لە زانکۆکانی ئالکالا و سالامانکادا ماف و ئیلاهییاتی خوێند. پاشان ماوەیەك کەوتە سەفەر و گەران، دوایی نووسینی شانۆنامانی کرد بە پیشە، سەرکەوتوویی شانۆنامەکانی، فیلیپی چوارەمی شای ئەسپانیای والێکرد کە لە ساڵی ١٦٣٦دا میدالی سانتیاگۆ-ی بداتێ.

ماوەیەکیش لە خزمەتی دۆك ئینفانتادو (١٦٣٧- ١٦٤٠)و دۆك ئالبادا (١٦٤٥- ١٦٤٩) بوو، هەر لەم ساڵانەشدا (١٦٤٠- ١٦٤٢)دا لە خزمەتی سوپادا بوو و دژی یاخییانی کاتولونیا بەشداری شەری کرد. کالدرون لە ساڵی ١٦٥١دا بۆ پایەی کەشیشی هەڵبژێردرا، و

دەستی لە شانۆنامەنووسی بۆ شانۆ گشتییەکان هەلگرت، بەڵام لەسەر نووسینی دراماى سێ پەردەیی و شانۆنامانی تاك پەردەیی مەزهەبی، بۆ شانۆی دەرباری، بەردەوام بوو.

بەرهەمی هەمەجۆر:

کالدرون چەند بەرهەمێکی نادرامی هەیە، کە بایەخێکی ئەوتۆیان نییە. کالدرون بەو سەد و هەشتا شانۆنامایە بەناوبانگە کە دەیخەنە ریزی گەورەترین چوار درامانووسی ئەسپانیاییەوە. دەشێت ئەم شانۆنامانە بەسەر سێ جۆردا دابەش بکرێن، بەو پێیەی کە بەشێوەیەکی گشتی ئەو سێ رەوتە فیکرییە دیارە نیشان دەدەن کە لە ئەسپانیای سەدەی هەڤدەیەمدا باو بوون.

١- *دڵبەندی توند بە ئایینی مەسیح و مەزهەبی کاتولیکەوە.*

٢- *وەفاداری موتڵەق و بێ چەند و چون بۆ پاشای ئەسپانیا.*

٣- *حەساسییەتی لە رادەبەدەر، و تەنانەت ئاوێتە بەزەبر و زەنگ و نەفرەت، دەرهەق بە دۆزی ئابرو و شەرەف.*

شانۆنامانی مەزهەبی و فەلسەفی:

دەکرێ ئەم گرووپە شانۆنامانەی کالدرون جارێکی دی بەسەر سێ جۆردا دابەش بکرێن:

١- *شانۆنامانی ژیانی قەدیسان.*

٢- *شانۆنامانی پەیوەست بە مەسەلەکانی حیکمەتی خوایی.*

٣- *شانۆنامانی مەزهەبی تاك پەردەیی (کە زیاتر دراماى مەجازین).*

باشترین نموونەی جۆری یەکەم (شازادەی نەگۆڕ- ١٦٢٩)ە کە ستایشی شازادە فرناندۆ-ی کوڕی جانی پاشای پورتوغال دەکات. فرناندۆ بە دەستی مورەکان (موسوڵمانان) یەخسیر دەبێ و حوکمی مەرگ دەدرێ- ١٤٤٣. بەناوبانگترین دراماى فەلسەفی کالدرون (ژیان خەونە-١٦٣٦)یە و بەرهەڤانی لە ئازادی ویستی مرۆڤ دەکات و پەیگیری ئەم فەلسەفەیە دەکات کە ئەگەر ژیان تەنیا خەونێك بێ، ئەوەی ئێمە لە ماوەی ئەم خەونەدا ئەنجامی دەدەین، شوێنی ئێمە لەو دنیایەدا کە لە دوای مەرگ چاوی پێدا هەڵدێنین، دیاری دەکات. قارەمانی شانۆنامەکە، سیگیسیموند لە رێگەی بەکارهێنانی ئەقڵ و بەڵگاندنەوە خۆی لە دنیای حەیوانییەت رزگار دەکات، لەم دنیا شادمان دەبێ و لەو دنیاش دەچێتە بەهەشت.

شانۆنامانی تایبەت بە پاشایان و مێژوو:

شاکاری ئەم جۆرە شانۆنامانە، (شارداری زەلەمیە- ١٦٤٤)یە، قارەمانی سەرەکی شانۆنامەکە ، پدروکرسپۆ، دێهاتییەکی فەلاح و داروغەی شارۆچکەکەی خۆیەتی. پدرو

سەروانێکی سوپایی کە کیژەکەی ئیغفال کردووە، دەکوژێ، پاشان کاتێ کە هێزی سوپایی لێدەبڕێ پەلاماری گوندەکە بدات، پدرو، لەلایەن پاشاوە پشتیوانی دەکرێ و دەکرێ بە داروغە و شارداری مەدەل عومری شارۆچکەکە.

شانۆنامانی "مەسەلەی شەرەف":

گرووپێکە لە شانۆنامەکانی کالدرون کە لە سەدەی هەڤدەیەمدا زۆر باو بوو، بەڵام بەلای خەڵکی ئەمڕۆوە تەقریبەن بابەتی نالوجیکی و تەنانەت هەندێ جار توندڕەوانە و نەخۆشانە پەیگیری دەکەن. کالدرون- مەسەلەی شەرەف بە "حەساسییەتێکی تورە نامێز دەرهەق بە پاك داوێنی لە ژیانی هاوسەریدا دەزانێ، کە بە کەمترین شنەی گومانداری لەکەدار دەبێ، جا لەم رووەوە شەرافەت بە ئابڕوو و ئابڕومەندیش لێك دەدرێتەوە و شرۆڤە دەکرێ". لەو شانۆنامانەدا کە موعالەجەی قەزیەی شەرەف دەکەن، نووسەر نەك هەر کەسی فاسق و داوێن پیسی کەم یا زۆر خەتابار بە شایستەی کوشتن دەزانێ، بەڵکو هەق بە مێرد دەدات کە هاوسەری تەواو بێ گوناهی خۆی، کە پاکی و ئابڕووی کەوتۆتە بەر مەزەندەی لاوازی ئەخلاقی یان خەتا و گوناحان، بکوژێت، شارداری زەلەمیە دەربارەی ناوەڕۆکێکی لەو جۆرەدا نووسراوە. "پزیشکی ئابڕوومەند، و نیگارکێشی بێ شەرەف" دوو شانۆنامەی دیکەی ئەم دەستە شانۆنامانەن.

هەڵسەنگاندن:

کالدرون، وەکو لوپە دڤگا، لە سەدەی هەژدەیەمدا تەقریبەن لە بیر چوو بووەوە، بەڵام هەندێ رەخنەگرانی رۆمانتیك (بەتایبەتی شلگل)، کە بە گەرمییەکی زیادەوە ئەویان بە هاوپایەی سوفوکلیس و شەکسپیر دەزانی، جارێکی دیکە ناوبانگیان زیندوو کردەوە، داوەری دروست تر ئەمەیە کە کالدرون درامانووسێکی گەورەیە، بەڵام بە جۆرێ نقومی ناوەرۆکێن نەتەوەیی و بابەتی رۆژ دەبێ کە لە کولیەت دوور دەکەوێتەوە زۆربەی کات پەیڕەوکردنی هونەرەکانی وشەبازی و لایەنگری وی لە یاسا توند و ناڕەواکانی شەرەف، دەبنە مایەی ناڕەزایی خەڵکی سەدەی بیستەم، گەورەترین ئیجابیاتی وی بریتییە لە: شارەزایی لە تەکنیکی شانۆ، داهێنان و دەست پێشکەری زۆر، باوەڕی مەزهەبی نەگۆڕ و پاك، توانایەکی گەورەی لیریکی.

پەخشانە بەرهەمێن مەزهەبی و فەلسەفی

دوو رێبازی پێچەوانەی یەکدی، واتە خواناسی سەدەکانی ناڤین و دنیا دۆستی، کە لە ئەسپانیای رۆژگار و سەردەمی رێنیسانسدا لە ململانێدا بوون، بە ریز لە بەرهەمەکانی قەدیسە ترێزا و گراتیان دا بە ئاشکرا دەردەکەون.

## سانت تریزای ئاڤیلایی ١٥١٥- ١٥٨٢:

سانت تریزا "گەورەترین ئافرەتی نووسەرە لە ئەدەبیاتی ئەسپانیادا"، و یەکێکە لە گەورەترین سوفیانی مەزهەبی، لە ئاڤیلا هاتۆتە دنیاوە. تریزا لە حەوت سالّی دا "بە قەستی شەهادەت" لە مالّ هەلاّت و، لە نۆزدە سالّیدا بوو بە ئەندامی فیرقەی "کەرملیانی"[٣٠] پێ پەتی". لە سالّی ١٦٢٢ بوو بە یەکێك لە زومریە قەدیسەکان.

گرنگترین بەرهەمی تریزا کە لە چەپۆکی رۆژگار خەلەسیوە، بریتییە لە چوار سەد نامە کە لە سالاّنی (١٥٦١- ١٥٨٢)دا نووسراون، یەك ئوتوبیوگرافی (نووسراوی سالاّنی ١٥٦٢- ١٥٦٦)، و قەسری روح یان ئەپارتمانان ( لە سالّی ١٥٧٧ دا نووسراوە و لە سالّی ١٥٨٨دا بلاّوبووەتەوە. چەند شیعرێکی نووسیوە، و "جگە لە قەسری روح" چەند بەرهەمێکی پەخشانی عارفانەشی نووسیوە.

نوتوبیوگرافییەکەی ترێزا، کە لەسەر راسپاردەی کەشیشە ئیعترافگیرەکەی ئەو نووسراوە، لەرووی شێوازی دیالۆگی، دۆستانە و راز ئاسایەوە شایان و مایەی سەرنجە.

گرنگترین بەرهەمی ترێزا قەسری روحە، ئەم قەسرە حەوت قاتی هەیە، هەر قاتێك رەمزی قۆناغێکی وێرد و پاڕانەوەی سۆفیانەیە، و قاتی حەوتەمین قاتی فەنایە لە ئەشقی خودادا، ئەم بەرهەمە توانای ریزپەڕی ترێزا لە دەربڕینی سۆزی شەخسی و دەروونیدا بەرجەستە دەکات، لویس دلیون-ی هاوچەرخ و بلاّوکەرەوەی بەرهەمەکانی وی دەربارەی شێوازی ترێزا دەڵێت: "بەرهەمەکانی وی لەرووی شێوەی دەربڕین، رازاوەیی و ئاسانی شێواز، لێکدانی ستایش ئەنگێزی وشە، و خۆڕسکییەوە زۆر پەسند و بەجێن، و من بە گومانم لەوەی کە هیچ نووسراوێك لە زمانی ئێمەدا بتوانێ شان لە شانی بدات".

## بالتاسار گراسیان ١٦٠١- ١٦٥٨:

گراسیان لە هەر روویەکەوە بیگری خالّی بەرانبەر ترێزایە (پێچەوانەی ئەوە). هەر چەندە کەسێکی یەسوعی بوو، نووسەرێکی بە گومان، خێرنەندێش، و مرۆڤدۆست بوو. کتێبی (پیاوی دووربین- ١٦٤٦)ەکەی وی جۆرە "دەرباری"[٣١] یەکی ئەسپانیاییە، کە بیست و پێنج خەسڵەتی پیاوی تەواوی، پیاوانەی خوێنەوار دەخاتەڕوو، (هونەری دووربینی- ١٦٥٣) بەرهەمێکە کە سێ سەد مەسەلەی ئاقلاّنەی لەخۆ گرتووە. شاکار و بەرهەمی بەناوبانگی گراسیان کتێبی (رەخنە- ١٦٥١- ١٦٥٧)یە، کە لە سێ بەشدایە، وەکو سێ قۆناغی ژیانی بەشەری (لاوی، کاملی و پیری) ئەم بەرهەمە گێڕانەوەیەکی مەجازی فەلسەفییە کە

سەفەرەکانی کریتیلو (مرۆڤی ئەقلگەرا)و ئاندرنیو (رۆڵەی سروشت) بـو قەڵـەمڕەوی، لاوی، کامڵی و پیری باس دەکات.

گراسیان خـاوەنی زەینێکـی تیـژ و حەساسـە، بـەڵام خـودانی بـیری قـوڵی ئـەخلاقی نییـە، لێکچواندن و درکەی غەریب و قـورس و نێـوەڕۆك "٣٢" پـەروەری، زەرەری زۆری لـە شـێوازی وی داوە، و تەوزیف کردنی زیاد لە پێویستی تەنز و حەنەك، وای کردووە بەرهەمەکانی تاقەتبەربن.

# پەراوێزان:

١- فەردیناندنی پاشای ئاراگۆن ١٤٧٩- ١٥١٦.

٢- ئیزابیل ١٤٥١- ١٥٠٤.

٣- ئارمادای Spanish Armade: ئارمادای لە شکان نەهاتوو، ناوی ئەو گەلە کەشتییە جەنگییە بوو کە فیلیپی دووەمی پاشای ئەسپانیا لە ساڵی ١٥٨٨دا بۆ هێرش کردنە سەر ئینگلیستان ئامادەی کرد، ئەم ئوستولە کە سەد و سی کەشتی و سەد و سی هەزار جەنگاوەری لەگەڵدا بوو، لە دەریای مانشدا لە چەند شەڕێکدا زیانی پێ گەیی و بەرەو باکوور هەڵات. تەنیا نیوەی ئەم ئوستولە بۆ بارەگای خۆی گەڕایەوە چونکە ئەوانیتر لە تۆفان و بۆراندا تێك شکان.

٤- سپانۆلیزم- Spanolismo: کۆمەڵە داب و نەریتێکی ئەخلاقییە لەمەڕ خەسڵەت و تایبەتمەندییە ئەسپانیاییەکان، واتە خو و خدەی ئەسپانیاییەکانن.

٥- گونگوریزم – Gongorism: ئەم زاراوەیە لە ناوی لویس دگونگورانی ئارگوتە (١٥٦١- ١٦٢٧)ی شاعیری چاخی زێڕینی ئەسپانیاوە وەرگیراوە. هەندێ لە خەسڵەتە دیارەکانی شێوازی گونگورا بریتییە لە بەکار هێنانی خواستن و قەلب بەشێوەیەکی نوێ، بەلاتینی کردنی وشە و زاراوەکان، ئاماژە و هێمایانی کلاسیکی و ئەفسانەیی، سوود وەرگرتن لە هەموو هونەرە ڕەوانبێژییەکان. گونگریزم هاو واتای مارینیزمی ئیتاڵیایی، پریسیوسیتەی فەڕەنسی و، یوفوئیزمی ئینگلیزییە، ئەم سێ زاراوەیە و گونگوریزم بەو سەبك و شێوازە ئەدەبییە دەگوترێ کە "باروك"ی پێ دەڵێن.

٦- کالیکات: شارێکی بەندەرییە لە باکووری ڕۆژئاوای هیند.

٧- مونتالڤو: نووسەرێکی ئەسپانیایی ئاخر و ئۆخری سەدەی پازدەیەمە. لەوە دەچێ ئەو ڕۆمانسی "ئامادای گل"ی لە پورتوغالییەوە وەرگێڕابێتە سەر زمانی ئەسپانیایی.

٨- مارتورل ١٤١٣- ١٤٦٨: نووسەرێکی خەڵکی کاتالونیایە (ناوچەیەکە لە باکووری رۆژهەڵاتی ئەسپانیا).

٩- دوگالبا: نووسەرێکی کاتالونیایی سەدەی پانزەیەمە.

١٠- پۆلۆ ١٥٣٠- ١٥٨٥: نووسەرێکی ئەسپانیاییە.

١١- مناندت یی پلایو ١٨٥٦- ١٩١٢: رەخنەگر و مێژوونووسێکی ئەسپانیاییە.

١٢- (....) نووسەرەکەی نادیارە، هەندێ لە مێژوونووسان دانەری ئەم بەرهەمە بە (دیگۆ هورتادو دمیندۆزا ١٥٠٣- ١٥٧٥) دەزانن کە نووسەرێکی ئەسپانیاییە.

١٣- لیستی کتێبە قەدەغەکان: لیستی ئەو کتێبانەی کە خوێندنەوەیان بۆ ئەندامانی کڵێسای کاتولیکی رومی لەلایەن ئەربابی کڵێساوە قەدەغە کرابوو، و ئەم یاساغییە تا ساڵی ١٩٦٦ش بە هەمان تین و تاوی خۆیەوە مابوو، یەکەمجار ئەم لیستە لە ساڵی ١٥٥٩دا بڵاوبووەوە.

١٤- سڤیلی- Seville: ویلایەتێکە لە باشووری رۆژئاوای ئەسپانیا.

١٥- فرناندز دناڤلاندا: وا مەزەندە دەکرێ کە ئەم ناوە خوازراو بێ، تا ئێستا ناسنامەی ئەم کەسە نەزانراوە.

١٦- لویولا ١٤٩١- ١٥٥٦: رۆحانییەکی ئەسپانیاییە، و دامەزرێنەری کۆمەڵگەی یەسوعییە.

١٧- سانچۆ پانزا، چەکدار و خزمەتکاری دون کیشۆتە.

١٨- لامانچا: ناوچەیەکە لە ئەسپانیای ناوەندی، لە باشووری کاستیلی تازەیە.

١٩- گومز مانریك ١٤١٥- ١٤٩٠: شاعیر و شانۆنامەنووسێکی ئەسپانیاییە.

٢٠- عەبا و شمشێر: ئەم زاراوەیە لە کۆمیدیاکانی شانۆنامەنووسانی ئەسپانیایی سەدەی شازدەیەمی وەکو لوپە دڤگاوە وەرگیراوە. ئەم شانۆنامانە پڕن لە ئەڤینداری و بەسەرهاتان و بابەتی سەرەکییان ئەڤین و پیلانگێڕی بەینی ئوروستوکراتەکانە.

٢١- دۆکی ئالبا ١٥٠٨- ١٥٨٢: فەرماندەیەکی ئەسپانیایی سەردەمی شارلی پێنجەمە.

٢٢- مونتالبان ١٦٠٢- ١٦٣٨: کەشیش و شانۆنامەنووس و رۆماننووسێکی ئەسپانیاییە.

٢٣- کومیدیا- Comedia: لە روانگەی لوپە دوڤگاوە وشەی کۆمیدیا تەنیا بەمانای شانۆنامەێن سێ پەردەیی (کۆمیدی، تراجیدی، یا تراجیکومیدی) دێت.

٢٤- فرانسیس دریك ١٥٤٠- ١٥٩٦: دەریا سالاری ئینگلیزی بوو.

٢٥- ریچارد شێردل (١١٥٧- ١١٩٩) شای ئینگلیستان بوو (١١٨٩- ١١٩٩).

٢٦- سەلاحەدین یوسف کوڕی ئەیوب (١١٣٨- ١١٩٣) فەرمانڕەوای میسر و سوریا بوو.

٢٧- بەیت لەحم: شارێکە لە فەلەستین، کە زێدی عیسا و زیارەتگەیەکی گرنگە.

٢٨- ئالکالا دئینارس، شارێکە لەئەسپانیای ناوەندی، لە کاستیلی تازە.

٢٩- سیانەکەی دیکە بریتین لە: لوپە دڤگا، ئالارکون، و کالدرون.

٣٠- کەرملیانی پێ پەتی: لقێکە لە فیرقەی کەرملی، هەڵبەتە لقێکی دەستکاری کراوی چاك کراو، فیرقەیەك لە رەبەنانی هەژار کە لە سەرەتادا لە چیای کەرملی فەلەستین دەژیان.

٣١- "دەرباری" ئاماژەیە بۆ کتێبی "دەرباری"یەکەی کاستیلونە.

٣٢- نێوەرۆك پەروەری — Conceptismo: ئەمە رێبازێك بوو کە بە دوای ناوەرۆك و تیمەی تازەدا دەگەڕا، و لە هزر و بیری پوختە و مکوم پتر بایەخی بە نێوەرۆك پەروەری دەدا.

# ئەدەبیاتی ئەسپانیا
# لە
# سەدەی هەژدەوە تا سەدەی بیستەم

سەرەتایەکی مێژوویی:

مێژووی ئەسپانیا لە ساڵی ١٧٠٠ بە دواوە بۆ خوێنکاری ئەدەبیاتی جیهان شتێکی ئەوتۆی تێدا نییە و دەکرێ بە خێرایی بەسەریا تێپەڕی. میللەتی ئەسپانیا لە زۆربەی ئەم قۆناغەدا "ئابوورییەکی شکست خواردوو و سیاسەتێکی لاوازی" هەبووە، جەنگە دەرەکی و ئاژاوە ناوخۆییەکانیش بەردەوام مەداری دەسەڵات و ئاقاری هێزی توانای وڵاتیان کەم کردۆتەوە. لە ساڵی ١٧٠٠ کە شارلی دووەم کۆچی دوایی کرد، فیلیپی پێنجەم کە لە بنەماڵەی بوربونەکانی فەرەنسا بوو بە پاشای ئەسپانیا دانرا، ئەم بنەماڵەیە تاساڵی ١٩٣١ حوکمیان کرد. تەنیا شەش ساڵی سەردەمی ناپلیۆن ١٨٠٨- ١٨١٤و شەش ساڵی قۆناغانی ١٨٦٨- ١٨٧٠، واتە قۆناغی حوکمڕانی ئامادیوس ساڤویی (١٨٧٠- ١٨٧٣)و دەوڵەتی کۆماریخوازی ١٨٧٣- ١٨٧٤، دەسەڵات لە دەستی ئەوان دەرچووە، سەرەنجام ئەسپانیا لە شەڕی ساڵی ١٨٩٨دا لەگەڵ ئەمریکادا، دەسەڵاتی خۆی لەسەر دوا موڵکە ئەمریکاییەکانی خۆی لە ئوقیانوسی ئارام لەدەستدا، لە ساڵی ١٩٣١دا ئالفونسۆی سیازدەیەم لەسەر دەسەڵات لابرا و کۆماری دووەم راگەیەنرا. دوای پێنج ساڵ جەنەراڵ فرانسیسکۆ فرانکۆ ١٨٩٢- ١٩٧٥) سەرکەوتووانە شۆڕشێکی فاشیستی بەڕێوەبرد (١٩٣٦- ١٩٣٩)، لەوە بەدواوە دیکتاتۆرییانە وڵاتی بەڕێوەبرد. ئەسپانیا بەشداری لە هیچ یەکێك لە دوو جەنگە جیهانییەکەدا نەکرد.

نۆڕینێکی گشتی:

بە مردنی کالدرون لە ساڵی ١٦٨١دا، داهێنانی بەرهەمی گەورەی ئەدەبیاتی ئەسپانیاییش کۆتایی هات. فەرمانڕەوایانی هەوەڵی بوربـون، کـە دەیانویـست ئەسـپانیاییەکان بـە شـێوەی فەرەنسایی پەروەردە بکەن، لە مەیدانی ریفـۆرمی کـەلتووری و پـەروەردە و فێرکاریـدا چـەند هەنگاوێکیان نـا. لـە سـاڵی ١٧١٢دا کتێبخانـەی نیـشتیمانی دامـەزرا، لـە سـاڵی ١٧١٤ ئەکادیمیای پاشایەتی ئەسپانیا دامەزرا، و لە ساڵی ١٧٣٥شدا ئەکادیمیای مێژوو هاتە ئاراوە.

لە ساڵی ١٧٢٥دا کاریگەری نەو کلاسیسزمی فەرەنسی بەسـەر نووسـەرانی ئەسـپانیاییدا دەستی پێکردبوو، و ئەم نووسەرانە لە جیاتی چاو لە نووسەرانی پێـشینی ئەسـپانیایی بکـەن، ستایشی بوالو-یان دەکرد و لافونتین و مولیر و راسین-یان دەکرد بـە سەرمەشـقی خۆیـان. بـە هەرحاڵ دەبێ ئەوە دووپات بکرێتەوە کە راپەڕینی نەو کلاسیك ئەو رەواجەی کە لە فەرەنـسادا هەیبوو، هەرگیز لە ئەسپانیا و لە ئینگلیستاندا ئەو برەوی پەیدا نەکرد، دیسان تاکگـەرایی و بێزاری زاتی ئەسپانیایی لە شتی بێگانە کردیە کارێك هەندێ لە نووسەران روو لـە تێۆرییـان و رێبازانی نەوکلاسیك وەرگێڕن، بە شێوەیەکی گشتی سەدەی هەژدەیەم قۆناغێکی وشـك و کـەم بەرهەمی ئەسپانیا بوو لە مەیدانی ئەدەبیاتی گەورەدا.

لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمەوە، رێبازی رۆمانتیزم لە ئەسپانیادا، وەکو وڵاتانی دیکەی ئەورووپای رۆژئاوایی رووی کردە هەڵکشان. جا لەبـەر ئـەوەی کـە نەوکلاسیـسزم هـیچ کاتێـك لـە ئەسپانیادا ریشەیەکی بتەوی دانەکوتابوو، و ئەسپانیاییەکانیش بە تەبیعەت زیـاتر ئـەهلی سـۆز و هەست بوون تا ئەهلی ئەقڵ و لوجیك، سەرکەوتنی راپەڕینی رۆمانتیکیش لـەم وڵاتـەدا لـە هـەر شوێنێکی دیکە کەمتر جۆش و خرۆشی نایەوە. گەلێك لە خەڵکانی ئەهلی ئەدەب کە لـە سـاڵانی دەسەڵاتی زاڵمانەی فەردیناندی حەوتەمدا بەرەو فەرەنسا و ئینگلیستان وڵاتیان بەجێ هێشتبوو، لە ساڵی ١٨٣٣دا بۆ ئەسپانیا گەڕانەوە، و ئەندێشەی رۆمانتیکیان لەگەڵ خۆدا بە دیاری هێنا، لەگەڵ گەڕانەوەی ئەواندا رۆمانتیزمی ئەسپانیا "وەکو راپەڕینێکی هەمە لایەنـە و هوشـیارانە" دەسـتی پێکرد. ئەم راپەڕینە لە ماوەی ساڵانی ١٨٣٣- ١٨٤٥دا گەیـیە ئەوپەڕی گەشانەوە.

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا، مەتریالیزم و کەم بوونـەوەی بـاوەڕی مەزهـەبی، بـووە مایەی بەدگومانی، کە لە ئەدەبیاتدا رەنگدانەوەیەکی فراوانی هەبوو.

پاش جەنگی ئەمریکا –ئەسپانیا، رێنیسانسی مەعنەوی و کەلتووری ئەسپانیا دەستی پێکرد. "نەوەی ١٨٩٨" لە مەیدانی پێشقەبردنی فێر بوون و پەروەردەدا هەنگاوی گەورەیان

نا، و دژی ناسیونالیزمی کورت بینانە، موحافەزەکاری، و توندڕەوی ئایینی وەستان، گەلێك لە شاعیران، رۆماننووسان، شانۆنامەنووسان، و زانایانی سەنگین لەم وارەدا بەگەڵیان کەوتن. لەو قۆناغەدا هیچ قوتابخانەیەك نەهاتە ئاراوە، بەڵام عەیبە تەقلیدییەکانی ئەدەبیاتی ئەسپانیا- بێ مویالاتی، ئیرتیجالیەت، و وشەبازی- بوو بە مایەی رەخنە، دوو رێچکەی پێچەوانەی یەکدی-ش دەرکەوتن، یەکێکیان بەرەو سنعەتبازی و ئاڵۆزی، ئەویتر بەرەو سادەیی و راستەوخۆیی.

لەماوەی دوو سەدە و نیوی رابردوودا ژمارەیەکی زۆر کەم لە بەرهەمی ئەدەبی بەرجەستە، لە مەیدانەکانی رۆمان، شانۆنامە و شیعر چووە سەر گەنجینەی ئەدەبیاتی ئەسپانیایی.

## رۆمان

تاقە رۆماننووسی بەرجەستەی ئەسپانیایی لە سەدەی هەژدەیەمدا خۆزیە فرانسیسکۆ دنیسلائی روخو (١٧٠٣- ١٧٨١) بوو. کتێبە بەناوبانگەکەی (سەربوری وەعزبێژی بەناوبانگ.. ١٧٥٨) هەجوویەکەی لەمەڕ شێوەی وەعزی هەستۆکی بە ئاوتاوی وەعزبێژانی نەوەکانی پێشوو.

لە قۆناغی رۆمانتیکدا رۆماننووسانی ئەسپانیایی کەوتنە وەرگێڕان و لاسایی کردنەوەی بەرهەمەکانی والترسکوت، شاتوبریان، کوپرو، مانزونی. لەم قۆناغەدا سەدان رۆمانی مێژوویی نووسران، بەڵام هیچیان سەرکەوتوو نەبوون.

پاش ئەمەی کە رۆمانتیزم روو لە ئاوا بوون چوو، رۆماننووسان روویانکردە رۆمانی رەفتاری کۆمیدی بەڵام ریالیستی کە زیاتر وێنەی ژیانی خەڵکی ناوچەیەکی تایبەتی دەگرت، باشترین ئەم رۆماننووسانە بریتین لە: سسیلیا بول فرن فیبر (ناوی خوازراوی فرنان کابالیرویە ١٧٩٦- ١٨٧٧)، کە نووسینی رۆمانی رەفتاری پێکەنیناوی داهێنا، خوان ڤالیری ئی ئالکا گالیانو ١٨٢٤- ١٩٠٥ کە رۆمانەکانی ژیانی ئەندەلوسی وێنە دەگرن، ئانتونیود ئالارکون ئی ئاریشا ١٨٣٣- ١٨٩١ کە زیاتر بە حەنەکچیاتی و شۆخیبازی بە نێو بانگە، خوزیە ماریا دپرزا ١٨٣٣- ١٩٠٦ کە رۆمانەکانی، دەربارەی ناوچەی مونتانایە، و بە خۆیشی "لە زۆر لایەنەوە گەورەترین ریالیستی ئەسپانیای سەردەمی تازەیە"، ئیمیلیا پاردو باسان ١٨٥٢- ١٩٢١، کە نەك هەر رۆماننووس، بەڵکو لە لایەنگرانی قوتابخانەی سیمبولیزمی فەڕەنسی بوو، ئارماندو پالاسیوڤالدس (١٨٥٣- ١٩٣٨) کە ناوەڕۆکی سەرەکی رۆمانەکانی ناوچەی

ئاستورياس"١" بوو، و ئەوجا ڤیسنتە بلاسکو ئیبانز (١٨٦٧- ١٩٢٨) کە چەند رۆمانێکی دەربارەی ئەمریکای باکوور، و رۆمانێکی دەربارەی جەنگی جیهانی یەکەم نووسی.. بنیتو پرزگالدوس (١٨٤٣- ١٩٢٠) کە چەند رۆمانسێکی مێژوویی و هەروەها چەند رۆمانێکی دەربارەی ریفۆرمی کۆمەلآیەتی نووسی.

لە سەدەی بیستەمدا رامون ماریا دل ڤالە ئینکلان (١٨٧٠- ١٩٣٦) چەند رۆمانێکی دلداری نووسی، و پیو باروخا (١٨٧٢- ١٩٥٦) کە رەنگە بەناوبانگترین رۆماننووسی ئەسپانیایی سەدەی بیستەم بێ کۆمەڵێك رۆمانی مێژوویین و رۆمانی بەنێوەڕۆك سیاسی نووسی.

## شانۆنامە

لە سەدەی هەژدەیەمدا زۆر کۆمیدیا بە چاولێکەری شانۆنامەکانی مولیر هاتە نووسین کە تا رادەیەك باش بوون، بەڵام تراجیدیاکانی ئەم قۆناغە دەستکرد، ناپوختە و لاواز بوون. رامون دلاکروز (١٧٣١- ١٧٩٤) رووبەڕووی نەوکلاسیسزم وەستایەوە و، چەند کۆمیدیایەکی ریالیستی چاکی نووسی، لیاندرو فرناندز دموراتین (١٧٦٠- ١٨٢٨) باشترین موریدی مولیر بوو.

فرانسیسکو مارتینز دلا روسا (١٧٨٩- ١٨٦٢)؛ یەکەمین شانۆنامەی رۆمانتیکی سەرکەوتووی (پیلانی ڤینز- ١٨٣٠) نووسی کە میلو درامایەکی سەرریژە لە ئەڤینداری، رەمز و رازداری، و دەسیسەکاری، ئانخل دساڤدرا-ی دۆکی ریڤاس (١٧٩١- ١٨٦٥) تراجیدیای پرجۆشی دون ئالڤارۆ یا جەبری چارەنووس (١٨٣١ و ١٨٣٥)ی نووسی کە دەربارەی قارەمانێکی میتا مرۆڤانییە. ڤیردی"٢" لەسەر بنەمای ئەم تراجیدیایە ئۆپرای جەبری (حەتمیەت) چارەنووسی دانا.

برتون دلوس ئارروس (١٧٩٦- ١٨٧٣) بۆ ریالیزم گەڕایەوە، و لە رێگەی شانۆنامە سووك و نوکتە ئامێزەکانییەوە گاڵتە بە چینی بورژوای کۆمەڵگە دەکات. خوا کوئین دیسنتا (١٨٦٣- ١٩١٧)ش درامای پرولیتاریایی ئەسپانیایی داهێنا.

یەکەمین درامانووسی دیار و گەورەی ئەسپانیا لە سەدەی بیستەمدا (خاسینتو بناڤینتەئی مارتینز ١٨٦٦- ١٩٥٤) بوو کە شانۆنامانی منالآن و درامای تەنزئامێزی کۆمەڵایەتیی نووسی. بەڵام لە هەمووان ناودارتر فدریکو گارسیالورکا (١٨٩٩- ١٩٣٦) بوو کە هەم لە

واری کۆمیدیا و هەم لەواری تراجیدیادا دەستێکی باڵای هەبوو. یەکێك لە بەناوبانگترین شانۆنامەکانی وی (زەماوەندی خوێنە- ١٩٣٣)، کە بەسەرهاتی کینە کێشییەکی خانەوادەیی و هەڵاتنی دڵداران لەگەڵ دلبەرەکانیاندا دەگێڕێتەوە. (یرما- ١٩٣٤)، تراجیدیای ژنێکە کە بێ منداڵی و ئارەزووی منداڵدار بوون بووە بە خۆرەی زەین و هۆشی، و (مالێ برنارد ئالبا- ١٩٣٦ ) شانۆنامەیەکی وێرانکەرە دەربارەی ژنێکی ریاکار و ستەمکار کە بە رەفتاری رەقی خۆی روحی کیژەکانی تێك دەشکێنێ و بەرەو شێت بوون و خۆکوژییان دەبات.

## هۆزان

هۆزانی ئەسپانیایی لە سەدەی هەژدەیەمدا زیاتر گێڕانەوەیی، تەنزئامێز، یان فێرکارییە. (توماس د ئیریاتە ١٧٥٠- ١٧٩١) بە حیکایەتە شیعرییە ئەخلاقییەکانی ناوبانگی دەرکردووە، (گاسپار ملچور دخوڤلیانوس ١٧٤٤- ١٨١١) کە جگە لە شاعیری، سیاسەتوان و ریفۆرم خوازیش بوو، بە بەندە فێرکاری، هەجوو، و نامە شاعیرانەکانی ناوبانگی دەرکردووە (خوان ملندز ڤالدیس ١٧٥٤- ١٨١٧) لە ژێر کاریگەری گسنر، یانگ، تومسن و رۆسۆدا بوو، و بە جوانی و پوختەیی شیعرەکانی بەناوبانگە. زۆر هۆزانی شوانکارەیی، چامە و بەرهەمی فێرکاری لە پاش بەجێماوە. شۆرەت و ناوبانگی (مانویل خوزە کنتانا ١٧٧٢- ١٨٥٧) بە قەسیدە نیشتیمانی و تەژی مرۆڤدۆستییەکانییەوەیە.

(خوزە دسپرونسدا ئی دلگادو ١٨٠٨- ١٨٤٢) گەورەترین شاعیری رۆمانتیکی ئەسپانیایە. ئەو کە شاعیرێکی بە گومان، بێزار، و نیشتیمانپەروەر بوو، لە رۆمانسی شاعیرانە و هۆزانێن لیریکی کورتدا دەستێکی باڵای هەبوو. (خوزیە زوریلائی مورال ١٨١٧- ١٨٩٣) زۆر چیرۆکی شاعیرانەی بەرزی نووسی، وەکو (غەرناتە)، کە بە هۆی هاماجی شاعیرانەیانەوە بەناوبانگن، هەروەها زۆر درامای زیندووشی نووسیوە کە گرنگترینیان دارشتنەوەی ئەفسانەی دون خوانە (دون جوان) بە ناوی (دون خوان تنوریو- ١٨٤٤). (گۆستاف ئادولفوبکر ١٨٣٦- ١٨٧٠) شاعیرێکی رۆمانتیکە کە بە شیعرە سادە و خەیاڵی و غەماوییەکانی لە کتێبی (قافیەکاندا — ١٨٧١)، و هەروەها بە ئەفسانە پەخشانییەکانی بەناوبانگە، ئەو ئەفسانانەی کە پڕن لە بویەر و رووداوانی جادوویی، خەیاڵی و میتافیزیکی.

رامون دکامپو ئامور (١٨١٧- ١٩٠١)، یەکێکە لەو شاعیرانەی کە وازی لە رۆمانیتزم هێنا و کەوتە گوتنی بەندێن داشۆرین و هۆزانگەلێك کە ناوی دەنان دولوراس- گێڕانەوە و

حیکایەتگەلێك بوون (کە تیایاندا حەقیقەتە ئەبەدییەکان بە رەمز و کینایە دێنە دەربڕین، و تایبەتمەندییەکانیان بریتییە لە کورتبڕی، ناسکی، جوانی، و دەرس و پەندی فەلسەفی شاراوە لە پشت ریشخەن و شۆخیبازییەوە)، سۆزپەروەری و مەیلی داستانبێژی، کامپۆ ئاموری لە سەردەمی خۆیدا ناودار کرد، شاعیرێکی دیکە کە چیرۆکانی پڕجۆش و خرۆش گوت، (گاسپار نونیاز دنارستە ١٨٣٢- ١٩٠٣)ـە، ئەمە شاعیری نا ئومێدی و بەدگومانی بوو، کە ئەمە بۆ گومانی وی لە مەزهەب و نائومێدی وی لە سیاسەت دەگەڕایەوە.

بزووتنەوەی ناسراو نوێگەرایی شیعری ئەسپانیایی لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٠ دا دەستی پێکرد. نوێخوازەکان، کە (روبن داریو ١٨٦٧- ١٩١٦)ی شاعیری ئەسپانی زمانی خەڵکی نیکاراگوا پێشەوایان بوو، چاویان لە پێکهاتەی تیۆرییەکانی پارناسیە فەرەنسییەکان و قوتابخانەی سیمبولیزم بوو، ئەم شاعیرانە جەختیان لەسەر زەرورەتی تاکپەروەری، دەروونگەرایی، فۆرمبازی، و دەوڵەمەندیی زمانەوانی شاعیر دەکردەوە.

گرنگترین شاعیرانی نوێخوازی ئەسپانیا مانویل ماچادو (١٨٧٤- ١٩٤٧)، ئانتونیو ماچادو ١٨٧٥- ١٩٣٩)، و (ئیدوارد دۆمارکینا ١٨٧٩- ١٩٤٦) بوون. خوان رامون خیمەنز ١٨٨١- ١٩٥٨ لەسەرەتادا بە نوێخواز دەژمێردرا، بەڵام پاشان کەوتە رەفزکردنی سنعەتکاری و ئاڵۆزی شیعری شاعیرانی نوێخواز. ئەو بە سادەیی، بەرزی هونەری، و بە گەرمی سۆز و سۆزداری بەناوبانگە، گەلێك لە شیعرەکانی خەماوی و لاوانەوەن، خیمەنز لە ساڵی ١٩٥٦دا خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیاتی وەرگرت. (رامون پرزد ئایالا ١٨٨٠- ١٩٦٢).

رۆماننووس و شاعیری تەبیعەتە. بەرهەمەکانی لەڕووی قوڵی فەلسەفی و ناسکی زمانی ئەسپانیاییەوە زۆر باشن. و لە دوا ئەنجامدا دەبێ ئاماژە بۆ (گابریلا میسترال- ناوی خوازراوی لوسیلا گودوی د ئالکایاگا- ١٨٨٩- ١٩٥٧)ی شاعیری شیلیایی بکرێ، کە لە ساڵی ١٩٤٥دا خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیاتی وەرگرت، شیعری وی کە بەگیانی لیریکی رەوانە بەناوبانگە، دەربڕی ئاسەی توندی شاعیرە بۆ عەدالەتی گشتی.

# ژێدەران:

١- ئاستوریاس: ناوچەیەکە لە باکووری رۆژئاوای ئەسپانیا.

٢- ڤێردی (١٨١٣- ١٩٠١): ئاهەنگسازێکی ناوداری ئیتاڵیاییە.

# بەشی چوارەم
# ئەدەبیاتی ئەڵمان
# سەدەی شانزەیەم:
# ڕێنیسانس و ڕیفۆرمی ئایینی "١"

سەرەتایەکی مێژوویی:

ئەو ئاژاوە و پاشاگەردانییە سیاسییەی کە سەرانسەری وڵاتی ئەڵمانی لە ماوەی نیوەی دووەمی سەدەکانی ناڤیندا گرتبووەوە تا سەدەی شانزەیەم و دواتریش هەر بەردەوام بوو. شارلی پێنجەم، ئیمپراتۆری ئیمپراتۆرییەتی موقدەسی ڕۆم لە ساڵانی ١٥١٩- ١٥٥٦، بە ڕادەیەك گیرۆدەی جەنگە دەرەکییەکان بوو کە دەرفەتێکی ئەوتۆی بۆ یەکخستنی ئەڵمان پەیدا نەکرد، و ئەوانەی دوای ئەویش هاتن لەو مەیدانەدا سەرنەکەوتن.

لەو ڕووداوە مێژووییانەی، کە بۆ خوێنکارانی ئەدەبیات بایەخی هەیە، ڕێبازێن هێزی — ئەقڵی و مەزهەبییە، هێزی ڕێنیسانس لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی چواردەیەمەوە بەرەبەرە لە ئەڵماندا سەری هەڵدا و، هەر لەو سەروبەندەدا، ڕاپەڕینی هومانیزم لە ناو چینێکی تایبەتیدا لە باکووری ئەورووپای ناوەندیدا برەوی سەند. هۆیەکانیشی ئاشکران، یەکەم، ڕاپەڕینی بوژانەوەی ژیانی ئەدەبیاتی کلاسیك، بەتایبەتی لاتینی، تایبەت بوو بە ئیتالیا-و تارادەیەك بە فەرەنساو ئەسپانیاوە- کە لە مشور و خەمی زیندوو کردنەوەی شکۆی ڕابردووی خۆدا بوون بەڵام بۆ ئەڵمان، ڕێنیسانس بێگانە و نامۆ بوو. دووەم، هۆمانیزمی ئەڵماندا لە

بنەڕەتدا بۆ دەستەبژێرانی ئەرستۆکرات و رۆشنبیران، کە شارەزای زمانانی لاتینی و یونانی بوون، جوان و دڵگیر و پەسند بوو، کەچی لەو وڵاتانەدا کە زمانەکانیان دەچووەوە سەر لاتینی، خەڵکێکی زیاتر رموودەی هومانیزم بوون، رەنگە هۆی ئەمەی کە بۆچی خەڵکی وڵاتانی ئەڵمانیا رووبانکردە ریفۆرمی ئایینی و ئیتاڵیاییەکان بە گەرمی پێشوازییان لە هۆمانیزم کرد، لەمەدابێ کە تەبیعەتی ئەم دوو نەژادە زۆر جیاوازە، ئەڵمانییەکان هەمیشە لایەنگری زمان و ئایین و هزری عیبری بوونە، ئیتاڵیایی و فەرەنسییەکان لایەنگری کەلتوور و شارستانییەتی یونانی بوونە.

هەڵبەتە، نابێ وا مەزەندە ببرێ کە هومانیزم هەرگیز لە ئەڵمانیادا پێشڤەچوونی. بە پێچەوانەوە، یوهان رویشلین (١٤٥٥- ١٥٢٢)ی ئەڵمانی، دسیدریوس ئیراسموس-ی خەڵکی روتردامی هۆڵەندا، و زۆری دیکە (بڕوانە دێڕەکانی داهاتوو) لە زمانانی کلاسیکدا گەیینە پسپۆری و مامۆستایەتی، بە شێوەیەکی گشتی دڵبەندی بە هۆمانیزم و داهێنانی چاپ بووە فاکتەرێکی گرنگ بۆ تێگەیشتن لە مانای گشتی هومانیزم، بەڵای کەمەوە لە ماوەی ساڵانی ١٣٤٨- ١٥٥٥دا پانزە قوتابخانە و زانکۆ کرانەوە، لوتەر بە خۆیشی پشتگیری لە زانستی تازە، تا ئەو شوێنەی لەگەڵ مەزهەبەکەیدا دەسازا، دەکرد.

لە سەرەتاکانی نیوەی دووەمی سەدەی چواردەیەمدا جان ویکلیف لە ئینگلیستان، یوهان هوس (١٣٦٩- ١٤١٥) لە بوهمیا، و ریفورمیستانی ئایینی دیکە کەوتبوونە هێرش بۆ سەر گەندەڵی ناو کڵێسای کاتولیك. تاك پەروەری، پەرەسەندنی خوێنەواری و فێربوون، و گیانی گومان و پرسنامێزی رێنیسانس، زۆر کەسی لە هەڵەناپەزێری کڵێسا دڕدۆنگ کردو بەرەو تاقیب کردن و لێکۆڵینەوە لەو قەواڵە و بەڵگەنامانەی بکێش کردن کە بە بنەما و بناغەی تەعلیماتی مەسیحی دەژمێردران. مارتین لوتەر لە ساڵی ١٥١٧ نەوەد و پێنج مەسەلە بەناوبانگەکەی خۆی "بە مەبەستی هەڵێنجانی حەقیقەت" دژ بە فتوایەکەی پاپا سەبارەت بە جایز بوونی کرینەوە و پاککردنەوەی گوناح و فرۆشتنی عەفو، بەسەر دەرگای کڵێسای گەورەی ویتن بورگدا هەڵواسی و پاش سێ ساڵان نوسخە ئیمزا کراوەکەی پاپای بەبەر چاوی عەوامی خەڵکەوە سوتاند (پاپا لەم نوسخە ئیمزا کراوەدا هەڕەشەی کردبوو کە ئەگەر لوتەر دەست بەرداری باوەڕەکانی خۆی نەبێ، بە مورتەد لە قەڵەم دەدرێ). خەڵکێکی زۆر باوەڕەکانی لوتەریان پەسند کرد، و دەکرێ (باوەڕنامەی ئۆگسبورگ"[٢]")ی وی لە ساڵی "١٥٣٠" بە "سەرەتای ئایینی پروتستانی سیستەماتیك" بژمێردرێ. شارلی پێنجەم بێهودە هەوڵیدا ئەم

بیدعەتە تازەیە نەهێڵێ، بەڵام لە ساڵی ١٥٥٥دا ناچار ملی بۆ ئازادی عیبادەت و پەرستن بۆ کاتولیکەکان و پروتستانەکان بە شێوەیەکی یەکسان (بەپێی فتوای ئەنجوومەنی ئوگسبورگ)دا.

نوڕینێکی گشتی:

ئاسایی بوو کە ئەدەبیاتی ئەڵمانی لە سەدەی شانزەیەمدا بە قوڵی بکەوێتە ژێر کاریگەری پاشاگەردانی و پەشێوییە ئایینییەکانەوە. نامەی "ستایشی حەماقەت"ەکەی ئیراسموس و زۆر بەرهەمی دیکە (هەموویان بەلاتینی بوون) کەوتنە گاڵتە کردن بە پیاوانی گەندەڵی کڵێسا، و رەخنەگرتن لە خەوشەکانی کڵێسا، و ستایشی فەزیلەتە سادە و ساکارەکانی مەسیحییەت. گرنگترین نووسەرانی پروتستانی لوتەر، ئولریش ڤون هوتن (١٤٨٨- ١٥٢٣)، و یوهان فیشارت (دەوروبەری ١٥٤٦- ١٥٩٠) بوون.

دابە ئەدەبییە کۆنترەکانی وەکو شانۆنامە و گۆرانی و بەستەی ئەڤینداری (ماستەر سۆنگ)[3]، بە هیمەتی گەورە شایەر[4] (هانس ساکس) بەردەوام بوو، بەڵام تەنانەت ساکس-یش لە ژێر کاریگەری ریفۆرمی ئایینی پرۆتستانەکاندا بوو.

زۆر چیرۆك و رۆمانسی جوانیش بڵاوبوونەوە کە زۆربەیان خاوەنەکانیان نادیار بوون.

بەناوبانگترینی ئەم بەرهەمانە دکتۆر فاوستە (١٥٨٧)، کە پاش بڵاوبوونەوەی یەکسەر وەرگێردرایە سەر زمانی ئینگلیزی. یورگ ویکرام (لە ساڵی ١٥٦٠دا مردووە)یش یەکەمین رۆمانی ئەڵمانی نووسی، کە یەکێك لەوانە (رشتەی زیرینە- ١٥٥٧).

ژانرە ئەدەبییە کەم بایەخترەکانی ئەم قۆناغە کۆمەڵە حیکایەت، جوگرافیا، مێژوو و پەند... هتد، یان لەخۆ دەگرت.

## ئیراسموس

دسیدریوس ئیراسموس (ئەمە ناوی خوازراوی گرهارت گرهارتس، یا گیرت گیرتس-ە کە لە ساڵانی ١٤٦٦- ١٥٣٦دا ژیاوە) ئیراسموس لە روتردام چاوی بە دنیا هەڵهێناوە. منداڵێکی هەتیو بوو و ئەو خانەوادەیەی کە سەرپەرشتی ئەویان لە عۆدەدا بوو، بە دێرێکی ئوگوستینۆسی -یان سپارد، ئیراسمۆس لەوێندەر نەفرەت و بێزارییەکی توندی سەبارەت بە رەقی و گەندەڵی رەبەنەکان لەلا پەیدا بوو، بە واسیتەی قەشە باشی کامبری[5]، مۆڵەتی وەرگرت کە دێری ناوبراو بەجێ بێڵێ، و دوا بە دوای ئەوە کەوتە سەفەر بە سەرانسەری ئەورووپادا کە یەکێك لەو وڵاتانە ئینگلیستان بوو. ساڵانی ١٥١١- ١٥١٤ی بە دەرس گوتنەوە

لە کەمبریج بردە سەر، و ئاشنایەتی لەگەڵ مور، کولت"٦"، گروسین"٧" و زانایانی گەورەی تری ئینگلیزی ئەو رۆژگارەدا پەیدا کرد. سەرەنجام لە بازل"٨" کۆچی دوایی کرد.

ئیراسموس زۆربەی تەمەنی خۆی بە فێرکردنی هومانیزم و دیانەتی سادەی مەسیحییەت گوزەراند، بەدەم سەفەری ئەوروپایەوە، لە هەموو شوێنێ هێرشی دەکردە سەر توندوتیژی، زۆرداری، ریاکاری، و هەرە جۆرە گەندەڵییەك، و بەتایبەتی رەخنەی لەگەندەڵی ناو کلێسا دەگرت، بەرهەمەکانی هەرچەندە لە مەیدانی پەرەپێدانی رابوونی ریفۆرمی ئایینیدا کاریگەر بوون، ئەو بە خۆی هەوەڵجار لە راپەرینەکەی لوتەر دوورە پەرێزیی کرد، و پاشان بە هۆی جەوهەر و ماهیەتی شۆڕشگێڕانەی ئەم راپەرینەوە رووبەڕووی وەستایەوە.

**بەرهەمەکانی:**

بەرهەمەکانی ئیراسموس هەمووی بەلاتینییە. ئینجیلی بەلاتینی وەرگێڕاو لەگەڵ شەرح و تەفسیرێکی توندا دەربارەی بەدرەفتاری کلێسا بلاوی کردەوە. ژمارەیەکی زۆری پەندی یونانی و لاتینی کۆکردەوە، چەند نامەیەکی ئەخلاقی و فێرکاریی نووسی، هەندێ نامەی نووسی کە زانیاری بەهاداریان لەمەڕ ژیانی خودی وی تێدان، و –لە هەموویان گرنگتر- کتێب یا نامەی ستایشی حەماقەت و دەمەتەقێیە.

**ستایشی حەماقەت ١٥٠٩:**

هەجونامەیەکە کە بە ئۆکەی سیرتوماس مور نووسراوە وادیارە ئیلهامی (کەشتی گەوجان)ی برانت –ە نووسراوە. ئەم بەرهەمە بە روالەت "گوتارێکە" کە لەلایەن خودی "حەماقەت"ەوە دەگوترێ، و لەڕاستیدا مەنەلۆگێکی بێ شێوە و فۆرمە کە "حەماقەت" گاڵتە بە گەندەڵی و کەجرەوییەکانی زەمانە دەکات. ئیراسموس، بە حەنەکبازییەکی کینایە ئامێزەوە دەکەوێتە "ستایشی" گەوجێتی و حەماقەتەکانی هەرچین و سنفێك- "فەیلەسووفانی پیری کەج خوو"، کیژانی بێ موبالات، دادوەران، تەبیعەتگەرایان، بەختگرەوان، پزیشکان، شاعیران، وتاربێژان، مافناسان، دەرباریان، پاشایان و زۆری دی. ئیراسموس بەتایبەتی پیاوانی کلێسا، لە پاپاوە تا رەبەنان و فرۆشیارانی چەکی غوفران دەست نیشان دەکات. هەڵبەتە ((ستایشەکە)) خراوەتە سەرزاری خودی ((حەماقەت)) و لەم لایەنەوە کتێبەکە ئیدیعا نامەیەکە دژی حەسوودی و بەغیلی، زبری و توندوتیژی، ریاکاری، خورافات، نادروستی، و خۆپەسندی هەموو تاقم و دەستەی گەوجان. ئیراسموس هەمووان بە گەوج دەزانێ، جگە لە خوا کە بە راستی خاوەن ئاوەزە. ((لەڕاستیدا، رەوتی ژیان لە جیهاندا

جگە لە شانۆیەکی پێکەوە بەستراوی زنجیرە گەوجێتییەك زیاتر چیتر نییە، و هەر هەموو ئەکتەرەکان بە یەك ئەندازە گەوج و شێتن...))

دەمەتەقێیەکان ١٥٢٦:

ئەم بەرهەمە شەست و سێ گفتوگۆی لەخۆ گرتووە کە لە بنەڕەتدا بە مەبەستی سەرگەرمی و هاندانی خوێنکارەکانی ئیراسمۆس نووسراوە. ئەم گفتوگۆیانە لەڕووی بابەتەوە هێندە هەمەجۆر و ئاوێتە بە یەکترن کە پۆلینکردنی وردیان زەحمەت و دژوار دەنوێنێ. بەڵام دەکرێ بە هەڵبژاردن بەسەر شەش دەستەدا دابەش بکرێن:

*نیشاندانی هەڵەکانی سرووت و رێورەسمە عیبادییەکان.*

*دژایەتی کردنی گەندەڵی ناو کڵێسا.*

*ریسواکردن و ئاشکراکردنی دەغەڵبازییە باوەکان.*

*دەربڕینی داخ لەمەڕ گوناهانی شەخسی.*

*ئامۆژگاری پراکتیکی بۆ عەوامان.*

*گفتوگۆی جۆراوجۆر بەمەبەستی سەرگەرمی- نەك فێرکاری.*

هێنانەوەی چەند نموونەیەك میتۆدەکانی ئیراسموس روون دەکاتەوە: دوو گوتاری "زیارەتی ئایینی" و "نەزرە بەپەلەکان" بیهودەیی سەفەرە یەك لە دووی یەکەکان بۆ مەزارەکان مەحکوم دەکات، چونکە قەدیسان نابێ بپەرسترێن. گوتارەکانی (فێڵی ئەسپ)، "دەرکەوتن" و "گەدایان" فڕوفێڵ و دەغەڵبازییە جۆراوجۆرەکان کەشف و ریسوا دەکەن، لە "پیاوی گەنج و سۆزانی"دا مەبەست ئەوەیە کە "داوێن پاکی لە زەیننی لاواندا بچەسپێ" لە "پەندی بەڕێوەبەری قوتابخانە"و "پارێزکاری سەردەمی لاوی"دا ڕەفتارە جوان و شایستەکانی گەنجێك دیاری دەکرێ، چەند گفتوگۆ و دەمەتەقێیەکیش بۆ ستایشی خوێنکاری راستەقینە و سەرزەنشت کردنی فەزڵفرۆشی و خۆهەڵکێشان تەرخان کراوە لەوانە: "تەقلید"و "ئەنجوومەنی دەستوورزانان".

گومان لەوەدا نییە کە ئەم کتێبە کارێکی زۆری کردۆتە سەر خێرایی بەخشین بە ڕاپەڕینی ریفۆرمی ئایینی لە ئەڵمان و ئینگلیستاندا، ئەمە جگە لەمەی کە لە مەیدانی نیشاندانی هەندێ خەسڵەتی ژیانی خوێنکاری و وردە ئاماژاندا بۆ هەندێ گۆشەی ژیانی نووسەر بەرهەمێکی بەنرخە.

# مارتین لوتەر

مارتین لوتەر ١٤٨٣- ١٥٤٦:

لوتەر لە ئایسلبن"٩" هاتە دنیاوە (لە سایەی چاودێری باب و دایکیدا لە دنیای زوهد و تەقوادا گەورە بوو)، لە ساڵی ١٥٠٥دا لە شاری ئورفورت"١٠" بوو بە رەبەنی (راهب) دێری ئوگوستینی، و لە ساڵی ١٥٠٨دا پلەی مامۆستای زانکۆی ویتن بورگ-ی وەرگرت، دوای سێ ساڵ سەردانی رۆمی کرد، و لەم شارەدا بێ سەروبەری و گەندەڵی روحانییەکان زۆریان نارەحەت کرد. لە ساڵی ١٥١٧دا فرۆشتنی چەکی غوفران بە هەر کڕیارێك کە داوای کردبا، وای لێکرد بۆچوونەکانی خۆی لەو بارەیەوە، بەسەر دەرگای کلێسای گەورەی وتین بورگدا هەڵواسێ. لوتەر لە ساڵی ١٥٢٠دا بەیاننامەکەی پاپای (کە هەڕەشەی تەکفیر بوو لە لوتەر) بە بەرچاوی خەڵکییەوە سوتاند، و لەسەر ئەم کارە داوا کرا بۆ ئەنجوومەنی باڵای ئایینی لەورمس"١١"، تا بەرەڤانی لەو کردەوەیەی خۆی بکات، بەرەڤانییەکانی رەفزکران، لوتەرش ئامادە نەبوو دەستبەرداری بیروبۆچوونەکانی خۆی ببێ، (و رایگەیاند کە ناتوانێ بڕیارەکانی پاپا و ئەنجوومەنانی ئایینی بەهۆی هەڵە زەقەکانیانەوە، قەبوڵ بکات). لە ئەنجامدا بە یاخییان لە قەڵەمدا، دۆستەکانی لە کۆشکی وارتبورگ. لە تورینگیادا شاردیانەوە. لوتەر لەوێندەر دەستی بە وەرگێڕانی ئینجیل لە دەقە یونانییەکەوە بۆ سەر زمانی ئەڵمانی کرد. پاشان ملانشتون"١٢"-ی دۆستی نزیکی یارمەتیدا. لوتەر لە ساڵی ١٥٢٥دا وازی لە دێرنشینی هێنا و لەگەڵ کاترینافون بورا-ی کۆنە رەبەندا زەماوەندی کرد.دوای پێنج ساڵ ئەو و موریدەکانی بنەمای باوەڕی خۆیان لە باوەڕنامەی ئوگسبورگدا بڵاوکردەوە، و لە ساڵی ١٥٣٧دا کۆنفراسێکیان پێك هێنا، کە لەو کۆنفرانسەدا لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە هەموو پەیوەندییەکی خۆیان لەگەڵ کلێسای کاتولیکدا بڕن، لوتەر لە مەوتەن و زێدی خۆی کۆچی دوایی کرد. تەبیعەتی لوتەر ئاوێتەیەك بوو لە رەقی و لە نەرمی. هەندێ جار توند و هەڵچوو بوو، هەندێ جاریش میهرەبان و دڵسۆز، هەمیشە کەسێکی بوێر و راستگۆ بوو و لە هەقانیەتی راپەڕین و بزووتنەوەکەی خۆی دڵنیا بوو.

وەرگێڕانی کتێبی موقەدەس (ئینجیل- ١٥٢٢، تەورات- ١٥٣٤):

وەرگێڕانەکەی لوتەر، یەکەمین وەرگێڕانی ئەڵمانیی کتێبی موقەدەس نەبوو، بەڵام وەرگێڕانەکانی پێشووتر هەموویان لەسەر دەقی لاتینی ولگات بوو. لوتەر دەقی ئەسڵی عیبری

و یونانی، کە رویشلین و ئیراسموس ئامادەیان کردبوو، بۆ وەرگێڕانەکەی خۆی هەڵبژارد. ئەو زمانی فەرمی ساکسونی، کە لە مایسندا قسەی پێ دەکرا، و بەبۆچوونی وی باوترین زمانی ئەڵمانی بوو، کرد بە بناغەی وەرگێڕانەکەی خۆی. بەڵام لوتەر ئەم زمانەی لەکۆت و بەندی وشکی رزگاری کرد، هەوڵیدا خۆی لە فیشاڵبازی و فەزلفرۆشی دوور بگرێ و بە ئانقەست زاراوە و وشەباوەکانی سەرزاری جەماوەری مەردمی بەکارهێنا، وەرگێڕانەکەی لوتەر "لەڕووی پابەندی بەدەقە ئەسلییەکەوە مایەی ستایشە، لەڕووی قوڵی و دەوڵەمەندی چەمکەوە، لەڕووی راشکاوییەوە، لەڕووی بەکار هێنانی وشەی دروست لە شوێنی دروستدا بێ هاوتایە".

ئەم وەرگێڕانە زۆر زوو لە سەرانسەری ئەڵمانیادا پەسندکرا و بوو بەو تاقە کتێبەی کە نەوە یەك لە دوای یەکەکانی ئەڵمان لەماڵەوە دەیانخوێندەوە... زمانی کتێبەکەی لوتەر (کتێبی پیرۆز) بوو بە زمانی هەموو میللەتی ئەڵمان. لەم رووەوە دەتوانرێ لوتەر بە دامەزرێنەری زمانی ئەدەبیی ئەڵمانی باڵای تازە ناو ببرێ، دەسەڵاتی کتێبی پیرۆزی لوتەر بەسەر ئەدەبیاتی ئەڵمانیدا وەکو دەسەڵات و کاریگەری کتێبی پیرۆزی کینگ جیمزە بەسەر ئەدەبیاتی ئینگلیزییەوە، و وا دیارە لەوەیە لەوش زیاتر بووە.

پەخشانی رەسەن:

لوتەر، سەرباری وەرگێڕانی کتێبی موقەدەس بۆ ئەڵمانی، زۆر نووسینی دیکەشی، بە زمانێکی پەخشانی رەسەن، هەیە. زۆربەی ئەم نووسین و بەرهەمانە بریتین لە گوتاری دیالیکتیکی و جەدەلی، نامە، مەوعیزە و نامەکانی خۆی، نامە و گفتوگۆ و دەمەتەقێیەکانی لوتەر رەنگدانەوەی ئاشتیخوازی، نەرمی و شۆخ تەبعی ئەون. سێ نووسینی گرنگی لوتەر کە لەمەڕ ئیلاهییات و خواناسیدا بایەخی مێژووییان هەیە، بریتین لە: بۆ ئەشرافانی مەسیحی میللەتی ئەڵمان، کڵێسا لە ئەسارەتی بابلییەکاندا، و دەربارەی ئازادی مەسیحییەت (ئەم سێ بەرهەمە لە ساڵی ١٥٢٠دا بڵاوبوونەتەوە). لوتەر لە نامەیەکیدا لە ژێر سەر اوی بە ئەندامانی ئەنجوومەنانی هەموو شارەکانی ئەڵمان دەڵێم کە دەبێ قوتابخانانی مەسیحی دابمەزرێنن و پارێزگارییان لێ بکەن (١٥٢٤) کە داکۆکی لە فێربوونی ئیجباری لە سەرانسەری ئەڵماندا دەکات.

سروودێن پاڕانەوە:

گرنگترین خزمەتی لوتەر بە ئەدەبیات و هەروەها بە ئایینی پروتستان کۆمەڵە سروودێکی پاڕانەوەیە کە ژمارەیان سی و حەوت سرووده. هەندێ لەم سروودانە جوان و رەسەنن، و ئەوانیتر بە وەرگێڕانی ئازاد لە سروودە ئایینییە لاتینییەکان و لە مزمارەکانەوە دەژمێردرێن.

سروودە هەرە بەناوبانگەکانی ئەم کۆمەڵەیە بریتین لە: قەڵای مەزن، سروودی خەبات لە پێناوی ریفۆرمی ئایینیدا، وەرە، روحی موقەدەس، ئەی عیسا مەسیح، و ئێمە لە ناوجەرگەی ژیانداین.

## هانس ساکس

هانس ساکس ١٤٩٤- ١٥٧٦:

کوڕی بابایەکی خەیات بوو، و لە نورنبرگ لەدایکبوو، بە منداڵی چووە قوتابخانەیەکی لاتینی، و لە ساڵی ١٥٠٩دا بوو بە شاگردی پینەدۆز. لە هەمان ساڵدا دەستی بە فێربوونی گۆرانی وەستایان "مایستر سونگ" کرد. لە ساڵانی ١٥١٢- ١٥١٧ وەکو پینەدۆزی گەرۆك بە سەرانسەری ئەڵمانیادا گەڕا. کە بۆ مەوتەن و زێدی خۆی گەڕایەوە ژنی هێنا، بوو بە یەکێك لە پێنەدۆزانی بەناوبانگ، و ژیانێکی درێژ و، بێ بویەر و خۆشی دەست پێکرد کە تەنیا لە رۆژگاری پیریدا بە مردنی هاوسەرەکەی و هەر حەوت مناڵەکەی خەمبار بوو. ساکس بە شادگوزەرانی، میهرەبانی و جوامێری بەنێوبانگە.

بەرهەمەکانی:

ساکس نووسەرێکی گەلەك بە بەرهەم بوو. پتر لە شەش هەزار بەیتە شیعری گوتوو و زێدەتر لە دوو سەد شانۆنامەی نووسی.

شیعرەکانی:

زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی ساکس کورتن (چوار بەندین) و قافیەدارن، پتر لە چوار هەزار بەیتە شیعری وی لە جۆری شیعری گۆرانین (مایستر سانگ)و لەبەر ئەمە دەستکرد و کەم بایەخن، شیعرەکانی دیکەی بایەخی پتری هەن.

ئەم جۆرە شیعرانە نێوەرۆکی هەمە جۆریان هەیە. لە هەندێکیاندا سەرسەختانە بەرەڤانی لە راپەڕینی ریفۆرمی ئایینی دەکات. بەناوبانگترینیان (بلبلی ویتن بورگ)ـە، کە هۆزانێکی مەجازییە، کە لەوێدا بلبل (کینایەیە لە لوتەر) پەزانی گوم بوو لە بیابانەدا بەرەو چیمەن و سەوزەزارێکی خۆش داژوێ... شیعرەکانی دیکەی وی، کە زۆریان لە شێوەی پەند و قسەی نەستەق و کورت دان، حەنەکبازی نەرم، ناوەزی ساغڵەم، نەرم و نیانی، و ئەخلاقی راستیان لەخۆ گرتووە.

شانۆنامەکانی:

ساکس پتر بە شانۆنامەکانی بەناوبانگە، کە ژمارەیەکیان هێشتاش هەر نمایش دەکرێن. ئەو توانای خۆی لە شانۆنامانی کتێبی موقەدەس، شانۆنامانی مێژوویی، و تراجیدیا، کە زۆر تیایا سەرکەوتوو نەبوو، تاقی کردەوە. وەستایی وی لەم جۆرە شانۆنامانەی خوارەوەدایە.

شانۆنامانی "۱۳" توانج:

هەندێ لە بەرهەمە شانۆییەکانی ساکس لە راستیدا گفتوگۆی کورت، نوکتەدار، و تەقریبەن بێ پلۆتن. باشترین کاری وی لەم زەمینەدایە (سان پیتر وبز)ە. لەم پلۆتەدا، بوترسی یاوەر بە دیتنی بێدادی و زۆرداری رۆژانە لەسەر رووی زەوی، داوا لە خوا دەکات کە بۆ سەر زەویی بنێرێ تا زۆرداری لە ریشە دەربێنێ. داواکەی قەبووڵ دەکرێ، دێت بۆ سەر زەوی، و کارەکەی خۆی بەرامکردنی بزنێکی سەرکێش دەست پێدەکات. ئەم ئەرکە هێندە دژوار دەنوێنێ کە پتروس چاوپۆشی لە هەموو ئامانجەکەی خۆی دەکات.

شانۆنامانی سێ رۆژ بەر لە چوارشەممەی تۆبە:

ساکس لە داهێنانی سکێچ و پلۆتانی کورتی ناوەرۆك نامەزهەبیدا، پێشینانی کرد، بە سەرمەشقی خۆی. بەرهەمەکانی وی لەم زەمینەیەدا، هەر چەند تا ئەندازەیەك ناوێتەی زبرین، لە زۆربەی شانۆنامەکانی دیکەی ئەم جۆرە بە ئەدەبانەترن، ئەم شانۆنامانە گفتوگۆی زیندوو حەنەکدار، کاراکتەرسازی ریالیستیانە، و پلۆتی تاراددیەك سادەیان هەیە. "تاسنی داغ" یەکێکە لە باشترینی ئەم بەرهەمانە، کە لەوێدا هاوسەرێك بۆ دڵنیا بوون لە وەفاداری و پابەندی مێردەکەی، داوای لێ دەکات کە پارچە ئاسنێکی داغ لە دەستیا بگرێ. پیاوە بە پەنهانی دەستی بە ماددەیەکی مانعی گەرمی دەپۆشێت، و ئەوجا ژنەکەی لە ئامێز دەگرێ و داوای هەمان ئەزموونی لێدەکات.

هەڵسەنگاندن:

ساکس وێڕای ئەوەی کە لە سەردەمی خۆیدا خۆشەویستی ناوبانگی پەیدا کرد، لە سەدەکانی هەڤدەیەم و هەژدەیەمدا بە تەواوەتی لە بیرچووەوە، لێ گوتە دووبارە کەشفی کردەوە و لە گوتارێکدا لە ژێر سەرناوی "پەیامی شیعری هانس ساکس"دا جارێکی دی سەرنجی جیهانی بۆ لای وی راکێشا، و ڤاگنەر بە ئۆپرای (مامۆستای مایستر سینگری نورنبرگ) جاویدانی کرد. ئەمڕۆکە ساکس نە ئەوەندە لەبەر خاتری توانای هونەری وی، بەڵکو لەبەر ئاوەزی ساغڵەم، شۆخ تەبعی هەمیشەیی، زیرەکی، و وەسفی بایەخداری ژیانی خەڵکی ئەڵمان لە سەدەی شازدەیەمدا ستایش دەکەن.

# ژێدەران:

١- ریفۆرمی ئایینی- Reformation:

شۆڕشی ئایینی لە ئەورووپای رۆژئاوایی، لە سەدەی شانزەی زایینیدا کە وەکو راپەڕینێك بە مەبەستی ریفورمی مەزهەبی کاتولیك دەستی پێکرد و بە راپەڕینی پروتستان شکایەوە.

٢- باوەڕنامەی ئوگسبورگ:

پرەنسیپەکانی باوەڕی لوتەرە، کە لە ساڵی ١٥٣٠دا لە ئەنجوومەنی شورای ئوگسبورگدا (شارێکە لە رۆژئاوای باڤاریا) پەسند کرا.

٣- ماستەر سونگ- Master Song:

گۆرانی ئەڤینداری کە لە سەدەی دوانزەوە تا سەدەی چواردەی زایینی لە ئەڵمانیادا برەوی سەند و بوو بە باو، و رەنگدانەوەی ئەشق و ڤیانی بەرز و ناسك و پابەندی داب و نەریت بوو.

٤- گەورە شایەر- Mastersinger:

گەورە شایەران بە دەستەیەك لە شاعیرانی لیریکی و مۆسیقازانانی ئەڵمانی لە سەدەی پانزە و شانزەیەم دەگوترێ کە زیاتر پیشەوەر و خاوەن پیشە بوون و لە شیعرەکانیاندا یاسا و رێسایەکی تایبەتییان پەیڕەو دەکرد، ئەوانە هەوڵیاندەدا کە گیانێکی تازە بە گۆرانی ڤیانی میللی ئەڵمان کە لە حاڵی بیرچوونەوەدا بوو، ببەخشن، گۆرانی و بەرهەمەکانی ئەم شاعیرانە بە "گۆرانی وەستایان- Meistersang" بەناوبانگە.. واتە گەورە شاعیران..

٥- کامبری: شارێکە لە باکووری فەرەنسا.

٦- کولت (١٤٦٦- ١٥١٩):

زانا و حەکیمێکی ئیلاهی ئینگلیزە.

٧- گروسین (١٤٤٦- ١٥١٩):

زانایەکی یونانیناسی ئینگلیزە.

٨- بازل: ویلایەتێکی باکووری سویسرایە، هاو سنوورە لەگەڵ فەڕەنسا و ئەڵمانی.

٩- ئایسلبن: شارێکە لە ئەڵمانیای ناوەندی.

١٠- نورفورت: شارێکە لە ڕۆژهەڵاتی ئەڵمان.

١١- ورمس: شارێکە لە ڕۆژئاوای ئەڵمان.

١٢- ملانشتون (١٤٩٧- ١٥٦٠):

زانا و ریفورمیستێکی ئایینی ئەڵمانییە.

١٣- شانۆنامانی توانج- Skit:

بەیتێك یان شانۆنامەیەکە کە پەیڕەوی تەقلیدێکی هەجونامێز و کاریکاتۆرئاسا دەربارەی یەك کەس یا شێواز و یا بابەتێکی تایبەتی دەکات مسکیت ئەگەر هاومانای هاو وێنەسازی و بورلسك نەبێ، بەلای کەمەوە زۆر لێوەی نزیکە.

# ئەدەبیاتی ئەڵمان
# لە
# سەدەی حەڤدەیەمدا

پێشینەیەکی مێژوویی:

تاقە رووداوی گرنگی مێژوویی ئەڵمان لە سەدەی هەڤدەدا جەنگی سی ساڵە (١٦١٨-١٦٤٨) بوو. ئەم جەنگە لە ئەنجامی هەوڵی بنەماڵەی هاپسبورگ بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینی پروتستان روویدا، پروتستانەکان بە کۆمەکی دانیماریك، سوید و فەرەنسا جارێکی دی ئازادی ئەنجامدانی رێوڕەسمی مەزهەبی خۆیان بەدەست هێنایەوە. بەڵام ئەم ئازادییە گران کەوت، ئەڵمان بەجۆرێ وێران بوونی تێ کەوت، و لە دانیشتووانەکانی چۆڵ بوو (نزیکەی دوو سێیەکی خەڵکەکە تیاچوون) کە تەقریبەن تا یەك سەدە نەیتوانی پشت راست بکاتەوە.

نۆڕینێکی گشتی:

ئاژاوە، پەشێوی و ئائارامی، و گەندەڵی ئەخلاقی و ئایینی، کە بەرەنجامی جەنگ بوو، بە تەبیعەت کارێکی یەجگار ناخۆشی بەسەر ئەدەبیاتەوە هەبوو. لە یەکەمین ساڵانی جەنگدا گەلێك لە نووسەران بۆ رازاندنەوەی نووسینەکانی خۆیان بەلای بەکارهێنانی وشە و پەیڤی زمانانی دیکەدا، بەتایبەتی وشەی فەرەنسی، دایانکێشا. لە هەمان کاتدا کۆمەڵە و ئەنجوومەنانێك بۆ دژایەتی ئەم رێبازە هاتنە ئاراوە و، پاککردنەوەی زمانی ئەڵمانییان لە وشەی بێگانە کردە خەمی خۆ، گەلێك لە شاعیران پاکسازی زمانیان لە ئەستۆ گرت، بەڵام رووبەڕووی کاردانەوەی قەبوول کردن و رەفزکردن بوونەوە. ئەم سەدەیە سەبارەت بە ئەدەبیات

وشك و قسر بوو، تەنیا هەندێ شیعری مەزهەبی، شانۆنامان، و پەخشانە چیرۆكی ناچیز هاتنە نووسین، یەكێك لەوانە یاكوب بومە (١٥٧٥- ١٦٢٤) بوو كە هەندێ بەرهەمی سۆفیانەی بە پەخشان نووسی كە كاری كردە سەر میلتن و ویلیام بلیك.

## هۆزان

یەكێك لە بە دەسەڵاتترین پاكسازانی بە زمان مارتین ئوپتیس (١٥٩٧- ١٦٣٩)ی شاعیر و رەخنەگر بوو، كە بە پێچەوانەی بیروبۆچوونی باوەوە، زۆر بە توندی كەوتە هێرشكردنە سەر بەكارهێنانی وشە و زاراوەی فەرەنسی، و بەرەڤانی لە زمانی خۆماڵی، بەڵام لە هەمان حاڵدا پشتیوانی لەلاسایی كردنەوەی نووسەرانی سەردەمی رێنیسانسی ئیتاڵیا دەكرد، بەجۆرە ئەو سەرەتایەی كردەوە كە بە (نیمچە رێنیسانسی ئەڵمان) بەناوبانگە، ئوپتیس لە بەرهەمێكیدا بە ناوی (كتێبی هۆزانی ئەڵمانی)، جەخت لەسەر سوود وەرگرتن لە ئاماژەێن كلاسیك و مێژووین "بە دووی یەكدا هاتنی سیلابی كورت و درێژ لە شیعرا"، و هەروەها بەیتی دوازدە سیلابی دەكاتەوە. بەرهەمەكانی ئوپتیس و پەیڕەوكارانی بەتایبەتی فریدریش ڤن لوگو (١٦٠٤- ١٦٥٥)و پاول فلمینگ (١٦٠٩- ١٦٤٠)، لەڕووی زمانەوە دروستن، بەڵام دەستكرد و بێ هەستن.

رازانەوەكاری نەزۆك و بێ پرشنگی ئوپتیس لە ئەنجامدا بە پێچەوانەوە شكایەوە. و شاعیرانی وەكو هوفمان ڤون هوفمانسوالدو (١٦١٧- ١٦٧٩)و كاسپرڤن لوهنشتاین (١٦٣٥- ١٦٨٣) بەلای ئەدەبیاتی (باروك)دا، واتە لاسایی كردنەوەی مارنییزمی ئیتاڵیایدا —سنعەت و هونەری جوانكاری زیاد، موبالەغەكاری، زمانبازی، و فەزڵفرۆشی و خۆهەڵكێشاندا، دایانكێشا. ئەم كاردانەوەیە كریستین ویزە (١٦٤٢- ١٧٠٨)و چەند شاعیرێكی دیكەی بەرەو ئەو كلاسیك پاڵدا، كە مەبەستی ئەو سادەیی و ناسكی تەبع و تەبیعەت بوو.

رەنگە گەورەترین كۆمەكێك كە لە ماوەی سەدەی هەڤدەیەمدا بە هۆزانی ئەڵمانی كرابێ، لە دەرێی قەڵەمڕەوی ئەم بزووتنەوەیەو بزووتنەوانی پێچەوانەدا بووبێ. پاول گرهارد(١٦٠٧- ١٦٧٦)، كە لە شیعری مەزهەبیدا لە پلەی دوای لوتەرەوە بوو، ژمارەیەكی زۆری شیعری سروودی ئایینی جوانی دانا، بەناوبانگترینیان بریتین لە: "چۆن ئاوێتەی تۆ دەبم"، "ئەی دڵ، رابە و بخوێنە"، "ئێستا هەموو بێشەكان لە ئارامی دان".

## شانۆنامە

**ئاندریاس گریفیوس (١٦١٦- ١٦٦٤):**

گریفیوس لە شیعری لیریکی، تراجیدی، و کۆمیدیدا دەستێکی باڵای هەبوو. هەندێ لە شیعرە لیریکییەکانی لەسەر شێوەی ئوپیتیس دانراون، بەڵام ئەوانی دیکەی قوڵتر، شەخسی تر و هزرڤانانەترن. شیعرەکانی دوایی زیاتر تانەئامێز و گومانـاوی، و دەربڕ و ڕەنگدانەوەی نائومێدی لەم دنیا و ئومێدەوار بوون بەو دنیان.

تراجیدیاکانی گریفیوس، کە لە قاڵبی هۆزانێن دوانزە سیلابی پڕناو و تاودا دانراون، ئەوە نیشاندەدەن کە شارەزاییەکی ئەوتۆی لە تەکنیکی درامی دا نییە، ئەم تراجیدیانە نە جوڵەیەکیان تێدایە و نە حاڵەتی مۆلەق چاوەڕوانی دەخولقێنن، و بە زۆری حاڵەتی ترس جێگەی تراجیدیای واقیعی دەگرێتەوە. لیونارمینیوس- ١٦٤٦ چیرۆکی پیلانێکی سەرکوتووانەی کەنارخستن و کوشتنی ئیمپراتۆرێکی گەورە دەگێڕێتەوە. کاردنیۆو سلیندە- ١٦٤٧ کە لەوەیە یەکەمین "تراجیدی بۆرژوازی" بێ، چیرۆکی قوتابییەکی زانکۆیی پۆلۆنیاییە کە هەڕەشەی کوشتن لە مێردی ماشوقەکەی دەکات، بەڵام هێزی موعجیزەیی و ناناسایی ڕێگە لە ڕوودانی تاوانەکە دەگرن. کاترینی گورجی (١٦٤٧)، تراجیدیای شابانۆیەکی لاساری بێ باکە کە مردنی پێ چاترە لە وازهێنان لە بیروباوەڕ. چارلز ستوارت- ١٦٤٩، دەربارەی مەحکوم کردنی ئینگلیزەکانە سەبارەت بە ئیعدامی چارلزی یەکەم. و پاپیانوس- ١٦٥٩، تراجیدیایەکی دیکە دەربارەی شەهیدێك.

کۆمیدیاکانی گریفیوس باشترن. لە کۆمیدیای هوریبیلی کریبری فاکسدا (دەوروبەری ١٦٥٠)، نەك هەر سەربازی فیشاڵبازی ترسنۆك (کە نووسەر نموونەی وی لە جەنگی سی ساڵەدا دیتووە) کەشف و ریسوا دەکات، بەڵکو گاڵتە بە خۆهەڵکیشان لە زمانیشدا دەکات. ئاغای پیتر سکوینز- ١٦٦٣ گێڕانەوەیەکی تری چیرۆکی پوراموس و تیسبەیە "١"، کە ئیلهامی لە گێڕانەوە ئەڵمانی و ئینگلیزییەکەی (خەونێن نیوە شەوی هاوین)ی شەکسپیر وەرگرتووە.

(سۆرگولی مەحبوب لە داوێنی دڕواندا- ١٦٦٠) شانۆنامەیەکی جوان و دلگرە لەمەڕ ڤیانی نێوان گوندییاندا، کە بەباشترین کۆمیدیای بەر لە لیسنگ دەژمێردرێ.

## رۆمان

<u>هانس یاکوب کریستوفل ڤۆن گریملس هاوزن (١٦٢٥-١٦٧٦):</u>

هاوزن تەنها بەرهەمی کلاسیکی پەخشانی سەدەی هەڤدەیەم و مەزنترین کتێبی ئەدەبی سەردەمی خۆی (سیمپلی سیسموس- ١٦٦٩)ی نووسی. ئەم چیرۆکە پیکارسکییە شەرحی ژیانی شترنفلس فوخشایم-ی زڕکوڕی جووتیارێکە. بە دەستی دەستەیەکی سوپایی لە مەزرای گوندی راودەنرێ و پەنا وەبەر شکەفتێك دەبات. لەوێندەر لە زاهیدێکەوە تەعلیماتی ئایینی فێر دەبێ. سەربازان دەیرفێنن، فێری لیبۆکی و یالانچیەتی دەکەن و ناوی دەنەن سیمپلی سیسیموس. ئاقیبەت روو دەکاتە دزی، گەنجینەیەکی نهێنی دەدۆزێتەوە، کیژێك فریو دەدات و ناچار زەماوەندی لەگەڵ دەکات، پاشان کیژە بەجێدێڵێ، دەچێتە سەر ئایینی کاتولیك، و لە پاش کۆمەڵێك سەربور و بەسەرهاتی دی بۆ لای زاهیدەکە (کە دەزانێ باوکی خۆیەتی) دەگەڕێتەوە و ژیانێکی بە هزرین و لێکدانەوە دەگرێتەبەر.

سیمپلی سیسیموس، وێڕای هەندێ پارچەی درێژ و تاقەتبەر، بە گشتی چیرۆکێکی سەرگەرمکەرە کە زۆر وێنەی واقیعیانە دەربارەی بێ رەحمی و قەساوەتی جەنگ، خوو خدەی دەربەدەران، زبری کۆمەڵگەی گەندەڵ و داب و نەریت و خورافات و پڕوپوچی خەڵکی نیشان دەدات.

# پەراوێزان:

١- پوراموس و تیسبە: پوراموس و تیسبە لە ئەفسانانی کلاسیکدا، کوڕ و کیژێکی خەڵکی بابل-ن، چونکە لە دیتنی یەکتریان قەدەغە کردبوون، لە درزی دیواری باخێکەوە قسەیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد. سەرەنجام قەراریان بەست کە لە کەناری گۆڕێکدا یەکدی بدینن، تیسبە کە لە پێشا گەییە ژوانگە لەترسی شێرێکی زار بە خوێن، جلەکانی خۆی داکەن و هەڵات، پوراموس کە چەند دەقەیەك دواتر گەیی، جلە خوێناوییەکانی بەدەمی شێرەکەوە بینی، و وایزانی کە تیسبە کوژراوە، خۆی کوشت، تیسبە کە پاش گەڕانەوە دڵدارەکەی خۆی بە کوژراوی بینی، خۆی کوشت.

# ئەدەبیاتی ئەڵمان
# لە
# سەدەی هەژدەیەمدا

سەرەتایەکی مێژوویی:

سەدەی هەژدەیەم سەردەمی شکۆی سیاسی و کەلتووری ئەڵمان بوو. وێڕای ئەوەی کە ئەم وڵاتە هێشتا بە فیدراسیونێکی نایەکسان لە چەند ویلایەتێکی کەم دابێژ سەربەخۆ دەژمێردرا، پروس بەرە بەرە وەکو دەسەڵات و هێزێکی باڵاتر سەری دەردێنا، و تیشکێك لە هۆشیاری نەتەوەیی هەڵدەهات. لە جەنگی حەوت"١" ساڵەدا (١٧٥٦- ١٧٦٣) رابەری دیار فردریکی دووەم"٢"، کارێکی وەهای دا پروس کە پشتیوانی سەربازانی هانوفر و کۆمەکی دارایی ئینگلیزی هەبوو، بتوانێ لەبەرانبەر سوپایانی فەرەنسا، نەمسا، و روسیادا بەرەڤانی بکات.

لە ئەڵمانیادا، وەکو زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای رۆژئاوایی، ناوەزگەرایی و "خواپەرستی" (دیزم) لایەنگرانی زۆری پەیدا کرد. ئەم سیستەمە عەقیدەتییانە هەوەڵجار رووبەرووی مخالەفەت و نارەزایی پیتیزم"٣" و پاشان رووبەرووی باوەڕێن فەلسەفی، پەروەردەیی، و رامیاری رۆسۆ بوونەوە، تیۆری و بۆچوونەکانی دیدرو و رۆسۆ دەربارەی حکوومەتی میللی، مافی مرۆڤ، و خۆیبوونی تاك، کە لە دروستبوونی شۆڕشەکانی فەرەنسا و ئەمریکادا رۆڵێکی کاریگەرییان بوو، لە ئەڵماندا لەرووی سیاسییەوە تەکان و وەرچەرخانێکیان دروست نەکرد -رەنگە لەبەر ئەمە بووبێ کە لەم دەڤەرەدا حکوومەتێکی ناوەندی لەسەر کار نەبوو تا خەبات و شۆڕشێك دژی بەرپا بێ و لە لایەکی ترەوە قارەمانانی نەتەوەیی، جوزیفی"٤" دووەم، و فردریکی گەورە،

بە هەوڵ و کۆششی فراوانی خۆیان لـە پێنـاوی چـاککردنی وەزع و حـاڵی خـەڵکی ئاسـاییدا، باوەڕی خەڵکیان بە حکوومەتی پاشایەتی بەهێز کرد.

لە قەڵەمڕەوی کۆمەڵایەتی و هزریدا، رۆسویزم"٥" کە ئاوەزگەرایی خستبووە بەر سـێبەر و شاردبوویەوە، خێرایی بە پێشڤەچوونی بزووتنەوەی خۆماڵی ناسراو بە (تۆفان و یـاخی"٦" بـوون) بەخشی، ریفۆرمی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی بەخشینی گیـانێکی تـازە بـە ئـەدەبیات لـە جوملەی ئامانجەکانی ئەم بزووتنەوەیە بوون ، بە هـەر حـاڵ "خۆبیبـوونی رامیـاری، یەکـسانی کۆمـەڵایەتی، ستایشی تەبیعەتی سـەرەتایی، بلیمـەتی، داهێنـانی شـاعیرانەی دوور لـە هـەر رەچاوکردن و پابەندییەك بەدابە تەقلیدییـەکانی هونـەرەوە ـبـەکورتی ئـازادی تـەواوی تـاك، ئارمانج و مەبەستی نەوەی نوێی ئەڵمان بوو".

دەروونگەرایی و بێ سەروبەری بزووتنەوەی " تۆفان و یاخی بوون" رووبەڕووی مخالەفـەت و ناڕەزایی عەمانوئیل کانت (١٧٢٤- ١٨٠٤) کە یـەکێك بـوو لـە گـەورەترین فەیلەسـووفانی جیهان، بووەوە. ئەو باوەڕی وابوو کە ئاوەز و لوجیـك و زەروورەت وا دەخـوازێ کـە ئیختیـار و ویستی ئازاد، جاویدانی، و بوونی خوا بە سەرچاوەی خێـر و جـوانی بـەدیهی و بەڵگەنەویـست بزانین، (کانت باوەڕی وابوو، ویستی خێر و چاکە بریتییە لە پەیڕەوی کردنـی ئـەرك و ویـژدانی ئەخلاقی، چونکە ئەرك و مەسئولیەت مرۆڤ ناچار دەکات بێ قەید و شەرت پەیڕەوی بکات، و تەنیا بە پەیڕەوکردنی ئەرك و ویژدان ویستی چاکەی رەها دێتە دی. چـونکە ئـەمرو فـەرمانی ئەرك "ئەمری موتڵەق"ە، یەك یاسا یان دەستووری ئەخلاقی لێدەبێتەوە، و ئەویش ئەمەیە کە بە جۆرێ کار بکە کە بتەوێ دەستووری کاری تۆ لە هەر شوێن و لە هەر زەمانێکدا بۆ هـەموو کەسێك یاسا و دەستوورێکی گشتی بێ).

نۆرینێکی گشتی:

لە ماوەی ساڵانی ١٧٠٠و ١٧٥٠دا بەرهەمێکی شایستە و بەرچاو لە ئەدەبیاتی ئەڵمانـدا دانـەنرا، هێـشتا دەسـەڵات و کاریگـەری ئـەدەبیاتی فەرەنـسی بـەهێزبوو، بـەڵام کاریگـەری بەرهەمێن دانەرانی ئینگلیزی، بەتایبەتی شەکسپیر، میلتن، دیفو، ئەدیسن، تومـسن، سـترن، وەك فرسن، بەرە بەرە لە ئەدەبی ئەڵمانیدا زیادی دەکرد و پەرەی دەسەند.

لەدەورووبەری ساڵی ١٧٢٥دا ، یۆهان کریستوف گوتشد (١٧٠٠- ١٧٦٦) کە پـەی بـە حاڵەتی ئەزۆکیی ئەدەبیاتی ئەڵمانی برد، کەوتـە چـاککردنی ، جـەختی لەسـەر وەرگـرتنی هەموو یاساکانی ئـەو کلاسیـسزمی فەرەنـسی و پـەیڕەو کردنـی نموونـەکانی نەوکلاسـیکی

فەرەنسی و ئینگلیزی کرد، "مشت ومالدانی ئەخلاق"، ناوەزی ساغلەم، و روونی و رەوانی دووپـات کـردەوە و تەقریبـەن وەکـو هـەموو ئـەو کلاسـیکەکان، رووی لـە سـۆزپەروەری و خەیاڵپریسی وەرگێڕا.

رەنگە ریفۆرمەکانی گوتشد درەنگ دەستی پاشایەدا پێکرد بێ، تەبیعەتی خەلکی ئـەڵمان لەگەڵ ئەو کلاسیسزمدا گونجاو نەبووە. هۆیەکەی هەرچییەك بێ، ئەو کلاسیسزم هیچ کاتێ ئەو پێگەیەی کە لە فەرەنسادا هەیبوو، لەئەڵمانیادا پەیدای نەکرد، یوهان یاکوب بودمر (١٦٩٨-١٧٨٣)و یوهانیاکوب برایتینگر (١٧٠١- ١٧٧٦) رەخنەگرانی سویسری، هێرشیان بردە سـەر بۆچوونەکانی گوتشد و کەوتنە لایەنگری لە هەستپەروەری و خەیالگەری. لە نیـوەی یەکـەمی ئەم سەدەیەدا تەنیا چەند نووسەرێك شایەنی باسـن. ئالبرشـت ڤـون هـالر (١٧٠٨- ١٧٧٧)ی شاعیری سویسری، هەندێ هۆزانی فێرکاری و ژمارەیەك غەزەلی گوت، فریدریش ڤون هاگدورن (١٧٠٨- ١٧٥٤) کـە حیکایـەت و سـروودە شـادەکانی وی فەلـسەفەی "دەرفـەت لـەکیس مەدە"ی هۆراس و ئاناکریون وەبیر دێننەوە، و کریستیان فروشتنگت گلـرت (١٧١٥- ١٧٦٩) کە کۆمەڵێك هۆزانی مەزهەبی پڕهەست و راستگۆیانە، چەند فابیلێك لەسەر شێوەی لافونتێن، سروودێن زۆری ئایینی و پاڕانەوە، کۆمیدیای سـۆزداری و ئـەوەی یـەکێك لـە مێژوونووسـانی ئەدەبی (یەکەمین رۆمانی عاتیفی لەمـەڕ ژیـانی خانـەوادەیی لـە ئـەڵمانیا)ی ناونـاوە، واتـە کونتیسی سوێدی ١٧٤٧- ١٧٤٨ نووسی کە یەکێك لە مێژوونووسانی ئەدەبی ئەم بەرهەمـەی بە "یەکەمین رۆمانی سۆزداری رۆنرا و لە سەر ژیانی خانەوادەی لە ئەڵمانیا" داناوە.

ئـەدەبیاتی ئـەڵمان، بـە هـۆی ئیلـهامگیری لـە کـرداری فردریکـی دووەم (پیتیـزم)، و تیۆرییەکانی رۆسۆ، لە ناوەڕاستی ئەم سەدەیەدا وردە وردە بوژایەوە و ژیانێکی تازەی تێگـەڕا، بزووتنەوەی " تۆفان و یـاخی بـوون"، کـە لـە دەوروبـەری سـاڵی ١٧٤٨دا دەسـتی پێکـرد، فاکتەرێکی کاریگەری ئەم بوژانەوە ئەدەبییە بوو. بـەمجۆرە، قۆنـاغی گەشـانەوەی یـەك سـەد ساڵەی چالاکی ئەدەبی، کە لە سەدەکانی ناڤین بە دواوە بێ وێنە بوو، دەستی پێکرد.

ئەو کەسەی کە بەهێزترین کاریگەری ئەدەبیی بەسەر بزووتنەوەی " تۆفان و یاخی بوون" و بەسـەر ئـەدەبیاتی رۆمـانتیکی ئەڵمانییـەوە بـوو، یوهـان گوتفریـد هـردر بـوو "بڕوانـە لاپەڕەکانی دواتر"، کە وەکو قارەمانی سۆز "سروشتی" کەوتە هێرش کردن بۆ سـەر ئـاوەز گەرایی، دا بە ئەدەبییەکان، رێسا مجەرەدەکان و، ئەو سـنعەتکاری و دەسـتکردییەی بەسـەر ئەو کلاسیسزمدا زاڵ بوو.

بەهەرمەکانی هەوڵی بزووتنەوەی "تۆفان و یاخی بوون" یەجگار توندڕەوانە و لە هەر یاسا و ڕێسایەك بەدەر بوون، بەڵام یەکسەر دوای ئەوە بەرهەمی وەك دەڵێن "کلاسیك"ی لسینگ، گوتە، و شیلەر هاتە نووسین، لە ماوەی ساڵانی ١٧٨٠- ١٨٣٠ گەورەترین شاکارێن ئەڵمانی هاتە ئاراوە، ئەم بەرهەمانە بە زۆری لە مەیدانی ڕۆمان، شانۆنامە، و هۆزانی لیریکی و مەلحەمیدا بوون.

## ڕۆمان

لە ساڵانی پێش ١٧٠٠دا چەند پەخشانە چیرۆکێکی درێژ لە ئەڵمانیدا نووسرا بوون کە دەکرێ لە ڕیزی ڕۆماندا سەیر بکرێن، یورگ ویکرام، فیلیپ ڤون تسیزن (١٦١٩- ١٦٨٩)، و نووسەرانی دیکە چەند چیرۆکێکی ڕۆمانتیکیان دەربارەی سوارچاکان، ڕۆژهەلات، و قارەمانان بلاوکردەوە، تسیزن ڕۆمانی (ڕۆزاموندی نادریاتیك- ١٦٤٥) نووسی، کە ڕۆمانێکی سایکولۆژییە دەربارەی ژیانی خانەوادەیی لە سەدەی هەڤدەیەمدا، بەلام تاقەتبەر و پێچەوانەی حەقیقەتەکانی ژیانە. کریستین رویتر (لەدایکبووی ١٦٤٥)و چەند کەسێکی دیکە هەندێ بەرهەمی کۆمیدی ئامێزیان بە چاولێکەری ڕۆمانانی سەرکێشی و سەفەرنامان نووسی، و گریلس هاوزن بەرهەمە بەناوبانگەکەی (سیمپلی سیسیموس)ی نووسی، لەگەڵ ئەمەشدا، دانانی یەکەمین ڕۆمان (تازە) کەوتە ئەستۆی ویلند.

<u>کریستوف مارتین ویلند ١٧٣٣- ١٨١٣:</u>

ویلند ڕۆڵەی واعیزێکی دەستکورتی خەڵکی ورتمبرگ بوو. ڕۆژانی لاوی بە خواپەرستی و زوهدی مەسیحییت بوری و لە ساڵی ١٧٥٢دا (لەسەر دەعوەتی یوهان یاکوب بودمر) بۆ زوریخ چوو. ماوەی حەوت ساڵ لەم شارەدا مایەوە، و بەرە بەرە لە خواپەرستی دوور کەوتەوە و زۆر بە خێرایی ڕوویکردە لەزەتخوازی و دنیاخوازی.

لە ساڵی ١٧٦٩دا گەییە پۆستی مامۆستایەتی زانکۆی ئورفورت. دوای سێ ساڵ بوو بە مامۆستا و موعەلیمی تایبەتی شازادە کارل ئوگوست-ی دۆکی ساکس- ویمار. لە ساڵی ١٧٧٥ بە دواوەش وازی لە کار هێنا و باقی تەمەنی خۆی لە ویمار قەتاند.

<u>ڕۆمانەکانی:</u>

"ویلند... بتەوی و بەرزی بە ڕۆمانی ئەڵمانی دەبەخشێت. لە موبالەغە و فەزلفرۆشی و فیشاڵبازی پاکی دەکاتەوە، و لە جیاتی ناوەڕۆکێن ڕەوتەنی، پرس و

مەسەلە قوڵەکانی سایکولوژی لە ڕۆماندا دەخاتەڕوو". ویلند جارێکی دی قافیەش دێنێتەوە ناو شیعری ئەڵمانی.

ئاگاتون ١٧٦٦-١٧٦٧:

بەڕای پریست، ئاگاتون "یەکەمین ڕۆمانی گرنگی سایکولوجی ئەڵمانییە. وەسفی قەناعەت بەخشی ئەم ڕۆمانە دەربارەی گۆڕانی دەروونی و نەشونمای کاراکتەر، پێوەرێکی نوێ لە ڕۆماننووسینی ئەڵماندا پیشان دەدات." ولسینگ "بە یەکەمین و تاقە ڕۆمانی دەزانێ بۆ مەژگە هزومەندەکان". قارەمانی سەرەکی چیرۆکەکە لاوێکی ئاتینییە کە کەم و زۆر وەکو خودی ویلند، لە پاکی و خواپەرستی قۆناغی لاوییەوە بەرەو نەفسپەرستی با دەداتەوە، و ئاقیبەت ئاسودەیی و ئاوەز لە ژیانی لە میانڕەویدا دەبینێتەوە.

نەفی دەکرێ، ماوەیەکی کورت لەگەڵ ژنانی باکۆس "٧" پەرستدا هاونشینی دەکات، پاشان بە دەستی دزانی دەریایی یەخسیر دەکرێ و لە ئەزمیردا بە کۆیلەیەتی دەفرۆشرێ. لەم شارەدا حەز لە دانائە دەکات، و کە پەی بە هەرزەیی دانائە دەبات وازی لێ دێنێ، ڕێگەی هەڵاتن دەگرێتە بەر، بۆ ئاتین و سیسیل دەڕوات، و ڕوو دەکاتە کارێن ترسناکی سیاسی و دەوڵەتی تا بەڵکو مانا و چەمکێك بە ژیانی خۆی بدات، بەڵام جگە لە نائومێدی چ شتێك بە دەست نایەنێ، لە ئەنجامدا بەرەو تارانت"٨" دەچێ، لەوێندەر لە (ئارخوتاس "٩")ی فەیلەسووفی فیتاغورییەوە فێردەبێ کە ڕێگەی کەماڵ و میانڕەوی بگرێتە بەر. دانائە کە دەستبەرداری هەرزەیی بووە، بۆ تارانت دێ و وا پێدەچێ کە زەماوەند لەگەڵ ئاگاتوندا دەکات، بەڵام چاوپۆشی لە لەزەتێن بەدەنی دەکات و خۆی بۆ پاکی و گەڕان بە دووی جوانیدا تەرخان دەکات.

گرونی ئەجیب زادە (١٧٧٧):

ئەم بەرهەمەش ڕۆمانێکی سایکولۆژییە، لێرەدا خەباتی ڕاستگۆیی و شەرەف دژی کەلکەڵەکانی شەهوەت و هەوەسبازی وێنە دەگیرێ. شوێنی ڕوودانی چیرۆکەکە دەرباری ئارتورشایە.

خەڵکی ئابدرا- ١٧٨٠:

ئەم ڕۆمانە هەجوویەکی گەوجێتییەکانی ژیانی ویلایەتنشینانی ئەڵمانییە، شوێنی ڕوودانی چیرۆکەکە یۆنانی کۆنە.

هۆزان:

ئەگەرچی ئەمڕۆکە ویلند بە ڕۆمانەکانی بەناوبانگە، بەڵام لە سەردەمی خۆیدا بە شاعیری بەناوبانگ بوو، و تەنانەت هەندێ لە ڕەخنەگرانی سەدەی بیستەم (ئوبرون) بە شاکاری ئەو دەژمێرن.

موزاریون- ١٧٦٨:

ویلند لەم بەیتە داستانییە پڕ پەندەدا لە هەوڵی سەلماندنی ئەم خاڵەدایە کە ئەڤینی بەدەنی دەکرێ بە کۆمەکی هەستی جوانیناسی لە خووی حەیوانی دوور بخرێتەوە. موزاریون، ژنێکی جوان و شەهوەتپەرست و هەوەسبازە، قەناعەت بە فایناس دەکات کە حەکیم-یش، وەکو "خەلکانی دیکەی ئاسایی" بە جوانیی بەدەنی دەهاڕوژێ بەلام مرۆڤی بە ئاوەز دەتوانێ رەنگدانەوەی تیشکی جوانیی ئایدیالی لە بەدەندا بدینێ.

ئوبرون- ١٧٨٠:

ویلند لەم داستانە تەنزئاسایەدا، هوان دوبوردو-ی رۆمانسی فەرەنسی سەدەکانی ناڤین لەگەڵ چیرۆکی تیتانیا- ئوبرون-ی ناو شانۆنامەی (خەونێن نیوە شەوی هاوین)ی شەکسپیردا بەرێك و پێکی ئاوێتە دەکات. هوان، بە فرمانی شارلمانی بە ماموریەتێکی ترسناك بە ناچاری بۆ بەغدا دەچێ، بەسەرکەوتوویی دەگەڕێتەوە و رەزیەی کیژی خەلیفەش وەکو دەزگیرانی خۆی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئەم جووتە لە سەفەری گەڕانەوەدا دووچاری کەلکەڵەی شەهوەت و هەوەس دەبن، بەلام دلێرانە رووبەڕووی زۆر سەختی و دژوارییان دەوستنەوە، بەمە کەفارەی گوناحەکانیان دەدەن. جا هەر لەو بەینەدا ئوبرون و تیتانیای شا و شابانۆی پەریان، بە شەڕ هاتوون و تەنیا نیشاندانی ئازایەتی و وەفاداری جووتێکی ئاسایی دەتوانێ ئەو دووانە لەگەڵ یەکتردا ئاشت بکاتەوە. ئوبرون، هوان و رەزیە وەکو ئەم جووتە هاوسەرە هەڵدەبژێرێ تا وەفاداری و ئازایەتی خۆ بنوێنن، جووتە ئاشق بە هاریکاری ئوبرون، سەربەرزانە لە تاقیکردنەوەکە دەردەچن، و وەفادارییان دەبێتە مایەی ئاشتبوونەوەی ئوبرون و تیتانیا. گوتە، بە جۆرێ کەوتە ژێر کاریگەری ئەم بەیتە کە تاجێکی لەگەڵای سەروو (وەکو میداڵ و نیشانەی شانازی) بۆ ویلند نارد.

وەرگێڕانەکانی:

ویلند لە ماوەی سالانی ١٧٦٢و ١٧٦٦دا بیست و دوو شانۆنامەی شەکسپیری بۆ سەر زمانی ئەلمانی وەرگێڕا. ئەم بەرهەمانە، تا سالی ١٧٩٧، کە شلگل دەستی بە وەرگێڕانەکانی کرد، لە جوملەی پڕخوێنەرترین وەرگێڕانی ئەلمانی دراماکانی شەکسپیر بوون.

## ڕەخنەی ئەدەبی

گوتهولد ئەفرائیم لسینگ ١٧٢٩- ١٧٨١:

لسینگ لە کامنس لە دایك بوو. لە مایسن چووەتە قوتابخانەی سان ئەفرا، و لەوێندەر بە هۆی بەهرەی پرشنگدارییەوە ئیحتویارێکی بۆ خۆی بە دەست هێنا. پاشان وەکو کلوپشتوك لێرا زانستی کەلام بخوێنێ. لە ساڵی ١٧٤٦دا لە زانستگەی لا یپزیگدا ناوی خۆی نووسی، و سەرباری زانستی کەلام، پزیشکی و فەلسەفە و ئەدەبیاتیشی خوێند، لە بەرەوە کەوتە شانۆنامە نووسین و شیعر گوتن، ئاشنایی وی لەگەڵ دنیای شانۆ و ئەکتەرانی وەکو خاتو کارولین نویبردا، بابە خواپەرستەکەی ترساند، بەڵام لسینگی لاو زانیارییەکی زۆر دەربارەی جیهان بەگشتی و هونەری دەرهێنان و شانۆنامەنووسی بەتایبەتی فێر بوو، لە ساڵی ١٧٤٨دا لە لایپزیگەوە بۆ بەرلین چوو، سێ ساڵ لەم شارەدا درێژەی بە خوێندنەکەی دا، ژیانی خۆیشی بە نووسینی کۆمیدیا، وەرگێران و ڕۆژنامەنووسییەوە دابین دەکرد. لە دیسامبەری ساڵی ١٧٥١ەوە تا دیسامبەری ١٧٥٢، چوو بۆ زانستگەی وتین برگ، و دەرەجەی مامۆستایەتی وەرگرت، لەوە بەدواوە هەرچەند ساڵێکی لە شارێکدا بەسەر برد: بەرلین ١٧٥٢- ١٧٥٥، لایپزیگ ١٧٥٥- ١٧٥٨، بەرلین ١٧٥٨- ١٧٦٠، بریسلاو"١٠" ١٧٦٠- ١٧٦٥، بەرلین ١٧٦٥- ١٧٦٧، هامبۆرگ ١٧٦٧- ١٧٧٠، و ولفنبوتل ١٧٧٠- ١٧٨١، لسینگ لە ماوەی ئەم ساڵانەدا بژێوەی خۆی وەکو شانۆنامەنووس، سکرتێری فەرمانداری بریسلاو، ڕەخنەگری شانۆی میللی (هامبۆرگ) و کتێبدار (بەرپرسی کتێبخانە)ی ولفنبوتل دابین دەکرد. لە ساڵی ١٧٧٦دا زەماوەندی لەگەڵ ئیڤاکونیگدا کرد، بەڵام ئەم ژنە دوای پانزە مانگ مرد. ئەو بە خۆیشی لە کاتی ئاکنجی بوونی لە برونسویك بە سەکتەی دڵ کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی:

لسینگ تەقریبەن بە هەمان ئەندازە لە درامانووسی و لە ڕەخنەی ئەدەبیدا بەناوبانگە، هەندێ حیکایەتی پەخشانی، هۆزانێن لیریکی و پەند و قسەی نەستەقی تاڕادەیەك کەم بایەختریشی نووسیوە.

ڕەخنەی ئەدەبی:

تێورییە ئەدەبییەکانی لسینگ جگە لەوەی کە لێرەدا ئاماژەی بۆ دەکرێ لە گفتوگۆیەك دەربارەی شانۆنامەکانیشیدا باس دەکرێتەوە.

ئەدەبیاتنامەکانی (١٧٥٩- ١٧٦٥):

لسینگ ئەم نامانەی بە هاوکاری (موزس مندلسون ١٧٢٩- ١٧٨٦)و (فریدریش کریستف نیکولای ١٧٣٣- ١٨١١) بلاوکردەوە، لەم نامانەدا رەخنەیەکی گشتگیری دەربارەی ئەدەبیاتی ئەلمانی سەردەمی خۆی بە دەستەوە داوە، لەم رەخنانەیدا بە سادەیی و راستگۆیی پەردەی لەرووی شیعر ریسان، وەرگیرانی بێ توانا، "فیشالبازانی کەم مایە"و مامۆستایانی ئەخلاقی درۆزن هەلمالیوە. لە هەموو ئەمانە گرنگتر، ئەو ریگەیەیە کە ئەو لەم نامانەدا بە شێوەیەکی گشتی لە دنیای تیۆری و پراکتیکی دا لەبەردەم ئەدەبیاتی ئەلمانیدا کردییەوە: بۆچوونەکانی گوتشد بوونە مایەی رەخنە، ئەوە نیشاندرا کە تراجیدیای کلاسیکی فەرەنسی بەو جۆرەش کە پێشتر تەسەور دەکرا راستەوخۆ یۆنانی نییە، و سوفوکلیس و شەکسپیر نموونەی زۆر باشترن لە راسین بۆ لاسایی کردنەوە.

لایوکویون یان سنوورانی نێوان نیگارکێشی و شیعر "١٧٦٦":

یوهان "١١" یواخیم و ینکلمان، لە سالی ١٧٦٤دا، بەرهەمێکی بەناوی میژووی هونەر لە سەردەمی کۆندا بلاوکردبووەوە. ئەو لەم کتێبەدا بە بەراوردی پەیکەری کۆنی یۆنانی لایوکویون "١٢" لەگەل وەسفی ڤیرجیل بۆ هەمان پیاو، ئەم بۆچوونەی دەربڕی بوو کە "سادەیی بە شکۆ و عەزەمەتی نارام" لە خەسلەتە بنچینەییەکانی هونەری یونانییە، کەوتبووە ستایشی ئەم پەیکەرە، چونکە جۆرە میانڕەوییەکی هونەری تێدا بینیبوو —میانڕەوییەك کە لە وەسفی شاعیرانەی ڤیرجیل بۆ چەوساوە و رەنجبەرانی ئەرموادەدا نەبوو (ئانائید، فەسلی دووەم)، جا کەشفەکەی وینکلمان ئەمەیە کە مەیدانەکانی شیعر و هونەرێن بەرجەستەکاری و پەیکەرسازی لەراستیدا وەکو یەکن، لسینگ لەلایوکویوندا، ئەم باوەڕە رەتدەکاتەوە و نارمانجی نیگارکێش و پەیکەرساز بە جوانی دەزانێ نەك بە کەمالی ئەخلاقی. لسینگ ئەم هونەرانە بە وەستاو دەزانێ —داهێنانی شتان لە چوارچێوەی شوێن و کاتدا- لەبەر ئەمە وەسفین، لە حالێکا کە شیعر نەوەستاوە، لە جولەدایە- واتە بەندە بە داهێنانی جولە و کردار لە زەماندا- لەبەر ئەمە زیاتر نەقلییە. بایەخی ئەم بۆچوونە لەمەدایە کە دەورێکی گرنگی لە کۆتایی هێنان بە رەوت و رەوشی سەدەی هەژدەیەم، کە هەولی دەدا شیعر بکات بە وەسفی، هەبوو.

دراماتورژی "١٣" هامبورگ ١٧٦٧- ١٧٦٩:

ئەم کتێبە هەمان بۆچوونەکانی بەرهەمی (ئەدەبیاتنامەیە) شەرح و شرۆڤە دەکات. لسینگ نیشانی دەدا کە بۆچوونەکانی نەوکلاسیك لەمەڕ دراما تەفسیر و شرۆڤەیەکی

نادروستی راو بۆچوونەکانی ئەرەستۆیە. ئەو جەخت لەسەر یەکێتی کار و مەرجی ئەرەستۆ بۆ وروژاندنی میهر و بەزەیی و ترس لەلای تەماشاڤان (بە مەبەستی پاك کردنەوەی سۆزان) دەکاتەوە و پشتیوانی لێدەکات، بەڵام لەگەڵ ئەم بۆچوونەی ئەرەستۆدا نییە کە خەڵکی ئاسایی بە قارەمانانی لەبار و گونجاو نازانێ بۆ تراجیدیا.

شانۆنامە:

وەزع و حاڵی دراماى ئەڵمانی لە ساڵی ١٧٥٠دا شتێکی هێوەتر لە بەزەیی وروژاندن بوو. دراما بریتییە لە نووسینێکی دەستکرد و تەقلیدێکی عیبادەت ئامێزی شانۆنامە ئەو کلاسیکەکانی کورنی و ڤولتێر. لێکدانەوەی نادروستی ئیتالیایی و فەرەنسی دەرهەق سێ یەکێتییەکە کوێرانە قەبووڵ دەکرد. لە سەدەکانی ناڤینەوە تا ئەم زەمانە، جگە لە بەرهەمەکانی ساکس، گریفیوس و لوهنشتاین، هیچ شانۆنامەیەك بە مانای واقیعی ئەم وشەیە لە ئەڵمانیادا نەنووسرا بوو. لەم حاڵ و بارەدا، لسینگ لە زەمینەی شانۆنامەنووسیدا هەمان پەیامی لە ئەستۆگرت کە کلوپشتوك لە زەمینەی شیعری غەیرە دراماتیکدا لە ئەستۆی گرتبوو. بەڵام ئەرك و رۆڵی لسینگ دژوارتر بوو. ئەو، گوتە و شیلەر بۆ یەکەمین جار دراما گەلێکیان بە ئەڵمان پێشکەش کرد کە هاوسەنگی شاکارە درامییەکانی میللەتانی دیکە بوون.

یەکەمین کۆمیدیاکانی لسینگ "لەبەر زیندوویەتی و رەوانی گفتوگۆکانی و پەخشانە سروشتییەکەی" لە بەرهەمی هاوچەرخەکانی خۆی جیان. یەکەمین کۆمیدی وی (خوێنکاری لاو- ١٧٤٨) بوو کە لە ئەزموونی خوێنکاری خودی لسینگەوە هەڵێنجراوە، بە هەر حاڵ لسینگ تا ساڵی ١٧٥٥یش هەر پابەندی داب و قەرارادە کۆنەکان بوو.

خاتو ساراسمپسون- ١٧٥٥:

"یەکەمین تراجیدیایە دەربارەی ژیانی چینی بۆرژوا لە زەمینەی درامانووسی ئەڵمانیدا" لسینگ لەم تراجیدیایەدا بۆچوونانی فەرەنسی و گوتشد رەتدەکاتەوە، بەپێی ئەم بۆچوونانە تراجیدیا دەبێ تەنیا ژیانی کەسایەتییانی بەرجەستە و گەورە وێنەبگرێ، لە قاڵبی شیعری دوانزە سیلابیدا دابرێژرێ، و سێ یەکێتییەکە رەچاو بکات. لسینگ بەچاولێکەری درامانووسانی ئینگلیزی، ژیانی خەڵکی کوچە و بازار بە پەخشان دەگێڕێتەوە. لە خاتو ساراسمپسوندا ناوی کاراکتەرەکان لە بەرهەمەکانی لیلو، کن گرو و ریچاردسن-ەوە وەرگیراون. چیرۆکی تراجیدیاکەش شانۆنامەکانی لیلو و شدول وەبیر دێنێتەوە: میلیفونت بە فڕوفێڵ سارا دەرەڤێنێ، ماروود-ی ماشوقەی جارانی میلیفونت، ئەو جووتە لە میوانخانەیەکدا دەبینێ، و

بێهودە هەوڵدەدا تا دووبارە ڕێی خۆی لە دڵی میلیفونتدا بکاتەوە. لەم حاڵەدا، ماروود پەی بەوە دەبات کە ئاغای سمپسون بە تەمایە کیژەکەی ببەخشێت، بۆیە سارا ژەهر خوارد دەکات، و میلیفونت-یش خۆی دەکوژێت.

فیلوتاس- ١٧٥٩:

ئەم تراجیدیا تاك پەردەییە دەربڕ و نیشاندەری ئەو ڕەگ و دەمارە نیشتیمانپەروەرییەیە کە فردریکی دووەم لەلای ئەڵمانییەکان بێداری کردەوە. فیلوتاسی شازادەی مەقدونیا، دیلی دوژمن دەبێ. بەڵام کە هەواڵی دەگاتێ بابی ناچارە لە هەنبەر ئازادی وی دا، ئاشتییەکی زەلیلانە تەحەمول بکات، خۆی دەکوژێت. لسینگ لەم بەرهەمەدا، هەموو توانایەکی خۆی سەرەفی سادەیی کلاسیك دەکات و هەمدیس پەخشان بەکار دێنێ.

میناڤون بارنهلم- ١٧٦٧:

"یەکەمین شاکاری کومیدی ئەڵمانی"یە، کە بە بۆچوونی گوتە "بەرهەمی ڕاستەوخۆی شەڕێن حەوت ساڵەیە، و پوختەترین ناوەڕۆکی نەتەوەیی ئەڵمانی باکووری لەخۆگرتووە و یەکەمین داهێنانی شانۆییە کە لەسەر بنەمای ڕووداوە گرنگەکانی ژیانی هاوچەرخ ڕۆنراوە". پلۆتی دراما کە تاڕادەیەك ئاڵۆزە: تلهایم-ی سەرگوردی سوپای پروس، کە بەر غەزەبی سەرانی سوپا کەوتووە، بە ناحەق بە بەرتیل گیری لە ساکسونانی دوژمن لە جەنگی حەوت ساڵەدا تۆمەتبار دەکرێ. ئەو کە دەترسێت نەوەکو ناوی باشی دەزگیرانەکەی (میناڤون بارنهلم)ی میراتگری ساکسونی، لەکەدار بێ، پەیوەندییەکانی لەگەڵیا دەبڕێ. لەم حاڵ و بارەدا مینا خەبەر بە تلهایم دەدات کە لە میرات بێ بەش بووە. تلهایم بەم خەبەرە خۆشحاڵ دەبێ، جارێکی دی بەرەو ئەو دەڵەزێ، بەڵام مینا کە نایەوێ ببێ بە بار بەسەر ئەوەوە ڕووی لێ وەردەگێرێ، تلهایم، بە نامەیەك کە لەشاوە دێ تەبرێ دەبێ. مینا ئیعتراف دەکات کە مەسەلەی بێبەشبوونی ئەو لە میرات دەستکرد بووە، و هەموو شتێك بە خۆشی دەبڕێتەوە. ئەگەرچی پلۆتی ئەم کۆمیدیایە زۆر تازە نییە، بەڵام ڕووداوەکانی چیرۆکەکە پەیوەندییەکی نزیکیان بە ڕووداو و هزرێن زەمانەوە هەیە، و قارەمانانی شانۆنامەکە، زیندوو و واقیعین. ئەم بەرهەمە ڕەنگدانەوەی تاسەی لسینگە بۆ دروستکردنی تەبایی و گونجان لە بەینی ویلایەتە جۆراوجۆرەکانی ئەڵمانیادا.

ئیمیلیا گالوتی- ١٧٧٢:

ئەم شانۆنامەیە وەرگێڕانێکی چیرۆکی کۆنی ئاپیوس و ڤیرجینیا "١٤"یە. شازادەی گواستالا، تەماحی لە ئیمیلیا-ی دەزگیرانی کۆنت ئاپیانییە. کۆمەڵێك بەکرێگیراو بۆ کوشتنی کۆنت

بەکرێ دەگرێ، ئیمیلیاش بە بیانووی "نەجات دانەوە" بۆ ڤێلاکەی خۆی دەبات. ئورسینا-ی کۆنە ماشوقەی شازادە، بەسەرهاتەکە بۆ بابی ئیمیلیا دەگێڕێتەوە. بابەکە خۆی دەگەیەنێتە کۆشك و ئیمیلیا بە خەنجەر دەکوژێت تا لە ریسوایی رزگاری بکات. ئەگەرچی شوێنی روودانی چیرۆکی ئەم تراجیدیا پەخشانییە ئیتاڵیایە، بەو حاڵەشەوە هەر کردەوەی زاڵمانە و ریسوای ئەرستۆکراتی ئەڵمانی وێنە دەگرێ.

ناتانی ئاقڵ- ١٧٧٩:

گەورەترین بەرهەمی چیرۆکڤانی لسینگە، ئەم بەرهەمە کە زەحمەتە بتوانرێ ناوی شانۆنامەی لێ بنرێ (ولسینگ بە خۆی بە "شیعرێکی درامی"ی ناو دەبات)، پلۆتێکی ناتەواو و ناواقیعی هەیە، ئەم بەرهەمە لەڕاستیدا، تەفسیرێکە لەمەڕ "خواپەرستی" (دیانەتی سروشتی، دئیزم) نووسەرەکەی.

لسینگ لەم شانۆنامەیەدا مەدارای ئایینی، خۆشەویستی برایانە، و خواپەرستی سادە فێر دەکات. ناتان-ی جولەکەی ئاقڵ و دلۆڤان، کیژێکی مەسیحی بە فەرزەنی هەڵدەگرێتەوە و دەکەوێتە پەروەردەکردن و تەربێت دانی. جا گرفتی ئەم پیاوە کاتێ دێتە پێشێ کە یەکێك لە سوارچاکانی "١٥" پەرستگا بۆ بەربەرەکانی سەلاحەدینی ئەیوبی و بەڕەڤانی لە مەزاری موقەدەس بۆ ئۆرشەلیم دێت و داخوازی کیژە دەکات (مەسەلەکە لە حوزوری سەلاحەدیندا باس دەکرێ)، لە ئەنجامدا هەموو گیر و گرفتەکان چارەسەر دەبن، چونکە سوارچاکەکە و کیژەکە پەی بەوە دەبەن کە خوشك و برای یەکترن، و هەردووکیانیش منالی برا گوم بووەکەی سەلاحەدینن، کە هاوسەرێکی ئەڵمانی هەبووە. لەم وەزع و حاڵەدا سەلاحەدین لە ناتان دەپرسێت کە لە هەر سێ ئایینی -مەسیحییەت، ئیسلام، و یەهودیەت- کامیان ئاینی راستییە. ناتان لە وەڵامدا چیرۆکی پەندئامێزی "سێ ئەڵقە" (لە دکامیرون-ی بوکاچووە وەرگیراوە) دەگێڕێتەوە، و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەوەیە هەموو ئایینەکان دەستکردی مرۆڤ بن. بەڵام پەیامی سەرەکی و رەسەن ئەمەیە کە هەر دینێ بەشەر بۆ پاکی و فەزیلەت و تەقوا رێنوێنی بکات راستە، لەبەر ئەمە نابێ لە نێوان پەیڕەوان و شوێنکەوتووانی باوەڕێن جیاوازدا هیچ موناقەشە و گەنگەشەیەك روو بدات. لێ لسینگ رەگەزی ئیمان لەبیر ناکات، و دەڵێت کە باشتر وایە بڵێین تەنیا خودا دوا حەقیقەت و راستی دەزانێ.

هەڵسەنگاندن:

لسینگ گەورەترین سیمای ئەدەبی ئەڵمانی پێش گۆتەیە. لە واری شانۆنامەنووسیدا "شارەزایی ورد و تەواوی خۆی دەربارەی مرۆڤ لە رێگەی ئەفراندنی کاراکتەرانی واقیعییەوە

بەکاردێنێ، گۆڕانکارییە دەروونییەکانیان لە ناخی خۆیدا تاقی دەکاتەوە، ئەم دوو بەهرەیە پایەی درامانووسێکی داهێنەری پێ دەبەخشن. لەبەر ئەمە دەتوانرێ بە یەکێك لە جوملەی نووسەرانی رەسەنی ولاتەکەی بژمێردرێ"، لسینگ وێڕای توندی و بێ میهری دەرهەق بە گەورەیی کورنی و راسین، ئەوجاش گەورەترین رەخنەگری ئەوروپایە، و پریست گوتەنی بە "رەخنەکانی بناغەی درامای تازەی ئەلمانی دارشتووە". "بەرهەمەکانی لە هەر گۆشەنیگایەکەوە تەماشا بکرێن دەچنە ریزی باشترین بەرهەمی سەردەمی خۆیەوە. لە زەمینەی رەخنەی ئەدەبیات و هونەردا، پوختەترین داوەرییانی سەدەی هەژدەیەم دەخاتەڕوو، و وەکو هونەرمەندێکی داهێنەر، بە تاقی تەنیا، بناغەی درامای تازەی ئەلمانی دادەرێژێ".

**یوهان گوتفرید هردر ١٧٤٤- ١٨٠٣:**

ئەگەر بتوانرێ لسینگ بە لوتکەی ئەلمانی سەدەی هەژدەیەم بژمێردرێ، ئەوا هردر سەرقافڵەی دنیای نوێی ئێمەیە. هردر فەرزەنی واعیزێکی دەستکورتی خەڵکی موورونگن-ی پروسی رۆژهەڵات بوو. سەردەمی لاوی بەزەبت و رەبت و خوێندنەوەی زۆر بوری. لە ساڵی ١٧٦٢دا لە زانستگەی کونیگسبرگ خۆی ناونووس کرد تا پزیشکی بخوێنێ، بەڵام زوو رای خۆی گۆڕی و کەوتە خوێندنی زانستی کەلام و فەلسەفە، و بەتایبەتی کەوتە ژێر کاریگەری دەرسەکانی عەمانوئیل کانت-ەوە، یوهان گیورگ هامان (١٧٣٠- ١٧٨٨)ی هاوڕێی ئاوری تاسەی شەکسپیری لە دەروونیا هەڵایساند و فێری زمانی ئینگلیزی کرد و دەقە دەرسییەکەشی هاملێت بوو. لەم سەروبەندەدا بەرهەمەکانی روسو-ش کارێکی قوڵی کردە سەر هزر و بیری هردر، هردر لە ساڵی ١٧٦٤دا لە ناحیەی رێگا بوو بە مامۆستا و یاریدەدەری کەشیش، دوای پێنج ساڵان وازی لەم پۆستە هێنا و رێگەی گەشت و گەڕانی گرتە بەر. بە کەشتی چوو بۆنانت و لەوێندەرەوە بۆ پاریس رۆیی. لەم شارەدا ئاشنایەتی لەگەڵ دیدرۆ و دالامبردا پەیدا کرد. هردر سەرەنجام بۆ هامبۆرگ گەڕایەوە و لەوێ دیداری لسینگی کرد. دوای چەند مانگێك تووشی نەخۆشی چاو بوو، لە مانگی سپتامبەری ساڵی ١٧٧٠دا بۆ چارەسەر چوو بۆ ستراسبۆرگ. لەم شارەدا گۆتەی ناسی و دۆستایەتییەکی راستگۆیانەی لەگەڵدا پەیدا کرد. ئەم دۆستایەتییە کاریگەرییەکی زۆری لە پێشڤەچوونی ئەدەبی گۆتەدا هەبوو. هردر لە ساڵی ١٧٧١وە تا ساڵ ١٧٧٦ پێشەوای روحانی بوکبیرگ (دۆك نیشینی ویلایەتی شاومبورگ-لیپە) بوو. لە ساڵی ١٧٧٦ بە هۆی دەسەڵاتی گۆتەوە، بۆ سەرۆکایەتی شورای کڵێسای لۆتەری لە وایمار هەڵبژێردرا. هاونشینی ویلند، گوتە، جان پول ریخنەر و ئەدیبانی دی بۆ هردر خۆش

بوو، بەڵام بە تێپەربوونی ڕۆژگار کەم حەوسەڵە و توندجێز دەبوو و دیارە سەرکەوتنەکانی گۆتە و شیلەر ئازاریان دەدا. هردر تاکو ڕۆژی مردنی لە ساڵی ١٨٠٣دا لە وایمار ژیا.

کاریگەری:

هردر بە دامەزرێنەری بزوتنەوەی "تۆفان و یاخی بوون" دەژمێردرێ. وەکو شوێنکەوتووی روسۆ و هامان، پتر لە هەر کەسێکی دیکە لە ئەڵمانیا، هەوڵیداوە تا کلاسیکی نوێ لـە وابەستەیی بـە ئاوەز و لوجێك و کۆنەگەرایی ئازاد بکات و زیاتر بە سۆز و ئەنگێزە تەبیعەییـە مرۆڤانیەکانییـەوە ببەسـتێ. هـردر لـەو بـاوەڕەدا بـوو کـە روحـی ئـەو خەلکـەی کـە دەسـتەمۆی مەدەنییـەت، و شارستانییەت نەبوونە، سەرچاوەی هۆزانی راسـتییە، شـیعرێك کـە دەبـێ بـە شـێوەی خۆڕسـك و یەکسەری بگوترێ. گۆرانی فۆلکلۆری، کتێبی موقـەدەس، نوسـیان، هومـەر، و شەکـسپیر وەکـو نموونەی "سروشتی" بە بەڵگە دێنێتەوە. هردر شیعری بە زمانی زگماکی رەگەزی بەشەر دەزانی و، ڕێگەی بۆ ئەو چەمکە تازەیە "ئەدەبیاتی جیهانی" کە گوتە و رۆمانتیکەکان مـژدە بـەری بـوون، خۆشکرد، و لە هەمان حاڵدا بناغەی شێوەی تازەی ئەدەبیاتی پراکتیکی دانا.

بەرهەمەکانی:

بایەخی هردر، وەکو رۆسۆ-ی مامۆستای زیاتر بەندە بە توانـای ئیلـهامی ئـەوەوە تـا بـە خەسڵەتی زاتی بەرهەمەکانیەوە. چەند بەرهەمێکی ئەدەبی هردر، کاریگەری و ئیحتویـارێکی وەهایان هەیە کە شایستەی ئەوەن هەریەکێکیان بە جیا بخرێنەڕوو.

"چەند گوتارێك لەمەڕ ئەدەبیاتی نوێی ئەڵمان ١٧٦٦- ١٧٦٧":

ئەم گوتارانە بۆ داکۆکی لە هەست و سۆز و، هێرش بۆ سەر پـەیڕەوی کلاسـیکی نـوێ لـە "ئەقڵی ساغڵەمی وشـك"و "روحـی تەقلیـد" نووسـراون. هـردر لێـرەدا چـەمکێکی تـازەش سەبارەت بە ئەدەبیات وەکو رەنگدانەوەی شارستانییەتێکی نەتەوەیی دەخاتەڕوو، کە نەك نابێ بە عەیار و پێوەرانی پێشوەختە و توندڕەوانە سەیر بکرێ، بـەڵکو دەبـێ بـە تـەواوەتی لەبـەر رۆشنایی پەرەسەندنی مێژووییدا سەیر بکرێ. بەمجۆرە دەبێ هردر بە دامەزرێنەر و بونیاتنـەری توێژینەوەی زانستی ئەدەبیاتی بژمێردرێ.

شکسپیر:

(نامەیەکە دەربارەی شێوە و هونەری ئەڵمانی- ١٧٧٣)، هردر لەم بەرهەمەدا درامانووسی ئینگلیزی وەکو دیاردەیەکی زەمان و ژینگەی خۆی بەرجەستە دەکات و بە شاعیرێکی گەورە و رەسەنی ئەوتۆی دادەنێ کە لە ئاستی خەیاڵ و هەستدا هاوسەنگی یونانیانی کۆنە.

گۆرانی فولکلۆری ١٧٧٨- ١٧٧٩:

بریتییە لە ١٨٢ گۆرانی فۆلکلۆری دەڤەرانی جیاواز. لەم کۆمەڵەیەدا چل گۆرانی ئەڵمانییە و ئەوانی دیکە هردر لە گۆرانی وڵاتانی ئەسکەندیناڤی، ئینگلیستان، فەرەنسان، ئەسپانیا، پیرۆ و دەڤەرانی دییەوە وەریگێڕاونەتە سەر زمانی ئەڵمانی. ئەم کۆمەڵە گۆرانییە دەورێکی گەورەی هەبوو لە پەروەردەکردنی زەوقی ئەڵمانی بە گۆرانی نەتەوەیی و خۆماڵی. ئەمە جگە لەمەی کە لە پاڵ کتێبەکەی قەشەباشی توماس پرسیدا (یادگارەکانی شیعری کۆنی ئینگلیز) یارمەتییەکی زۆری گەشەکردنی ئەو ڕێبازانەیدا کە ڕۆمانتیزمیان لێکەوتەوە.

هەندێ بیر و ئەندێشان لەمەڕ فەلسەفەی مێژووی بەشەر (١٧٨٤- ١٧٩١):

ڕەنگە شاکاری هردر بێ. زۆربەی هزرە ئەدەبی و فەلسەفییەکانی وی لەخۆ دەگرێت، و بیروبۆچوونی وی دەربارەی پەرەسەندنی کەلتووری مرۆڤ دەخاتەڕوو. هردر بەشەریەتی بە یەکەیەکی مەزن دەزانی و هەوڵیدەدا پێشڤەچوون و پێشکەوتنی خوایی تیرەی بەشەر کە دەگاتە کەلتووری باڵا، مەزهەبی حەقیقی، و مرۆڤپەروەری و ئینسانیەت، نیشان بدات. باوەڕی وابوو ئەو جیاوازییانەی لە پێشکەوتنی میللەتانی جیاوازدا هەیە، دەبێ لە ڕێگەی جیاوازییەکان و گۆرانکارییەکانی یەك بە یەکی خەڵکی و ژینگەی سروشتی ئەو خەڵکەوە پیشان بدرێن و بسەلمێنرێن، و هەموو میللەتێك لە پەرەسەندن و گەشەکردنی کەلتووری بەشەریدا شەریك بووە.

## هۆزان

فریدریش گوتلیب کلوپشتوك ١٧٢٤- ١٨٠٣:

گەورەترین شاعیری لیریکی ئەڵمانی ماوەی نێوان والدرن ڤون درفوگلوید و گۆتەیە. لە کویدلین"١٦" بورگ لە دایکبووە. لە ساڵی ١٧٣٩دا بۆ قوتابخانەیەك لە شولپفورتا نێردرا، کە لەوێندەر ئاشنای بەرهەمەکانی هومەر، کتێبی موقەدەس و میللتن لە ڕێگەی وەرگێڕانەکانی بودمرەوە بوو. لە ساڵی ١٧٤٥دا بۆ یناچوو و کەوتە خوێندنی زانستی کەلام. لەم ماوەیەدا سێ بەشی یەکەمی بەیتی مەسیحی بە پەخشان نووسی، پاشان بە دەعوەتی بودمر-ی وەرگێڕی سویسری بەرهەمەکانی میلتن، چوو بۆ زوریخ، دڵبەندی کلوپشتوك بە لەزەتە دنیاییەکانەوە، ناکۆکی خستە بەینی خانەخوێ و میوانەوە، و لەبەر ئەمە کلوپشتوك یەکسەر دەعوەتی فردریکی پێنجەمی پاشای دانیمارك، بۆ ئەوەی لە کۆپنهاگن بژی، قەبووڵ کرد و بۆ

ئەو وڵاتە چوو، لەساڵی ١٧٥٤دا لەگەڵ مارگاریت مولیردا زەماوەندی کرد، و تا چوار ساڵ، کە مارگاریت مرد، ژیانیان خۆش بوو. لە ساڵی ١٧٧٠دا فردریکی پێنجەم مرد. مەرگی وی گۆڕانکاری سیاسی جۆراوجۆری بە دوادا هات، و کلوپشتوکش ناچار لە هامبۆرگدا کونجی گۆشەگیری گرت. باقی ژیانی جگە لە چەند سەفەرێکی کورت، لە هەمان شاردا ژیا.

بەرهەمەکانی:

مەسیح:

کلوپشتوک هەر لە منداڵییەوە حەزی لێ بوو کە داستانێکی گەورەی مەسیحی بۆ ئەڵمان بڵێ. وەکو چۆن میلتن بۆ ئینگلیستانی گوتبوو. ئەو ئەم داستانەی بە پەخشان لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیدا دەست پێکرد، و ئەو سێ بەشەی کە نووسیبووی بە شیعری شەش بڕگەیی گۆڕی (ڕەنگە بە قسەی گوتشد ئەمەی کردبێ). دەقە شیعرییەکەی داستانەکە لە ساڵی ١٧٤٨دا بڵاوبووەوە. بەشی ١-٥ لە ساڵی ١٧٥١، بەشی ٦-١٠ لە ساڵی ١٧٥٦، بەشی ١١-١٥ لە ساڵی ١٧٦٩، و بەشی ١٦-٢٠ لە ساڵی ١٧٧٣دا بڵاوبووەوە. کۆی بەیتەکانی ئەم داستانە دەگاتە نزیکەی بیست هەزار بەیت.

نێوەڕۆکی داستانە درێژەکەی کلوپشتوك فیدیە قەبوولکردنی حەزرەتی عیسایە لە تیرەی بەشەر. چیرۆکەکە بەسەرکەوتنی عیسا بۆ سەر کێوی زەیتون دەست پێدەکات، و بە دانیشتنی لە پاڵ خوایا لە بەهەشت کۆتایی دێت. لەم قەڵەمڕەوە سنووردارەی گێڕانەوەکەی ئینجیل دایە کە کلوپشتوك- بە بێهودە- هەوڵدەدا ڕووداوە لاوەکییەکان، ڕووداوە پاژییەکان گرنگ و پڕ مانا بنوێنێ، و کەموکوڕی کار و جوڵە بە پەنابردنە بەر ژمارەیەك لە فریشتان، شەیتانان، و تەنانەت تەسلیس (تثلیث) قەرەبوو بکاتەوە، زێدەباری ئەمەش، لە ئەفراندنی کەسایەتییەکانیدا بە خولق و خووی مرۆڤانییەوە، سەرکەوتوو نییە. جا لەبەر ئەم کەم و کوڕیانەیە کە داستانی مەسیح، لە هەموو داستان و بەیتە مەزهەبییەکانی جیهان، یەکنەواترە و تێ گەیشتنی ئەستەمترە، باشترین فەسڵێن ئەم داستانە وەسفە خەیاڵییەکانی ناو چەند بەشی هەوەڵی بەیتەکەیە.

هۆزانێن لیریکی:

بلیمەتی کلوپشتوك پتر لە هۆزانی لیریکیدا بوو تا لە هۆزانی داستانی. لە ساڵی ١٧٧١دا دەفتەرێکی شیعری بە ناوی قەسیدان —کە مەبەستی "هۆزانان" بوو- بڵاوکردەوە. جگە لە چەند شیعرێکی ئایینی، هەموو شیعرەکانی ئەم دەفتەرە لە قاڵبێکی نزیك بە شیعری ئازاد

گوتراون-بەبێ قافیە و لە "وەزنی ئازادا"، کلوپشتوك سۆزی بە هێزی خۆی لەم شیعرە لیریکیانەدا دەردەبڕێ و ستایشی دۆستایەتی، خۆشەویستی، سروشت، ئازادی، شیعر، نیشتیمانپەروەری دەکات. تەقریبەن لە هەموو ئەم شیعرانەدا جۆش و خرۆشێکی مەزهەبی قووڵ شەپۆل دەدا. هۆزانێن دەریاچەی زوریخ، سەرزەمینی من، کەرنەڤالی بەهاری، و شەوی هاوین بە باشترین شیعرێن ئەم دەفتەرە دەزانرێن.

شانۆنامەکان:

کلوپشتوك شەش شانۆنامەی نووسی. ناوەڕۆکی سیانیان واتە مەرگی ئادەم- ١٧٥٧ ، سلێمان- ١٧٦٤، و داود- ١٧٧٢، لە کتێبی موقەدەسەوە هەڵێنجراوە. سێ شانۆنامەکەی دی، شەڕی هرمان- ١٧٦٩، هرمان و شازادەکان- ١٧٨٤و مەرگی هرمان- ١٧٨٧ یەك شانۆنامەی سێ بەشی پێکدێنن، کە هەندێ لایەنی ژیانی هرمان (ئارمینیوس)ی قارەمانی نەتەوەیی ئەڵمان وێنە دەگرێت. لەم شانۆنامانەدا "ژیانی دراماتیك" لە ئارادا نییە، بەڵام هەندێ پارچە و پەرەگرافی لیریکی جوانیان تێدایە. ڕەنگە ئیجابیەتی سەرەکی ئەم شانۆنامانە ئەمە بێ کە تیشکێك لە تازەبوونەوەی سەردەمی ئەڵمان دەخەنە سەر رابردووی خۆیان.

هەڵسەنگاندن:

گەورەترین بەشداری کلوپشتوك لە گەشەکردنی ئەدەبیاتی ئەڵمانیدا -وێڕای هەستگەرایی- زیندوو کردنەوەی هەست و خەیاڵە. ئەمە جگە لەوەی کە واژە شیعرییەکانی رازاندنەوە و دەوڵەمەندی کردن، و هەندێ کێشی کۆن و ریتمی تازەی برەوپێدا. ئەگەرچی ئەم قسەیەی هردر کە گوایە بایەخی یەك غەزەلی (سوناتە) کلوپشتوك لە هەموو ئەدەبیاتی لیریکی بریتانیا پترە، کۆمیدیایی دەنوێنێ، بەڵام ئەم گوتەیە نیشانەی کاریگەری کلوپشتوکە بەسەر هاوعەسرانی خۆیەوە.

## شانۆنامە

لسینگ (کە پێشتر باس کراوە) گەورەترین درامانووسی ئەڵمانی سەدەی هەژدەیەم بوو. داهێنان و بۆچوونە تازەکانی وی لە مەیدانی شانۆنامەدا بە رادەیەکی زۆر درامای ئەڵمانی لە کۆت و بەندی نەوکلاسیکی فەرەنسی رزگار کرد، و بەمجۆرە رێگەی بۆ سەرکەوتنەکانی گوتە و شیلەر خۆش کرد.

## یوهان و لفگانگ ڤون گوتە ١٧٤٩- ١٨٣٢:

گوتە لە فرانکفۆرت —ئام- ماین لە دایك بوو، بابی کە (وەکیلی دەعاوی) بوو و پایەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگی هەبوو، پیاوێکی کەم دوو، توندە تەبیعەت، سەختگیر، کەللە رەق و ئیرادگیر و بە ئیعتراز بوو. دایکی، کە تەنیا هەژدە ساڵ لە کورەکەی گەورەتر بوو، روخۆش و هێمن و خەیاڵمەند بوو، هەمیشە گەنجانە رەفتاری دەکرد و حەزی لە چیرۆکبێژی دەکرد، ولفگانگ-ی لاو هەوەڵجار لە فرانکفورت چووە بەر خوێندن و پاشان (١٧٦٥- ١٧٦٨) چووە زانستگەی لایپزیگ و لقی مافی خوێند، بە هۆی نەخۆشییەوە ناچار لایپزیگی بە جێ هێشت و لە ساڵی ١٧٦٨دا بۆ زێدی خۆی گەڕایەوە، بەڵام دوای دوو ساڵ بۆ تەواوکردنی خوێندنی ماف بۆ زانستگەی ستراسبۆرگ رۆیی. لەوێندەر ناشنایەتی لەگەڵ هردرا پەیدا کرد و ئەو، تین و تاوی بە هەموو ئەوماکەی "تۆفان و یاخی بوون" (بزوتنەوەکەی هردر) بەخشی کە بە شێوەیەکی هێواش لە سروشت و دەروونی شاعیری لاودا هەبوو، بەو رێگەیەی کە فێری کرد کە دڵی هەر کەسێك بە نرخترین موڵکی ویە و تەرجەمەکردنی دڵ یەکەمین ئەرکی ئەوە.

گوتە لە ساڵی ١٧٧٠دا پەیوەندی نافەرمی لەگەڵ فریدریکە بریون-ی کیژی پێشەوای روحانی زنهایمدا بەرقەرار کرد.

ئەم پەیوەندییە یەك ساڵ درێژەی کێشا و بوو بە ئیلهامبەخشی گەلێك لە شیعرەکانی گوتە، جیابوونەوەی ئەم دووانە لە ساڵی ١٧٧٠دا گۆتەی زۆر خەمبار کرد.

گوتە لە ساڵی ١٧٧١دا بۆ فرانکفۆرت زڤڕییەوە، و چوار ساڵان خەریکی وەکالەتی مەحکەمە و نووسەری بوو. لە ساڵی ١٧٧٣دا بە نووسینی شانۆنامەی (گوتس ڤون برلیشینگن) ناوی کەوتە سەر زاران، و ساڵی دواتر بە شاکاری (ئازارەکانی ڤارتەری لاو) ئەوروپای هەژاند و ناوبانگی بەرز بووەوە.

گوتە لە ساڵی ١٧٧٥دا بە دەعوەتی کارل ئوگوست-ی دۆکی لاوی وایمار، بۆ ئەم شارە چوو، و لەوساوە تا کاتی مردنی (١٨٣٢) لە وایمار مایەوە (تەنیا یەك جار سەفەرێکی ئیتالیای کرد). گوتە لە ماوەی ساڵانی ١٧٧٨- ١٧٨٦دا پۆستی جۆراوجۆری وەرگرت، لەوانە بوو بە ئەندامی دەستەی وەزیران، و لە ساڵی ١٨٧٣دا لەلایەن ئیمپراتۆرەوە نازناوی ئەشرافی پێ درا.

گوتە لە ژێر گوشاری مەسئولیەتی سیاسی و کارگێڕی و ناکامی لە خۆشەویستی شارلوتەڤون شتایندا (کە مێرددار بوو) لە پایزی ساڵی ١٧٨٦دا بۆ ئیسراحەت و سەرگەرمی

بۆ ئیتالْیا چوو، و ساڵ و نیوێك لەم وڵاتە مایەوە. لەم ماوەیەدا بە تاسەوە سوودی لە هونەر و کەلتووری ئیتالْیا وەرگرت. سێ کەس کاریگەری گەورەیان بەسەر ژیان و شیعری گۆتەوە هەبوو. یەکەمیان شارلوتەڤون شتاین-ی هاوسەری یەکێك لە دۆکەکان بوو، ئەم ژنە پاك و رەسەنە لە ماوەی ساڵانی ١٧٧٥- ١٧٨٦دا سەرچاوەی ئیلهامی شیعری گوتە بوو.

دووەمین کەس کریستین ڤولپیوس، بوو، کە کیژێکی جوانی نەخوێنەواری فەرمانبەری بچووکی دەوڵەتی بوو لە وایمار.

ئەم کیژە لە تەموزی ١٧٨٨ەوە ماشوقە و شەریکی ژیانی گوتە بوو و منالێکی لێی بوو. لە ساڵی ١٨٠٦دا بە رەسمی و لە کلێسادا ژننامەیان دەرهێنا.

سێیەمین و کاریگەرترین هاونشینی گوتە، فریدریش شیلەر بوو. ئەم دووانە لە ساڵی ١٧٨٨دا یەکتریان ناسی. ئەم یەکتر ناسینە لە ساڵی ١٧٩٤ەوە بوو بە دۆستایەتی گیانی بە گیانی. لەوساوە تا کۆتایی تەمەنی شیلەر (١٨٠٥)، هەردوو شاعیر ئیلهامبەخش و چاککەرەوەی شیعری یەکتر بوون. لە ساڵانی ١٧٩٠- ١٧٩٤دا هێزی داهێنانی گوتە بەرەو توانەوە دەچوو، شیلەر بەهانایەوە چوو، و دووبارە لاویەتی و جەوانی پێ بەخشییەوە، و جارێکی تر کردییەوە بە شاعیر.

دەربارەی کەسایەتی گوتە راوبۆچوونانی جۆراوجۆر دەربڕدراوە پریست پێی وایە کە "شاعیرێکی راشکاو و سادە، دلۆڤان، راستگۆ و دڵسۆز و دڵگەرم بوو، یەجگار عەوداڵی حەقیقەت و جوانی بوو و هەمیشە ستایشی دەکرد و ئەرکی جددی ژیانی بوو". لەلایەکی دیکەوە، ویلکینسن گومان لە دڵسۆزی و جددییەتی گۆتە دەکات و رەخنەی توندی لێدەگرێ کە کەسێکی خۆهەڵکێش، خۆپەرست، و خەمسارد بووە دەرهەق بە خەڵکانی دی. بە کورتی حەقیقەت هەر چییەك بێ، گومان لەم خاڵەدا نییە کە گۆتە پیاوێکی لەبار و قۆز، زیتەڵ، حەنەکچی، ورە بەرز و کۆششکار بووە، و "مشت وماڵدانی نەفس"ی بە گەورەترین ئامانجی ژیانی خۆی زانیوە و بە ئاواتەوە بووە کە قەدر و پایەیەکی هاوتای گەورە پیاوانی هەبێ. لە راستیدا گوتە ویستویەتی خۆی بکات بە تەوەری جیهان، و ئەم کەلکەڵەیە بە جۆرێ لە بوونیا بلێسەی سەندبوو کە نەیدەزانی بۆ ساتێ لێی غافڵ بێ.

بەرهەمەکانی:

تەقریبەن هەموو بەرهەمەکانی گوتە کەم تا زۆر لایەنی ئوتوبیوگرافییان تیایە. لە نێوان خاڵێسانەترین هۆزانی لیریکییەوە تا شانۆنامەکانی دەتوانرێ پەی بە هەندێ گۆشەی رووداوەکانی ژیانی، بەسەرهاتی عاشقانە، یا هەندێ رووی پەرەسەندنی وی ببرێ.

گوتە وەکو ڤۆلتێری هاوعەسری، لەڕووی فرەکاری و بەرینی و هەمەجۆری مەیدانی بەرهەمەکانییەوە شاعیرێکی کەم وێنە بوو. لە رۆژگاری لاوییەوە تا چەند مانگێك بەر لە کۆتایی تەمەنی هەشتا و دوو ساڵەی بە بەردەوامی دەینووسی، و بەرەنجامی کارەکانی سەد و بیست بەرگە. ئەو ژانرە ئەدەبیانەی کە پتر بوونە مایەی شۆرەتی گوتە بریتین لە: شیعری غەزەل، داستان، رۆمان، شانۆنامە، جگە لەمەش، کۆمەڵێك چامە، وتارێن زانستی، رەخنەێن ئەدەبی، و ئوتوبیوگرافیەکی نووسیوە.

غەزەل و چامەکان:

پەرەسەندنی بەردەوام و یەك نەفەسی بلیمەتی گۆتە لە شیعرە کورتەکانیا بە چاکی دیارە. هەوەڵێن شیعرە لیریکییەکانی یەکپارچە جۆش و خرۆش و هەستن، و بە ئاشکرا کاریگەری بزووتنەوەی "تۆفان و یاخیبوون" نیشاندەدەن. ئەو غەزەلانەی کە لە ماوەی ساڵانی ١٧٧٥- ١٧٨٦دا لە وایمار گوتوونی تاڕادەیەك هێدی تر و بیرروونگەراترن، بەڵام لەم شیعرانەشدا شاعیر تاسەمەندی ئارامی روحی و هزرییە. ئەو شیعرە لیریکیانەی کە یەکسەر پاش گەرانەوەی لە ئیتاڵیا، گوتوونی، مرۆڤانی و پڕهەستن و لە دوا ئەنجاما غەزەلخوانیەکانی رۆژگاری پیریی وی، هزرمەندانە کورت و حەکیمانەن، ژمارەیەکی زۆر لە چامە و غەزەلەکانی، بەتایبەتی ئەوانەی لە سەردەمی لاوێتی شاعیردا گوتراون، دەربارەی ئەڤین و تەبیعەتن، بۆ نموونە چامەی "گوڵەباخی خەڵەنگزار" گوزار شتێکی سیمبولیکە لەمەڕ سەربوری ڤیانی گۆتە بۆ فریدریکە بریون، و هۆزانێن لیریکی "دۆزراوە"و "وەرزی هەمیشە بەهار" بۆ کریستینی هاوسەرێتی. چامەی "ئیرل کینگ" (کە شوبرت ئاوازی بۆ داناوە)، چیرۆکی غەمەنگێزی کوریژگەیەکی نزیکە مەرگە کە بابی بە ئەسپ بۆ لای دکتوری دەبات. کوریژگەکە لە خەیاڵی ئەوەدایە کە شای پەرییان فریا بکەوێ و بۆ وڵاتی پەریانی بەرێ، بەڵام ئیرل[١٧] کینگی دێویان لی پەیدا دەبێ، و مناڵەکە بە باوەشی بابییەوە گیان دەسپێرێ. هەندێ لە شیعرە هەڵبژاردەکانی دیکەی گوتە ئەمانەن: "ئاوازی شەوانەی پیاوی ئاوارە"، "پێشوازی و دوعاخوازی"، و "ئەواوی چەنگی".

هرمان و دروتیا- ١٧٩٧:

ئەم بەیتە داستانییە کە لە قاڵبی شیعری شەش هیجایی سێ پایەییدا گوتراوە، هەوڵێکە بۆ ئەوەی روحی هۆمەر بەبەر داستاندا بکرێتەوە. گۆتە لێرەدا لە خوڵقاندن و ئەفراندنی هاماجی "بابەتی و کلاسیکدا" سەرکەوتووە، بەسەرهاتی داستانەکە لەسەر بناغە و بنەمای

بویەرێکە کە لە باڤاریادا بەسەر کەسێکی پڕ وتستانی دوور خراوەی خەڵکی سالسبورگ لە ساڵی ١٧٣٢دا هاتووە، و گوتە بە زمانی پەناهەندەیەکەوە لە ساڵی ١٧٩٦دا دەیگێڕێتەوە. هرمان، کوڕی کابرایەکی خودان میوانخانەیە، دڵبەندی ئەشقی دروتیای هەڵاتوو دەبی، و سەرەنجام قەناعەت بە بابی دەکات کە وێڕای هەژاری کیژەکە، بە زەماوەندی وان قایل ببێ، گوتە لەم داستانەدا باسی نیشتیمانپەروەری، چۆنیەتی هەڵبژاردنی دایکان و باوکان، و ئازادی و مافی تاك دەکات، ئەم بەیتە لە دوای فاوست، بەناوبانگترین بەرهەمی درێژی گوتەیە.

## رۆمانەکانی

ئازارەکانی ڤارتەری لاو- ١٧٧٤:

رۆمانێکی زۆر پڕ هەستە کە بە چاولێکەری (هلویزی نوێ)ی رۆسۆ نووسراوە، نێوەڕۆکی عاتیفی رۆمانەکە زیاتر دەچێتەوە سەر بەسەرهاتی ڤیانی گوتە و شارلوتەڤون، و ئەنجامی چیرۆکەکە بە خۆکوژی کارل یروسالم-ی دۆستی گۆتە دەشکێتەوە. ئەم رۆمانە ناوێنەی بالانمای ئازار و هەڵچوونەکانی قۆناغی "تۆفان و یاخیبوونە".پلۆتی ئەم رۆمانە ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن ڤارتەر-ی خوێنکاری لاو و خەیاڵپەروەر دڵبەندی ئەشقی لوتە دەبێ، و پاشان کە دەزانێ کیژە دەزگیرانی پیاوێکی دیکەیە (ئالبێری هاورێی ڤارتەرە)، بۆ سەفەر دەچێ تابیری لوتە لە سەری خۆی دەربکات، ئاگری عەشق وردە وردە لە گیانیا بڵێسەدارتر دەبێ و بۆ شاری ماشوقەکەی دەگەڕێتەوە. لەم بەینەدا بۆی دەردەکەوێ کە لوتە شووی کردووە، و خۆی دەکوژێ. ئەم رۆمانە هەرچەندە بۆ خوێنەری سەدەی بیستەم لە رادەبەدەر عاتیفییە، بەڵام کاراکتەرسازییەکی وەستایانە، وەسفی گەش و زیندووی تەبیعەت، و بەرجەستەکردنێکی جوانی روحی ئازارمەندی تێدایە.

سالانی شاگردیی مامۆستا ویلهلم- ١٧٩٦، و سەفەرەکانی مامۆستا ویلهلم ١٨٢١-١٨٢٩کە درێژەی یەکەمە:

لەم جووتە رۆمانەدا کە رەنگدانەوەی ژیان، خزین و خەتا و گەشەکردنی خودی گوتەن، سالانی خوێندن و پەروەردە و قۆناغی خەملینی کوڕی بازرگانێکی دەولەمەند وێنە دەگیرێ، لە سالانی شاگردیی مامۆستا ویلهلمدا، قارەمانی رۆمانەکە بۆ دۆزینەوە و بەدەست هێنانی ژیان و مانای ژیان، دەست لە ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی بۆرژوازی هەڵدەگرێ. هەوەڵجار پەیوەندی بە تاقمێك ئەکتەری گەڕۆکەوە دەکات، و لەگەڵ ماریاندا، کە ژنێکی ئەکتەری ناو تاقمەکەیە،

پەیوەندی دڵداری پەیدا دەکات. لەلایەکی دیکەوە ئاشنای بەرهەمەکانی شەکسپیر دەبێ (کە لێرەدا گوتە تەفسیرێکی پڕ بەها لەمەڕ هاملیت نیشاندەدات)، ویلهلم ئەنجام ئەکتەرەکان بەجێ دێلێ، و پەروەردە و تەربێتی کوڕەکەی، کە یادگاری ئەڤینی ماریانە، دەکا بە خەمی خۆی. لەم بەینەدا تریزەو ناتالی دەناسێت، و سەرەنجام لەگەڵ ناتالیدا زەماوەند دەکات. ویلهلم لەلایەکی دیکەوە، مەرگی مینیون دەبینێ، کیژۆڵەیەکی جوانی ئیتاڵیاییە کە ئەوی لە دەستی تاقمە پەتبازیکی دڵڕەق رزگار کردووە، بە مردنی کیژە، ویلهلم "ساڵانی شاگردی خۆی" بە تەواو بوو دەزانێ. ئەو لەم قۆناغەدا فێر بووە کە بە جدی کار بکات و ژیان و ئەرکەکانی ژیان بە هەند بگرێ. درێژەی کتێبەکە رۆمانێکی تاقەتبەرە، بەڵام کەم دابێژێك سەرکەوتووە، کە مامەڵەی ویلهلمی ساردی و گەرمی چەشتوو، لەگەڵ کۆمەڵگەدا نیشان دەدا.

هەردوو رۆمانەکە لەڕووی بونیادەوە لاوازن، رۆمانی دووەم تاڕادەیەك کۆمەڵە چیرۆکێکی لێکدی دوورن کە پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بە گێڕانەوە ئەسڵییەکەوە نییە.

لەڕووی ئەخلاقیشەوە راوبۆچوونی جۆراوجۆر دەربارەی ئەم دوو رۆمانە دەربڕاوە، بەڵام زۆربەی رەخنەگران بە راپۆرتێکی موعتەبەر و پەند ئامێزی گەڕانی مرۆڤیان زانیوە بە دوای دۆزینەوەی وەڵامی مەتەڵی ژیاندا.

شانۆنامەکانی:

گوتس ڤون برلیشینگن- ١٧٧٣:

ئەم شانۆنامە بەناوبانگە وێڕای ئەم راستییەی کە بویەرەکانی لە سەدەی شازدەیەمدا روو دەدات، بە دەربڕینێکی جوانی گیانی بزووتنەوەی "تۆفان و یاخیبوون" دەژمێردرێ، گوتس رۆبن هودێکی ئەڵمانییە -رێگرێکە پشتیوانی هەژاران، ئازاردەری کەشیشان و دەوڵەمەندان، و قارەمانی ئازادییە. وایزلینگن-ی دۆستی گوتس و خۆشەویستی ماریای خوشکیەتی، دوودڵە لە نێوان وەفاداری دەرهەق بە گوتس و لایەنگری لە دەربار. گوتس، لە کاتی رابەریکردنی هەرایەکی جووتیاریدا زامدار دەبێ، دیل دەکرێ، و بە فەرمانی وایزلینگن حوکمی مەرگ دەدرێ. وایزلینگن حوکمەکە هەڵدەوەشێنێتەوە بەڵام بە خۆی بە دەستی ژنێکی جوانی دەرباری دەرمانخوارد دەکرێ. زامەکانی گوتس دەیگەیەننە حاڵی مەرگ، و لە حاڵێکا کە وشەی (ئازادی) بەسەر لێوەوەیە گیان دەسپێرێ. گیانی رۆمانتیکیانە، کاراکتەرسازی وەستایانە، و دەربڕینی کورت، بوونە مایەی سەرکەوتنی ئەم درامایە لە ساڵی ١٧٧٣دا.

ئیگمونت- ١٧٨٧- ١٧٨٨:

شانۆنامەیەکی مەیلە و مێژووییە، کە شەڕی هۆڵەندییەکان لەگەڵ ئەسپانیاییەکاندا لە سەدەی شازدەیەم وێنە دەگرێ. قارەمانی شانۆنامەکە بێ ئەقڵانە باوەڕ بە ئەسپانیاییە خاینەکان دەکات و لە پێناوی ئازادی هۆڵەندادا شەهید دەبێ.

ئیفیجینی لە تاوریس- ١٧٨٧:

درامایەکە لەسەر بنەمای شانۆنامەیەکی یورپیدس بە هەمان ناوەوە، بەڵام گوتە گرێی چیرۆکەکە بە شێوەیەکی دیکە دەکاتەوە.. لە شانۆنامەکەی یورپیدیسدا، ئاتینە لە ڕێگەی سلینگێکی گەورەوە کە لە پشت شانۆکەوە ئامادە کراوە، لەسەر شانۆ دەردەکەوێ و فەرمان بە توئاس شا دەدا کە ئیفیجینی و ئورستس ئازاد بکات. لە دراماکەی گوتەدا شا لە بەرانبەر میهرەبانی و پاکی ئیفیجینی و پەشیمانی ئورستسدا تەسلیم دەبێ، لەم شانۆنامەیەدا سادەیی کلاسیك و زاڵبوون بەسەر نەفسدا شوێنی ڕەگەزەکانی "تۆفان و یاخیبوون" و دراماکانی سەرەتای گوتەی گرتووەتەوە.

تورکاتو تاسو- ١٧٩٠:

چیرۆك و گێڕانەوەیەکی ڕۆمانتیکییە دەربارەی دوا ساڵەکانی تەمەنی تاسۆ-ی گەورە شاعیری ئیتاڵیایی. گوتە بە خۆی ناوەڕۆکی ئەم شانۆنامەیە بە "ناتەبایی نێوان بەهرە و ژیان" دادەنێ —واتە- ئاشوبی دەروونیی هونەرمەند لە کاتی تێگ گیرانی تەبیعەتی هونەری وی لەگەڵ ڕووداوە ناخۆشەکانی ژیاندا. ئەم شانۆنامەیە، وەکو تراجیدیاکانی راسین، لەسەر ساتێکی قەیرانی سۆزداری نووسراوە. واتە بە دەوری تەوری ساتە قەیرانێکی سۆزداریدا دەسوڕێتەوە. ڕووداوەکانی ئەم شانۆنامەیە گاڤێ دەست پێ دەکەن کە شاعیر تازە داستانی ئورشەلیمی ئازاد-ی تەواو کردووە، و شادوێتە لیونورا (خوشکی ئالفونسو-ی دۆکی فرارا) کە تاسۆ ئاشقی وییە، تاجە گەڵایەکی سەروو وەکو نیشانەی میری شاعیران دەکاتە سەری شاعیر، تاسۆ لە ژێر کاریگەری ستایشی ئەودا لەو ساتەدا بە جۆرێ خۆی لە بیر دەکات کە جیاوازی بەینی خۆی و شادوێتە لەبیر دەکات و پێ لە بەرەی خۆی زیاتر رادەکێشێت. ئانتونیو-ی وەزیری بە ئەزموونی دۆك، زۆر سەرزەنشتی دەکات و تانەی لێدەدات. بەینی ئانتونیو و تاسۆ تەواو تێك دەچێ تا ئاقیبەت تاسۆ داوای شەڕی تەن بە تەن لە ئانتونیو دەکات. دۆك دێتە ناو مەسەلەکەوە و تاسو زیندانی دەکرێ. تاسۆ کە زۆر ڕەنجاوە —بەتایبەتی کە خۆی بە شاعیرێکی گەورە دەزانێ- داوا دەکات ڕێگەی بدەن لە فرارا بڕوات. ئەم داوایە قەبووڵ دەکرێ. لە کاتی

خواحافیزی لە لیونورا، جارێکی دیکە هەست و سۆز بەسەر تاسۆدا زاڵ دەبێ و خۆشەویستی خۆی بۆ لیونورا دەردەبڕێ. لیونورا بە نەرمی و ناسکییەوە ئەڤینی وی رەتدەکاتەوە، بەو حاڵەوە شاعیر گیرۆدەی گرفتی نائومێدی دەبێ. سەرەنجام تاسۆ، ئەنتونیوی ئیجابی و ئەهلی کار بە تەواوکەری بنیادەمێکی خەیاڵپەروەری وەکو خۆی دەزانێ و دۆستایەتی وی قەبووڵ دەکات. کێشمانەکێشە دەروونییەکانی تاسۆ نەك هەر گۆرانکارییە دەرونییەکانی خودی گوتە لە پایەی رەسمی ئەودا، لە دەرباری دۆك کارل ئوگوستدا، وەبیر دێنێتەوە، بەڵکو پەیوەندییەکانی شاعیر لەگەڵ فراڤون شتاین-یشدا نیشان دەدا.

فاوست (دەستپێك ١٧٦٩، تەواوکردن و بڵاوکردنەوە- ١٨٣٢):

سەرچاوەکانی:

لە ئەفسانەی ئەڵمانیدا دەگێردرێتەوە کە یوهان فاستوسی "مامۆستای سیحر و جادووگەری" لە دەوروبەری ساڵی ١٥٢٥دا لە فرانکفورت دەژیا، بە گویرەی گێرانەوە چاپی "١٨" یەکەی ساڵی ١٥٨٧، هەمان دکتور فاوست، حیلەبازی و نێرەنگ دەکات بە پیشە، لەگەڵ شەیتاندا پەیمان دەبەستێ و، ئاقیبەت بەسزای کاری خۆی دەگات. کریستوفر مالرو لەسەر بنەمای هەمان حیکایەت شانۆنامەی دکتور فاوستوسی لە ساڵی ١٥٩٠دا نووسی. جگە لەمە زۆر حیکایەتی دیکە لەسەر بنەمای ئەم ناوەرۆکە دانرابوون کە تا سەدەی هەژدەیەم دەماودەم دەگێردرانەوە. گۆتە ئاگای لە هەموو ئەم حیکایەت و گێرانەوانە هەبوو.

فۆرم و تەکنیك:

فاوست لە قاڵبی جۆراوجۆری شیعری دا هۆنراوەتەوە، و هەندێ بەشی بە پەخشان نووسراوە، وشەی "دراما" بۆ ئەم بەرهەمە ناوێکی نابەجێیە، چونکە لەڕاستیدا شیعرێکی دراماتیکی درێژە لە دوو بەشدا "نزیکەی شازدە هەزار بەیتە".

چیرۆکەکە:

بەشی یەکەمی فاوست، وەکو کتێبی ئەیوب (لەتەوراتدا)، بەسەرەتایەك دەست پێدەکات کە دیمەنێکە لە بەهەشت. لێرەدا خوا فاوست دەخاتە بەردەم وەسوەسەکانی مفیستوفلس-ی"١٩" شەیتان. مفیستوفلس پێشنیازی سەروەت، ژن، شانازی و هەرچییەك ئارەزوو بکات، بۆ فاوست دەکات، بە مەرجێ کە ویستەکانی هاتنە دی- لە ساتێکی شادمانی وەهادا کە ئارەزوو بکات ئەو ساتە هەر پایەدار بێ- روحی خۆی تەسلیم بە شەیتان بکات. فاوست مەرجەکان قەبووڵ دەکات، و قەراردادەکە بە خوێن ئیمزا دەکرێ. مفیستوفلس هەوەڵجار فاوست بە

لەزەتی بادەنۆشی و رابواردن تاقی دەکاتەوە. بەڵام لەم نەخشەیەدا شکست دێنێ، و دەکەوێتە بیری ئەوەی بە ئەڤین لە خشتەی بەرێ. فاوست بۆ ئاشخانەی سیحربازە مێچکەکان و دەرمانێکی دەرخوارد دەدەن کە لاوی بۆ دەگێڕێتەوە. هەنگێ تراجیدیا بەناوبانگەکەی مارگارت (گرچن) دەست پێدەکات. فاوست بە هاوکاری مفیستوفلس، کیژێکی لاو دەخەڵەتێنێ. لە شەڕێکی تەن بە تەندا برایەکەی دەکوژێ، و ناچار لە شار هەڵدێ. گرچن منداڵێکی دەبێ، لە پەرێشانحاڵی و نائومێدی دا دەیکوژێت، دەکەوێتە زیندان، و حوکمی مەرگ دەدرێ. فاوست و مفیستوفلس زەمینەی ئازادکردنی فەراهەم دەکەن، بەڵام کیژەکە لە کردەوەی خۆی ژێوانە، مل بۆ هەڵاتن نادا، تا بە مەرگی خۆی کەفارە و سزای گوناحەکانی بدات. ئاقیبەت کاتی مەرگی دێ. مفیستوفلس هاوار دەکات کە ئەم کیژە نەفرەتی لێکراوە، بەڵام فریشتەکان وەڵام دەدەنەوە کە بەخشراوە. بەجۆرە بەشی یەکەم تەواو دەبێ.

لە بەشی دووەمدا، فاوست و مفیستوفلس دەچن بۆ دەرباری ئیمپراتۆری ئەڵمان، و لە ئاستەنگە داراییەکانیدا یارمەتی دەدەن، پاشان مفیستوفلس، هیلینی تەروادەیی لە جیهانی روحانەوە ئامادە دەکات و دەیهێنێ. فاوست شەیدای ئەو دەبێ، بەڵام چونکە دەستی لێ دەدات هیلین ون دەبێ- ئەمە دەربڕینێکی مەجازییانەی ئەو باوەڕەی گوتەیە کە ناتوانرێ لە پڕێکا و بەبێ هەوڵ و تەقەللا کەماڵ بە دەست بێت. ئەوجا فاوست دەچێ بۆ یونان، و لەوێندەر بە یارمەتی مفیستوفلس لەگەڵ هیلیندا زەماوەند دەکات، ئەم پەیوەندییە، دەربڕینی رەمزییانەی ئارەزووی شاعیرانەی خودی گوتەیە، واتە پەیوەندی "شیعر و هونەری باکوورییە بە جوانی ئایدیالی یونانییەوە". (بە گوتەیەکی دیکە، ئەم زەماوەندە نیشانەی پەیوەندی کلاسیسزمە بە رۆمانتیزمەوە، واتە ئەو گوتە و پەیڕەوکارەکەی "لوردبایرون" داوایان دەکرد، بەرەنجامی پەیوەندی فاوست لەگەڵ هیلیندا، منداڵێکە بە ناوی یوفوریون، کە فڕینی بە ئاسماندا دەبێتە مایەی کەوتن و مردنی، و لەڕاستیدا بەرجەستەکردنێکی لورد بایرونە لەلایەن گوتەوە. هیلین جارێکیدی لەبەرچاو غەیب دەبێ. فاوست پشتیوانی ئیمپراتۆر لە شەڕدا دەکات، و دەگاتە حکومەتایەتی سەرزەمینێ کە لەوێندەر خۆی وەقفی ئاسودەیی خەڵکی دەکات. جا لەم حاڵ و بارەدا کە وا دەزانێ ئارەزووەکانی هاتوونەتە دی، لە ساتە وەختێکدا هێندە خۆی بەختیار و شادومان دەبینێ کە خۆزیا دەخوازێ ئەو ساتە وەختە هەر بەردەوام بێ. لەم کاتەدا گیان دەسپێرێ. مفیستوفلس، بەو خەیاڵەی کە قەرارادادەکە بە تەواوی ئەنجامدراوە، داوای روحی فاوست دەکات، بەڵام فریشتەکان سوورن لەسەر ئەوەی کە

ئەم "ساتە وەختە" لەبەر خاتری هاونشینی وی لەگەڵ شەیتاندا نەهاتۆتە دی، بەڵکو زادەی گەشەکردنی مەعنەوی خودی فاوستە. روحی فاوست بۆ بەهەشت رێنوێنی دەکەن، و لەوێندەر گرچن و مریەم خێرهاتنی دەکەن.

چەمك و فەلسەفە:

فاوست-ی گوتە تەنیا رەمز و مەجازی ئینسانێك نییە کە روحی لە بارتەقای دەسەڵات، لەزەت، زانست، و سەروەت بە شەیتان دەفرۆشێت، ئەم درامایە شرۆڤە و لێکۆڵینەوەی خەباتە دژی "ئەو ئەنگێزە سەلبی و شەڕانەی کە لە هەر مرۆڤێکدا بە تەرزێك هەیە... خولاسە، پەیامی دراماکە ئەمەیە: مادامێکی مرۆڤ لە پێناوی ئارمانجێکی بەرزدا تێ بکۆشێت، بێگومان شایستەی رزگارییە پڕ بە مانای بەرینی ئەو وشەیە".... یا جان میسی گوتەنی، "خود رێگەی ئامانجە، ژیان ئامانجی خودە، کەماڵ مەحاڵە... لەبەر ئەمە باڵاترین سەرکەوتنی ئێمە هەوڵ و خەباتی ئابڕوومەندانەیە، و ماندوو نەبوونە لە ژیانێکی داهێنەرانە".

وەکو زۆر جار ئاماژە کراوە، فاوست لە زۆر رووەوە دەشوهبێتە سەر خودی گوتە. هەردووکیان ئارەزووی دەسەڵات و لەزەتی دنیاییان هەبوو و پێی گەیشتن، و هەردووکیان بیری خۆکوژییان لەسەردا هەبوو و رەتیان کردەوە، هەردووکیان دروستییان لە بەردەم خوّدا بینی، بەڵام زیاتر بە ئانقەست و زانستانە نادروستییان هەڵبژارد، چیرۆکی گرچن لە هەندێ لایەنەوە بە سەربوری خودی گوتە یا فردریکە بریون دەچێ.

رەخنەکان:

رەخنەگران، ئیرادیان لە بێ فۆرمی و ناکۆکی شانۆنامەی فاوست گرتووە. گەلێك لە شرۆڤەکاران بەشی دووەمی کتێبەکە بە تاقەتبەر و دژوار دەزانن. کاراکتەرسازییەکانیش هەندێ جار سست و مەیلەو ناسازن.

زۆربەی رەخنەگران وێڕای ئەوەی کە پێیان وایە هەندێ بەشی کتێبەکە تاقەتبەر و هەندێکی ئاڵۆزە، لەمەدا هاو رەئین کە فاوست نەوەك هەر گەورەترین بەرهەمی گوتەیە بەڵکو گەورەترین نووسراوی ئەدەبیشە لە پاش مردنی شەکسپیر و دانتی. کالڤین تۆمس دەڵێت کە فاوست "شکۆدارترین هۆزانێن خەیاڵئەنگێز، قوڵترین رەخنەگرتن لە ژیان، دلگیرترین و جوانترین واقیع گەری، جوانترین شۆخیبازی، و بەزەیی ئەنگێزترین تراجیدیای لەمەڕ ئەڤیندداری لەگەڵ ژندا لەخۆ گرتووە کە تا ئێستا لە زمانی ئەڵمانیدا دەرفەتی دەبڕینی بۆ رەخساوە".

ب. و. ولز ئاماژە دەکات کە "هەموو رەخنەگرانی ئەڵمانی فاوست بە گەورەترین ئەدەبیاتی خود و بە ئەڵمانی ترین داهێنانی هزری ئەڵمانیی دەزانن".

پریست-یش فاوست بە "قوڵترین و دەوڵەمەندترین بەیت، لە ناو هەموو داهێنانەکانی ئەدەبیاتی هاوچەرخدا" ناو دەبات.

رازی گەورەیی ئەم کتێبە لە دەرك و تێگەیشتنی بەرێنێتی لە تیرەی بەشەر و سستی ئەخلاقی مرۆڤ، لەوەدایە هەندێ بەشی لەمەڕ جوانی و قودرەت و دەسەڵاتی مەزن لەخۆ گرتووە وەکو دیمەنی مردنی گرچن و، جەخت کردنەوە لەسەر خەبات لە پێناوی باڵاترین بەهایاندا.

<u>هەڵسەنگاندن:</u>

ژمارەیەکی زۆر کەم لە شرۆڤەکاران بەوە قاییل نابن کە گۆتە لە زومرەی عەجایەبەکانی جیهانی ئەدەبیات دابنەن، چونکە بە بۆچوونی ئەمان بەرهەمەکانی وی لە رادەبەدەر ئوتوبیوگرافیانەن و بە هیچ جۆرێ رەنگدانەوەی شکۆ و گەورەیی روحی خاوەن بەرهەم — یەکێکە لەو مەرجانەی کە لونگینوس بۆ بەرزی بەرهەمی ئەدەبی داناوە- نین. بەڵام زۆربەی رەخنەگران ستایشی گوتەیان کردووە، لەوانە هاینریش هاینە دەڵێت کە "سروشت دەیویست تەماشای وێنەی خۆی بکات و گۆتەی دروست کرد". ماتیونارنولد گوتە بە "حەکیمترین پیاوی ئەوروپا... پزیشکی سەردەمی ئاسن" ناو دەبات. رەخنەگرێکی دیکە بە گەورەترین شاعیری سەدەکانی هەژدەیەم و نۆزدەیەمی لە قەڵەم دەدا. هەروەها رەخنەگرێك پێی وایە کە گوتە بەزەوقترین ئەدیبە کە تا ئێستا جیهان بە خۆیەوەی دیتووە. و هرمان گریم دوا قسە لە وەسفی گوتەدا دەکات و بە "گەورەترین شاعیری هەموو میللەتان و گشت سەردەمانی" ناو دەبا.

لەوەیە هەندێ لەم ستایشانە کەمێك گەرم و گوڕی و شەیدایی توندڕەوانەیان پێوە دیار بێ، بەڵام لە ماوەی پتر لە سەدەیەکدا زۆربەی خەڵکی لەمەدا کە گوتە یەکێکە لە چوار پێنج سیمای گەورەی جیهانی ئەدەب، هاو بۆچوونن.

<u>یۆهان کریستوف فریدریش ڤون شیلەر (١٧٥٩- ١٨٠٥):</u>

شیلەر لە مارباخ لە ڤرتمبرگ لە دایك بوو، لە منداڵیدا رۆژگارێکی هەندێ ناخۆشی بەسەر برد، ئەوسا بە پێچەوانەی حەزی خۆیەوە خرایە یەکێك لە قوتابخانە سوپاییەکانەوە (١٧٧٣-١٧٧٩) و لە بەشی مافدا خوێندی، پاش ماوەیەك دۆکی ڤورتمبرگ ناچاری کرد کە پزیشکگەری بخوێنێ. لە ساڵی ١٧٧٩دا وەکو جەڕاحی سوپا لە شتوتگارت کەوتە خزمەت کردن. لەم حاڵ و بارەدا ژیانی سوپایی روحی ئازار دەدا و ئاقیبەت لە دەستی زوڵم و زۆری

دۆك بۆ مانهایم هەڵات. ساڵانێکی لە ئاوارەیی و دەربەدەریدا بەسەر برد، لەوانە: لەلایپزیگ((١٧٨٥- ١٧٨٦)، لە سدن (١٧٨٦- ١٧٨٧)و لە وایمار (١٧٨٧- ١٧٨٨) لە زۆربەی ئەو رۆژگارانەدا ئەسیری چنگی هەژاری بوو. کاری مامۆستایەتی زانستگەی ینا کە گوتە بۆی دۆزیبووەوە (١٧٨٩)و ئەو موچە ساڵانەیەی کە دۆك هولشتاین- ئوگوستن بورگ لە ساڵی ١٧٩١ بە دواوە بۆی بڕیبووەوە کرانەوەیەکی لە ژیانیدا چێکرد. سێ ساڵ دواتر، بەرانبەر بە پارەیەکی باش کەوتە بڵاوکردنەوەی مانگنامەیەك لە مەیدانی جوانیناسیدا بەناوی (سەعاتان)، و داوای لە گۆتەش کرد کە هاوکاری بکات، بەجۆرە نامە و دۆستایەتی نێوان ئەم دووانە دەستی پێکرد کە تاکو مردنی شیلەر بەردەوام بوو. لە ساڵی ١٧٩٩دا بە چوونی شیلەر بۆ وایمار، ئەم دۆستایەتییە قوڵتر بوو. شیلەر لە ساڵی ١٨٠٥دا لە وایمار کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی:

ناوەڕۆکی هەمیشەیی بەرهەمەکانی شیلەر شەیدا بوونە بە ئازادی. لە شانۆنامەکانی سەرەتاییدا جۆش و خرۆش و تاسەمەندییەکی زۆر سەبارەت بە ئازادی تاك- لە سیاسی و کۆمەڵایەتی- بەدی دەکرێ. بەرهەمەکانی دواتری زیاتر دەربڕی ئازادی مەعنەوی و گشتین. لە بەرهەمەکانی ساڵانی کۆتایی تەمەنی شاعیردا کاریگەری ئەخلاق و جوانیناسی کانت ئاشکرا و دیارە.

شیلەر جگە لە شانۆنامەکانی، مێژوویەکی دەربارەی جەنگی سی ساڵە، چەند نامەیەکی لەمەڕ جوانیناسی، و ژمارەیەکی هەندێ زۆری هۆزانی لیریکی و فەلسەفی و چامانی لە پاش بەجێماوە. هۆزانە لیریکییەکانی هزرمەندانەن، و کاریگەرییان پتر لە رێگەی دەربڕینی هونەرییانەی ئەندێشە فەلسەفییەکانەوەیە تا لە رێگەی دەربڕینی ئاشکرای هەست و سۆزەوە بێ. چامەکانی دەربڕی هزرێن ئەخلاقین. هەندێ لە هۆزانە لیریکییە بەناوبانگەکانی ئەو: "بە شادومانی"، "هونەرمەندان" و "دەنگی زەنگ". "ئەبەرد دەگەڵ ئەژدیهادا"و "غەواس"یش لە چامە بەناوبانگەکانی ئەون و شایستەی باسن.

نامەکان:

شیلەر کە بە قوڵی لە ژێر کاریگەری بەرهەمە فەلسەفی و ئەستاتیکییەکانی کانتدا (بەتایبەتی رەخنەی ئەقڵی پراکتیکی، ١٧٨٨، و نەقدی حوکم و بڕیار، ١٧٩٠) بوو. هەستی دەکرد کە زەرورەتێك گوشاری بۆ دێنێ تا دەربارەی پەیوەندی نێوان هونەر و ئەخلاق بنووسێت. ئەویش وەکو کانت دژی ئاسانگیری و ئەقڵانییەتی درۆینە، فەلسەفەی ئەپیکوری و

دەروونگەرایی، تاکگەرایی بێباکانەی رابەرانی بزووتنەوەی "تۆفان و یاخی بوونـە". لـە بـاوەڕ بوون بە ئازادی ویست و زەرورەتی بە پیرەوە چوونی گازی ویژدانیشدا هـاورەأیی کانتـە... بـە هەر حاڵ، شیلەر لە مەیدانی جوانیناسیدا، کە زەمینەی تایبەتی لێکۆڵینەوەی ئـەو بـوو، لـە کانت دابڕا، لە (نامە فەلسەفییەکاندا ١٧٨٦- ١٧٨٨) رای دەگەیەنێ کـە لـە هـەر شـتێکدا تایبەتمەندییەکی زاتی هەیە کە ئەو شتە جوان دەنوێنێ، کانت باوەڕی وایە کە هیچ پێوانەیەکی بابەتی لە ئارادا نییە، شیلەر پێ وایە کە ئەم جۆرە پێوەرە (ئازادی رواڵـەتی)یـە، و مەبەسـتی ئەمەیە کە بەرهەمێکی هونەری لە حاڵێکا جوانە کە پابەندی هەموو یاسا هونەرییـەکان بـێ، بەبێ ئەوەی کە ئەم پابەندییە ئاشکرا و دیار بێ. (ئەم تیۆرییـە بـە تـەواوەتی هـاو پەیوەسـتە لەگەڵ ئەم باوەڕەی شیلەردا کە ئامانج و مەبەستی پەروەردە و فێرکردن، تەربێت دانـی مرۆڤـە بەشێوەیەك کە ئەوەی دروست و راستە ئەنجامی بدات). شیلەر لە نامەیـەکی تریـدا دەربـارەی (لوتف و ویقار- ١٧٩٣)، جارێکی دی بە دەربڕینی ئەمەی کە جـوانی و تەبیعـەتی بەشـەری ناتەبان، لە کانت جیا دەبێتەوە، هەوڵدەدا بیسەلمێنێ کە لەودیو ئەو شتەوە کە ئەو ناوی جوانی "بەدەنی" لێ دەنێ، جوانییەکی دیکە لە مرۆڤدا هەیە کە لە کەسایەتییەوە سەرچاوە دەگـرێ: و ئەمە هەمـان "لوتف"ە، و جلیوەی کەسایەتی جوانە، لە حاڵێکا کە ویقار جیلوەی فیکرێکی بەرزە، هەمان ئەم بیرانە لە بەرهەمی چەند نامەیەك دەربارەی فێربـوونی ئەسـتاتیکا- ١٧٩٥ بەردەوام دەبن. شیلەر لەم بەرهەمەدا، کـە شـایەدی گـرنگترین نامـەی وی بـێ لـە مەیـدانی ئەستاتیکادا، باوەڕی وایە کە ئەخلاق و جوانی لێکدی نایەتە دابڕان، و پێی وایە کە گـرنگترین و گەورەترین کەلتووران بەرەنجامی یەکێتیی (لوتف و ویقارە). لە نامەی (دەربارەی شیعری پاك و هەستیاریی ١٧٩٥- ١٧٩٦)دا شـاعیران بەسـەر دوو دەسـتەدا دابـەش دەکـات: شـاعیرانی "خۆڕسك"یان "تەبیعی"، (کە عادەتەن ئەمانە لە رۆژگارانی کۆندا دەبینرێن، بـەڵام نـەك بـە تایبەتی) کە پایەیەکی باڵاتریان هەیە، چونکە تەبیعەت بە شێوەیەکی خۆڕسك، بابەتی، و بـێ بیرکردنـــەوە دەخولقێننـــەوە، و شـــاعیرانی "هەســـتیاریی" یـــان "ئەندێـــشەمەندی" کـــە شارستانییەت، یەکێتیی هێزی ئیدراك و خۆڕسکی لێ سەندوونەتەوە، ئەم شاعیرانە (و شـیلەر دەڵێ کە زۆربەی شاعیرانی سەردەمی تازە ئیحساساتی-ن) پایەیـەکی نزمتریـان لـە دەسـتەی یەکـەم هەیـە، چـونکە سـەروکاریان لەگـەڵ سروشـتدا بـە جـۆرێکی ناراستـەوخۆیە، ئەمانـە سەروسەختیان لەگەڵ هزر و ئارمانجدایە، بەڵام ئەمانەش دەوری تایبەتی خۆیـان هەیـە- یـانی نواندنەوەی هەست و سۆزان، ئەنجامگیری کردن، تاقیـب کردنـی ئارمـانج... و نزیـك بوونـەوە

لەوەی کە بێ کۆتاییە. رویرتسون ئەم نامەیە بە بەرەڤانینامەی شاعیر لە شیعری خۆی دەزانێ چونکە شیلەر ئاگادار بوو کە زیاتر شاعیرێکی ئیحساساتییە تا تەبیعی.

**شانۆنامەکانی:**

**رێگران- ١٧٨١:**

شانۆنامەیەکە (بە پەخشان) رەقی و توندی و زبری و پیلانگێڕی بەرجەستە دەکات. کارل مور، لە ئەنجامی فیتنەیی و دەسیسەکاری فرانز-ی برای لە بابی زویر دەبێ و دەبێ بە رابەری دەستەیەك رێگر، بەڵام ئەویش وەکو گوتس ڤون برلیشینگن، "رێگرێکی شەریفە"، خەتا باران سزا دەدات و یارمەتی هەژاران دەدات، فرانز بابیان دەخاتە زیندانەوە و لێدەبڕێ ئامیلیا-ی دلبەری کارل بە تۆبزی ناچار بکات زەماوەند لەگەڵ خۆیدا بکات. کارل بە بیستنی ئەم هەواڵە بە خۆی و دار و دەستەکەیەوە هێرش دەباتە سەر فرانز. فرانز خۆی دەکوژێت، باوکەکە دەمرێت، ئامیلیا کە پەی بەوە بردووە کارل لەبەر ئەو سوێندەی کە خواردوویەتی ناتوانێ لەگەڵ ویدا زەماوەند بکات، داوا دەکات کە ئەویش بکوژن. کارل ناچار بە شمشێر دەیکوژێت، و ئەوسا خۆی دەداتە دەستی بەرپرسانی یاساوە، زانیویەتی کە خەیاڵەکانی هەڵە بوون -و یاساشکێنی رێگەی چاك کردنی هەڵە و خەتایان نییە.

**ئەڤین و پیلانگێڕی ١٧٨٤:**

تراجیدیای (بە پەخشانە) ژیانی چینی بورژوایە. فەردیناند-ی کوڕی حاکمی بێ مەرامی ویلایەتێکی بچووك، حەز لە لویز-ی کیژی مۆسیقازانێك دەکات. حاکم بۆ وەی رێگە لە زەماوەندی ئەم دووە بگرێ، کیژە ناچار دەکات تا وا بنوێنێ کە دڵی بە کەسێکی ترەوەیە. فەردیناند ژەهرێك ئامادە دەکات، و بەر لەوەی کە لویز فریا بکەوێ پەردە لەسەر بویەرەکە لابەرێ، هەردووکیان ژەهر دەخۆنەوە، بابەکە ژێوان دەبێتەوە و خۆی تەسلیمی قانون دەکات. ئەم شانۆنامەیە سوچێك لە ریسواییەکانی چینی ئەرستۆکرات ئاشکرا دەکات و ئەوە نیشان دەدات کە چۆن بەد رەفتاری ئەرستۆکرات سەبارەت بە چینی بورژوا بۆ هەردوو چینەکە مایەی نسیبەتە.

**دون کارلوس ی شازادەی ئەسپانیا ١٧٨٧:**

یەکەمین شانۆنامەی شیعریی بێ قافیەی شیلەرە. پلۆتی دراماکە سادەیە: دون کارلوسی کوڕی فیلیپی دووەمی پاشای ئەسپانیا، حەزی لە شابانۆ ئیلیزابت-ی ژنی بابی خۆی کردووە. شا پەی بە خەیاڵەکانی وی دەبات، و تەسلیم بە کاربەدەستانی تەفتیشی باوەڕانی دەکات.

ماركی پوزا لە كەسایەتییە سەرەكییەكانی ئەم تراجیدیا مێژووییەیە، دۆست و شیرەتكاری دون كارلوسە كە بە (سەفیری ئینسانیەت) دەژمێـردرێ. داكۆكیكـارێكی بـوێرە لـە ئـازادیی، كـە شیلەر ئایدیالیزمی سیاسی خۆی و لایەنگری لە حكوومەتی زانایـان و خێرخـوازان لـە زەمـانی ئەوەوە بەرجەستە دەكات و دەردەبڕێ. ئیجابیەتی ئەم شـانۆنامەیە لـە قـوڵی بیرەكـانی و لـە زمانە سفتەكەیدا پەنهانە.

والنشتاین ١٧٩٨-١٧٩٩:

شانۆنامەیەكە لە سێ بەشدا: ئۆردوگای والنشتاین-١٧٩٨، پێشەكییەكە لە یەك پـەردەدا، پیكولومینی-١٧٩٩و مەرگی والنشتاین-١٧٩٩كە هەر یـەكێكیان لـە پێـنج پـەردە دایـە. قارەمانی سەرەكی ئەم درامـا مێژووییـە، والنـشتاینی فەرمانـدەی هێزەكـانی ئەڵمانییـە لـە جەنگێن سی ساڵەدا. ئەو كـە تینـووی دەسـەڵات و پایەیـە. دەكەوێتـە بـیری خیانـەت و لـە پیلانێكدا دژی ئیمپراتۆر دەست لەگەڵ سـوێدییەكاندا تێكـەڵ دەكـات. كۆنـە دۆسـتەكەی وی ئوكتاڤیو پیكولومینی، پیلانەكە ئاشكرا دەكات، و زۆربەری سـەربازان لـە دەوری والنـشتاین دوور دەكەونەوە. شیلەر بۆ یەكەمین جار لەم درامایـەدا كەسـایەتییەكی گـەورەی ئەفرانـدووە. پلۆتی لاوەكی دراماكە سـەربوری ئـەڤینی تـەكلا-ی كیـژی والنـشتاین، و مـاكس-ی كـوڕی پیكولومینی بەرجەستە دەكات. (شیلەر لێرەدا جەخت لەسـەر توانـای داهێنەرانـەی بەشـەری دەكاتەوە و باوەڕی خۆی بە جەبر و حەتمیەتی مێژوو دەردەبڕێ).

ماری ستوارت- ١٨٠٠:

ئەم تراجیدیا مێژوویی و سیكولۆجییە بە ناودارترین شانۆنامەی شیلەر دەژمێردرێ. كار و جوڵە لەم شانۆنامەیەدا كەمە. كە شانۆنامەكە دەست پێدەكات، خوێنـەر بـۆی دەردەكـەوێ كـە مـاری (شابانۆی سكوتلاند) بە مەرگ مەحكومە، و دراماكە بـە شـێوەیەكی گـشتی بـە دەوری تـەوەری تۆمەتبار كردنی شابانۆ ئەلیزابت لەلایەن مارییەوە، كـە لـەڕووی ئەخلاقییـەوە پێدەچـێ شـایانی سەرزەنش بێ، دەسوڕێتەوە. ماری ئەگەر چی تا رادەی ستایش و ئافەرین بوێرانە وێنەگیراوە، لێ بێ گوناحی و سادەیی ئاشكرای وی بوار نادات كە بتوانرێ بە قارەمانی تراجیدیاكە دابنـرێ. بـە هـەر حاڵ، ماری بە تاوانی هاودەستی كردن بۆ كوشتنی ئەلیزابت مەحكومە، و بە خۆی سـزای ئیعـدام وەكو سزایەكی خوایی بۆ گوناهانی رابردووی قەبووڵ دەكات. (دیمەنی ململانێی هەردووشـابانۆ كـە لەوێدا ماری خۆی لە ئاستی مەعنەویدا بە باڵاتر نیشاندەدات، شێوەیەكی دراميیە كە شـیلەر بـە كاری هێناوە، و لەگەڵ حەقیقەتی مێژووییدا یەك ناگرێتەوە).

خانم ئورلیان- ١٨٠١:

لەم "تراجیدیا رۆمانتیکەدا" (بە گوتەی خودی شیلەر)، جاندراك وێنای نیشتیمانپەروەری و ملکەچییە بۆ خوا. کێشمانەکێشی تراجیدی نێوان پەیامی جاندارك و کەسایەتی وی لە پایەی ئینسانێك دایە، بەجۆرە کە لە ساتێکی رەوتەنی دا پەیامی خۆی سەبارەت بە لاوێکی ئینگلیزی بەناوی لیونل لە یاد دەبات. پاشان بە چاوپۆشی لە لیونل-ی لاو و بە مەرگی خۆی سزای گوناهەکانی رابردوو دەدات.

بووکی مسینا- ١٨٠٣:

یەك (تراجیدیای چارەنووسە) لەسەر بنەمای گێرانەوەیەکی جیاواز لە نێوەرۆکی کۆنی ئودیپ، فالچییەك بە شازادە مسینا دەڵێت کە کیژێك بە نێوی بیاتریس، کە هێشتا لە دایك نەبووە، دەبێتە باعیسی مردنی هەردوو کورەکەی وی. کە بیاتریس دێتە دنیاوە، شازادە فەرمان دەدا فرێی بدەنە دەریاوە. دایکی کیژە نەجاتی دەدات و دوور لە چاوی شازادە دەکەوێتە بەخێوکردنی.، دوو برایەکەی، سزار و مانۆئیل، کە کیژە ناناسن، حەزی لێدەکەن، سزار لە ئیرەییدا مانوئیل دەکوژێ، و پاشان کە دەزانێ بیاتریس خوشکی خۆیەتی، خۆی دەکوژێ. شیلەر لەم درامایەدا بە سوود وەرگرتن لە گرووپی کۆراڵ (کە لێرەدا گۆرانی نالێن بەڵکو قسە دەکەن)، بەکار هێنانی دەوری چارەنووس، و تەوزیف کردنی ناوەرۆکی گوناحی بۆ ماوەیی، دڵبەندی خۆی بە سۆفوکلیس نیشان دەدات.

ویلهلم تل — ١٨٠٤:

درامایەکی داستانییە دەربارەی ئازادی و جیابوونەوەی وڵاتی سویسرا لە نەمسا، ئەم درامایە چیرۆکی بەناوبانگی خەباتی سەرکەوتووانەی تل دژی حاکمی ستەمکار گسلر دەگێرێتەوە. ئەم داستانە هەمیشە بە دڵی خەڵکی ئەڵمان و سویسرا، و ئیلهامبەخشی نیشتیمانپەروەران بووە.

هەڵسەنگاندن:

ئەگەرچی زۆربەی رەخنەگرانی هاوچەرخ گەورەیی شیلەر لە گوتە بە کەمتر دەزانن، پێیان وایە کە فرە لایەنی و واقیعیەتی گۆتەی نییە، بەڵام ژمارەیەکیش -بەلای کەمەوە لە واری شانۆنامەنووسیدا- ئەو لە گۆتە بە گەورەتر دەزانن. جیمزك- هاسمر، شیلەب لە درامانووسیدا بە "هاوسەنگی گوتە" دەژمێرێ، و دەنووسێت کە شیلەر "نموونەی بەرزی شاعیرێکی ئەڵمانییە. هیچ شاعیرێکی دیکە لەرووی رەسەنایەتییەوە لەو تێ نەپەڕیوە..."

ویلکینسونش لەگەڵ هاسمردا، بەتایبەتی لە بابەتی ڕەسەنایەتیدا هاودەنگە و والنشتاین "بە گەورەترین هۆزانی ئەدەبیاتی ئەڵمان" دەزانێ. روبرتسون پێی وایە: "شیلەر نموونەی گەورە شاعیرانێکە کە کارلایل "شاعیری قارەمان"ی پێ دەگوت... نووسینەکانی سەر ڕێژن لە گیانی ئایدیالیستی ڕەسەن و هیمەتی بەرز، بەڵام پەیامی ئەم بەرهەمانە بۆ جیهانی ئەمڕۆ لە ریالیزمی بێ لایەنانەی گوتە کەمترە... لەگەڵ ئەمەشدا شیلەر گەورەترین درامانووسی ئەڵمانییە".

# ژێدەران:

١- جەنگی حەوت ساڵە (١٧٥٦- ١٧٦٣):

جەنگی نێوان فەڕەنسا و نەمسا و روسیا، ساکس و سوێد و (لە ساڵی ١٧٦٢ بە دواوە) ئەسپانیا لەلایەك، و پروس و بەریتانیای گەورە و هانوڤر لەلایەکی دیکە. لە ئەنجامی ئەم جەنگەدا بەریتانیا بوو بە ئیمپراتۆرییەتی کۆلۆنییەکانی جیهان و پروس بوو بە یەکێك لە دەوڵەتە بە دەسەڵاتەکانی ئەورووپا.

٢- فردریکی گەورەی (١٧١٢- ١٧٨٦) پاشای پروس (١٧٤٠- ١٧٨٦).

٣- پیتیزم- Pietism:

بزووتنەوەیەکی ئایینی بوو لە کڵێسا لوتەرییەکانی ئەڵماندا لە ئاخر و ئۆخری سەدەی هەڤدەیەما سەری هەڵدا و مەبەستی رازانەوە و پاك کردنەوە نەبوو، بەڵکو باوەڕی باتینی و ژیانی بەپێی پرەنسیپەکانی مەسیحییەت دەخستە سەرووی رواڵەتی پرەنسیپەکانی باوەڕی مەسیحییەوە و جەختی لەسەر خوێندنەوە و موتاڵای کتێبی موقەدەس دەکردەوە. پیتیستەکان باوەڕیان وابوو مرۆڤ بە ئەنجامدانی کاری چاك لە گوناح پاك دەبێتەوە.

٤- جوزیفی دووەم (١٧٤١- ١٧٩٠):

شای ئەڵمان (١٧٦٤- ١٧٩٠): ئیمپراتۆری ئیمپراتۆرییەتی موقەدەسی رووم (١٧٦٥- ١٧٩٠).

٥- رۆسۆیزم: پەیڕەو کردنی راوبۆچوونانی جان جاك رۆسۆ، وەکو پەروەردەی تەبیعی، ماف و ئازادییەکانی تاك، یەکسانی و .... هتد.

٦- تۆفان و یاخی بوون (Sturmund Drang):

بزووتنەوەیەکی ئەدەبی ئاخر و ئۆخری سەدەی هەژدەیەم بوو کە هردر-ی نووسەر و فەیلەسووفی ئەڵمانی دامەزرێنەری بوو. ئەم بزووتنەوەیە کە ناوی خۆی لە شانۆنامەیەکی فریدریش م. ڤون کلینگرەوە بە هەمان ناو وەرگرتبوو، یاخی بوونێك بوو بەرانبەر بە قەرارداد و پرەنسیپ و دابە باوەکان، بەتایبەتی بەرانبەر بە گیانی رۆشنگەری و کلاسیسزم. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەو بزووتنەوەیە تەبیعەت پەروەری بوو کە باوەڕی بە

جۆرە وەحدەی وجودێك هەبوو، ئەمەش شاعیرانی لاوی لایەنگری بزووتنەوەکەی بەرەو قەبوولی پرەنسیپانێك کە لەودیوی ئەقڵەوە بوو، رادەکێشا.

۷- باکوس پەرستان- Bacchants:

(لە ئایینانی یۆنان و روم) بەو ژنانە دەگوترا کە باکوس یادیونوسوس (خوای شەراب) یان دەپەرست. سروودی پەنهانی وان، بە بێهۆشی شێتانە ئەنجام دەدرا و بریتی بوو لە مەیخۆری و مۆسیقای توند و وروژێنەر، یۆنانیان، مادیناس-یشیان پێ دەگوتن.

۸- تارانت (ئیتالیایی: تارانتو) شاری ئاپولیا، لە باشووری ئیتالیا، لەسەر کەنداوی تارانت.

۹- ئارخوتاس (٤٣٠ پ.ز- ؟) ریازیات زان و فەیلەسووفی فیتاغوری رۆمی.

۱۰- بریسلاو- Breslau:

شارێکە لە باشووری رۆژئاوای پۆلەندا.

۱۱- یوهان یواخیم وینکلمان (۱۷۱۷- ۱۷٦۸) ئارکولوجیست و مێژوونووسی هونەر-ی ئەڵمانییە.

۱۲- لایوکویون- Laocoon:

لە ئەفسانانی یونانیدا کاهینی پەرستگەی ئاپولۆیە کە لە جەنگی تەروادەدا خەڵکی تەروادەی ئاگادارکردەوە کە رێگەی ئەسپەدارینەکەی یۆنانیان بۆ شار نەدەن، ئەم کارە بووە مایەی توڕەیی ئاتنە و بە گوتەیەکی دی پۆسیدون یان زیوس، و دوو ماری دەریایی راسپارد کە لویوکون تەمبێ بکەن و ئەوانیش لە قەدی خۆی و دوو کوڕەکەی هاڵان و کوشتیانن. ئەو پەیکەرەی کە ئێستا لە ڤاتیکاندایە جەنگی ئەوان و مارەکان نیشان دەدات.

۱۳- دراماتورژی: واتە هونەری شانۆنامەنووسی، یان دەرهێنانی.

١٤- ئاپیوس و ڤیرجینیا: لە ئەفسانانی رومیدا، ئاپیوس کلودیس (ئەندامی ئەنجوومەنی دە ئەفەری حکوومەت و یاسادانەرانی رومی) چاوی تەماح دەبڕێتە ڤیرجینیای جوانی کیژە هەژار و لە دادگاییەکی درۆینەدا دەیکات بە کۆیلەی خۆی. بابی کیژەکە بە مەسەلەکە دەزانێ، دەچێ بۆ دادگا و بە خەنجەر کیژەکەی خۆی دەکوژێت و ئەوجا لە شاردا شۆڕشێك بەرپا دەکات.

۱۵- سوارچاکانی پەرستگا: لە مێژووی سەدەکانی ناڤیندا، فیرقەیەکی ئایینی و سوپایی بوو کە لە ماوەی شەڕەکانی سەلیبیدا هاتە ئاراوە. سوارچاکانی پەرستگا لە بنچینەدا دەستەیەکی نۆ ئەفەری بوون لە دلاوەران کە لە ساڵی ۱۱۱۸دا بە مەبەستی پاراستنی زیارەتکەرانی ئۆرشەلیم خڕ بوونەوە. ئەم فیرقەیە کە تەواو لایەنی سوپای هەبوو، یەك سەرۆك و ئەنجوومەنێکی گشتی هەبوو و مەڵبەندەکەی لە ئۆرشەلیم بوو. ئەم فیرقەیە لە ساڵی ۱۳۱٤دا نەما.

١٦- کویدلین بورگ: شارێکە لە کۆماری دیموکراتیکی ئەڵمانیای جاران.

١٧- ئیرل کینگ- Erlking:

لە ئەفسانەی ئەڵمانیدا، ناوی دێوێکە کە خەریکی لە ناودانی خەڵکی بەتایبەتی منداڵان بوو.

١٨- گێڕانەوەی چاپی: ئەم گێڕانەوەیە کە بە پێنووسی یوهان سپیس بە زمانی ئەڵمانی نووسراوە، بە یەکەمین، گێڕانەوەی ئەفسانەی ((فاوست)) دەژمێردرێ.

١٩- مفیستوفلس: ناوی شەیتانە لە سیما گرنگەکانی ((فاوست))ـە، دەربارەی ریشەی زمانەوانی ئەم ناوە چەند گێڕانەوەیەك هەیە. هەندێ پێیان وایە کە ئەم ناوە وشەیەکی یۆنانییە لە پیتی نەفی me و Phos بە مانای رۆشنایی و فیلوس بە مانای دۆستداری رووناکی پێك هاتووە کە بەسەر یەکەوە مانای ((دوژمنی رووناکی)) دەگەیەنێ.

# ئەدەبیاتی ئەڵمان
# لە
# سەدەی نۆزدەیەمدا

سەرەتایەکی مێژوویی:

سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن بۆناپارت جەزرەبەیەکی توندی بە هیوا و ئومێدی نیشتیمانپەروەرانی ئەڵمانی و خوازیارانی یەکێتیی میللەتی ئەڵمان گەیاند. داگیرکاری فەرەنسا لە ساڵی ١٨٠٣وە تا ساڵی ١٨١٣ی خایاند. شکستە سوپاییەکانیش جۆش و خرۆشی نیشتیمانپەروەرانی دانەمرکاندەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە بڵێسەی بە مەشخەڵەکاندا، و یەکێتی دژی دوژمنی هاوبەش، ویلایەتە هاوپەیمانەکانی لێکدی نزیکتر کردەوە. ژمارەیەك لە دراما و هۆزانێن لیریکی شاعیرانی گەورە -بەتایبەتی میناڤون بارنلهم-ی لسینگ، ویلهلم تل-ی شیلەر، و بەشی یەکەمی فاوست-ی گوتە- کەلەپوری هاوبەشی ویلایەتە ئەڵمانی زمانەکانی دەوڵەمەندتر کرد و تین و تاوێکی زیاتری بەهزر و بیری نیشتیمانی هاوبەشی باب و باپیران بەخشی.

سوپاییانی ئەڵمانی کە لە ساڵی ١٨١٣دا ناپلیۆنیان شکاند چاویان لە ریفۆرمی جۆراوجۆری وەکو ئازادی رامیاریی پتر و حکومەتی قانونی بوو. بەڵام چاوی رەشی ئومێدیان کاڵبووەوە. ئەو سیاسەتە کۆنەپەرستانەیەی کە مەتەر نیخ[١] لە نەمسا گرتیەبەر، لە زۆربەی ویلایەتەکان گیرایە بەر، و خەڵکی لە بەشداری لە حوکمڕانی و ئازادی دەربڕین و چاپەمەنی مەحروم بوون. ئەم قۆناغی کۆنەپەرستی و دیکتاتۆرییەتە چەندی دەیەیەك بەردەوام بوو، بەلام

نارەزایی گشتی بە جۆرێ پەرەی سەند کە لە ساڵی ١٨٤٨دا راپەڕینی ئاشکرای لێکەوتەوە. هەنگێ هەندێ هەنگاوان لە پێناوی بەرقەراری حکومەتی قانونیدا نرا و سیاسەتێن دیکتاتۆری کەم دابێژێك راگیرا. سەرەنجام میللەتی ئەڵمان لە ساڵی ١٨٧١دا بوون بە خاوەنی "ئەنجوومەنی یاسادانان".

لەم کەین و بەینەدا هەوڵێکی زۆر بۆ دابینکردنی یەکێتیی نەتەوەیی درا. لە ساڵی ١٨١٥ کونفدراسیونی ئەڵمانی (١٨١٥- ١٨٦٦) بە گوێرەی بڕیارەکانی کۆنگرەی ڤیێنا و لە سایەی دەسەڵاتی نەمسادا دامەزرا، لە ساڵی ١٨٣٤دا بە دامەزراندن و دروستکردنی یەکێتیی گومرگ"[٢]"، ئەڵمان یەکێتیی واقیعی بە دەست هێنا، و لە ساڵی ١٨٦٦دا کونفدراسیۆنی ئەڵمانی"[٣]" باکووری هاتە ئاراوە. سەرەنجام، ئەڵمان فەرەنسای لە شەڕی فەرەنسا- پروس دا (١٨٧٠) شکاند، و ویلهلم- ی یەکەم (شای پروس) بوو بە ئیمپراتۆری ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمان (١٨٧١).

ئەڵمانیش گەلێك لە هەمان ئەو گرفتە ئابووری، پیشەسازی، و فەلسەفییانەی کە فەرەنسای سەدەی نۆزدەیەم گیرۆدەی بوو، لە بەردەمدا بوو. زیاد بوونی ژمارەی کارخانان، گەشەکردنی شاران، پەیدا بوونی چینێکی کۆمەڵایەتی بەهێز لە بازرگانان، ململانێی نێوان سەرمایە و کار، و کەشفکاری زانستی- هەر هەموویان ئەڵمانیان بەرەو ماددەگەرایی و نائومێدی و بەدگومانی برد.

چەندین فەیلەسووفی دیاری ئەڵمانی لە دیاریکردنی رێبازی هزری، رامیاری، کۆمەڵایەتی و ئەستاتیکادا نەك هەر لە وڵاتی ئەڵمانیادا، بەڵکو لە هەموو ولاتانی تری جیهان، دەورێکی گەورەیان هەبوو.

<u>یوهان گوتلیب فیختە (١٧٦٢- ١٨١٤):</u>

لە بەرانبەر حوکمە ئەخلاقییە ئەجرەدەکانی کانتدا وەستاروکەوتە بەرەڤانی لە مافێن فەردی، و بەمجۆرە پشتیوانی لە بزاڤی رۆمانتیکی ئەڵمانی لە ئەدەبیاتدا کرد.

<u>فریدریش ئارنست دانیل شلایرماخر (١٧٦٨- ١٨٣٤):</u>

چەند هەوڵێکی دا تا ئایین لەگەڵ ژیاندا بگونجێنێ و، شێوەی باوەڕێکی دەروونی پێ بدات. بەباوەڕی وی "ئاین ناوێکی دیکەی هەست و ئارەزەووە بەرزەکانە .... دین شیعری روحە".

<u>گیورگ ویلهلم فریدریش هیگل (١٧٧٠- ١٨٣١):</u>

لە هەوڵی ئەوەدا بوو تا لە نێوان دوالیزمی ئانتولۆجی کانت و باوەڕی ئەفلاتوونی دەربارەی روح یان نەفس پردێك دروست بکات، و هەردووکیان لەگەڵ نەفس تەرك کردنی مەسیحیدا بگونجێنێ.

"ئایدیالیزمی موتڵەق"ی هیگل پێی وایە کە دنیا لە هەوەڵی بوونەوە تاکو ئێستا لە پرۆسەیەکی بەردەوامی گۆرانکاری و خۆبەدیهێنانەوەدا بووە. زەین و ماددە هەردووکیان لە هەوەڵەوە هەبوونە، زەین لەگەڵ ماددەدا پەرەی بە روح داوە. ئەم پرۆسەیە بەردەوام دەبێ تا جیهانێکی جوانترو رەسەنتر بێتە دی. ئەم تێورییە گەشبینانەیە، کە هیگل بە تەما بوو لە مەیدانی مێژوو، ئایین، حیکمەتی پراکتیکی، هونەر، ئەدەبیات، و لە راستیدا لە هەموو مەیدانەکاندا بەکاری بێنێ، لە ماوەی سالانی ١٨٣٠- ١٨٧٠دا کاریگەرییەکی قووڵی بەسەر هزرینی هزرڤانانی ئەورووپاوە هەبوو.

فریدریش ویلهلم جوزیف ڤون شلینگ (١٧٧٥- ١٨٥٤):

فەیلەسووف و عارفێك بوو کە باوەڕی وابوو سۆز و خەیاڵ رێنوێنسانی بـاوەرپێکراون، واتە جێگەی متمانەن، بەم بۆچوونە بەشداری لە پێشڤەبردنی بزووتنەوەی رۆمانتیکدا کرد. ئەو دەیگوت کە تەبیعەت و روح جگە لەلایەنی جیاوازی (نەفسی جیهان) چ شتێکی دیکە نین و لە هونەردا ئەم دوو لایە نە ناوێتەی یەکدی دەبن (بە گوتەیەکی دی، هونەر لە یەکێتیی روح لەگەڵ سروشتدا دەخولقێ، و بالاترین و پەسندترین ئەوزاری مەعریفەتە).

ئارتور شوپنهاوەر (١٧٨٨- ١٨٦٠):

رێك بە پێچەوانەی فەلسەفەکەی هیگلەوە، کەسێکی تەواو بە گومان و رەشبین بوو، پێی وابوو کە ویست تاقە شتێکە کە واقیعیەت و حەقیقەتی هەیە، جیهانی بوون شەڕە، کردەوەی ویستن بنیادەم بە هیلاك دەبا، و لەبەر ئەمە نەفی ویست —بە ویستی ژیانیشەوە- دوا خێرە. شوپنهاوەر بوونی خوا، ئازادی ویست، و نەمری روحی نینکار دەکرد.

کارل مارکس ١٨١٨- ١٨٨٣:

دامەزرێنەری سوسیالیزم و بە دەسەلاتترین و کاریگەرترین فەیلەسووفی سیاسەتە کە تا ئێستا جیهان بە خۆوەی دیتووە. بوچوونەکانی مارکس لە مانیڤێستی کۆمۆنیست (١٨٤٨ بە هاوکاری فریدریش ئەنگلز ١٨٢٠- ١٨٩٥)، و لە کتێبی دەستمایەدا (سەرمایە) هاتوونەتە دەربرین. ئەو پێی وایە کە کار وەکو کالایە. نرخی گشتی هەر کالایەك دەبێ بە رادەی ئەو کارەی کە لە بەرهەمهێنانیدا سەرف کراوە دیاری بکرێ، سەرمایەدار نابێ لە قازانجدا شەریك بێ، و لەبەر ئەمە کرێکاران دەبێ خەباتی چینایەتی بکەن و هەر هەموو سەرچاوە و ئەوزارەکانی بەرهەمهێنان بگرنە دەستی خۆ و لە نوێ دابەشی بکەن.

سەرەنجام، فریدریش ویلهلم نیتشە (١٨٤٤- ١٩٠٠) پەیدا بوو، و کەوتە هێرش کردن بۆ سەر ریازەتگەری شوپنهاوەروکەوتە ستایشی ویست. ئەو مەسیحییەت، ئەخلاق، ویژدان و

مرۆڤدۆستیی بە هیچ نەدەزانی. هەموو ئەمانەی بەلاوازی روت دەزانی، و داخی بۆ هەر جۆرە لاوازییەك دەخوارد. ئەو رای وابوو کە "ویستی زادەی توانا و دەسەلات" خێری بالآیە، و لە داکۆکیکارانی پەروەردەی "سۆپەرمان"- بوونەوەرانی بەهێز لەرووی بەدەنییەوە، نەگۆڕ و ، و بێ بەزەیی- بوو. فەلسەفەی نیتشە لە بنچینەدا گەشبینانەیە، و جەخت کردنەوەیەکە لەسەر تاکپەروەری، هێڤی و چالاکی. بەناوبانگترین بەرهەمی وی (ئاوهای گوت زەردەشت ١٨٨٣- ١٨٨٥)ـە کە دەربڕی فەلسەفەی "سۆپەرمانیەتی" وییە.

<u>تۆرینێکی گشتی:</u>

ئەدەبیاتی ئەڵمانی لە سەدەی نۆزدەیەمدا تەقریبەن هەمان رێگەی بڕی کە ئەدەبیاتی فەرەنسا بڕی بووی- رۆمانتیزم، ریالیزم و ناتورالیزم.

وەکو بەر لە ئێستا ئاماژەکرا گەلێك لە رەگەز و تۆخمەکانی رۆمانتیك لە بزووتنەوەی "تۆفان و یاخی بوون"دا لە سالی ١٧٨٠دا هەبوو، و گۆتە و شیلەر، دوو کۆڵەکە بنچینەییەکەی رۆمانتیزمی ئەڵمان، هەوڵیاندەدا تا رۆمانتیزمی خۆماڵی بە کلاسیسزمی پێشینانەوە ببەستنەوە و موتوربە بکەن، لەگەڵ ئەمەشدا، تەنیا لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا بوو کە بزووتنەوەی رۆمانتیك لە ئەدەبیاتی ئەڵماندا رەسمییەتی پەیدا کرد.

لە سالی ١٧٩٧دا چەند کەسێك لە پیاوانی لاو لە گرووپێکدا کۆبوونەوە تا بانگەشە بۆ ئەو پرەنسیپ و بنەمایانە بکەن کە لەو زەمانە بە دواوە بە رۆمانتیزم ناوی دەرکردووە، "گەڕانەوە بۆ زەوقی خەڵکی و خۆرسکی و سادەیی سروشتی، دژایەتی کردنی یاسا و رێسای نادروست و فورمالیزمی توندڕەوانەی رۆشنبیرانی سەدەی هەژدەیەم و قەتعیەت و نەگۆڕان، روو کردنە ئازادی تەواوی ژیانی روحی و خەیاڵ پەروەری". ئەم پیاوە لاوانەی کە پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ بزووتنەوەی رۆمانتیکدا هەیە، بریتین لە: ئۆگوست ولهلم شلگل (١٧٦٧- ١٨٤٥)ی شاعیر و وەرگێڕی شەکسپیر و کالدرون، فریدریش شلگل-ی برای (١٧٧٢- ١٨٢٩). شاعیر، رۆماننووس، وتار نووس و رەخنەگر، کە بە دامەزرێنەری ((شیعری رۆمانتیك)) دەژمێردرێ، نوڤالیس-ی (١٧٧٢- ١٨٠١، ناوی خوازراوی فریدریش ڤۆن هاردنبرگە) شاعیری عارف و رۆماننووس، ویلهلم هاینریش واکنرودر (١٧٧٣- ١٧٩٨)ی وتارنووس، و یوهان لودویگ تیك (١٧٧٣- ١٨٥٣)ی شانۆنامەنووس، شاعیر و نووسەری کورتە چیرۆکان. یەکەمین ژمارەی گۆڤاری رەخنەیی رەخنەی رۆمانتیزم بە ناوی ئاتنیوم کە ئۆرگانی بیرەکانی ئەم گرووپە بوو، لە سالی ١٧٩٨دا (هەمان ئەو سالەی کە وردزورث و کولریج چامە لیریکییەکانیان بلاوکردەوە)

بڵاوبووەوەو لە راستیدا بە سەرەتای بزووتنەوەی رۆمانتیکی ئەڵمان دەژمێردرێ. ئەمانە شەکسپیر، هردر، گوتە و شیلەریان بە سەر مەشقی خۆ هەڵبژارد، و لەلایەکیشەوە لە ژێر کاریگەری کلوپشتوك و ریشترش دابوون. دوو فەیلەسووفی سەردەم، فیختە و شلینگ، لە نزیکەوە پەیوەندییان لەگەڵ بزووتنەوەکەدا هەبوو. ئەم گرووپە، دە ساڵ لە رۆمانتیکانی ئیتاڵیا و بیست ساڵ لە رۆمانتیکانی فەرەنسا لە پێشتر بوو.

لە دەوروبەری ساڵی ١٨٠٤دا هایدلبرگ"٤" بوو بە مەڵبەندی دووەمین شەپۆلی رۆمانتیکەکان. ناوە سەرەکییەکانی سەر بەم شەپۆلە کە ناوەندی چالاکی وان پەیوەندی بەم شارەزا نکۆییەوە هەیە، بەمجۆرەن: فریدریش دولامات- فوکە (١٧٧٧- ١٨٤٣)ی شاعیر، رۆماننووس و شانۆنامەنووس، کلمنس برنتانو (١٧٧٨- ١٨٤٢)ی شاعیر، لودویگ لیواخیم ڤون ئارنیم (١٧٨١- ١٨٣١)ی شانۆنامەنووس، کە کۆمەڵە گۆرانییەکی جوانی نەتەوەیی بە هاوکاری برنتانۆ لە کتێبێکی بەناوبانگدا بە نێوی (شەیپوری جادوویی کورێژگە ١٨٠٥- ١٨٠٨) کۆکردەوە، یاکوب گریم ١٧٨٥- ١٧٦٣)و برایەکەی ویلهلم گریم (١٧٨٦- ١٨٥٩) کە لە زانستی زمان، کەلەپووری فۆلکلوری، و کۆکردنەوەی ئەفسانەی پەریاندا شارەزاییەکی زۆریان هەبوو: و جۆزیف ڤۆن ئایخن دورف ١٧٨٨- ١٨٥٧)ی شاعیر و رۆماننووس.

لە ناودارانی دیکەی بزووتنەوەکە دەتوانرێ ئەم ناوانەش ببرێ: ئارنست تیودور ئامادیویس هوفمان (١٧٧٦- ١٨٢٢)ی رۆماننووس، هاینزیش ڤون کلایست (١٧٧٧- ١٨١١)ی شانۆنامە و رۆماننووس، ئەدلبرت ڤۆن شامیسو (١٧٨١- ١٨٣٨)ی شاعیر، یوهان لودویگ ئولانت (١٧٨٧- ١٨٦٢)ی شاعیر و زانای زمانەوانی، فرانتس گریل پارتسر (١٧٩١- ١٨٧٢)ی نووسەری شانۆنامە و رۆمان، هاینزیش هاینە (١٧٩٧- ١٨٥٦)ی شاعیر و نامەنووس (نووسەر).

قوتابخانەی رۆمانتیك لە دەوروبەری ساڵی ١٨٣٠دا کەوتبووە نشێوی نەمانی بێ چەندوچوون-ەوە، لە ساڵی ١٨٤٨دا خواستە کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوورییەکان پێداویستییەکانی سەرکەوتنی ریالیزمیان فەراهەم کردبوو. ئەدەبیات لەرووی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە هۆشیار تر دەبوو، شیعری غەزەل و دڵداری لە حاڵی ئاوا بووندا بوو، و دراما، رۆمان و رۆمانۆك وەکو ژانری گرنگی ئەدەبی برەویان دەسەند، فرید ریش هبل (١٨١٣- ١٨٦٣) و ئوتولودویگ (١٨١٣- ١٨٦٥) بە رچەشکێنانی درامانووسی ریالیستی دەژمێردران. کارل لبرشت ئیمرمان (١٧٩٦- ١٨٤٠)و فریتس رویتر (١٨١٠- ١٨٧٤) لە

پێشەوایانی رۆماننووسی بوون. لە نێو دیارترین نووسەرانی کورتە چیرۆکانیشدا دەتوانرێ نـاوی تیودور ئەشتورم (١٨١٧- ١٨٨٨)، گوتفرید کلر (١٨١٩- ١٨٩٠)، و کونراد فردیناند مـایر (١٨٢٥- ١٨٩٨) ببرێ.

ئەدەبیاتی ئەڵمان لە سایەی کاریگەری زۆلا، موپاسان، سوپنهاوەرد، نیتشە، تولـستۆی، و دۆستۆفسکیدا، لە ریالیزمەوە بۆ نـاتورالیزم پـەرەی سـەند، و شـانۆنامە و رۆمـانی کـرد بـە گرنگترین ئەوزاری دەربڕینی خۆی. پێشەوای درامانووسانی ئەم قوتابخانەیە گرهارت هاوپتمـان (١٨٦٢- ١٩٤٦) بوو، جدیترین رەخنەی کۆمەڵایەتی، نـە لـە ئـەڵمانیا، بەڵکـە لـە وڵاتـانی ئەسـکەندیناڤی هاتـە ئـاراوە، هنریـك ئیبـسن (١٨٢٨- ١٩٠٦) و بیورنـستیرنە بیورنـسن (١٨٣٢- ١٩١٠) لە نەرویج، توگوست ستریند بـرگ (١٨٤٩- ١٩١٢) لـە سـوێد پەیوەنـدی نزیکیان لەگەڵ ریالیستان و ناتورالیستانی فەرەنسەوی و ئەڵمانی دا هەبوو.

رێك لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا رەمزییەت بەرەبەرە جێی قوتابخانـەی نـاتورالیزمی گرتـەوە، بەڵام وا بەجێتر دیارە کە ئەم قوتابخانەیە لە فەسڵی سەدەی بیستەمدا بخرێتە بەر باس.

## رۆمانتیزم
## (١٧٩٨- ١٨٣٠)
## هۆزان

فریدریش هولدرلین (١٧٧٠- ١٨٤٣):

هولدرلین، بە شاعیری غەزەلخوانی سەرەتای قۆناغی رۆمانتیـك دەژمێـردرێ. بـە جـۆش و خرۆشەوە ستایشی یۆنانی کۆنی دەکرد و لە هەمان حاڵدا زۆر بە قوڵی لە سـایەی کاریگـەریی بزووتنەوەی "تۆفان و یاخی بوون" و بەرهەمی زهنیەتگەرایی وەکـو ڤارتـەر-ی گۆتـەدا بـوو. ستایشی یونان لە لایەن هۆلدرلین و "بـاوەڕی وەحـدەتول وجودیانـەی وی بـە یـەکێتیی خـوا و سروشت، دوو جەمسەری سروشتی وی پێکدێنن، و لە بندێڕی هەموو شیعرەکانیدا تاسەمەندی بـۆ هاوئاهەنگییـەك کـە هـەرگیز نـەیتوانی بەدەسـتی بـێنێ، و بـەدگومانی زادەی رەنجـان و نائومێدی شەپۆل دەدا". ئەم بەدگومانییە لە "سروودی چارەنووس"دا، لـە رۆمانـسی درێـژی (دوو بەرگی) هی پریون (١٧٩٧- ١٧٩٩)دا دەردەکەوێ. هی پریون،ی قارەمانی رۆمانـسەکە، لاوێکی یونانییە کە یارمەتی میللەتی خۆی لە شەڕی تورکاندا لە سـاڵی ١٧٧٠دا دەدات. لـە شیعرە کورت و جوانەکانی هولدرلین، دەتوانرێ ناوی "بۆ ئەڵمانییەکان" و "بۆ ئیتەر" ببرێ.

نوڤالیس (ناوی خوازراوی فریدریش ڤون هاردنبرگە ١٧٧٢- ١٨٠١):

هەندێ غەزەلانی گوتووە کە بە هۆی بێگەردی قوڵی مەزهەبی و عیرفانی، و بە هۆی بە ئایدیالی کردنی ڤیانەوە بەناوبانگن، "ئەو خوای سەر زەمینە" و "سروودی مردووان" لە باشترین غەزەلەکانی ئەون. نوڤالیس رۆمانێکیشی بە ناوی (هاینریش ڤۆن ئوفتر دینگن)ەوە نووسی کە تەواو نەکراوە. شانۆی چیرۆکەکە سەدەکانی ناڤینە و قارەمانی کتێبەکە سوارچاکێکی شاعیر رەفتارە، کە دوای مەرگی دڵبەر، سوکنایی لە داواکردنی "گوڵی غەم"دا دەبینێ کە رەمزێکە لە رۆمانتیزم.

جوزیف ڤون ئایخن دورف (١٧٨٨- ١٨٥٧):

گەورەترین شاعیرێ تەبیعەتە لە ئەڵمانی ئاخر و نوخری سەردەمی رۆمانتیکدا. جگە لەو شیعرانەی کە دەربارەی سروشت گوتوونی، سوناتەی ئەڤینداری و نیشتیمانیشی هەیە، زۆربەی شیعرەکانی لە دەفتەرێکدا بە ناوی سادەی (شیعران- ١٨٣٧) بڵاوبوونەتەوە. ئەگەرچی مەیدانی دیدی وی تەسکە، لێ روبرتسون دەربارەی دەڵێت: "لە مێژووی شیعری ئەڵماندا جگە لەو چ شاعیرێکی دیکە ناتوانرێ بدۆزرێتەوە کە خەسڵەتی بێ خەوش دەربارەی هەموو هۆزانە ئاشقانەکانی دروست بێ".

لە باشترین غەزەلیاتی وی: "لە چاڵی ساردا"، (ئەی دۆڵانی بەرین، ئەی کێوان"، و "دەتگوت بەهەشت بوو)ە، ئایخن دورف جگە لەمە چەند شانۆنامە، مێژوو و رەخنەی ئەدەبی، رۆمان و چیرۆکی کورتی نووسیوە، لە نێو چیرۆکە کورتەکانیا "بیرەوەری بنیادەمێکی بێکارە- ١٨٢٦" شاکارێکی بچووکی دڵگیر و جوانە دەربارەی ژیانی مۆسیقازانێکی ئاوارە.

ویلهلم مولیر ١٧٩٤- ١٨٢٧:

مولیر ستایشکار و دەروێشی لۆرد بایرون بوو. یەکەمجار لە جەنگی سەربەخۆیی یونان دژی تورکیا وەکو قارەمانێك شۆرەتی پەیدا کرد (سروودێن یۆنانی ١٨٢١- ١٨٢٤)ەکەی وی کۆمەڵە شیعرێکە سەر رێژ لە گیانی نیشتیمانپەروەری، بەڵام تەقریبەن ئیحساساتییە (سۆزدارییە). مولیرە چامە، هۆزانی ئەڤینداری، و شیعری دەربارەی تەبیعەتیش گوتووە. فرانتس شوبرت ئاوازی بۆ شیعری ئاشقانەی "کیژی جوانی ئاشەوان" و شیعری تەبیعەتی "سەفەری زستانە"ی وی داناوە.

هاینریش هاینە (١٧٩٧- ١٨٥٦):

هاینە رەگێکی جولەکەیی هەبوو و لە دوسلدورف لە دایك بوو. لە هەوەڵەوە رووی کردە بازرگانی، بەڵام سەرنەکەوت، پاشان کەوتە خوێندنی ماف و لە ساڵی ١٨٢٥دا زانستگەی

گوتینگن-ی تەواو کرد. لە هەمان ساڵدا چووە سەر دینی مەسیحییەت. لەم زەمانەوە شەش ساڵی بە خەرجی مامی لە ئەڵمان، ئیتاڵیا، و ئینگلیستاندا بە گەڕان و سەفەر بوراند. لە ماوەی ئەم ساڵانەدا دوو بەرهەمی خۆی بە ناوی (سەفەری هارتس- ١٨٢٦)و (کتێبی ستڕانان- ١٨٢٧) بڵاوکردەوە کە بوونە مایەی ناوبانگی. بە هەر حاڵ هێرشی چزداری بۆ سەر کەسانی جۆراوجۆر و حکوومەتی ئەڵمان مەحبوبییەتی ویی لە بەین برد. ئەم بێزرانە، و بێزاری لە وەزع و حاڵی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەڵمان، و هەروەها خەون بینین بە عەدالەتی سیاسییەوە لە فەڕەنسا، هاینەی لە ساڵی ١٨٣١ دا بەرەو پاریس راکێشا و، باقی تەمەنی لەم شارەدا مایەوە. لە سەرەتاکانی دەیەی ١٨٣٠دا بوو بە ئەندامی "رێکخراوی ئەڵمانی لاو" کە لەو نووسەرە لاوانە پێك هاتبوو کە دژی کۆنە پەرستییەتی مەزهەبی و رامیاری سەردەم دەخەبتین، و لە هەوڵی دامەزراندنی حکوومەتی ئازادیخوازانی ئەڵماندا بوون.

هاینە لە ساڵی ١٨٤٨دا تووشی نەخۆشی بڕبڕەی پشت بوو، و هەشت ساڵی کۆتایی تەمەنی خۆی گوتەنی لە "نوێنی مەرگدا" قەتاند.

سێ بویەری ئەڤینداری کاریان کردوەتە سەر شیعری هاینە. لە ساڵی ١٨١٩ەوە تا ١٨٢٣ ئەسیر و بەندی ئەڤینی ناکامی ئامالی کیژە مامی خۆی بوو. لە زستانی ساڵی ١٨٣٤-١٨٣٥دا ئاشقی ئوجینی میرات بوو، دوای شەش ساڵ زەماوەندی لەگەڵ کرد و، ئاقیبەت بە هەموو بوونییەوە دڵبەندی ئەشقی کامیلی سلدن-ی پەرستاری وەفاداری دوا ساڵانی نەخۆشییەکەی، بوو.

شرۆڤەکارانی هاینە هەمیشە ئەویان بەلاوە سەراپا مەتەڵ، ئاڵۆزی و نەگونجاو و نەساز بووە، لە بنەماڵەیەکی جولەکە لە دایك بوو، مەسیحییەتی هەڵبژارد، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ جار گاڵتەی بە هەردوو مەزهەبەکە دەکرد و سەرکۆنەی دەکردن. بە ئەڵمانی لە دایك بوو، رۆیی بۆ فەڕەنسا، لەگەڵ ئەمەشدا هەم خراپەی ئەڵمانی دەگوت و هەم فەڕەنسا. جنێوی بە هەردوو وڵات دەدا، لە گوتنی غەزەلی ناسك و جواندا بەهرە و توانایەکی سەیری هەبوو، لەگەڵ ئەمەشدا لە مەیدانی تەنز و توانجدا توانا و بەهرەی ئاریستوفانسی هەبوو. شاعیرێکی رۆمانتیکی بوو، و تەوس و توانجی ئاوێتەی رۆمانتیزم کرد.

شایەد بشێت پاساوی ئەم ناسازی و ناکۆکییە بەم جۆرە بدرێتەوە کە هاینە پەیامبەرێك بوو لە رۆژگارێکی غەیری رۆژگاری خۆیدا لە دایك بووبوو. سەرڕێژ بوو لە جۆش و خرۆش و تاسەی ریفۆرم خوازی، کە هیچ ئەنگێزەیەکی بۆ ئەم تاسەمەندییەی خۆی پێ نەبوو، (هاینە

کۆکەرەوەی دژەکان بوو: جولەکەیەك لەنێو ئەڵمانییەکانا، ئەڵمانییەك لەنێو فەرەنسییەکانا، "هاینە"یەك لەنێو جولەکەکانا، شۆڕشگێڕێك لە نێو بۆرژوایانا، و موحافەزەکارێك بوو لەنێو شۆڕشگێڕانا).

بەرهەمەکانی:

ناوبانگی هاینە پتر بە هۆزانە لیریکییە کورتەکانی و بەستەکانییەوەیە، بەڵام چەند پەخشانە بەرهەمێکی دیکەشی لە پاش بەجێماوە کە لە رۆژگاری خۆیدا خوێنەری فرەیان هەبوو. گرنگترین کۆ شیعرێن هاینە بریتین لە: هۆزانان- ١٨٢٢، کتێبی بەستەکان- ١٨٢٧، هۆزانێن نوێ- ١٨٤٤، رۆمانسان- ١٨٥١، و دواهەمین هۆزانان ١٨٥٣و ١٨٥٥).

هۆزانێن لیریکی:

هۆزانە لیریکییەکانی هاینە لەگەڵ زۆربەی هۆزانێن لیریکی ئەڵمانیدا جیاوازن، بەجۆرە کە ئەو لە ئاماژە وردە مەعنەوی و کاریگەرییە ناسك و نەرمە تەم و مژاوییەکانی دوورە... و شێوەی وێنەسازی بەرجەستە و هەست پێکراو بە کاردێنێ کە وا دێتە بەرچاو توندترین و خێراترین سۆزان بۆ تیشکێکی درەوشاوە و روونی رۆژ دەگۆڕێ. گەلێك لە هۆزانە لیریکییەکانی وی ـلە یەکەمین تا دوایەمین - تەواو شەخسین. ئەم شیعرانە رەنگدانەوەی گەلێك لە حاڵەت و سۆزی وەکو: غەم، شادی، حەنەکبازی، هەڵچوون، ئازار، و کۆڤان و کەسەرە، یەکێك لە تیمە و ناوەرۆکە دڵخوازەکانی هاینە ئەڤینی بێ ئاکامە. هاینە ئەم ناوەرۆکەی لە هەر شاعیرێکی پێش یان پاش خۆی خەمناکتر شیعراندووە. هاینە شاعیری سروشتیشە، و باشتر لە هەر شاعیرێکی ئەڵمانی دیکە جوانی و بەسامی دەریای دەربڕیوە. بەناوبانگترین ئەم شیعرانە بریتین لە: "سنۆبەر تەنیا دەوەستێ"، "بلێ مەحبوبە جوانەکەت لە کوێیە"، "تۆ، کیژی جوانی ماسیگر"، "کاتێ دەنۆڕمە چاوانت"، "تۆ وەکو شکۆفەی"، "لەسەر باڵی گۆرانی"، "لە مانگی خۆشەویستی مایسدا"، "من تورە نابم"و "تۆ ئەڵماس و مرواریت".

چامەکان:

چامەکانی هاینە ئاوێتەی روحی گۆرانیانی میللی بوون. بۆ نموونە: "لورلی"، ئەفسانەیەکی غەمەنگێزی کورتە دەربارەی کیژێکی لاو کە لەسەر لوتکەی کێوێکا لە کەناری راین دەژی، ئەو دەریاوانان بەرەو لای خۆی رادەکێشێت و ئەوان بەر تاوێران دەکەون و لەناو دەچن. "دوو سەربازی فەوجی پیادە" چیرۆکی نیشتیمانپەروەری دووان لە سەربازانی ناپلیۆن دەگێڕێتەوە کە لە روسیادا دیل بوون، لێ ئێستا رێگەی فەرەنسایان گرتۆتە بەر، "بلشازر" نەقلێکی کورتی

جوان و دڵگیرە دەربارەی میوانداریيەك كە لەوێدا چارەنووسی شای بابیل دەستێك كە لە سەر دیوار دەنووسێت پێشبینی دەكات.

پەخشانەكانی:

پەخشانی هاینە ئەوە نیشان دەدا كە شێوازی وی، هەرچەندە یەك نەوا نییە، لێ وەستایانەیە. "لەیەك بەندی نووسینی ئەودا هەندێ جار ناسكترین هەست و سۆزی شاعیرانە لەگەڵ توندترین و بە ئازارترین تەنز و ریشخەندا ئاوێتە دەبێ"، لەگەڵ هەموو ئەمەدا، هاینە هەمیشە روون، رەوان، و سوار دەنووسێت. بەرهەمە پڕ جۆشەكەی (وێنەكانی سەفەر- ١٨٢٦-١٨٣١) كە چوار بەرگە، بیرەوەری گەشت و گەڕانی وی لە ئەڵمان، ئیتاڵیا و ئینگلیستان دەگێڕێتەوە، باشترین فەسڵی ئەم سەفەرنامەیە، كتێبی یەكەم، سەفەری هارتس (كێوەكانی مەركەزی ئەڵمان)ـە. كە "هیچ بەرهەمێكی تا بەم رادەیە نزم و داروخاو، و لە هەمان حاڵدا درەخشان و جوان، تا ئێستا لە زمانی ئەڵمانیدا نەنووسراوە". ئەوەی لە لوتفی كتێبەكە كەم دەكاتەوە، هێرشی بێ پەروایەتی بۆ سەر ئەم و ئەو، دام و دەزگاكان، و مەزهەب و ئایین.

هاینە بە خۆی دەگوت "سەربازی جەنگی ئازادی تیرەی بەشەر". لە ساڵانی ئاكنجی بوونیا لە پاریس، زۆر وتارانی بۆ رۆژنامە ئەڵمانیەكان نووسی. لەم گوتارانەدا هێزێن ئەنتی دیموكراسی بەرهێرش و جنێوان داوە و سورە لەسەر دامەزراندنی حكومەتی ئازاد و سەربەخۆ. ئەو بە گەرمی ستایشی فەرەنسای دەكرد و لە ناخی دڵەوە، وێڕای ناڕەزایی لە دام و دەزگاكان، ئەڵمانی خۆش دەویست. وتارەكانی هاینە لە سێ بەرگ لە ژێر سەرناوێن مەسەلەكانی فەرەنسا- ١٨٣٣، سالۆن- ١٨٣٥- ١٨٤٠، و لوتشیا- ١٨٥٤ بڵاوبوونەتەوە.

بەرهەمێكی گرینگی دیكەی هاینە بەناوی قوتابخانەی رۆمانتیك – ١٨٣٦ـە، كتێبێكە دەربارەی شرۆڤەی رۆمانتیزمی ئەڵمانییە بۆ فەرەنسییەكان نووسراوە و بۆچوونی ورد دەخاتەڕوو. لاوازی سەرەكی كتێبەكە تەوسكردن بە هەندێ كەسان، و بڕێك دەربڕین و زانیاری نادروستە.

هەڵسەنگاندن:

هێرشی هاینە بۆ سەر ئەڵمان و تەوس و توانجی چزداری ژەهراوی لە هەندێ ئەڵمانیانی تایبەتی لەگینە زادەی ئەم حەقیقەتە بێ كە مەوتەن و زێدی خۆی بە زۆر ئەوی وەكو شاعیرێك بە كەم گرتووەن، غەزەلەكانی لە وڵاتانی دیكەدا لە هەر شاعیرێكی تری ئەڵمان پەسندتر و

کاریگەرتر بوو. رەنگە زیادمان پێوە نەنابێ، ئەگەر هاینە، بێجگە لە گوتە، بە گەورەترین شاعیری لیریکاخوان بزانین کە ئەڵمان تا ئێستا لە باوەشی خۆیدا پەروەردەی کردووە.

نیکولاوس لناو ١٨٠٢- ١٨٥٠ (نیکولاوس فرانتس نیمش ڤۆن شترلناو):

لناو، یەکێك لە بەدگومانترین شاعیرانی رۆمانتیکی ئەڵمان و پیاوێکی بێ ئارام و خەمین بوو کە لە هەندێ لاینەوە دەکرێ بە هاوسەنگی لیوپاردی بژمێردرێ. لە سایەی کاریگەری گوتە، ئایخن دورف، و بایروندا بوو، بە هاوبیری بزووتنەوەی "ئەڵمانی لاو" دەژمێردرا. یەکەمین کۆی شیعری لە ژێر سەرناوی سادەی (هۆزانان- ١٨٣٢)ـە، لە بنەڕەتدا کۆمەڵە پارچەیەکی کورتە لەمەڕ ژیانی گوندییانی ئەڵمان و مەجەڕستان (لناو بە خۆی لە مەجەڕستان لە دایك بووە)، تەنانەت ئەم شیعرانەش ناوێتەی خەم و، دڵتەنگی و گومانی مەزهەبین. لناو ماوەیەکی کورتی لە ئەمریکادا، بە ئومێدی شادی و ئازادی، بوراند، و هەندێ شیعری لە ستایشی ئەمریکادا و بەتایبەتی سورپێستەکانی ئەمریکادا گوت، کە شیعری "نیاگارا" یادگاری ئەم سەفەرەیە. دراما لیریکییەکەی وی، فاوست – ١٨٣٦ رەنگدانەوەی خەم و کۆڤانی خودی شاعیرە، ساڤوناروڵا- ١٨٣٧و ئالبیگتر- ١٨٤٢ دوو بەیتی داستانی درێژن و نائومێدانەن کە ستایشی ئازادی ویژدان دەکەن. لناو تەنانەت لە داستان و دراماشدا هەستی خۆی تێکەڵ دەکات، چونکە بەهرەی وی لە بنچینەدا لیریکییە. "لە ئەورووپای باکووریدا هیچ شاعیرێك ناناسین کە وەکو لناو هەستی "حوزنی ئەبەدی"و نائومێدی بێ بڕانەوە و لە چارە نەهاتووی بە وشە سپاردبێ. ئەو تاڵترین وێنەی بەدگومانی و نائومێدی زاڵ بەسەر ئەدەبیاتی ئەڵمانیدا لە ماوەی ساڵانی ١٨٥٠و ١٨٨٠دا رەسم کردووە".

ئیدوارد موریکە (١٨٠٤- ١٨٧٥):

ناسکی و جوانی، سادەیی، خۆرسکی، میهرەبانی، توانای تەداعی و هەستی حەنەکبازی لە غەزەلەکانی موریکە دا، لە نێو شاعیرانی رۆمانتیکی ئەڵماندا لە پلەی دوای هاینەی دا دەنەن.

یەکەمین کۆشیعری وی بە ناوی (هۆزانان-١٨٣٨) ناسکە غەزەلی دڵگیری وەکو "کیژی تەنیا"و "دەزگیرانی سەرباز"ی لەخۆ گرتووە. بەستەکانی، وەکو "سێبەر"، "روترواى جوان" تارادەیەك ناسەرکەوتوترن، جگە لەوانە موریکە چەند حیکایەتێکی پەرییان-یشی نووسیوە. رۆمانێکی تەواو نەکراوی بەناوی (نولتنی نیگارکێش- ١٨٣٢) لەبەر دەستدایە کە لەڕووی نێوەڕۆك و بێ فۆرمییەوە ویلهلم مایستر وەیاد دێنێتەوە، هەرچەند ئەم رۆمانە بونیادێکی

لاوازی هەیە، بەڵام لەلایەنی کاراکتەرسازی وەستایانەیەوە و لەڕووی ئەو شیعرە کورتانەوە کە تیایدا هاتووە، بەرهەمێکی بەهادارە.

## شانۆنامە

سەرچاوەی رۆمانتیزم زیاتر لیریکی و دەروونگەراییە تا دراماتیکی. لەبەر ئەمە تەواو ئاساییە کە لە سەردەمی رۆمانتیک-ی ئەڵمانیدا ژمارەی سیما بەرجەستەکانی درامانووسی کەم بوو.

یوهان لودویگ تیک (١٧٧٣- ١٨٥٣)، یەکێك لە پێشەنگانی قوتابخانەی رۆمانتیک، بە شانۆنامەی تەنز و توانج ئامێزی، پشیلەی چەکمە پۆش- ١٧٩٧ درامای هەستەوەری دایە بەر تەوسان، و چەند شانۆنامەیەکی دیکەشی نووسی کە نیشانەی دڵبەندی ئەون بە سەدەکانی ناڤینەوە. شانۆنامەنووسانی کەم تواناتر، فوکە و ئارنیم بوون. جووتە شانۆنامەنووسێك کە لە ئاسمانی ئەدەبی جیهاندا باش درەوشاونەتەوە، کلایست و گریل پارتسر-ن.

هاینریش فۆن کلایست ١٧٧٧- ١٨١١:

نەجیمزادەیەکی پروسییە کە هەموو ژیانی هەر رەنج و نەگبەتی بوو. وازی لە خزمەتی سوپا هێنا و دووی خوێندنی خۆی کەوت، بەڵام زۆری نەبرد کە زانستگەشی تەرك کرد. ئاقیبەت، شکستە حەیابەرەکانی ئەڵمان لەبەردەم ناپلیۆن، و هەروەها شکستی شانۆنامەکانی خودی کلایست، زۆریان ئەزیەتدا، و مەرگی وەلیّ نیعمەتەکەی، واتە مەلیکە لویز، خەمی دەستکورتی-شی کردە سەرباری نەگبەتی و ئازارەکانی دیکەی. ئەو کە لە هەموو روویەکەوە ماندوو بووبوو، بە گوللە خۆی کوشت.

شانۆنامەکانی کلایست کە لە روانگەی جۆش و خرۆش، زهنیەتگەرایی، و غەریبی هەندێ لە قارەمانەکانەوە، بە رۆمانتیك دادەنرێن، هەندێ تایبەتمەندیی کلاسیکی وەکو روونی ئامانج و پلۆتیشیان تێدایە. لە شانۆنامەکانی ویدا کاراکتەرسازی واقیعیانەیە. ژنان و پیاوانی ناو دراماکانی بنیادەمانانی ناو ژیانن، و کەسایەتی هەر تاکێکیش سەربەخۆیانە وێنە دەگیرێ. پەیجۆری حەقیقەتدۆزی هەندێ جار کلایست بە جۆرێ لە ناتورالیزم (بە مانا فەرەنسییەکەی) نزیك دەخاتەوە کە ناتوانرێ جیاوازی نێوان ئەوەی ترسناکە و ئەوەی ئەفرەت ئەنگێزە بکرێ.

یەکەمین بەرهەمی کلایست، ماڵباتی شروفنشتاین -١٨٠٣، تراجیدیایەکی کوشندەیە — نیشاندەری "تۆفان و یاخی بوونی" دەروونی خودی کلایستە- کە لەوێدا کینەی خانەوادەیی، دوو

ئاشق بەرەو مەرگ دەبات. پنتسیلیا- ١٨٠٨، "خولقاندنەوەیەکی سەردەمی هۆمەرە لەبەر ڕۆشنایییەکی کزی ڕۆمانتیزمێکی پەریشاندا". مەلیکەی ئامازون ئاخیلوس کە بە ئیدیعای خۆی ئەڤینی وی تەوهین کردووە، دەکوژێ، بەدەنی وی دەخوات، و پاشان خۆکوژی دەکات، کیتی خەڵکی هایلبرون ١٨٠٨، کۆمیدیایەکی ڕۆمانتیکی سوارچاکییە. کیتی، کەوا دیارە کیژی پیاوێکی چەخماخچییە دڵبەندی ئەڤینی سوارچاکێکی لاو دەبێ، و وێڕای زبری و ڕەقی سوارچاکەکە، بۆ هەموو شوێنێ دووی دەکەوێ. سەرەنجام سوار چاکەکە کە پەی بەوە دەبا کیتی کیژی ئاشەرعی ئیمپراتۆرە زەماوەندی لەگەڵدا دەکات. هەرچەندە پلۆتی ئەم کۆمیدیایە— بە تایبەتی کۆتاییەکەی- نامۆ دەنوێنێ، بەڵام سەرریژە لە جوانی و دڵگیریی ڕۆمانتیکی. شەڕی هرمان (لە ساڵی ١٨٠٨دا نووسراوە، لە ١٨٢١دا بڵاوبووەتەوە) شانۆنامەیەکە لەمەڕ خۆشەویستی نیشتیمان، و تەوەرەکەی بەسەرهاتی هرمانە (ئارمینیوس) کە کلوپشتوک-یش شانۆنامەیەکی سێ بەشی لە ژیانی ئەم قارەمانە نەتەوەییە ئەڵمانییەوە هەڵێنجاوە و داهێناوە. بۆ کلایست، ڕۆم وەکو فەرەنسا، و وڵاتی چرۆسکانس وەکو ئەڵمان مایەی ستایشە. دوایەمین و باشترین شانۆنامەی کلایست، شازادەی هامبورگە (لە ١٨١٠دا نووسراوە، لە ١٨٢١ بڵاوبووەتەوە) درامایەکی نیمچە مێژووییە کە بویەرەکانی لە سەدەی هەڤدەیەمدا روو دەدەن. شازادە فریدریش بەسەرپێچی لە دەستووری فەرماندەکەی خۆی، لە فربلین سەرکەوتنێکی گەورە بە دەست دێنێ، شازادە حوکمی مەرگ دەدرێ و ترس سەراپای دەگرێ، بەڵام زۆر زوو بەسەر خۆیدا زاڵ دەبێ و ئەنجامدانی عەدالەت قەبووڵ دەکات، لێ عەفووی بۆ دەردەچێ، کلایست لەوێنەگرتنی کەسایەتی شازادەدا ئەوپەڕی توانای خۆی دەنوێنێ.

لە نێو کورتە چیرۆکە فرەکانی کلایستدا، میکائیل کولهاوس (١٨١٠) لە هەموویان پرشنگدارترە. ئەم چیرۆکە دەربارەی "دەڵاڵێکی ئەسپە کە پابەندی قانوونە" ئەجیمزادەیەك بە ئەحەق ئەسپەکانی وی داگیر دەکات. دەڵاڵەکە کە ناتوانێ لە ڕێگەی قانوونییەوە ئەسپەکانی خۆی بسەنێتەوە، بە خۆی ئەنجامدانی قانوون لە ئەستۆ دەگرێ. لە ئەنجامدا دووبارە دەبێتەوە بە خاوەنی ئەسپەکانی، بەڵام چونکە پەیدەبات کە خۆی بووە بە مایەی زوڵم و بێدادی، مل بۆ سزا دەدات، ئەم چیرۆکە شاکاری سەراحەت و گێڕانەوەی واقیعگەرایانەیە.

فرانتس گریل پارتسر ١٧٩١- ١٨٧٢:

"گەورەترین شانۆنامەنووسی نەمساوی"یە لە ڤینا هاتە دنیاوە، و هەموو تەمەنی درێژ، ئارام و بێ گرفتی خۆی وەکو فەرمانبەرێکی بچووکی دەوڵەتی بەسەر برد.

یەکەمین بەرهەمی شایستەی وی (داپیرە- ١٨١٧)یە، لە جوملەی "تراجیدیایێن روحان"دا دەنرێ، کە لەوێدا قەدەری روحی ژنێك وایە بۆ قەرەبووکردنەوەی گوناحەکانی چاودێری خانەوادەیەك بکات. شانۆنامەیەکی گەورەی دیکەی گریل پاتسر بە ناوی (سافو- ١٨١٩)یە، حیکایەتێکی رۆمانتیکییە دەربارەی ئەڤین و خۆکوژی سافۆ،ی شاعیری غەزەلخوانی گەورەی یونانی. گریل پارتسر کێشمانەکێشی نێوان ئەڤینی سافۆ بۆ فایون، وەفاداری سافۆ بۆ هونەر بە هەستێکی هاوخەمی قوڵەوە وەسف دەکات. ئەم شانۆنامەیە و چەند درامایەکی دواتری گریل پارتسر نیشانەی شێوازی لیریکی چڕە هەوێن و دڵبەندی ئەوە بە کلاسیکانی کۆنەوە. (بەرگن زێڕین"٥" - ١٨٢٠)، شانۆنامەیەکی سێ بەشی گریل پارتسرە: میوان، ئارگوناتەکان و میدیا لەخۆ دەگرێ. لەم درامایەدا گوناهی یاسون (رابەری ئارگوناتەکان) و میدیا-ی سیحربازی بەناوبانگ، بە باڵادەستی تاوتوێ دەکات. (شانوتوکار، پەیدا بوون و کەوتنی وی- ١٨٢٥) درامایەکە لەسەر بنەمای سایکولۆژی. لەم تراجیدیایەدا شەڕی شابوهم دژی رودلفی یەکەمی هاپسبورگ وێنەگیراوە. لە شانۆنامەی (خزمەتکاری وەفاداری ئاغا- ١٨٣٠)، وەفاداری نوێنەری پاشای مەجەرستان دەرهەق بە پاشا نیشاندەدرێ. ئەم نوێنەرە ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە تا گیانی شابانۆی وڵات رزگار بکات. ئەم حەقیقەتەی کە ئەشکەنجەکانی برای شابانۆ بوونەتە مایەی خۆکوژی هاوسەری نوێنەرەکە، هیچ درزێك ناخاتە وەفاداری ئەوەوە. جوانترین شانۆنامەی گریل پارتسر (شەپۆلانی دەریا و ئەڤین- ١٨٣١)ی ناوە، کە وەرگێڕانێکی درامی چیرۆکی کۆنی یونانی (هیرۆ ولیندەر)ە.

لە شانۆنامەی "ژیان خەونە- ١٨٣٤" واقیع و ئەفسانانی پەرییان وەستایانە ئاوێتەی یەکدی دەبن. لەم درامایەدا خەنێك دەبێتە باعیسی رزگاری قارەمانی چیرۆکەکە لەو رووداوە مسیبەتبارانەی کە پایەخوازییەکانی خۆی بۆی دێننە پێشێ، (ئەعلەت لە درۆزن ١٨٣٨) تاقە کۆمیدیای گریل پارتسرە. قارەمانی شانۆنامەکە لیون-ی ناوە و ئاشپەزی قەشەباشی گریگورییە کە لێدەبڕی برازایەکی قەشە باشی لە چنگی بەربەرەکان رزگار بکات. بەڵێنی وی کە هەمیشە راستی بڵێ، نەك هەر هەڵوێست رووداوی کۆمیدی دێنێتە پێشێ، بەڵکو قەناعەت بە بەربەرەکانیش دەکات. ئەم درامایە ئەمڕۆ بە شاکارێکی کۆمیدی دەژمێردرێ.

گریل پارتسر لەم سەردەمەدا گەورەترین شانۆنامەنووسی ناو ئەڵمانی زمانەکانە. شانۆنامەکانی بەهۆی "هەستی قوڵ لەمەڕ حەقیقەتی شیعری، .... بێگەردی و رەسەنایەتی... شیکردنەوەی باشی سایکۆلۆژییانەی قارەمان و کردارە مرۆڤانییەکانیان،

بتەوی و سۆزداری قوڵ، بەڵام بە پارێز و پەنامەکیانەی ژنان و پیاوانی ناو دراماکانی"، هەمیشە بە زیندوویەتی دەمێننەوە.

## رۆمان

بە دروستی دیار نییە کە لە چ زەمانێکا رۆمانی کلاسیکی ئەڵمانی بە کۆتا دێ و قۆناغی رۆمانتیك دەست پێدەکات. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا هێشتا کاریگەری و دەسەڵاتی رۆسۆ، ستێرن، و هەستگەرایانی دیکە بەهێز بوو.

گەلێك لە رۆمانە هەوەڵینە ئەڵمانییەکان کە بە رۆمانتیك دادەنرێن، کۆمەڵە هەوڵێك بوون بۆ هاوشێوە بوون لەگەڵ رۆمانەکانی سیروالتر سکوتدا. (واتە لاسایی کردنەوەی سیروالتر سکوت بوون- وەرگێڕ) ئاخیم ڤون ئارنیم، ویلهلم هاوف (١٨٠٢- ١٨٢٧)، و ویلیباد ئالکسیس (ناوی خوازراوی ویلهلم هارینگ-ە، ١٧٩٨- ١٨٧١)، هەندێ رۆمانی مێژوویی رۆمانتیکیان نووسی، بەڵام هیچیان بەسیرەت و نۆڕینی مێژوویی پێویستیان بۆ ئەفراندنی بەرهەمی بایەخدار تێدا نەبوو.

رەگەزێکی رۆمانتیکی دیکە— دڵبەندی بە سەیر و سەمەران و مەسەلەێن میتافیزیکی- لەبەرهەمەکانی ئەرنست تیودور ئامادیوس هوفماندا رەنگ دەداتەوە.

جان پاول (ناوی خوازراوی فریدریش ریشتەرە ١٧٦٣- ١٨٢٥):

رۆماننووسی رۆمانتیکی و حەنەکباز، لە ژێر کاریگەری ستێرن، رۆسۆ و ویلندا بوو، لەگەڵ ئەمەشدا کورتە چیرۆکان و رۆمانانی تازە و جوانی نووسی، کە بەسەر یەکەوە دەگەنە شەست بەرگ. یەکێك لە چیرۆکە کورتەکانی "کوینتوس فیکسلاین"ە، کە رەنگدانەوەی ژیانی دێهاتییە. رۆمانە درێژەکانی وی، هەرچەندە لەڕووی شێوازەوە ئاڵۆز، لەڕادەبەدەر هەستیار، و بۆ خوێنەری ئەمڕۆ لەڕادەبەدەر تیل نیشانیان لەخۆ گرتووە، بەڵام بە هۆی ئەو شۆخیبازییە تەنز ئامێز و هەستە ناسکەوە کە تیایاندایە ناسکی و جوانییەکی فرەیان هەیە. تیتان (١٨٠٠- ١٨٠٣)، چیرۆك و بەسەرهاتی شازادەیەکە کە لە ماڵباتەکەی خۆی دوور دەکەوێتەوە و بە گومناوی گەورە دەبێ، پاش "قۆناغێکی شاگردی و کارئاموزی" پەروەردەی هەستۆکی کە مامۆستا ویلهلم وەبیر دێنێتەوە، دەگاتە تەخت و تاجی پاشایەتی.

جان پاول، لە هەر نووسەرێکی دیکەی سەردەمی خۆی پتر بە وێنەی درەخشان و جوان، و بە نووسینی سەر رێژ لە جوانیی خەیاڵئەنگێز ئەدەبیاتی ئەڵمانیی دەوڵەمەند کردووە. ئەو وێنانەی کە لەمەڕ ژیان گرتوونی بۆ خوێنەری ئەمڕۆش جوان و دڵگیرن.

ئارانست تیودور ئامادیوس هوفمان (١٧٧٦- ١٨٢٢):

هوفمان مامۆستای چیرۆکانی فانتازی و ترسناکە، کە بە زەبری بلیمەتی سەیری خۆی قارەمان و دیمەنە واقیعییەکانی بۆ بوکەڵان و داهۆڵان و دیمەنێن فانتازی و خەیاڵئەنگێز گۆڕیوە، بەرهەمە چوار بەرگییەکەی، گوتار و چیرۆکەکانی هوفمان بە ناوی (چیرۆکێن فانتازی بەشێوەی کالوت (١٨١٤- ١٨١٥) ناوبانگێکی زۆری بۆ پەیدا کرد. یەکێك لە بەناوبانگترین چیرۆکی ئەم کۆمەڵەیە بادەی زێڕینە. یەکێك لە رۆمانە درێژە ترسناکەکانی وی ئەکسیری شەیتان (١٨١٥- ١٨١٦)ـە، دەربڕی ژیانی راهیبێکە کە دەرمانێکی کۆنی نهێنی ئامێز لە دێڕدا دەدۆزێتەوە و هەر کە دەیچەژێ ئیدی دەست دەکات بە زنجیرە تاوانێکی سەیر. لە ئەنجامدا ئەڤین و خۆشەویستی دەبێتە مایەی رزگاربوونی، و تۆبە دەکات. بەرهەمە چوار بەرگییەکەی چیرۆکەکانی دیکەی هوفمان، (برایانی سێراپیون ١٨١٩- ١٨٢١)، ژمارەیەك چیرۆکانی ترسناك، چەند چیرۆکێکی نەرمتری لەخۆ گرتووە.

شۆرەتی هوفمان تاڕادەیەك قەرزاریاری ئۆپرای چیرۆکەکانی هوفمانە کە جاك ئوفن"٦" باخ لەسەر بناغەی سێ چیرۆکی ئەو داینناوە.

## ریالیزم و ناتورالیزم

## ١٨٣٠- ١٩٠٠

## شانۆنامە

کریستیان فریدریش هبل (١٨١٣- ١٨٦٣):

هبل دامەزرێنەری شانۆنامەی ریالیستییە لە ئەڵماندا. لە خێزانێکی هەژار، لە وسلبورن-ی هوڵشتاین چاوی بە دنیا هەڵێناوە. لەبەر هەژاری خوێندنی رەسمی پێ تەواو نەکراوە، بەڵام لە ئەنجامدا توانی خۆی بگەیەنێتە زانستگەکانی هایدلبرگ و مونیخ، لە ساڵی ١٨٣٩دا دەستی بە شانۆنامە نووسین کرد. و یەکەمین تراجیدیای وی (جودیت- ١٨٤٠) هەندێ سەرکەوتوو بوو. هبل ساڵانی ١٨٤٣- ١٨٤٥ی بە گەشت و سەفەر لە فەرەنسا و ئیتاڵیادا، لەسەر حیسابی دەرباری دانیمارك بەسەر برد. لە کۆتایی سەفەرەکەیدا لە ڤیێنا ئاکنجی بوو و لەگەڵ کریستین ئەنگهاوس-ی ئەکتەردا زەماوەندی کرد (١٨٤٥). لەم زەمانەوە دراماکانی بەرە بەرە شۆرەتیان پەیدا کرد، و هبل گەیە جۆرە ئاسودەییەکی رێژەیی، کەمێك دوای ئەفراندنی دوا بەرهەمی گەورەی خۆی (نیبلونگن) کۆچی دوایی کرد.

\

هبل "جۆرە درامایەکی داهێنا کە لەڕووی دیالیکتیکی توندی ئیحساساتەوە بە پێشینەی دراماکانی ئیبسن دەژمێردرێ، و لە باری وێنەگرتنی ئەو کەسایەتییانەوە کە ژیانیان لە روحێکی بێ ئۆقرە و خۆ ویستییەکی توندا دەگوزەرێ —سوپەرمانان و ژنانی باڵا- بەرهەمەکانی نیتشە وەبیر دێنێتەوە".

جودیت (١٨٤٠)، کۆپی چیرۆکێکی ئاپوکریفە، جودیت-ی ژنە قارەمانی تراجیدیایەکە، خۆی تەسلیمی هالوفرنس-ی فەرماندەی دوژمن دەکات، و پاشان دەیکوژێت، وڵاتەکەی خۆی رزگار دەکات. هەردوو تراجیدیای گنوڤڤا- ١٨٤٣، و هیرودو ماریان- ١٨٥٠ دەربارەی ژنێکە کە خەمساردی و گوێنەدانی مێرد حورمەتی وی پایەماڵ دەکات. ئاگنیس برناور- ١٨٥٢، ناکۆکی نێوان مافی تاك و ویستەکانی دەوڵەت دەخاتەڕوو. باوکی دۆکێك کە هەست دەکات کورەکەی ئەڤینی هێناوەتە ناو ئەرکە رەسمییەکانەوە، ئاگنیس-ی هاوسەری جوانی وی لە دانوب دا غەرق دەکات. گوگس و موستیلەکەی وی- ١٨٥٤ لەسەر چیرۆکێکی هرودوت نووسراوە، کاندولس (شای لیدیا) رێگە بە گوگس، کە بە موعجیزەی موستیلەی جادوویی غەیب دەبێ، دەدا بە رووتی تەماشای رودوپە-ی شابانۆی جوان بکات. رودوپە کە بەمە دەزانێ، بۆ سڕینەوەی ئەم نەنگە، گوگس هاندەدا کە شا بکوژێ و پاشان شوو بەو بکات، کە شا دەکوژرێ، رودوپە خۆی دەکوژێت.

نیبلونگن- ١٨٦٢ دوا بەرهەمی هبل-ە، شانۆنامەیەکی سێ بەشییە:

١- *زیگفریدی گیان سەخت، کە پێشەکییەکی تاك پەردەییە.*

٢- *مەرگی زیگفرید.*

٣- *تۆڵەی کریمهیلد، کە هەر یەکێك لەم دوو بەشە.*

پێنج پەردەن. ئەم شانۆنامەیە کۆپییەکی راستگۆیانەی بەیتی داستانی نیبلونگن-ە، لێ هبل فۆرمێکی نوێ بە رووداوەکان دەبەخشێت، کە ئەوەندە بە دڵی زەوقی سەدەی نۆزدەیەم نییە.

"دوا داوەری لەمەڕ بەرهەمە دراماییەکانی هبل هەر چییەك بێ، گومان لەوەدا نییە کە لە مەیدانی ئاوێتە کردنی شیعری درامی دا بە چەمکێکی تازەی سایکۆلۆژی سەرکەوتووە. هەموو پێشڤەچوونەکانی دواتری درامای ئەوروپایی قەرزاری شانۆنامەکانی ئەوە".

<u>ئوتولودویگ ١٨١٣- ١٨٦٥:</u>

لودویگ و هبل هەردووکیان لە یەك ساڵدا لە دایك بوون، و هەردووکیان بە دەستکورتی گەورە بوون.

لودویگ هونەرمەندێکی ورد و تیژ سەرنج و لە شەیدایانی پڕجۆش و خرۆشی شەکسپیر بوو، ئەوەندە خۆی بە رازاندنەوەی بەرهەمەکانی خۆوە خەریك کرد تا بە گوێرەی پێوەرەکانی مامۆستای درامای ئینگلیزی دەرچن، لەبەر ئەمە بەرهەمی کەم بوو.

هونەری لودویگ، لە بەرجەستەکردنی قارەمانان و لە ئەفراندنی هاماجی دراماکانیا پەنهانە، لەوێنە گرتن و رەسمکردنی پاژاندا بالاّ دەستە و، زۆری حەز بە وردەکارییە، لەلایەنی دەربڕینی ناکۆکییە عاتیفییەکانەوە لە چاو هبل-ەوە لە پلەیەکی نەوی تردا دێ.

لێڕەوانی بۆماوەیی ١٨٥٠:

تراجیدیایەکی لە رادەبەدەر خەمناکی لودویگ-ە، بەسەرهاتی لێڕەوانێکە کە دەڵێت چونکە باب و باپیریشی مینانە و لێڕەوان بوونە، بەپێی یاسا ناتوانرێ لەم کارە دەربکرێ. گاڤێ کە خاوەنی تازەی لێرەکە دەری دەکات، لێڕەوانەکە لە لێبڕاوە تۆڵە بکاتەوە، تاپۆیەك کە وا دەزانێ کوڕی خاوەن لێڕەکەیە بەر گوللە دەدات، بەڵام پەی دەبات کە قوربانییەکە کیژەکەی خۆی بووە، (مەکابیان- ١٨٥٤) بەسەر هاتو (لە ئاپوکریفاوە وەرگیراوە) بویەری قوربانی شەریفی حەوت کوڕەکەی لیەیە لە"[٧] رێگەی نیشتیمان و مەزەبدا، ئەم درامایە وێڕای سستی بونیادەکەی، زۆر دیمەنانی جوان و کاریگەری تیدایە.

لودویگ سەرباری تراجیدیاکانی، چەند کۆمێدیایەکی بەهادار و چیرۆکانی جوانی لەمەڕ ژیانی گوند-یش نووسیوە.

لە جوملەی کۆمیدیاکانیا (هانس فری ١٨٤٢- ١٨٤٣) و (مەدام دو سکودری- ١٨٤٨) شایانی باسن، لە نێو چیرۆکەکانیا "لە چاڵەوە بۆ بیر- ١٨٥٧"و "لە نێوان ئاسمان و زەویدا- ١٨٥٦" لە هەموویان بەناوبانگترن.

هنریك ئیبسن ١٨٢٨- ١٩٠٦)[٠]:

ئیبسن لە سکین-ی مەرکەزی ویلایەتی تلمارکی نەرویج لە دایك بوو. باوکی لە ساڵی ١٨٣٦دا، کە تاوەکو بەر لەو ساڵە بازرگانێکی سەرکەوتوو بوو، نابووت بوو، و خێزانەکەی غەرقی هەژاری بوون. ئیبسن لە ساڵی ١٨٤٤ەوە تا ساڵی ١٨٥٠ بە مەبەستی خوێندنی پزیشکی لەلای دەرمانسازێك لە گرێمشاد بوو بە شاگرد، و بە مەبەستی تەیار بوون بۆ تاقیکردنەوەی زانستگە کەوتە فێربوونی لاتینی،

ئەم کارە بەرەو خوێندنەوە و موتالای بەرهەمەکانی سالو"[٨] ست-ی راکێشا، و یەکەمین شانۆنامەی وی (کاتیلین ١٨٤٨- ١٨٤٩)، زادەی دڵبەندی وی بوو بە کەسایەتی کاتیلین-ەوە (قارەمانی کتێبێکی سالوستە بە هەمان ناوەوە).

ئیبسن لە ساڵی ١٨٥٠دا بۆ ئوسلو رۆیی، و درێژەی بە شیعر گوتن و شانۆنامە نووسیدا. لە پایزی ساڵی ١٨٥١ بە یاریدەدەری دەرهێنەر و شانۆنامەنووسی شانۆی نەتەوەیی بیرگن "٩" هەڵبژێردرا، بۆ ماوەی شەش ساڵ لەم پۆستەدا مایەوە. لە ساڵی ١٨٥٧دا بۆ ئوسلۆ گەڕایەوە، و بوو بە بەڕێوەبەری شانۆی نورسکە (نەرویج). ساڵی دواتر لەگەڵ سۆزانا تورسندا زەماوەندی کرد، و ئەم ژنە بوو بە گەورەترین یاوەر و ئیلهامبەخشی وی. شانۆی نورسکە لە ساڵی ١٨٦٢دا بە هۆی گرفتی داراییەوە داخرا، و ئیبسن لە شانۆی کریستیانادا پۆستێکی کاتیی وەرگرت. لەم حاڵ و بارەدا بە پشتیوانی کۆمەکێکی داراییەوە کە وێی درا، کەوتە توێژینەوە و موتالای فۆلکلۆری نەرویجی، و پاش ماوەیەك دەرفەتێکی بۆ سیاحەت و گەشتی خۆرایی پەیدا کردو رێی سەردانی پاریس و رومی (١٨٦٤) گرتە بەر. تا ساڵی ١٨٦٨ی لە ئیتاڵیادا بەسەربرد و، شانۆنامانی شیعریی (براند ١٨٦٦و پیرگینت- ١٨٦٧)ی نووسی، کە پایەکانی شۆڕەتیان لە نەرویجدا قایم کرد، ئیبسن سالانی ١٨٦٨- ١٨٧٦ی لە سدن و ساڵانی ١٨٧٦-١٨٩١ی لە مونیخ بەسەر برد، لەم ماوەیەدا تەنیا ساڵانی ١٨٨٠- ١٨٨٥ی لە روم بەسەر برد. لە ساڵی ١٨٩١ بۆ ئوسلۆ گەڕایەوە، و تا مردن لەم شارەدا مایەوە.

تەکنیك:

ئیبسن داهێنەرێکی مەزن بوو. جۆرە درامایەکی تازەی ئەفراند، کە نەك هەر لە ئاستی بابەت و نێوەرۆك، بەڵکو لەڕووی شێوەی مامەڵە کردن و تەکنیکیشەوە لە شانۆنامانی تەقلیدی جیاواز بوو.

لە هەوەڵەوە، زۆربەی دراماکانی ئیبسن شانۆنامانی "رەخنەیی و کۆمەڵایەتی"ن، زیاتر دڵبەندی خستنەڕووی مەسەلە فەردی یا کۆمەڵایەتییەکانە تا کردنەوەی گرێی گیروگرفتان. ئەو تەنیا بەدەستنیشانکردنی نەخۆشییەکانی کۆمەڵگەی نوێ خۆشحاڵە، بەڵام بۆ تیمارکردن هیچ دەرمانێك دانانێ. "بەڕای وی ئەوەندە بەسە کە ناتەبایی و ناکۆکییەکان، و بێ توانایی و کەم و کوڕی ئایدیالە دێرینە و تەقریبەن سواوە مەزهەبی، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان کە بەگشتی ئیعترافمان پێ نەکردوون، بە کۆمەکی زنجیرە وێنەیەکی هەژێنەر لەمەڕ ژیان نیشان بدەین".

ئیبسن هەستی کرد بۆ بەرجەستە کردنی "کۆمەڵە وێنەیەکی درەخشان و سەرسامکەر" دەبێ جۆرە پلۆت و نەخشەیەکی تازە دابهێنرێ. لەو رۆژگارەدا کە راسین درامایانی سایکولۆژی دەنووسی، شانۆنامانی کەم جوڵەی سەردەمی ئاسخیلوس نەیدەتوانی دەربڕی مەسەلەکانی رۆژ بێ. و ئیبسن، کەسایەتییەکی ئەفراند تا کێشمانەکێشەکانی تاك لەگەڵ تاکدا یان بە

شێوەیەکی گشتی تاك لەگەڵ کۆمەڵگەدا ئاشکرا بکات. لە دراماکانی ئەودا، وەکو بەرهەمەکانی راسین، عادەتەن رووداو تەنیا کەمێك پێش کارەسات دەست پێدەکات، و پاشان شێوەی تەحلیلی بەکار دێت، واتە ئاشکراکردنی ئەو رووداوە قەیداناوییانەی کە کارەساتی دراماکەیان هێناوەتە پێشێ و لێکەوتووەتەوە. سوود وەرگرتن لەم شێوازە دەبێتە هۆی ئەوەی لە زۆر شانۆنامانی ئیبسندا پتر بایەخ بە یەکێك یان زیاتر لە سێ یەکێتییەکە بدرێ. لێ ئیبسن بەپێچەوانەی راسین-ەوە خۆی بە پەیڕەو کردنی هیچ رێسایەکی بنجبری پێشوەختە دیاری کراوەوە نابەستێتەوە، وەکو چۆن لە (پیرگینت و گافێ ئیمەی مردووان رادەبین)دا یەکێتییەکانی کات و شوێنی پشتگوێ خستووە و لە (مالی بووکە شووشە)دا پلۆتێکی لاوەکی بەکار هێناوە.

لەبەر ئەوەی کە کارەکان لە بنچینەدا لەسەر بنەمای سایکولۆژییە، دڵبەندی ئیبسن-یش پتر بە کاراکتەرانەوەیە تا پلۆت و نەخشە. لێ ئامانجی شانۆنامەکانی وی لە ئەسڵدا نیشاندانی پەرەسەندنی کاراکتەر (کەسایەتی) نییە.

مەبەستی شانۆنامە نیشاندانی عیللەتی ئانتولوجی کاراکتەرانە لەواری کاروکاردانەوەدا بە خودی خۆیان، و روونکردنەوە و تەئویلی کاراکتەرەکان بە شێوەی نورینە رابردوو، یان بە گوتەیەکی دی، لە رێگەی پێداچوونەوە بە تایبەتمەندی و سەربور و بویەرەکانی رابردووی ئەواندا.

ئیبسن بە بەکارهێنانی شێوەی تەحلیلی یەکەم خوێنەری شانۆنامە بەرەو داوەرییەکی غەڵەت لەمەڕ کاراکتەری دراماکە دەبات و پاشان ناسنامەی واقیعی ئەو ئاشکرا دەکات، و بەمجۆرە خوێنەر لە حاڵەتی مۆڵەق و چاوەڕوانیدا گیرۆدە دەبێ.

کاراکتەرانی شانۆنامەکانی ئیبسن هەرچەندە هەندێ تایبەتمەندیی (نموونەیی)یان تێدایە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نموونەیی (تیپیك) تەواو نین، ئەمانە کەسانێکی تاقانەو تایبەتن، بۆ نموونە، لە (مالی بووکە شوشەدا) هیلمەر، نموونەی مێردێکی لەخۆرازییە، بەڵام ترسنۆکی، و دووروویی زاتی و -لەمەش زیاتر- لاوازی ئەو لە دیتنی ریاکاری و خۆهەڵکێشاندا، دەیکەن بە تورڤالد هیلمەر-ێکی تاق و تەنیا کە لە دنیادا ژیاوە. رەنگە هەر پێکهاتەی تایبەتمەندییە تیپیکەکە بێ کە قارەمانانی دراماکانی ئیبسن بێ هاوتا و -گشتگیر- دەنوێنێ.

ئیبسن لە بەکارهێنانی قارەمانان (کاراکتەرانی) بچووکترا وەکو بریکار یان هاوتای کارکتەرانی سەرەکی دراما یەجگار باڵا دەستە، وەکو چۆن لە هودا گابلردا، قارەمانی سەرەکی

دراماکە بە ئابووتی شادی و بوونی خەڵکانی دی بەختەوەر دەبێ، لەبەرانبەر ئەودا جولیاناتسمان، ژیانی تەنیا و تەنیا لەبەر خاتری کەسانی دی دەوێ.

چەند دانەیەك لە رەخنەگران، مەیلی سیمبولیزمیان لە دراماکانی ئیبسندا ئینکار کردووە. بەڵام زۆربەیان پێیان وایە کە لە شانۆنامە بەرجەستەکانیا سوود لە سیمبول و رەمز وەردەگرێ. ناونیشانی هەندێ لە دراماکانی -وەکو ماڵی بووکە شووشە و سۆنەی کێوی- بەڵگە و نیشانەی ئەم باوەڕەن.

ئایا دەتوانرێ گومانێك لەمەدا هەبێ کە پارچەکانی پەیکەرەکە لە (گاڤێ ئێمەی مردووان رادەبین) بە جۆرێکی رەمزییانە دەلالەت لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی پێشووی ئیبسن دەکەن؟ بە زۆری لەسەر ئەمەی کە فلان شت یان کەس رەمزی چ شتێکە موناقەشە و جیاوازی لە بەینی رەخنەگرەکاندا هەیە، بەڵام لەسەر ئەمەی کە ئەم رەمزانە دەلالەت لە کەسان یان شتانێك دەکەن، هیچ چەند و چوون و دوودڵییەك نییە.

ئەوەی بە وردی لەگەڵ رەمزییەتگەرایی لە بەرهەمەکانی ئیبسندا پەیوەندی پەیدا دەکات بەکارهێنانی دەستەواژەی کلیلی یە. سوودوەرگرتنی بەردەوام لە رەمز و دەستەواژانی وەکو "موعجیزە"، "کلاوکوڕە"، "سۆرە" لە (ماڵی بووکە شووشەدا)، و "لەزەتی ژیان" لە شانۆنامەی (تاپۆیان)، لەڕووی ئاشناکردنی خوێنەرەوە بەو بابەتە ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی، یان سایکولۆژییانەی کە درامانووس مەبەستی گەیاندنیان بووە، سوودمەندن.

براند و پیرگینت (دوو شانۆنامەی رۆمانتیکن) بە شیعر گوتراون. بەرهەمەکانی دیکەی ئیبسن پتر بە پەخشانن- پەخشانێکی سادە، کورت و چڕ، و سروشتی، کە ئەو بۆ واقیع پەروەری بە گونجاوی دەزانێ. ئیبسن ئاوەڵناو کەم بەکار دەبات، خۆی لە وتاربێژی، رازانەوەی زمان، و گوتاری دوور و درێژ، بەتایبەتی گوتارێن روونکاری یا چیرۆکڤانی بە مەبەستی ئاگادار کردنی خوێنەر لە رووداوانی پێشوو، دەپارێزێ.

<u>هزرو بیران:</u>

ئیبسن لە مەیدانی ئەندێشە و تەکنیکی شانۆنامەنووسیدا داهێنەر و نوێئاوەر بوو. بە چاوێکی وردبین ریاکاری، خۆپەسندی، گەوجایەتی، خاوی، کورتبینی و ترسنۆکی کۆمەڵگەی سەردەم و داب و نەریتانی کۆمەڵگەی تەماشا دەکرد، و ئازایانە و بێباکانە ئاشکرای دەکردن، بە جورئەت و زاتێکی ئاشکراوە مەسەلەی نەخۆشییەکانی تێکەڵ بوون، وەفاداری لە ژنومێردایەتیدا، و هەقی ژن لە دەست هەڵگرتن لە مێرد بە هۆی نەگونجانەوە، دەخستەڕوو،

ئەم جۆرە بابەتانە لە رۆژگاری ئیبسندا مایەی نەعلەت و تەکفیر بوون، و ئەویش لە لافاوی جوێن و نەفرین نەدەخەلەسی، هەڵبەتە مەبەست و ئامانجی ئیبسن لە باسکردنی ئەم مەسەلە روون و ئاشکرایانە تەنیا هاندانی خەلکی بوو بۆ دۆزینەوەی چارەسەران و بەس، "ئەو عەودالی جوانیی نەبوو، بەڵکو عەودالی حەقیقەتی رەها و پابەندیی بە ئایدیالە مرۆڤانییەکان بوو، هەوڵی ئەو نە بۆ چالاکاندن، بەڵکو بۆ راکێشانی خوێنەر بوو، ئەگەر لە رێگەی دزێوی و ناپاکیشەوە بوو".

یەکێك لەو مەسەلە تایبەتییانەی کە ئیبسن زۆر بە خەمییەوە بوو، ئازادی ژنان و خوێندن و پەروەردەی ژنان بوو. ماف و توانا و بەهرەی ژنان بە بەراورد لەگەڵ پیاودا لە شانۆنامانی تاپۆیان، ماڵی بووکە شووشە، خانمی دەریا و روزمێرس هولمدا خراونەتەڕوو، ژن تەقریبەن لە هەر یەکێك لە شانۆنامەکانی ویدا تەواوکەری زەروری یان ئیلهامبەخشی پیاوە.

جا دڵبەندی ئیبسن بە تەئکیدی زاتی هەر کەسێك چ پیاو چ ژن، تا ئەندازەیەك رێك دەگەڕێتەوە بۆ هەمان بابەت. ئەو کە لە سایەی کاریگەریی گۆتە و نیتشەدایە، بانگەشە بۆ پێشکەوتن و پەرەسەندنی هەموو توانا و ئیمکانەتەکانی هەر تاکێك -کەشف و دەربڕینی "خودی" راستەقینەی هەر کەسێك، سەروەری تاك، بەرزکردنەوەی کەسی خودپەروەر، و پەرستنی سۆپەرمان- دەکات. ئەو زوڵمانە دەست نیشان دەکات کە کۆمەڵگە لە تاکی دەکات، و ئەو نادروستییانە دەستنیشان دەکات کە مرۆڤی بەرەو پیر دەبرێ، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، ناو بەناو هۆشداری لە هەنبەر ئەو خۆهەڵکێشانە لە رادەبەدەرانە دەدات کە بە زیانی کەسانی دی دەشکێتەوە.

ئەم چەشنە هۆشدارییانە نیشانەی ئەوەیە کە ئیبسن لە باوەڕیارانی راستەقینەی ئازادی ویستە، و لە هەقیقەتدا هەر واشە. بەڵام لە هەمان حاڵدا شەیدای دەور و رۆڵی ویراسەت و ژینگەیە لە دیاریکردنی چارەنووسی مرۆڤدا.

دۆزینەوەکانی داروین و زانایانی دیکە کاریگەری قووڵیان بەسەر هزرێن ئەوەوە هەبوو، و لە زۆر شانۆنامانیدا جەخت لەسەر پەیوەندی کردار و ماهیەتی کاراکتەرەکانی بە پەروەردەی سەرەتایی و ویراسەتەوە دەکات. لە هەندێ شانۆنامانی ئیبسندا (بەتایبەتی ماڵی بووکە شووشە و تاپۆیان) ئەم فاکتەرانە جۆرێکی تازە لە چارەنووسی مسیبەتبارییان لێدەکەوێتەوە.

باسی چارەنووس مەسەلەیەك دەخاتەڕوو کە وەڵامدانەوەی هێشتا جێگەی مشتومڕ و گەنگەشەیە. ئایا ئیبسن گەشبینێکی ئایدیالیستە یان رەشبینێکی ریالیست؟ ژمارەیەك

لە شرۆڤەکاران لەم باوەڕەدان کە ئەو لـە ئایـدیالیزم دابـراوە و دەربـارەی ئاینـدەی بەشـەر بەدگومان و نائومێدە.

رەخنەگرانی دیکە لەسەر ئەم باوەڕەن کە ئیبسن، وێڕای ئەو وێنە ریالیستیانەی کە لەمـەڕ وەزع و حاڵی ناڵەبار و خەماوی کۆمەڵگەی دەگرێت، هەر بـاوەڕی بـە ئایـدیالیزم هەیـە و بـە ئومێدەوە چاوی بڕیوەتە ئاینده.

شانۆنامەکانی:

شانۆنامەکانی ئیبسن بەسەر سێ قۆناغی گـرینگ دابـەش دەبـن، لـە قۆنـاغی یەکەمـدا (دەروروبەری ١٨٥٠- ١٨٦٧) پتر دراماپانی رۆمانتیکی لەسەر بنەمای ئایدیالیزم بە شێوازی بەرز دادەهێنێ، لە قۆناغی دووەمدا (١٨٧٧- ١٨٩٠) روو دەکاتـە شـانۆنامانی ریـالیزم کـە بەگشتی لە دۆز و مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەڵدەهێنجرێن، گرنگترین بەرهـەمێن ئیبسـن بەرووبوومی ئەم قۆناغەن. لە دواهەمین قۆناغدا (١٨٩١- ١٨٩٩)، ئیبسن پتر بەلای مەسـەلە فەردییەکاندا با دەداتەوە. شانۆنامەکانی ئەم قۆناغەی بە زۆری مەجازی و عارفانەن.

قۆناغی یەکەم:

"براند- ١٨٦١":

چیرۆکی واعیزێکی ئایدیالیستە کە بانگەشە بۆ ئەنجامی حوکم و مەشیەتی خوایی هـاوڕێ لەگەڵ تەرکی تەواوەتی حەز و ئارەزووە شەخسی و خۆویستییەکاندا دەکـات. لـە پێنـاوی ئـەم رێبازەدا هاوسەر و منـاڵەکەی لە دەست دەدات، سەرەنجام هـەم جماعەتەکـەی و هـەم مـەرام و مەبەستەکانی، کە هەموو شتێکی خۆی فیدای ئەوان کـردووە، رووی لـێ وەردەگێـڕن و لـەنێو بەفراندا بەرەڵڵای دەکەن، چـونکە -ئەمانـە کـە مـرۆڤن و گوناهکـارن- نـاتوانن بـەو رێگـە سەختەدا بڕۆن کە واعیزەکە پێی نیشان داون. براند دەکەوێتە ژێر رەنووە بەفرەوە، بەڵام ئیمانی لە دەست نادات.

((پیر گینت"١٠" - ١٨٦٧)):

بەسەرهاتی پیرگینت-ی خەیاڵپەروەری، دەسباد، و فیـشاڵبازە کـە حـەزی چـووەتە کیـژێکی داوێنپاك بە ناوی سولڤیگ، بەڵام سستی و بێ دەسەڵاتی وی کیژەی لێ دەتۆرێنێ. پیر گینت هار و یاخی دەبێ، هەوڵ و تەقەلای سولڤیك بۆ چاککردنەوەی وی سوودی نـابێ، مـەرگی دایکیـشی نایهێنێتەوە سەر رێگە. مغامەرە دەخولقێنێ: لەگەڵ کیژێکدا بە نێوی ئینگرید هەڵدێ، ماوەیەك لەگەڵ کورتەباڵایاندا دەژی، تێکەڵی کڕین و فـرۆتنی کـۆیلانی ئـەفریقیایی دەبـێ، ... و لەگـەڵ

ئانیترای عەرەبدا سەروساخت پەیدا دەکات. سەرەنجام پیرو نائومێد بۆ نەرویج دەگەڕێتەوە، و لەوێندەر بوتن مولدر (مەرگ یان قەدەر) لە بێهودەیی و پوچی کارەکەی ئاگاداری دەکاتەوە، پیرگینت ئاقیبەت بە ئەڤینی پاکی سولڤیگ رزگاری دەبێ. لەم شانۆنامەیەدا لێکچوونانی ئاشکرا لە نێوانی پیرگینت و فاوست و لەنێوان سولڤیك و گرچندا دیارە.

قۆناغی دووەم:

((کۆڵەکەکانی کۆمەڵگە- ١٨٧٧)):

ئەم شانۆنامەیە، وەکو لە ناوەکەیا دیارە، هەجوویەکی ریاکاریی کۆمەڵگەیە. کارستن برنیك بە، "کەسی یەکەمی" شار، روحانییەکی خواپەرست، نیشانەی خێزاندۆستی، و بە پێشەوای ئابڕومەندی کۆمەڵگە دەژمێردرێ، لێ لەڕاستیدا هەموو ژیانی بەریاکاری، خۆپەرستی، و درۆ بەسەر بردووە، و زیرەکانە سیمای راستەقینەی خۆی لە کەسانی دی شاردۆتەوە.

ئاقیبەت کە خەتەری کەشفبوونی نهێنییەکە هەڕەشەی لێدەکات، تۆبە دەکات، بەڵام بەلاچوونی خەتەرەکەش هەر لە کردەوەی خۆی ژێوان دەبێ، ئیعتراف بە هەموو شتێك دەکات و رێگەی دروستکاری دەگرێتە بەر.

"ماڵی بووکە شووشە- ١٨٧٩":

لەم شانۆنامەیەدا حەز و مەبەستی ئیبسن سەبارەت بە ناساندنی ژن وەکو شەریك و هاوبەشی هزری و مەعنەوی پیاو دەربڕدراوە نورا. هیلمەر قەواڵەیەك تەزویر دەکات تا پارەیەك بە دەست بێنێ، گیانی مێردە نەخۆشەکەی (تورڤالد) لە مەرگ بحەلەسێنێ. بە ئاشکرا بوونی ئەم قەواڵە سازییە، ناسنانە و ماهیەتی راستەقینەی مێردە ترسنۆکە و دوو رووەکەش ئاشکرا دەبێ، نورا پەیدەبات کە لە ژیاندا گەمە و لەیزتۆکی پیاوێکی کەڵەکچی بووە، واز لە مێردەکەی دێنێ تا "خودی خۆی بدۆزێتەوە."

"تاپۆیان- ١٨٨١":

ئەم درامایە سکالانامەیەکی دوو لۆنەی دژی ریاکاری ئەخلاقی و مەزهەبی. نوسوالد ئالوینگ لە مەیل و ئارەزووە دژە ئەخلاقییەکانیا دەچێتەوە سەر بابی، و دەشبێ بە قوربانییەکی نەخۆشی داوێن پیسی و مێبازی ئەو، بە جۆرێ کە لە کۆتایی شانۆنامەکدا نوسوالد ئالوینگ شێت دەبێ.دایکی، کە دژی کۆمەڵگەیەك کە ئەو هەلومەرجانەی بەسەردا زاڵە دەوەستێ و یاخی دەبێ، قارەمانی سەرەکی تراجیدیاکەیە.

"دوژمنی گەل- ١٨٨٢":

رەنگە وەڵامی ئیبسن بێ بۆ ئەو کەسانەی کە دژی ئەو پەردە هەڵماڵینەی وی بوون لەسەر نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان. "دوژمن"، دکتۆر شتوکمانە. دکتور بە ئاشکرا کردنی ئەم بابەتەی کە ئاو بەناوی تەندروستی بنکەیەکی تەندروستی لەڕاستیدا میکروباوییە، ڕەونەقی ئابووری ئەو شوێنە نایەڵێ.

"سۆنەی کێوی- ١٨٨٤":

نارەزاییەکە لەمەڕ قسانی نیمچە راست و لەوەیە بەرەڤانییەکیش بێ لە ئەولەویەتی کار. ئیبسن وا دیارە لەم درامایەدا ئاماژە بەم بابەتە دەکات کە هەندێ جار هەقیقەتی موتلەق خێری باڵا نییە و ئادەمیزاد بۆ وەی شاد بژی پێویستی بە روالەتبازی و خەیاڵیش هەیە. هدویگ کیژێکی جوان و هەستیاری چواردە ساڵانە، کاتێ کە دەبیستێ حەرامزادەیە، خۆی دەکوژێت.

"روزمیرس هولم- ١٨٨٦":

یەکێکە لە نارەزایینامە هەرە توندەکانی ئیبسن دژی تاکپەروەری بێ سنوور، ریبکاویست (ژنێکی گەنجی پیلانگێڕە کە هزری یەجگار تازەی لە کەللەدایە) بە جۆرێ شەیدای روزمیر دەبێ کە بیتا-ی هاوسەری روزمیر خۆی دەکوژێت تا بەر لە ریسواییەکی خانەوادەیی بگرێ. روزمیر کەم و زۆر لە ژێر کاریگەری ئازاد هزرینی ریبکادایە، و ریبکاش لە ژێر کاریگەری ئایدیالە بەرزەکانی روزمیردایە. ئەنجام روزمیر پەی دەبات کە پیلان و دەسیسەکانی ریبکا بوونەتە مایەی فەوتانی بیتا، و لەگەڵ ریبکادا خۆکوژی دەکەن.

"هداگابلر- ١٨٩٠":

چیرۆکێکی دیکەیە دەربارەی ژنێکی خۆپەرستی لوتبەرزی خۆسەر، کە تاسەی هەوسار پچڕیوی وی بۆ زاڵ بوون بە سەر کەسانی دی و ئابووتی ئەو کەسانە، مەرگی خۆی و نووسەرێکی لێدەکەوێتەوە و تەقریبەن بەدبەختی بۆ هەموو دەوروبەریشی دروست دەکات. لوڤ بورگ، ئاشقی ناکامی هدا، بە هاندانی پیاوێکی نەجیب و بە حورمەت دەست لە دەسبادی و وەختکوژی هەڵدەگرێ و کتێبێك دەنووسێت، کتێبەکە ناوبانگی بۆ پەیدا دەکات. هدا کە شووی بە کەسێکی فیشاڵبازی کەم حەوسەڵە کردووە، جارێکی دی لوڤ بورگ رادەکێشێتەوە بۆ دەست بلاوی پارە بە فیرۆدان، بە دزییەوە دەستنووسی کتێبی دووەمی وی دەسوتێنێ، و پاشان دەمانچەیەکی دەداتێ تا خۆی بکوژێ. لوڤ بورگ خۆی دەکوژێ.

هداش کە خەریکە نهێنییەکەی ئاشکرا دەبێ، هەودای ژیانی خۆی دەپچڕێنێ،

قۆناغی سێیەم:

"وەستا، بەنا- ١٨٩٢":

ئەم درامایە بە شێوەی جۆراوجۆر راڤە کراوە: توێژنەوەی پیری، لێکۆڵینەوەی لادانی سێکسی، مەحکوم کردنی رۆمانتیزم و ئایدیالیزم، و بەرەڤانی لە ئایدیالیزم، زۆربەی رەخنەگران بە کۆمەڵە هێما و ئاماژەیەکیان زانیوە بۆ ژیانی خودی ئیبسن بەتایبەتی "دڵبەندی نائاسایی وی" بە ئەڤینی ئیمیلی بارداخ-ی هەژدە ساڵان لە ساڵی ١٨٨٩دا. هالڤارد سولنس-ی بەنا، دەستبەرداری کڵێساسازی دەبێ و لە رێگەی بیناکردنی خانووانی نیشتەنییەوە دەوڵەمەند و ناودار بوو. لەسەر دوا بینایدا بورجێکی بەرز دروست دەکات. هیلدا وانگل-ی ژنی بیست و سێ ساڵە، لەسەر شانۆ دەردەکەوێ، بیری سولنس-ی دەخاتەوە کە دە ساڵ لەوە پێش قەولی "کۆشك"ێکی بەوی داوە و داوا لە سولنس دەکات کە تاجە گوڵینەیەك بەسەر بورجەکەوە هەڵواسێ، وەکو چۆن بەسەر دوا کڵێساوە هەڵی واسیبوو. سولنس داواکە قەبووڵ دەکات، لەسەر بورجەکە تووشی سەرەگێژکێ دەبێ و بەسەر سەردا دەکەوێتە سەر زەوی و گیانی دەردەچێ.

"کاڤێ ئێمەی مردووان رادەبین- ١٨٩٩":

تەقریبەن هەموو رەخنەگران ئەم شانۆنامەیەیان بە ئوتوبیگرافییەك زانیوە و داناوە، بەڵام راو بۆچوونەکای لەمەڕ شرۆڤەی رەمزییانەی بەرهەمەکە جیاوازن، ئایا ستایشێکی ئایدیالیزم و سەرزەنشتێکی قۆناغی ریالیزمی ئیبسن-ە؟ ئایا ستایشێکە لەمەڕ یەکێتی ئەڤین و هونەر؟ یان قەبوولکردنی ئەو وێرانی و داڕووخانەیە کە ئایدیالیزم بەگەڵ خۆی دەخات؟ روبیك-ی پەیکەرتاش، بە ئیلهامی ئیرنە، ئەو کیژە جوانەی دەبێ بە مۆدیلی، بەرهەمێکی هونەری مەزن دەئافەرێنێ. کاڤێ کە کیژەکە حاڵی دەکات کە لەڕووی بەدەنییەوە ئاشقی نییە، کیژەش واز لەو دێنێ، و روبیك روو دەکاتە تاشینی پەیکەری بوونەوەرانێك کە دەشوبهێنە سەر گیانلەبەران. لەگەڵ مایادا زەماوەند دەکات تا شەریکی ژیان بدۆزێتەوە بەڵام لێی بێ تاقەت دەبێ. ئیرنە دەگەڕێتەوە، مایا بە حوسن و رەزا رەدووی راوچییەکی حەیوان سوخەت دەکەوێت و، روبیك و ئیرنەش رێگەی کێوێکی بەرز دەگرنەبەر، کە گەڕانەوە لەو کێوە نییە.

رەخنە و هەڵسەنگاندن:

ئیبسن بەهۆی ئەوەی کە زۆر خاڵی پاژیی ناواقیعی لە شانۆنامەکانیدا خستووەتەڕوو، بووە بە ئامانجی رەخنە و نارەزایی. سەرنجی سایکۆلۆژییانەی ئەو، دەربارەی بابەتێن وەك بەردەوامی چاکبوونی کوتوپڕی ئەخلاقی برنیك لە (کۆڵەکەکانی کۆمەڵگە)دا مەرفوزە.

ئیرادی ناخۆشتر بابەتی ئاڵۆزی و هەڵوێستی دراماکانی وییە. دەربارەی ئیرادی یەکەم دروستە، چونکە بۆ تەمەشاڤانان یا خوێنەری ئاسایی هەندێ لە رەمزەکان بێ مانا دەنوێنن و تەنانەت راستگۆترین ستایشکەرانی ئیبسن لە شرۆڤەی رەمزەکاندا هاورەئی نین. بەڵام زۆر لە رەمز و هێماکان روون و مەفهومن، و زۆرجار مەبەستی سەرەکی یان پەیامی شانۆنامەکە تەواو روون و ئاشکرایە. بەڵام دەربارەی ئەم ئیرادەی کە شانۆنامەکانی ئیبسن "کونە"ن، دروستە کە زۆربەی مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانی وی (وەکو باوەڕ بوون بە یەکسانی ژن و پیاو) بە رادەیەکی زۆر چارەسەر کراون، بەڵام ئەو حاڵەتە سایکۆلۆژی و روحییانەی کە قارەمانانی دراماکانی ئیبسن پێوەی گیرۆدەن هەمیشە مەسەلەی رۆژ بوونە و مەسەلەی رۆژن.

کاراکتەرانی ئیبس- چ وەکو نموونە و چ وەك تاك- بە گشتی مایەی سەرنجن. پلۆتی دراماکانی کە هەندێ جاریش سۆزاوی دەنوێنن، بەلای کەمەوە جۆش و خرۆش و هاروژانی پێویستیان تێدایە، وێڕای ئەوەی کە لە شانۆدا رووداو کەم روو دەدا، بزووتنەوەی درامی خاو و تاقەتبەر نییە.

هەمیشە کێشمانەکێشێك هەیە کە دڵەڕاوکێ و شڵەژان دەخولقێنێ (هەر چەندە ئەم کێشمانەکێشە سایکۆلۆژی و روحییە)، و ئیبسن ئەم کێشمانەکێشە وەستایانە بۆ بینەر یا خوێنەر دەگوازێتەوە.

لەڕووی مێژوویییەوە، ئیبسن بە سەرزەنشتکاری ریاکاری، نادروستی، و سووك ئەخلاقی سەدەی نۆزدەیەم، و هەروەها بە بەدەسەڵاتترین نوێتاوەری مەیدانی درامانووسی لە دوای راسین و مولیر دەژمێردرێ. لە جوملەی ئەو نووسەرانەی کە لە هەمووان زیاتر قەرزارباری ئەون دەتوانرێ ناوی هاوپتمانی ئەڵمانی، برناردشۆ، و جیمزجویسی ئینگلیزی، ستریندبرگی سوێدی و یوجین ئونیلی ئەمریکایی ببرێ.

هرمان زودرمان ١٨٥٧- ١٩٢٨:

شانۆنامەنووس، رۆماننووس و نووسەری کورتە چیرۆکان، خەڵکی پروسی رۆژهەڵاتی بوو. لە کونیگسبرگ چووە قوتابخانە و، پاشان بۆ بەرلین چوو، لەم شارەدا درێژەی بە خوێندندا، و تا

کۆتایی ئەمەن لەوێندەر ئاکنجی بوو. زودرمان لـە دەوروبـەری سـاڵی ١٨٨٩دا حـەزی چـووە شانۆو زۆر زوو بە دراماکانی شۆرەت و سامانێکی پێکەوە نا.

زودرمان کە لە بزاڤی ناتورالیزمی ئەڵمانیدا رۆڵێکـی گـەورەی هـەبوو، و لـە مـاوەی ساڵانی ١٨٩٠- ١٩٠٥دا درامانووسێکی زۆر بەناوبانگ بوو، بۆ ئەمڕۆکە بە هونەرمەندی تـەرزی یەکـەم نایەتـە ژمـاردن. شـانۆنامەکانی زێـدەباری "کۆنـەیی" رێـژەییان، قـوڵی سایکۆلۆژی و روحی و راستگۆیی بەرهەمی هونـەریی گـەورەیان کەمـە، و لـە رادەبـەدەر ئیحساساتی و شانۆیین.

"خانمی دلۆڤان- ١٨٨٧":

ئەم رۆمانە خەمناك و ئوتوبیوگرافی ئاسایە کە یەکەمین پایەکانی شۆرەتی زودرمـانی قـایم کرد، مەینەتییەکانی لاوێکی شەرمن و سادە وێنە دەگـرێ کـە بـابی نـابووت دەبـێ، دایکـی دەمرێت، و خوشکە خەڵەتاوەکانی دەبنە مایەی نەنگ و ریسوایی. ئەو بە خۆیشی بە تۆمـەتی ئاگربەردان رەوانەی حەپـسی تـەمبێ کـاری دەکـرێ، بـەڵام ئـەنجام ژنێـك کـە لەبـەر دەرگـا چاوەڕێیەتی، ئازادی بۆ دەگەڕێنێتەوە.

"شەرەف" (دەرهێنان: ١٨٨٩، بڵاوبوونەوە: ١٨٩٠):

یەکەمین شانۆنامەی زودرمانە کە بە باشی کاریگـەریی ئیبـسنی پێـوە دەردەکـەوێ. جیاوازی نێوان چەمکی شەرەف لـە روانگـەی خانـەوادەی کارخانـەدارێك و لـە روانگـەی خانـەوادەی کرێکـارێکی هـەژاری هـەمان کارخانـەدا تیمـە و نێـوەڕۆکی سـەرەکی ئـەم درامایەیە. ئەنجامگیری فەلسەفی دراماکە ئەمەیە کە "شەرەفی قەراردادی یەکێکە لە درۆ قەراردادییەکان"، کابرای کارخانەدار کە کوڕەکەی بووەتە باعیسی نـەنگ و ئابڕوچـوونی کیژی کرێکاری کارخانەکە، چـەکێکی گـەورە بـە نـاوی کیـژەوە دەنێـرێ، هـەم دایـك و باوکەکە و هەم کیژەکە بە ئاسـەوە چەکەکە قـەبوڵ دەکـەن. بـەڵام کـوڕی ماڵەکـە کـە چەمکێکی بەرزتری بۆ شەرەف لە زەینـدایـە، زۆر دەشـەمزێ و خەفـەت دەخـوات. پـشت دەکاتە خانەوادە حەقیرەکەی خـۆی، هەڕەشـەیەك بـۆ کارخانەدارەکـە دەنێـرێ، و پاشـان لەگەڵ کیژەکەی ویدا دەرەڤێ.

سۆنگەی گرێکردنەوەی ئەم درامایە تاڕادەیەك لاواز دێتە بەرچاو، لێ دیمەنی دراماکە گەرم و گوڕ و دلگرە، و پلۆتی ئاشـکرا و راسـتەوخۆی مەسـەلە ئەخلاقییـەکانی کتێبەکـەش بـووە مایەی پێشوازی گەرم و گوڕی ئەڵمانیانی سەردەمی زودرمان.

"زاگە یا ماگدا- ١٨٨٩":

زودرمان لەم درامایەدا جارێکی دی هێرش دەکاتە سەر وێنا نادروستەکان دەربارەی شەرەف، قارەمانی ژنی دراماکە، ماگدا (دی هایمات)، بۆ رزگاربوون لە جەوری بابی، کە ئەفسەرێکی پیری سوپایە، شاری زێدی خۆی بەجێدێڵێ.

فریوی پارێزەرێکی لاو دەخوات و پاشان بە داوێنی لەوتاوەوە بەتەنێ دەمێنێتەوە. ئاقیبەت روو دەکاتە دنیای ئەکتەری و کە ناوبانگ دەردەکات دەچێتە دیداری بابی و زێدی خۆی. باوکە کە واریقاتی پارێزەری فێڵباز دەژنەوێ، پێ دادەگرێ لەسەر ئەوەی کە ماگدا بۆ پاراستنی ئابرووی خانەوادەیی، لەگەڵ پارێزەرەکەدا زەماوەند بکات. کابرای لاو بەم مەرجەی کە ماگدا دەست لە ئەکتەری هەڵگرێ، بە ناچاری مل بۆ زەماوەندەکە دەدا. ماگدا لەبەر خاتری بابە پیرەکەی مەرجەکە قەبووڵ دەکات، بەڵام لە بەرانبەر پێ داگرتنی پارێزەکە کە داوای لێدەکات واز لە منداڵەکەشی بێنێ هەڵوێست گیری دەکات. بابەکە تورە دەبێ و هەڵدەکێشێتە دەمانچە تا ماگدا بکوژێت، بەڵام بەخۆی لە ئەنجامی سەکتەیەکی کوتوپڕدا دەکەوێتە سەر زەوی.

ماگدا ئازادی خۆی بە دەست دێنێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دەستێکی لە مەرگی بابیدا هەبووە، هەمیشە ویژدانی ئازار دەدا.

شانۆنامەکانی دیکە:

زودرمان، جگە لەوانەی بوری، شانۆنامانی دیکەشی نووسیوە، کە شۆرەت و ئیحتوبارییان زیاتر کردووە.

(ئەمانی سودوم- ١٨٩١) تراجیدیایەکی تەنزئامێزە دەربارەی گەندەڵی و تاوانکارییەکانی ناو بەرلین (غەزەلی غەزەلەکان- ١٩٠٨ لە باشترین ئەو شانۆنامانەیەتی کە پەردە لەرووی خەڵك خەڵەتێنی و گەندەڵی کۆمەڵایەتی هەڵدەماڵێ). شانۆنامەیەکی دیکەی (شادی لە گۆشەگیریدا – ١٨٩٦) چیرۆکی خانمێکی داوێن پاك دەگێڕێتەوە کە رووی خۆش لە بەرانبەر لاوانەوە و ئەوازشی درۆینە و ریابازانەی پیاوێکی بەناو عاشقدا نیشان نادات و لە ئەنجامدا لەگەڵ مێردە پیرەکەی خۆیدا بە جۆرە شادییەکی تازە دەگات.

گرهارت یوهان هاوپتمان ١٨٦٢- ١٩٤٦:

هاوپتمان لە زالتسبرون"١١" لە سیلزی"١٢" هاتۆتە دنیاوە. پاش ئەوەی کە توانا و بەهرەی خۆی لە پەیکەرتاشی، نیگارکێشی و زانستە سروشتییەکاندا تاقی کردەوە، ماوەیەکی کەم لە ئەسپانیا و ئیتاڵیادا کەوتە گەشت و گەڕان و پاشان لە بەرلین ئاکنجی بوو. زۆر زوو کەوتە ژێر

کاریگەریی ناتورالیستانی فەڕەنسی و ئیبسن و دەستی بە شانۆنامەنووسی کرد. هاوپتمان زۆربەی ساڵانی تەمەنی درێژی هەر خەریکی نووسینی شانۆنامانی ناتورالیستی و رۆمانتیکی بوو، و هەندێ جاریش هەردوو شێوەکەی ئاوێتەی یەکدی دەکرد. لە ساڵی ١٩١٢دا خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی وەرگرت، لە ئاخر و ئوخری تەمەنیا بە "دامەزرێنەری ئەدەبیاتی نوێی ئەڵمان" دەژمێردرا.

بەرهەمەکانی:

هاوپتمان لە شانۆنامەکانی سەرەتایدا یەکێك بوو لە توندڕەوترین ناتورالیستان. لە رێگەی بەکارهێنانی رەوت و رێبازی زانستییەوە، بێ باکانە کەوتە پیشاندانی بابەتێن قەدەغەی وەك مەسەلەێن سێکسی، نەخۆشی، ئالودە بوون بەمەی، و توند و تیژی، زۆربەی کات قارەمانانی شانۆنامەکانی لە نێو چینی زەحمەتکێشانەوە هەڵدەبژارد.

بەر لە خۆر هەڵاتن- ١٨٨٩:

ئەم تراجیدیایە چیرۆکی ژیانی خێزانی مەی ئالوودەی پیاوێکی جووتیار وێنە دەگرێ کە بە دۆزینەوەی زوغاڵی بەرد لە زەوییەکانیا دەوڵەمەند دەبێ. هاوسەری یەکەم و کیژە گەورەکەی وەکو خۆی بادەنۆشن و، هاوسەری دووەمی ژنێکی "سووك و زیناکارە". کیژە چکۆلەکەی، هیلێن کە دوور لە خێزانەکە چووەتە قوتابخانە، کیژۆڵەیەکی جوان و شەرمن و سەلار، دەبێ بە دەزگیرانی گەنجێکی زانا. بەڵام گەنجەکە کە دەبینێ خێزانەکەی وی لە زەلکاوی بادە و ناو زڕاوی دا گیری خواردووە هەڵدێ. هیلێن-یش خۆی دەکوژێت.

جۆلایان- ١٨٩٢:

ئەم شانۆنامەیە کە بە باوەڕی هەندێ لە رەخنەگران بە شاکاری هاوپتمان دەژمێردرێ، وێنەگرتنێکی تاقەتبەری ستەمێکە کە لە جووتیارانی هەژار دەکرێ. ئەم شانۆنامەیە لەسەر بنەمای راپەڕینی مێژوویی ژمارەیەك لە جولایانی سیلزی لە ساڵی ١٨٤٤دا، هاتۆتە نووسین. ئەم راپەڕینە نابووتی موڵك و کوشتنی لێدەکەوێتەوە، بەڵام جۆلایانی هەژار لە کۆتاییدا وەزع و حاڵێکی ئاسوودەتر پەیدا ناکەن.

سەفەری ئاسمانی هانلە- ١٨٩٣:

لێرەدا، سیمبولیزم، یان رۆمانتیزمی نوێ، کە بەرە بەرە لەگەڵ ناتورالیزمدا ئاوێتەی یەك دەبن، رەونەق و جیلوە پەیدا دەکات. هانلەی کیژی بێنەوای بەردتاشێکی هەمیشە مەست، لەلایەن چەند پیاوێکی دێو رەفتارەوە تەجاوزی دەکرێتە سەر. لێدەبڕێ خۆی لە ئاودا غەرق

بکات، بەڵام رزگاری دەکەن و بۆ گەداخانەی دەبەن. لەوێندەر لە خەونانی ئاسمانیدا، مامۆستاکەی لە شێوەی مەسیحدا دەبینێ کە ئەو لەنێو مردووەکاندا زیندوو دەکاتەوە. هەر کە خەونەکە دەڕەوێتەوە، هانلە دەمرێت.

پاڵتۆی فەرو- ١٨٩٣:

ئەم درامایە کۆمیدیایەکی ناتورالیستییە- دیاردەیەکی دەگمەنە- چونکە زۆربەی بەرهەمێن ئەدەبی ناتورالیستی یا نائومێدانەن یا تراجیدین. لێ بابەتی ئەم شانۆنامەیە هەجوی دادگایانی پروس و شێوەی دادپرسی ئەو دادگایانەیە. کاتێ پاڵتۆیەکی فەرو دەدزرێ، قازی ورهان کە لەڕادەبەدەر کەودەن و زۆر لە بابەتەکە دوور و بێ ئاگایە، ناتوانێ بڕیاری مەحکومییەتی تاوانباران کە تاوانەکانیان ئاشکرایە، دەربکات.

فلوریان گیر- ١٨٩٥:

هاوپتمان لەم درامایەدا کە بۆ ریالیزمی پەتی دەگەڕێتەوە، هەوڵدەدا جەنگی جووتیاران"١٣" لە سەدەی شازدەیەمدا وێنە بگرێ، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی سەرکەوتوو نابێ.

زەنگی نقوم بوو- ١٨٩٦:

ئەم شانۆنامەیە بادانەوەیەکی دیکەیە بەرەو رۆمانتیزم، بەڵام کەم و زۆر هەندێ رەگەز و توخمی ناتورالیزمی تێدا هەیە. هاوپتمان لێرەدا دەکەوێتە شیکردنەوەی وەزع و حاڵی پیاوێك کە کەوتووەتە نێوان کێشمانەکێشی ئارەزووی ژیانی ئازاد و دوور لە مەسئوولیەت، و هەستی وەفاداری و پابەندی بە هاوسەر و کۆمەڵگەوە. هاینریش، کەپیشەی زەنگ سازییە، شاکاری خۆی کە زەنگێکە بۆ کلێسا، دروست دەکات. بە خۆشحاڵییەوە زەنگەکە بە عەرەبانەیەك بەرەو شوێنی مەبەست دەبا، یەکێك لە فونەکان عەرەبانەکە وەردەگێڕێ و زەنگەکە غل دەبێتەوە ناو دەریاچەیەکەوە. هاینریش بە زەحمەت لە غەرق بوون دەرباز دەبێ، یەکێك لە حۆرییانی دەریا بۆ پەنا کێوێکی دەبات، هاینریش ماوەیەکی زۆر لەوێندەر دەمێنێتەوە، سروشت پەرستی دەکات، و زەنگانی شرك ئامێز دروستدەکات. هاوسەرەکەی لەگەڵ کەشیشی گوندا دێتە سۆراخی، و بە پاڕانەوەوە داوای لێدەکات بۆ سەر خانەولانەی خۆی بگەڕێتەوە. هاینریش بە گەڕانەوە رازی نابێ مەگەر لە حاڵێکا گوێی لە دەنگی زەنگە نقوم بووەکە بێ. زەنگەکە بە دەستی هاوسەرکەیەوە کە بە مەبەستی خۆکوژی خۆی خستووەتە ئاوەکەوە، لێدەدا. هاینریش بە ژنەوتنی دەنگی خەمناکی زەنگەکە بۆ گوندی دەگەڕێتەوە، لێ گوندنشینان رووی لێ وەردەگێڕن. هاینریش ناچار روو دەکاتەوە کێوان، کە دەگاتەوە پەناگەکە بۆی دەردەکەوێ کە حۆری دەریا زەماوەندی کردووە، ئەویش نائومێد و دڵشکاو دەمرێت.

بەرهەمێن دی:

لە شانۆنامەکانی دیکەی هاوپتمان دەتوانرێ ناوی دراماى رۆمانتیکی (هاینریش-ی بێنەوا- ١٩٠٢)و شانۆنامەی رەمزی(بەر لە ئێواران- ١٩٣٢) ببرێ.

هاوپتمان هەرچەندە بە شانۆنامەنووسی بە نێو بانگە، رۆماننووس، نووسەری کورتە چیرۆکان و شاعیریش بوو. لە رۆمانەکانی: (عەمانوئیل کوینت، مەسیحی گیل- ١٩١٠) ئاوێنەی مەیلی باوی رۆژە بەلای عیرفاندا.

## رۆمان و کورتە چیرۆك

رۆمان و چیرۆکی کورت دەربڕی هەمان ئەو رێچکە و رێبازە ریالیزمی و ناتورالیزمییەن کە لە باسی شانۆنامەدا ئاماژەیان بۆ کرا. گەلەك لە گەورە نووسەرانی سەردەم لە هەر سێ واری -شانۆنامە، رۆمان، و چیرۆکی کورتدا- بەرهەمیان نووسیوە، گرنگترین چیرۆکنووسانی ئەم قۆناغە بریتین لە: ئیمرمان، فرایتاگ، شتورم، کیلەر و، مایر.

کارل لبرشت ئیمرمان ١٧٩٦- ١٨٤٠:

ئیمرمان یەکێك بوو لە هەوەڵین رۆماننووسانی واقیعی لە ساڵی ١٨٣٦دا رۆمانی ژیانامەیی (ئیپیگونەکان) لە هەجووی هاوچەرخانی خۆیدا نووسی. ئەم رۆمانە ژیان لە دەیەکانی دووەم و سێیەمی سەدەی نۆزدەیەمدا وێنە دەگرێت. ئیمرمان لەم رۆمانەدا کە بە ئیلهامی "مامۆستا ویلهلم"ی گوتە نووسیویەتی، کێشە و ململانێی نێوان چینی بۆرژوا و ئەرستۆ کراتانی کۆن دەردەبڕێ، و بەجۆرە بناغەی رۆمانی کۆمەلایەتی بۆ نەوەی دواتر دادەنێ. رۆمانێکی تری ئیمرمان، (مونشهاوزن ١٨٣٨- ١٨٣٩)ـە کە لە سەربورەکانی بارون مونشهاوزنەوە "١٤" هەلێنجراوە و بەراوردێکی تەوس ئامێزە لە نێوان سووکی و پووچییەکانی کۆمەلگەی چینی بالا و پاکی و سەنگینی سادەی خەلکی گوند. ئەو چیرۆکە کورتەی کە بەگەلّ ئەم رۆمانە خراوە "دادگای بەرز"ی ناوە، و رۆمانسێکی گوندییاتی بەرزە کە بە ناودارترین بەرهەمی ئیمرمان دەژمێردرێ. ئیمرمان زێدەباری رۆمانەکانی، چەند کۆمیدیا و تراجیدیایەکیشی نووسیوە.

کۆستاف فرایتاگ ١٨١٦- ١٨٩٥:

شانۆنامەنووس، رەخنەگر و رۆماننووسە. (بەناوبانگترین شانۆنامەی، رۆژنامەنووسانە- ١٨٥٤، کە کۆمیدیایەکی زیرەکانەیە لەمەر ژیان و سیاسەت لە شارە بچووکەکاندا). یەکێك لە

ڕۆمانـەکانی (قـەرز و داوا- ١٨٥٥)یـە، ڕاپـۆرتێکی مـدارا بـەزەیی ئـەنگێزە لەمـەڕ ژیـانی بازرگانێکی لاو کە لێدەبڕێ خانەوادەی ئابڕوومەندی بارون-ێك ڕزگار بکـات و سـەرەنجام لەگـەڵ کیژی باروندا زەماوەند دەکات. واقیعیەتی ئەم ڕۆمانە لەو وێنانەدا پەنهانە کـە دەربـارەی ژیـانی بازرگـانی ئـەڵمانی دەیـانگرێ. ڕۆمـانێکی دیکـەی بـەناوی (دەستنووسـی ونبـوو- ١٨٦٤)، ڕۆمـانتیکیتر و تەقلیـدی تـرە. پرۆفیـسۆرێك کـە هـەموو هـۆش و گۆشـی لـەلای دۆزینـەوەی دەستنووسێکی ونبوویەتی دەربارەی تاسیتوس، لە هاوسەرە گەنجەکەی غافڵ دەبێ، و شـازادەیەك ئاشقی ژنـە دەبـێ، ئـەنجام لـە دایـك بـوونی منالێـك، پرۆفیـسور وەئاگادێنێتـەوە و لـە بـیری دەستنووسەکەی دەردێنێ. بەناوبانگترین بەرهـەمی فرایتـاگ کۆبەرهـەمێکی هەشـت ڕۆمانییـە بەناوی (پێشینان "باپیران" ١٨٧٢- ١٨٨٠). ئـەم ڕۆمانانـە پێـشکەوتنی مێـژوویی میللـەتی ئەڵمان لە سەدەی چواردەهەمەوە تا ساڵی ١٨٤٨ دەگێڕنەوە.

تیودور شتورم ١٨١٧- ١٨٨٨:

شتۆرم لە نووسینی کورتە چیرۆکدا تەقریبەن بە هەمان ئەنـدازەی گـوتنی شـیعری لیریکـی بەناوبانگە، یەکەمین بەرهەمی وی، (هۆزانان)، لە ساڵی ١٨٥٣دا بڵاوبووەوە. شیعرەکانی نـاو ئەم دیوانە ژیانی ئارام و دیمەنێن سروشتی هێمنی زێدی وی شلسویگ- هولشتاین وێنە دەگرن، یەکەمین چیرۆکانی وی، کە مەنشورترینیان (ئیمنـزە- ١٨٥٢)ی نـاوە، زیـاتر ڕۆمـانتیکین تـا ڕیالیستی. شتورم تا پیر تـر دەبـوو، چیرۆکەکانیـشی واقیعـی تـر و لـەڕووی سـایکۆلۆژییەوە وردبینتر دەبوون، چیرۆکانی (ڤیـولا تریکولـور ١٨٧٣)، "پـاول-ی دەرهێنـەری بوکەڵـەبازی- ١٨٧٤)، و "گیان- ١٨٧٥" بە ئاشکرا ئاوێنەی ئەم گۆڕانکارییەن لە شێوەی تەکنیکی ئەودا. شتورم لە ساڵانی هەفتادا ڕووی کردە چیرۆکی مێـژوویی. "نقـوم لـە ئـاوا- ١٨٧٧" باشـترین چیرۆکی ئەوە لەم مەیدانەدا، شتورم شاکارە واقیعیانەکانی لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا نووسـی: "کوڕانی سیناتۆر- ١٨٨١"و "هانس و هاینزکرش- ١٨٨٣"، و "سوارچاکی ئەسـپی سـپی- ١٨٨٨"، کە لە بنچینەدا وێنەگەلێکن لەبەر ڕۆشنایی سایکۆلۆژی.

گوتفرید کیلەر ١٨١٩- ١٨٩٠:

زۆربەی ڕەخنەگران، کیلەر بە یەکێك لە گـەورەترین چـیرۆکنووس و ڕۆماننووسـی ئـەڵمانی دەزانن. ڕوبرتسون، بە "گەورەترین نووسەری کورتە چیرۆکانی" لـە ئـەدەبیاتی ئەڵمانیـدا نـاو دەبـات، و تـومس لەسـەری دەڕوات "کتێبـەکانی کیلـەر بەسـەر یەکـەوە باشـترین بابـەتی

خوێندنەوەن کە لەسەر خوانی بەربڵاوی چیرۆکی خەیاڵی سەدەی نۆزدەیەمدا دەتوانرێ بدۆزرێتەوە". کیلەر لە شیعریشدا دەستێکی باڵای هەبوو.

کیلەر لە شاری زوریخی سویسرا هاتە دنیاوە، زۆربەی بەرهەمەکانی کەش و هەوای سویسرایان هەیە. لە گەنجێتی هەندێ شیعرانی گوت، لێ زیاتر خۆی بۆ نیگارکێشی تەرخان کرد، و چونکە لەم لقەدا بەهرەیەکی لە خۆیدا نەبینی، دوو ساڵ لە زانستگەی هایدلبرگ، و پاشان ماوەی پێنج ساڵ لە زانستگەی بەرلین درێژەی بە خوێندندا. یەکەمین کۆمەڵە شیعری خۆی بە نێوی هۆزانان لە ساڵی ١٨٤٦دا بلاوکردەوە بەڵام سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بە دەست نەهێنا. لە ساڵی ١٨٥١دا دووەمین بەرهەمی بەناوی هۆزانێن نوێ، بڵاوبووەوە، کە شیعری دڵگیر و جوانی تێدا بوو. کیلەر لە کاتی ئاکنجی بوونیا لە بەرلین حەزی چووە سەر چیرۆکی پەخشان، و لەم شارەدا بلیمەتی راستەقینەی وی ئاشکرا بوو. لە ساڵی ١٨٥٥دا بۆ زوریخ گەڕایەوە و تا کۆتایی تەمەنی لەوێندەر مایەوە.

هنری سەوز ١٨٥٤- ١٨٥٥:

ئەم رۆمانە ئۆتۆبیوگرافی ئاسایە، چوار بەرگییە تاڕادەیەك یادی (مامۆستا ویلهلم)ەکەی گۆتە لە هزراندا زیندوو دەکاتەوە. ئەم بەرهەمە ئەگەرچی تا ئەندازەیەك بێ فۆرمە و جوڵەیەکی خاوی تێدایە، چیرۆکی دڵگیری منالییەتی، لاوی و قۆناغی کامڵی هاینریش لی دەگێڕێتەوە (کە جۆری جل لەبەر کردنەکەی شۆرەتی هنری سەوزی داوەتێ). قارەمانی چیرۆکەکە، وەکو کیلەر، خەڵکی زوریخە و کەڵکەڵەی بە هونەرمەند بوونی لەسەردایە. لە پێناوی خوێندنی هونەردا شاری زێدی خۆی بەجێدێڵێ، و بۆ مونیخ دەڕوات. لە ئەنجامدا پەی بە خەیاڵ خاوی خۆی دەبات، دەست لە هونەر دەشوات، بۆ مەوتەنی خۆی دەگەڕێتەوە مل بۆ ژیانی گومناوی دەدات.

"خەڵکی سلدویلا" (١٨٥٦، پێداچوونەوە: ١٨٧٤):

کۆی چەند چیرۆکێکە دەربارەی خەڵکی شارۆچکە و گوندەکانی وڵاتی سویسرا. هەندێ لە چیرۆکەکانی رۆمانتیکی، ژمارەیەکیان ریالیستی، بڕێکیان کۆمیدی، و هەندێکیان تراجیدین بۆ نموونە "رۆمیۆ و جولیتی گوند" سەربوری خەمناك و تراجیدی دوو ئەڤیندداری لاو دەگێڕێتەوە کە بنەماڵەکانیان لەسەر زەوی و زاری کشتوکاڵی بوون بە دوژمنی یەکدی، ئەم دوو لاوە لە ئاهەنگێکدا دەرەقسن و پاشان خۆیان غەرق دەکەن.

چیرۆکەکانی زوریخ ١٨٧٨:

ئەم کۆمەڵە، وەستایانەترین کورتە چیرۆکانی کیلەر لەخۆ دەگرێت. "بەیداخی حەوت پیاوی چاکەکارە یەکێکە لە باشترین چیرۆکانی ئەم کۆچیرۆکە. ئەم چیرۆکە بارودۆخی سیاسی سویسرا لە سەرەتاکانی سەدەدا بەرجەستە دەکات.

مارتین سالاندر- ١٨٨٦:

رۆمانێکی تا ئەندازەیەك تاقەتبەرە لەمەڕ ژیان و سیاسەتی سویسرای سەردەمی تازە.

هەندێ لە کۆ چیرۆکەکانی دیکەی کیلەر بریتین لە: حەوت ئەفسانە- ١٨٧٢ (کیلەر لەم کۆچیرۆکەدا بە شێوەی چیرۆکی پەریان هەندێ چەمکی قەدیسان و مریەمی موقەدەس بە قەڵەمێکی شیرین و سادە دەگێڕێتەوە)و قسەی ئەستەق- ١٨٨٢.

چیرۆکەکانی کیلەر، پلۆتی رەسەنیان نییە، هیچ پەیامێکی گرنگیش نیشان نادەن. ناسکی ئەم چیرۆکانە لە گاڵتەبازی دلگیر و هەروەها جۆری ئاشکرا کردنی شەخسیەتی دلگیر، خۆڕسك و بەهێزی خودی نووسەردا پەنهانە.

کونراد فردینامایر ١٨٢٥- ١٨٩٨:

مایر، وەك کیلەر، لە بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراتی دەوڵەمەند لە زوریخ لە دایك بووە، تاوەکو بەر لە جەنگی فەرەنسا- پروس جارێ بە فەرەنسی و جارێ بە ئەڵمانی دەینووسی، بەڵام لە دوای جەنگەوە (١٨٧١) هەموو بەرهەمەکانی بە ئەڵمانی نووسیوە، مایر، هەم وەکو کیلەر، لە بوارێن نووسینی کورتە چیرۆك و گوتنی شیعردا (هۆزانێن لیریکی، چامان، بەیتێکی داستانی و بەیتێکی شوانکارەیی) خۆی تاقی کردوەتەوە، بەڵام پتر بە رۆمانەکانی بەناوبانگە.

یۆرگ ییناچ- ١٨٧٦:

رۆمانێکی نیمچە مێژووییە دەربارەی جەنگەکانی سی ساڵە (کە بەسەرهاتی دژوار و مەرگی دڵتەزێنی کەشیشێکی سویسری لە پەیڕەوان و شوێنکەوتووانی لوتەر لەسەرەتاکانی سەدەی هەڤدەیەمدا دەگێڕێتەوە. لەم رۆمانەدا غروری زادەی خۆپەرستی، گوناح و کارەساتی لێدەکەوێتەوە).

قەدیس — ١٨٨٠:

یەکێکە لە بەناوبانگترین چیرۆکەکانی مایر، کە لە سەر تەوەری ژیانی رۆحانی شەهیدی ئینگلیزی تۆماس ئابکت، نووسراوە. مایر لە ساڵی ١٨٨٣دا پێنج رۆمانی بڵاوکردەوە: تەلیسم، گوللەیەکە لەسەر مینبەرەوە، پلاوتوس لە دێردا، پێشکاری گۆستاف ئادولف، و

خەمانی کورپێژگەیەك. چیرۆکی زەماوەندی رەبەن- لە ساڵی ١٨٨٤دا بڵاوبووەوە، و قازی ژن، لە ساڵی ١٨٨٥، و وەسوەسەی پسکارا لە ساڵی ١٨٨٧، و ئانجیلا و بورجیا-ش لە ساڵی ١٨٩٠دا بڵاوبووەوە.

وەکو لە ناوی بەرهەمەکانی مایرەوە دەردەکەوێ، ئەو پتر دڵبەندی رێنیسانس بوو. ئەو وێڕای ئەمەی کە گاڵتەبازی و جددییەتی کیلەری نەبوو، هونەرمەندێکی وردتر و وردبینتر بوو، رۆمانەکانیشی رازاوەتر و هاوسەنگ تر و گونجاوترن.

# زێدەرەکان:

١- مەتەرنیخ (١٧٧٣- ١٨٥٩):

سیاسەتوانێکی نەمساوی بوو.

٢- تسولفراین: یەکێتیی گومرگی نێوان وڵاتانی ئەڵمان لە سەدەی نۆزدەیەمی زاییینیدا.

٣- کۆنفدراسیونی ئەڵمانی باکووری: یەکێتیی نێوان بیست و دوو ویلایەتی ئەڵمانی باکووری رووباری ماین، بە رابەری پروس، ئەم کۆنفدراسیۆنە جێگەی ئەو یەکێتییەی گرتەوە کە لە ئەنجامی شەڕی ١٨٦٦ی نەمسا و پر وس لە نێو چوو بوو.

* سەرمایە (کاپیتال- Capital):

بەرگی یەکەمی لە ساڵی ١٨٦٧ بڵاوبووەوە و بەرگی دووەم و سێیەمی بە راستکردنەوەی ئەنگلز، لە ساڵی ١٨٨٥ و ١٨٩٥دا بڵاوبوونەوە.

٤- هایدلبرگ: شارێکە لە رۆژئاوای ئەڵمان.

٥- بەرگن زێڕین – Golden Feece:

لە ئەفسانانی یۆنانیدا، بەرگنی سیحر ئاسای ئەو بەرانەیە کە فریکسوس بە ئایتس-ی پاشای کولخیس-ی دا، یاسون و ئارگوناتەکان بە دوویدا بۆ کولخیس چوون، و پاش ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە ئایتس دیاری کردبوون، بە دەستیان هێنانەوە.

٦- کالوت- Callot:

هونەرمەندێکی فەرەنسی سەدەی هەڤدەیەمە، کە بە شێوازە عەجیب و غەریبەکەی بەناوبانگ بوو.

٧- لیە- Leah:

کیژی گەورەتر و ناشیرینتری لابان و ژنی یەکەمی یەعقوب بوو.

٨- سالوست- Sallust:

(٨٦- ٣٤ پێش ز): مێژوونووس و سیاسەتوانی رومی بوو.

٩- بێرگن- Bergen:

شارێکی بەندەرییە لە باشووری رۆژئاوای نەرویج.

١٠- پێرگینت- Peergynt:

قارەمانێکی ئەفسانەیی ولاتانی ئەسکەندیناڤییە.

١١- زالتسبرون: شارێکە لە سیلزی ژێری.

١٢- سیلزی: ناوچەیەکە لە باکووری ئەورووپای مەرکەزی. لە پاش جەنگی جیهانی دووەم تەقریبەن هەمووی بوو بە بەشێك لە پۆڵەندا، بەڵام هەندێ بەشی کەمی لە چیکۆسلۆڤاکیا و ئەڵمانی رۆژهەڵاتدایە.

١٣- جەنگی جووتیاران (١٥٢٤- ١٥٢٦) راپەڕینێکی گشتی جووتیارانی ناوچەکانی ناوەندو باشووری ئەڵمان بوو دژی ئەرستۆکراتان و زوڵمی مولکدارەکان، و دژی ئەنجامدانی یاسای روم بوو کە جووتیارانی لە ریزی کۆیلان دادەنا. ئەم جەنگە بە شکستی جووتیاران شکایەوە.

١٤- مونشهاوزن (١٧٢٠-١٧٩٧): راوچی و سوپایی ئەڵمانییە کە بە رواڵەت چیرۆکانی موبالەغە ئامێز و باوەڕ نەکردەنی دەگێڕێتەوە.

# ئەدەبیاتی ئەڵمان
# لە
# سەدەی بیستەمدا

سەرەتایەکی مێژوویی:

مێژووی رامیاری و سوپایی ئەڵمان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا ئەوەندە زانراوە کە دەشێت بە ئاماژە بۆ خاڵە سەرەکییەکانی بەسەریا رابری. ئەڵمان لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی تزار ویلهلم"١"-ی دووەمدا، لە ساڵی ١٩١٤دا جەنگی جیهانی یەکەمی دەست پێکرد، لە ساڵی ١٩١٨دا کە ئیدی پشتی لەبەر پڕابوو، و هەناسەی تیا نەمابوو، لەبەردەم هاوپەیمانەکاندا"٢" بەزی و هەموو کۆلۆنییەکانی، ئالزاس و لورین، و هەندێ دەڤەر و ناوچەی سنووریی لەدەستدا (پاش ئیستیقالەی ویلهلم و قەبوولکردنی مەرجە قورسەکانی پەیمانی ڤێرسای"٣") لە ساڵی ١٩١٩دا حکوومەتی کۆماری لە ئەڵماندا (کۆماری وایمار) راگەیەندرا. میللەت تا ماوەی چواردە ساڵان لە وەزعێکی ناڵەباری بەزمیی ئەنگێزدا ژیا. ئابووریی تەواو تێك شکاو و دەوڵەت لەڕادەبەدەر نائارام بوو، و جەماوەری خەڵك باری گوناحی جەنگیان بە شانەوە بوو. سەرەنجام ئادولف هیتلەر، کە لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٢٣دا بە وتارە پڕ جۆشەکانی خۆی رێگەی بۆ گەیشتنە دەسەڵات خۆشکردبوو، توانی بگاتە رابەرایەتی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی ئەڵمان ((نازی))، لە ساڵی ١٩٣٣دا هەموو دەسەڵاتەکانی گرتە دەست، و ئەڵمانی خستە ژێر دەسەڵاتی نازییەکان. بەجۆرە هیتلەر کۆماری وایماری لابرد، و کۆماری ناسراو بە رایشی سێیەمی، واتە حکوومەتی دیکتاتوری موتڵەقی خۆی، بەرپا کرد. پەیمانی ڤێرسای کە کۆتایی بە

جەنگی جیهانی یەکەم هێنابوو، هەڵوەشاندەوە، خەباتی پاکسازی نەژادی بە (لایەنگری لە نەژادی ئاریایی و دژایەتی سامی) دەست پێکرد، لە ساڵی ١٩٣٧دا نەمسا و لە ساڵی ١٩٣٨دا بەشێك لە چیکوسلوڤاکیای خستنە سەر ئەڵمان، لە ساڵی ١٩٣٩دا بە هێرش بردنە سەر پۆڵەندا جەنگی جیهانی دووەمی دەست پێکرد، ئەڵمان جارێکی دیکەش لە ساڵی ١٩٤٥دا بەزی. بەریتانیای مەزن، یەکێتیی سۆڤیەت، فەرەنسا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داگیریان کرد، و سەرەنجام لە ساڵی ١٩٤٩دا بەسەر دوو بەشدا دابەشکرا: بەشی رۆژهەڵاتی (کۆماری دیموکراتی ئەڵمان) کەوتە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەتەوە، و بەشی رۆژئاوایی (کۆماری فیدراڵی ئەڵمان) کەوتە سایەی دەسەڵاتی فەرەنسا، ئینگلیستان و ئەمریکا.

<u>نۆڕینێکی گشتی:</u>

ئەدەبیاتی ئەڵمان لە سەدەی بیستەمدا، وەکو سەدەی نۆزدەیەم، بە هەمان رێچکە و رێبازانی ئەدەبیاتی فەرەنسیدا چووەتە پێشێ، لەم قۆناغەدا شێوە توندەکانی ناتورالیزم کەم و زۆر هەڵوەشاوەتەوە، بەڵام ریالیزم، هاوشانی رۆمانتیزمی نوێ، درێژەی بە ژیانی خۆی داوە.

جەنگی جیهانی یەکەم، گەشەی بە هۆزانێن نیشتیمانی و شانۆنامان و رۆمانانی ریالیستیدا. ئەم گەشانەوە و بوژانەوەیە هەرچەندە لەلایەنی مێژووییەوە مایەی سەرنجە، تیژتێپەڕ و بێ دەوام بوو.

رژێمی توتالیتاری هیتلەر لە راستیدا کۆتایی بە سەرلەبەری چالاکییەکانی مەیدانی ئەستاتیکی رەسەن و فەلسەفە هێنا. گەلەك لە زانایان، نووسەران و فەیلەسووفان بە ناچاری وڵاتیان بەجێهێشت و لە وڵاتانی دیکەدا گیرسابوونەوە و پەنایان گرتبوو. لەو هزرڤانانەی کە رای بەردەوامانندنی هەوڵی داهێنەرانەی خۆدا بۆ ئەمریکا هەڵاتن، فرانتس ورفل، ئەریش ماریا ریمارك، تۆماس مان، و ئالبرت ئینشتاین لە هەموویان بەرجەستەترن.

گرنگترین ژانری ئەدەبی لە ساڵی ١٩٠٠ بە دواوە هۆزانی لیریکی، شانۆنامە و رۆمان بوونە.

لە هەوەڵێن ساڵانی سەدەی بیستەمدا هۆزانی لیریکی دووبارە تارادەیەکی زۆر گەشایەوە. ناتورالیزم و ئیمپرسیونیم مادیانە بەرەو سیمبولیزم و ئەکسپرسیونیزم، کە شێوەیەکە لە هەستگەرایی رۆمانتیزم، بایدایەوە. لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم هۆزانی لیریکی بتەوتر، قووڵتر و مەعنەویتر بوو. لیریکاخوانانی ناوداری ئەم سەردەمە بریتین لە: دەمل، گیورگە، هوفمانشتال، ریلکە و ورفل.

ریشارد دمل (١٨٦٣- ١٩٢٠):

لە دەروێشانی نیتشە بوو. هۆزانەکانی تێکەڵەیەکن لە ریالیزم و رۆمانتیزم، عیرفان و ئەقڵانییەت. ئەم هۆزانانە (ئاوێتەی ئارەزووە ناجێگیرە ئەخلاقییەکانی سەردەم بوون. بە زۆری مەکشوف و بە گوێرەی خواستە بەدەنی و تەنانەت مەیلەو نەخۆش و توند و تیژەکانن) سێ نێوەرۆکی دڵخوازی وی سێکس، پەیوەندی تاك بە بوونەوەران، و ئەرکی مرۆڤ دەرهەق بە هاورەگەزی خۆیەوەیە.

گرنگترین دیوانە شیعری وی بەم ناوانەن: هەر ئەڤین ١٨٩٣، ژن و جیهان- ١٨٩٦ و دوو مرۆڤ- ١٩٠٣. باشترین غەزەلی پەراگەندەی وی بریتین لە: "شاری بێدەنگ"، "زۆر شەوان" و "حەوت رەنگیلە".

شتیڤان گیورگە ١٨٦٨- ١٩٣٣:

گیورگە رێك پێچەوانەی دمل بوو و کاردانەوەیەکی توندی لە هەنبەر پەرێشانی و ئاڵۆزی و زۆری شیعری وی نیشان دا.

گیورگە کە لە باری روحییەوە ئەرستوکرات تەبیعەت بوو، بە توندی دژی ریالیزم و ناتورالیزم وەستا. شیعری وی سارد، سنووردار، دەروونگەرا، گۆشەگیرانە و نەو کلاسیك بوو.

گیورگە کە ئەم شیعرانەی لە کۆڕی چکۆلەی دەروێشانی خۆیدا دەخوێندەوە، کەم و زۆر لە ئامانجی رەمزییانەی خۆی، واتە بەرجەستەکردن و دەربرینی ئەوەی ئایەتە دەربڕین نزیك دەبێتەوە، ئەو ستایشی پرەنسیپانی ئایدیالیزمی ئەخلاقی، ئەستاتیکی، حەقیقەتی رەها، روونی و راشکاوی دەکات. گیورگە هۆزانە لیریکییەکانی خۆی لە چەند دیوانێکی چکۆلەدا بڵاوکردووەتەوە، کە لە هەموویان بەناوبانگتر بەم ناوانەن: سروودێن ئایینی- ١٨٩٠، تەقویمی روح- ١٨٩٧، نەخشەکانی ژیان- ١٨٩٩، حەوتەمین ئەڵقە- ١٩٠٧، ئەستێرەی پەیمان- ١٩١٤. لە شیعرە کورتەکانیشی "لویسی سێزدەیەم"، "سروودی رۆژ" و "دێڕ" شایانی باسن.

هۆگۆ ڤۆن هوفمانشتال ١٨٧٤- ١٩٢٩:

شاعیرێکی نەمساوییە و بە یەکێك لە پێشەوایانی راپەڕینی سمبولیزمی ئەڵمانی دەناسرێ. وێڕای ئەمەی کە لە سایەی کاریگەریی شتیفان گیورگەدا بوو، هۆزانەکانی گەلەك لە سروودەکانی گیورگە گەرمتر و سادەترن. شایەدا شۆرەتی وی پتر لەوەدا بێ کە شاعیری شیعرێن ئۆپراکانی شتراوس[٤]ـە، بەتایبەتی شیعرێن ئۆپراکانی سالومە- ١٩٠٥، روزن کاڤالیر- ١٩١١، و ئاریادنە لە ناکزوس- ١٩١١. هوفمانشتال درامای رەسەنیشی نووسیوە:

کەودەن و مەرگ- ١٨٣٩، و زەماوەندی زوبەیدە- ١٨٩٩. هەروەها ئەم شانۆنامەشی بۆ شانۆ ئامادە کردووە: ئـەلکترا- ١٩٠٣ی سـوفوکلیس، و هـەروەها پـارێزراو لـە خەتـەر- ١٩٠٥ی تۆماس ئاتوی، و شانۆنامەی ئـەخلاقی (هـەموو کـەس- ١٩١٢)ی یـدرمان، (کومیـدیایانی شادی جەنتلمانی سەختگیر- ١٩٢١، و ژنی بێ سێبەر ١٩١٩-یش هی ئـەون، دوا بەرهـەمی وی شانۆنامـەیەکی تراجیدییە بە نێوی تاوەر- ١٩٢٣).

راینەرماریا ریلکە ١٨٧٥- ١٩٢٦:

ریلکە، یەکێکە لە گـەورەترین شـاعیرانی لیریکـی ئـەڵمان، لـە پـراگ چـاوی بـە جیهـان هەڵێناوە. ئـەو کـە لـە دەروێـشانی شـتیڤان گیورگـە، بـۆدلێر، و رۆماننووسـانی روس بـوو، رەمزییەتی ئاوێتەی سۆزگەراییەکی قووڵ کرد. زۆر لە گیورگە پتر دڵبەندی جەماوەری خەڵك و کاروباری مەعنەوی بوو. روبرتسون بە حەق دەربارەی وی گوتوویەتی، کە "شیعرەکانی گەڕانـە بە دووی یەزدان"دا. گەلێك لە شیعرەکانی ریلکە عیرفانییە، گرنگترین کۆشیعری وی بریتین لە: "کتـێبی وێنـان- ١٩٠٢، کتـێبی سـەعاتان- ١٩٠٥و هـۆزانێن نـوێ ١٩٠٧، ١٩١٩. لـە بەناوبانگترین هۆنراوەی پەراگەندەی ئەویش: فریشتەکان، گۆشەنشین، و رۆژی پاییزی، شـایانی باسن، (لە بەرهەمەکانی دیکەی وی چیرۆکەکانی خوا- ١٩٠٠یە کە رەوتی عیرفانییانەی قوڵی وی ئاشکرا دەکات. لە دوا شیعری ئەویش دەتوانرێ ناوی "لاوانەوەی کۆشکی دوئینو ١٩٢٣" و "چەند سوناتەیەك بۆ ئورفیوس- ١٩٢٣" ببرێ.

## شانۆنامە

ریالیزم یا ناتورالیزم:

لە هەوەڵین ساڵەکانی سەدەی بیستەمدا، وێڕای ئەمە کە ژمارەی پەیڕەوکارانی قوتابخانـانی سیمبولیزم و ئەکسپرسیونیزم بە بەردەوامی زیادی دەکرد، درامانووسـانێکی مینـا زودرمـان، هاوپتمان، و ئەوانەی کە تا بەر لـە سـاڵی ١٩٠٠ شـانۆنامانێکیان نووسـیبوو، درێـژەیان بـە داهێنانی شانۆنامان لە مەیدانی جۆراوجـۆری ریـالیزمی و نـاتورالیزمی دادا، دیـارترین ئـەم سیمایانە ئارتور شنیتسلر، و فرانك و دەکینت- یان ناوە.

ئارتو شنیتسلر ١٨٦٢- ١٩٣١:

شانۆنامەنوس و رۆماننووسـێکی نەمسـاوییە، کـە ڤینـای وەکـو شـانۆی بەرهەمـەکانی هەڵبژاردووە، ژمارەیەکی زۆری شانۆنامە، رۆمـان و چـیرۆکێن کـورتی نووسـیوە و داڕووخـانی

هەوەڵین ساڵەکانی سەدەی بیستەمی وێنە گرتووە، دراماکانی تاڕادەیەك کەم جوڵەن، بەڵام لەڕووی دیالۆگانەوە زیندوو، درەوشاوە و ناوازەن، لە گرنگترین شانۆنامەکانی شنیتسلر دەتوانرێ ئامـاژە بۆ: چاوبازی – ١٨٩٥، میرات- ١٨٩٨، کوکاتوی سەوز، رووبەندی بیاتریس- ١٩٠٠، چەرخ و فەلەك- ١٩٠٠، میدار دوسی لاو- ١٩١٠، و پرۆفیسور برنهاردی- ١٩١٢ بکرێ. لانگە باوەڕی وایە کە ئەم شانۆنامانە "نیشانەی نەخۆشی سەردەمێکی خەمناك و بێ موبالاتن".

فرانك و دەکینت ١٨٦٤- ١٩١٨:

(کوڕی پزیشکێکی دیموکرات بوو، تەقریبەن هەرجۆرە کارێکی تاقی کردووەتەوە- رۆژنامەنووسی، شاعیری، ئەکتەری و گۆرانی بێژی مەیخانان) و دەکینت لە شانۆنامەکانی دا ریالیزم لەگەڵ شتێن کۆمێدی و سەیردا ئاوێتە دەکرد. ژمارەیەك لە رەخنەگران، بەرهەمەکانی بە دزێو و حەیابەرە دەزانن، و هەندێکیش ستایشی بوێری ئەو دەکەن لە وێنەگرتنی بێباکانە و سیحرئامێزی جیهانی تێك رژاوی بۆرژوازیدا. دراماکانی رەنگدانەوەی نائومێدی، بەدگومانی، و گومانی فەلسەفی زاڵ بەسەر زۆربەی کەسایەتییە ئەدەبییەکانی سەرەتاکانی ساڵی ١٩٠٠ن، شانۆنامەی (بێداری بەهار- ١٨٩١)ەکەی معامەلەیەکی ناباو و جیاوازە لەگەڵ مەسەلەکانی لاویدا. شانۆنامانی جن- ١٨٩٥، سەندووقەکەی پاندورا- ١٩٠٣، هیدالا- ١٩٠٤، و خوازبێنیکەری ترسناك- ١٩٠٥، دەربارەی گوناحکاران و تاوانبارانن. لە شانۆنامەکانی دواتری ویدا، کە کەمتر شەقڵی دزێوییان پێوەیە، مۆسیقا- ١٩٠٧، و فرانسیسکا- ١٩١١ شایانی باسن

ئیکسپرسیونیزم:

بزووتنەوەی ئیکسپرسیونیزم بەتایبەتی لە مەیدانی درامانووسی هەوەڵین ساڵانی سەدەی بیستەمدا بەهێز بوو. ئەم بزووتنەوەیە، وێڕای ئەمەی کە بە تەواوی بە یەك ئاراستەدا نەدەڕۆیی، هەرچەندە لە ناو بزووتنەوەکەدا، و لە بەینی هەندێ گرووپاندا، جیاوازی بیر و بۆچوون لەمەڕ هەندێ مەسەلان هەبوو، بەڵام جەختێکی فرەی لەسەر پێویستی سۆزگەرایی زیاتر، ریفۆرمی کۆمەڵایەتی و مەعنەوی، و باوەڕ بە خودا و ئەمری دەکردەوە. دیارترین پەیرەوکارانی ئەم شێوە هونەرییە دەبوون بە دوو دەستەوە:

*١- لایەنگرانی گیورگ کایزر، کورت هیلر (١٨٨٥- ...)، یوهانس روبرت بکر (١٨٩١- ١٩٥٨)، و ئەرنست تولر (١٨٩٣- ١٩٣٩)، کە سۆزگەراییان بە ئەقڵانییەت رام دەکرد و زیاتر دڵبەندی ریفورمی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوون.*

*٢- لایەنگرانی فرانتز کافکا (١٨٨٣- ١٩٢٤)، فریتس ڤون ئونرو (١٨٨٥- ١٩٧٠)، (پاول کورنفلت ١٨٨٩- ١٩٤)، فرانتس و رفل (١٨٩٠- ١٩٤٥)، و راینهارت یوهانس زرگە ١٨٩٢- ١٩١٦)، کە زیاتر شەیدای پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوا و تێنووی ئازادی روح بوون تا ریفۆرمی کۆمەڵایەتی. ئەم دەستەیە لە چاو دەستەی یەکەمدا زۆر کەمتر مەیلیان بە لای ئەقلیەتگەراییدا هەبوو.*

رێباز و رەوشی ئیکسپرسیونیزم گواستنەوەی سۆز و هەستی دەروونی هونەرمەندە —وەکو خەونان، ئومێدان، ترس و ئەو بابەتە شتانە- لە رێگەی شتە دەرکی و بێرونییە ناپەیوەستەکانەوە. لە بنەڕەتدا درامای ئیکسپرسیونیزم زیاتر لە هەوڵی وێنەگرتنی رەنج و خەمدایە تا کار و کردەوە، بەڵام ئەم رەنجە نیشانەی سەرکەوتنی ئەخلاقییە بەسەر سەرکەوتنە رواڵەتییە دنیاییەکاندا، درامای رەسەنی ئیکسپرسیونیستی بە کەشفی، بە هائیجابییەکانی ژیان، ئەگەر قارەمانەکەشی بمرێ، کۆتایی دێت، ئەم درامایە نیشانەی ئومێدی روونە بە ئایندە.

<u>گیورگ کایزر ١٨٧٨- ١٩٤٥:</u>

یەکەمین شانۆنامانی کایزر هەندێ کۆمیدیایانی هەجوونامێزن وەکو (بێوەژنی جولەکە- ١٩١١)و (کینگ مارك- ١٩١٣). (خەڵکی کالە- ١٩١٤)، یەکەمین درامای ئیکسپرسیونیستی کایزرە، و بە سەرەتا و دەستپێکی ئەم بزووتنەوەیە دەژمێردرێ.

ئەم درامایە چیرۆکی یوستاش دوسن پیر وێنە دەگرێ کە چۆن خۆی دەکوژێ تا هیچ یەکێك لە شەش هاوشارییەکەی لێنەبڕێ بۆ ئیعدام کردن خۆی بە شای ئینگلیستان تەسلیم بکات. بەمجۆرە، قارەمانی دراماکە، هاوڕێ لەگەڵ ئارمانجێن ئیکسپرسیونیستیدا، سەرکەوتنی ئەخلاقی بە دەست دێنێ، هەرچەندە لەم پێناوەشدا گیانی خۆی لە دەست دەدا. شانۆنامانی: مەرجانان- ١٩١٧، گاز- ١٩١٨، و گاز- ١٩٢٠، درامایەکی سێ بەشی پێك دەهێنن.

گاز، بەسەرهاتی فەرزەندی کابرایەکی دەوڵەمەندە کە پاش تەقینەوەی کارخانەی گازەکەی بابی، دەیەوێ کارخانەکە دابخات و زەوییەکی کشتوکاڵی ئامادە بکات تا کرێکارەکان بە ئاسوودەیی کاری لەسەر بکەن. تاقمێك سەرمایەدار کرێکارەکان هاندەدەن کە بەر لەم کارە بگرن، و کوڕە بۆ دوورکەوتنەوە لە فەرتەنە و خوێنرێژی، دەست لە خەونە مرۆڤپەروەرانەکانی خۆی هەڵدەگرێ، بەڵام دەزانێ کە لە ئایندەدا کیژەکەی، وەکو چۆن قەولی داوە، ئەو خەونانە

دێنێتە دی. (لە گازدا، جیهان بە تەواوەتی تەکنولۆژییانە وێنە دەگیرێت و مرۆڤ قوربانیی هەمیشەیی تەکنۆلۆژی و جەنگە).

لە شانۆنامە ئیکسپرسیونیستییەکانی دیکە کایزر، کە بە دەنگی بەرز دژی چەوسانەوەی هەژاران و دژی شارستانییەتی تەکنولۆژیی هاوار دەکرێ: لە شەفەقەوە تا نیوەشەو- ١٩١٦، سنتورەکان"٥" - ١٩١٦، و چەرچێتی- ١٩٢٤ شایانی باسن.

ئیرنست تولەر ١٨٩٣- ١٩٣٩:

تولەر، وەکو کایزر، هێرش دەکاتە سەر نەخۆشییەکانی شارستانییەتی تەکنەلۆژی رۆژ و هەندێ چارەسەران دەخاتەڕوو- چارەسەرانێك کە خۆی ناتوانێ پراکتیزەیان بکات، بەڵام تەسەور دەکات لە ئایندەدا دێنە دی.

شانۆنامەی "مەسخ- ١٩١٩"ی وی دەربارەی پەیکەرتاشێکی لاوە کە دەچێتە قالبی سەربازەوە، بە خۆی دەنازێ کە بەشداری جەنگی جیهانی یەکەمی کردووە، لێ کە دەزانێ لە جەنگدا، دەهەزار کەس مردوون، شانازییەکەی دەگۆڕێ بۆ بێزاری و ئائومێدی. پەیکەرەکەی کە "سەرکەوتنی نیشتیمان"ی ناو ناوە، دەشکێنێ. ئەڤین و خۆشەویستی مرۆڤایەتی سەراپای دادەگرێ، روو دەکاتە سیاسەت و، رێبەرایەتی جیهادێکی سەلبیی دژی ماددەگەرایی دەکات، تولەر، لەشانۆنامەی (مەکینە شکێنان- ١٩٢٢)دا چارەسەرێکی جیاواز، لەوەی کایزر لە شانۆنامەی گازدا بۆ مەسەلە تەکنولۆژییەکانی پێشنیاز دەکات، دەخاتەڕوو.

تولەر، باوەڕی وایە کە وەڵامی گرفتەکان و چارەسەریان لە ناو بردنی مەکینە یان کارخانەی گاز نییە بەڵکو چاك کردنی ئەو کۆمەڵگەیەیە کە ئەو تەکنولۆژیا و شتانە بەڕێوە دەبات. (مرۆڤ و جەماوەر- ١٩٢٠ شانۆنامەیەکی دیکەی تولەرە).

## رۆمان

رۆمانی سەدەی بیستەم بە هەمان رەوت و رێبازاندا چووەتە پێشێ کە لە باسی درامای سەدەی بیستەمدا ئاماژەیان بۆ کرا. بە گوتەیەکی دیکە ئامادە بوون و حزوری ریالیزم، ناتورالیزم، نورمانتیزم و ئیکسپرسیونیزم، هەر هەمووی لە رۆماندا ئاشکرایە. تا پێش جەنگی جیهانی یەکەم زۆربەی رۆمانە گرنگەکان بە دەوری تەوەری دیاریکردنی نەخۆشییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا دەسوڕایەوە. ئەم رۆمانانە نادروستی گەلەك لە بەهایەکانی سەدەی نۆزدەیەمیان ئاشکرا دەکرد، و هۆشداری نەمانی نزیکی کەلتووری بورژوازیان دەدا.

ڕۆماننووسانی ماوەی ساڵانی ١٩١٤- ١٩٣٩، لە جیهانێکدا کە مانای خۆی لە دەست دابوو، عـــەودالّی مانـــا بەخـــشین بـــە تـــاك و میللـــەت بـــوون. هیـــوا و تیـــۆری و ئامانجـــە ئیکسپرسیونیستییەکان وەکو شتانێ کە لە ریزی پێشەوەی گرنگیدا بن جەختیان لەسـەر کـرا. لە ڕاستیدا هەر ڕۆماننووسێك کە لە نێوان دوو جەنگە گەورەکەدا دەستی دەدایە ڕۆماننووسین، کەم و زۆر ئیکسپرسیونیست بوو. سەرباری سێ ڕۆمان نووسـی گـەورەی سـەردەم –واسـرمان، تۆماس مان، و ورفل- زۆر ڕۆماننووسانی باشی دیکە لە خانەێن خوارتردا هەبوون.

ریکاردا هوخ ١٨٦٤- ١٩٤٧:

گرنگترن بەرهەمی ئەم خانمە ڕۆماننووس و شاعیرە، ڕۆمانە میژووییە سێ بەشەکەیەتی بـە ناوی (جەنگی گەورەی ئەڵمان ١٩١٢- ١٩١٤) کە دەربارەی جەنگێن سی ساڵەیە.

(هرمان شتر ١٨٦٤- ١٩٤٠):

لە سەردەمی نووسەرایەتی خۆیدا بە ریز ناتورالیـست، ڕۆمانتیـست، ئیکسپرسیونیـست و سورریالیست بوو. لە دواهەمین و گرنگترین ڕۆمانی خۆیدا وازی لە بۆچوونی ڕیالیستان هێنا و بوو بە لایەنگری ئیکسپرسیونیستەکان و باوەڕی بـە توانـای موتڵـەق و داهێنەرانـەی ویـستی ئینسانی هێنا. (سـێ شـەو- ١٩٠٩، پـیتر بریـنـداریزنر- ١٩٢٤، ناتانیـل مـاخلر- ١٩٢٩و نەوەکان- ١٩٣٣) لە ڕۆمانە بەناوبانگەکانی ئەون.

هاینریش مان ١٨٧١- ١٩٥٠:

برا گەورەی تۆماس مان، و نووسەری ڕۆمانانی تەنزئامێزە. نەخۆشییەکانی ئـەڵمانی بـەر لە ساڵی ١٩١٤ی ئاشکرا کردو هێرشی کردنە سەر. لە (وڵاتـی نیعمـەت- ١٩٠٠)دا، ژیـانی بۆرژوایی لـەڕووی نەفـسپەرستی و سـووکییەوە بـەر ڕەخنـان دەدات. لـە (پرۆفیـسۆرکەپەك- ١٩٠٥)دا سوود لە شێوەی ڕەسمکردنی کاریکاتۆری بە شێوازی ودکینت دەبینێ. (ژێر دەسـت- ١٩١٧) هێرشێکە بۆ سەر ڕوحی ئەڵمان بەر لە جەنگی جیهـانی یەکـەم. ڕۆمـانی (سـەرۆك- ١٩٢٥)، وەسفێکی تەنزئامێزی سەردەمی ویلـهلم –ە (بـە هێـرش کردنـە سـەر بیروکراسـی، سیاسەتبازی و پیشەسازی ئەو سەردەمە). دوو دوا ڕۆمانی لاویەتی هنری چـوارەم- ١٩٣٥، و کامڵی هنری چوارەم- ١٩٣٨، بە ڕۆمانانی ئوتوبیوگرافیانە و فێرکاری دەژمێردرێن.

هانس گریم ١٨٧٥- ١٩٥٩:

شۆرەتی ئەم ڕۆماننووسە پـتر قـەرزارباری ڕۆمـانی (میللـەتی بـێ شـوێنە- ١٩٢٦) کـە ڕۆمانێکی نیمچە میژووییە و هەندێ بەسەرهاتی ئـەڵمانییانی ئـاکنجی باشـووری ڕۆژئـاوایی

ئەفریقیا دەگێڕێتەوە. ئەم رۆمانە شایەدا بەرهەمێکی لە رادەبەدەر جددی بێ، بەڵام لەرووی کاراکتەرسازیی مرۆڤانییەوە وەستایانەیە. رۆمانۆکەکانی گریم-یش دەستیان لە ناوبانگی ویدا هەیە، وەکو: (چیرۆکانی ئەفریقیای باشووری- ١٩١٣، پەڕینەوە بە خیزەڵاندا- ١٩١٦، و قازی لە کارو- ١٩٣٠).

هیرمان هیسە ١٨٧٧- ١٩٦٢:

(هیسە کوڕی بانگەشەکارێکی ئاینی بوو لە هیند، لێ ئەو بەخۆی لە قوتابخانەی ئیلاهییات هەڵات و ماوەیەك بوو بە کتێب فرۆش، لە ساڵی ١٩١١دا سەفەری وڵاتانی رۆژهەڵاتی کرد و ماوەیەکی لە هیند بەسەر برد. لە ساڵی ١٩١٢دا بوو بە هاووڵاتی سویسری، و لەم وڵاتەدا مایەوە). بەر لە کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم چەند رۆمانێکی نەرم و خۆش ئاهەنگ، کە رەنگدانەوەی هەستێن خەماوی و شەخسی بوون، نووسی: پیتەر کامنزینت- ١٩٠٤، گرترود- ١٩١٠ و دمیان- ١٩١٩، هزرەکانی هیسە پاش جەنگ قووڵتر و جددیتر بوون. (گورگی بیابان- ١٩٢٧) وێنەیەکی تاراددیەك دڵتەزێنە لەمەڕ نەوەیەکی گیرۆدەی کێشمانەکێشی نێوانی بێ قانوونی و ترسنۆکی بورژوازی. دوو رۆمانی دوایی هیسە، (نێرگز و زێڕین زار- ١٩٣٠)و (گەمەی مرواریانی شووشەیی- ١٩٤٣)، ئارمانجە ئیکسپرسیونیستییەکان وەکو چارەسەری گرفتە جیهانییەکان دەخەنەڕوو، هیسە چەندین خەڵاتی ئەدەبی، لەوانە خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیاتی ساڵی ١٩٤٦ی بەدەست هێناوە.

ئیروین گیدوکولبن هییر ١٨٧٨- ١٩٦٢:

دانەری چەند رۆمانێکی مێژوویی گرنگە: خۆشەویستی خوا- ١٩٠٨، وەستا یواخیم پوزوانگ- ١٩١٠، و رۆمانی سێ بەشی (پاراسیلسوس ١٩١٧- ١٩٢٥).

فرانز کافکا ١٨٨٣- ١٩٢٤:

کافکا لە پراگ، لە خێزانێکی ناوەنجی حاڵی جولەکە چاوی بە دنیا هەڵێناوە، مافی تەواو کرد، و لە کۆمپانیایەکی بیمەدا لە پراگ دامەزرا، سەرەنجام، نەخۆشی سیل ناچاری کرد دەست لە کار هەڵگرێ). کافکا بابایەکی نورمانیست، ئیکسپرسیونیست، و سوریالیست بوو. کافکا کورتە چیرۆکان، رۆژانە هەواڵ، نامە و برێك رۆمانانی نووسی کە زۆربەیان لە دوای مردنی بەهیمەتی ماکس "٦" برودی دۆستی بڵاوبوونەوە: کۆ بەرهەم ١٩٣٥- ١٩٣٧ی کافکا زیاتر نووسینە کورتەکانی لەخۆ دەگرێت. سێ رۆمانی تەواو نەکراو و سەیری کافکا کە نیشانەی بلیمەتی نووسەرەکەیانن، دادگا (١٩٢٥)، کۆشك (١٩٢٦)و (ئەمریکا ١٩٢٧)یان ناوە، و بە

قسەی ماکس برود یەك "رۆمانی سێ بەشی تەنیایی" پێك دەهێنن. بە گوتەی لانگە ئەم رۆمانانە، "وەکو هەر بەرهەمێکی دیکەی کافکا، ئەزموونی تەنیایی مرۆڤ و هەستی هاوسۆزی لەگەڵ بەدبەختیدا، بە چەمك و مانای جددی مەزهەبی، نیشان دەدەن. ئینسان کە باری "گوناح"ی بە سەر شانەوەیە، ناچارە لە جیهانێکدا کە تەسەور و سەربور و گونجانی لە بنچینەدا نادیار و نامەفهوومە لە "دادگا"ی ژیاندا ئامادەبێ". باوەڕی بتەوی کافکا لەسەر ئەمەیە کە مرۆڤ هیچ کاتێك پەی بە نهێنی ویستی خوایی نابات، بەڵام ناچارە بە هەموو توانایەکییەوە بکەوێتە تاقیبی ئەو کۆمەڵە خواستە خواییانەی کە لەگەڵ کرداری ویدا لەم دنیایەدا پەیوەندی پەیدا دەکات، و دەبێ لە هەنبەری ویستی خواوەندیدا تەسلیم بێ. بەرهەمەکانی کافکا وێنەیەکی سەیر لەمەڕ ئەورووپا و بەتایبەتی ئەڵمانی ساڵەکانی پاش جەنگی جیهانی یەکەم دەگرێت، سوود وەرگرتنی فرە لە ڕەمزێن مەزهەبی، چڕی، گوشاری توندی عەسەبی، لە بنج و بناوانکردن و پەیجۆری وردی مەسەلە مەزهەبی و فەلسەفی و زۆر دیمەنێن مۆتەکە ئاسا، غەریب و خەیاڵ ئەنگێز، لە خەسڵەتەکانی شێواز و سەبکی کافکان کە دەشێت بە سوورریالیستی ناو ببرێن. (لە بەرهەمەکانی دیکەی کافکاوە دەشێت ئاماژە بۆ چیرۆکانی میتامۆرفۆس- ١٩١٣، داوەری ١٩١٣، هونەرمەندی برسی- ١٩٢٠، و کۆ چیرۆکی دکتۆری گوندی- ١٩١٩ بکرێ).

## ئەرنست ویشرت ١٨٨٧- ١٩٥٠:

ویشرت لە پروس-ی ڕۆژهەلاتی لە دایك بوو، لەو گرووپە نووسەرانەیە کە شکستی ئەڵمان لە ساڵی ١٩١٨دا بێ تاقەت و نائومێدی کردبوون و بزووتنەوەی "گەڕانەوە بۆ سروشت"یان دەست پێکرد، و مەبەستیان لە گەڕانەوە بۆ سروشت، تاڕادەیەك مل دان بوو بە ژیانی زاهیدانە و ئەرکە قورسەکانی ئەو ژیانە. ویشرت و هاوبیرانی، وەکو گەلەك لە رۆماننووسانی دیکەی ئەم قۆناغە، هێرشیان کردە سەر ئەو شتانەی کە بە نادروستییەکانی شارستانییەتی بۆرژوازی پێش جەنگیان دەزانی. نێوەڕۆکی سەرەکی رۆمانەکانی ویشرت کێشەی نێوان تاك و کۆمەڵگەو، ناتەبایی و ناکۆکییەکانی سروشت و شارستانییەتە، بە ناوبانگترین رۆمانی وی (بارونس ١٩٣٤)ی ناوە. (ویشرت بەهۆی دوژمنایەتی لەگەڵ نازییەکاندا شەش مانگێکی لە ئۆردوگای بوخنوالد بوراند، رۆمانی "جەنگەڵی مردووان- ١٩٤٦" یادەوەری ئەم ئوردوگایەیە. لە رۆمانەکانی دیکەی: زەوی میراتی مەیە ١٩٤٥- ١٩٤٧، جەنگەڵان و چیرۆکان ١٩٣٦ و ژیانی سادە ١٩٣٩ شایانی باسن).

ئیریش ماریا ریمارك (کرامیر ١٨٩٧- ١٩٧٠):

(ریمارك لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لە سوپای ئەڵماندا خزمەتی کردووە، و چەندین جار بریندار بووە. ساڵانی ١٩٣٢- ١٩٣٩ی لە سویسرا بەسەر برد. لەم ساڵەدا چوو بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لە ساڵی ١٩٤٩دا بوو بە هاووڵاتی ئەو وڵاتە)، و چەند رۆمانێکی لەمەڕ جەنگی جیهانی یەکەم، و قۆناغی هەرەس و داڕووخانی ئەڵمان نووسیوە. بەناوبانگترین رۆمانی وی "لە رۆژئاوادا چ خەبەرێك نییە- ١٩٢٩" (سەرکەوتووترین رۆمانی ئەڵمانییە کە دەربارەی ژیانی سەربازیی لە جەنگی جیهانی یەکەمدا نووسراوە، رۆمانێکی دیکەی بە ناوی سێ هاوڕێ ١٩٣٧یە، ژیان لە ئەڵمانی پاش جەنگ وێنە دەگرێت. رۆمانی تاقی سەرکەوتن ١٩٤٦، چیرۆکی پەناهەندەیەکی ئەڵمانییە لە پاریس رێك بەر لە دەست پێکردنی جەنگی جیهانی دووەمە. لە رۆمانەکانی تری رێگەی گەڕانەوە ١٩٣١، و کاتێ بۆ خۆشەویستی و کاتێك بۆ مردن- ١٩٥٤ شۆرەتی فرەیان پەیدا کردووە. ریمارێك شانۆنامەیەکیشی دەربارەی دوا رۆژەکانی بەرلین نووسیوە بە ناوی دواهەمین وێستگە- ١٩٥٦).

یاکوب واسرمان ١٨٧٣- ١٩٣٤:

ئەم رۆماننووسە ئەڵمانی و رۆشنبیرە تەبیعەت بەرزە جولەکەیە، یەکێك لە هەوەڵین ئیکسپرسیونیستەکان بوو. شێوەی سایکولۆژی بۆ توێژینەوەی سۆزێن مرۆڤانی و روحی بەشەری بەکار هێنا، بۆچوونی سەرەکی واسرمان دەشێت بە "مەسئولیەتی فەردی ئینسان بۆ هەموو ئەندامانی بەشەر" لێك بدرێتەوە.

لە رۆمانی "جولەکانی سیرندورف ١٨٩٧"دا مەسەلەی رەنج و ئازاری جولەکان کە لە سەرانسەری وڵات و دەڤەرانی پروتستان نشیندا پەرت و بڵاون، دەخاتە بەرباس. کاسپکار هاوزەر- ١٩٠٨ رۆمانێکە دەربارەی منداڵێکی دۆزراوە، و فرێدراو کە رەنج و خەم بەرزی بە روحی دەبەخشێت، دوو رۆمانی دیکەی، کریستیان وانشافە ١٩١٩ و دۆزی ماوریسیوس ١٩٢٨ یان ناوە، (لە دوا ئەنجامدا پێویستە ئاماژە بە ژیانامەکەی وی بە ناوی، رێگەی من وەکو ئەڵمانییەك و جولەکەیەك- ١٩١٢، بکرێ).

دەربارەی واسرمان و بەهای رۆمانەکانی بیر و بۆچوونانی کۆك و ناکۆکی زۆر دەربڕدراون. لانگە پێی وایە کە واسرمان تەنانەت "تاقە یەك رۆمانی بەهاداریشی نەنووسیوە". هەمان رەخنەگر دەڵێت کە شێوازی واسرمان "بە بریق و باق" و "پڕ ئاو و تاوە"، و رۆمانەکانی سەرڤە سەرڤە و تەژی تەسەنوعە. روبرتسون-یش دوودڵە لەوەی کە "رۆمانەکانی واسرمان

بایەخی پایەداریان هەبێ". لە لایەکی ترەوە و. ر. بنە باوەڕی وایە کە بەرهەمەکانی واسرمان "قوڵی هەست و توانای توێژینەوەی روحی مرۆڤیان" تێدایە. هەروەها و.پ. فریدریش، واسرمان بە یەکێك لە سێ گەورە رۆماننووسی ئەڵمانی ئەم سەدەیە (سەدەی بیست) دەزانێ (دووانەکەی دی بەرای ئەو ورفل و توماس مان-ن).

توماس مان ١٨٧٥- ١٩٥٥:

مان لە لوبك[٧٧] لە دایك بووە، لە پانزە ساڵیدا بابی مرد، و سێ ساڵ دواتر لەگەڵ بنەماڵەکەیدا بۆ مونیخ چوو. لە وێندەر ماوەیەك لە کۆمپانیایەکی بیمەدا کاری کرد، و پاش ئەمەی کە دوو چیرۆکی وی بڵاوبووەوە، هەموو کاتی خۆی بۆ نووسەری تەرخان کرد. یەکەمین بەرهەمی ئەدەبی گرینگی وی بودین بروکس ١٩٠١ بوو کە لە ماوەی دە ساڵاندا پەنجا جار چاپ کرایەوە و شۆرەت و ئیحتویاری جیهانی بە مان بەخشی، لە ساڵی ١٩٣٣دا نازییەکان کتێبەکانی مان-یان قەدەغە کرد و ئەویش لە سویسرا ئاکنجی بوو. دوای ماوەیەك لەگەڵ هەر شەش مناڵەکەی، و هاینریش-ی برایدا بۆ وڵاتە یەککرتووەکان چوو.

مان لە سایەی کاریگەری نیتشە، شوپنهاور و فرویدا، ئاشقی ئەو مەسەلە سایکۆلۆژی و فەلسەفییانەیە کە لە پەیوەندییەکانی تاك لەگەڵ کۆمەڵگەی سەدەی بیستەمدا، کە مان بە داڕووخاوی دەزانێ، سەرچاوە دەگرن. مان گرنگییەکی تایبەتی بە رۆڵی جوانیناسی لە دنیای تازەدا دەدات.

مان نووسەرێکی گەلەك ورد و زۆر وەسواسە، کە لە پێناوی داهێنانی رۆمانەکانیدا هەر رەنجێك بە دڵ و بە گیان دەکێشێت. شێوازی وی لەڕادەبەدەر هونەرمەندانەیە و دەشوبهێتە سەر گۆرانی و مۆسیقا، بە جۆرێ کە دەشێت ناوی سەمفۆنی پەیڤان لە بەرهەمەکانی بنرێت. تەنزی ناسك و ژیرانە، کە لە هەستی قوڵەوە هەڵدەقوڵێ، لە تایبەتمەندییە دیارەکانی بەرهەمێن وییە. هەندێ لە رەخنەگران ئیرادیان لە درێژنووسی بە وەخت و ناوەختی ئەو گرتووە و بەوە تاوانباریان کردووە کە هەندێ جار جڵەوی دەسەڵات لە دەست دەدات و جۆرە لێك پچڕان و داپڕانێك لە بەرهەمەکانیا پەیدا دەبێ.

بودین بروکس ١٩٠١:

رۆمانێکی درێژە، کەم و زۆر لەسەر بنەمای مێژووی باپیرانی خودی نووسەر نووسراوە، کە باسی هەرەس و رووخانی خانەوادەیەکی دەوڵەمەندی بازرگانی ئەڵمانی لە ماوەی سەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا دەکات. کە وەزع و حاڵی دارایی بنەماڵەی بودین بروك تێك دەچێ،

ئەندامانی خێزانەکە رۆژ بە رۆژ پتر ئاشقی هونەر، زانست و مۆسیقا دەبن. هانویودین بروك، ی دوا فەردی بنەماڵەکە، لاوێکی نەخۆش ئاسایە کە جوانپەروەری بیێ وەری وی، رەمزی داڕووخان و هەرەسی زادەی ماددیگەری ئەم بنەماڵەیەیە.

تونیوگروگێر ١٩٠٣:

رۆمانۆکێکە لەمەڕ کێشەی دەروونی هونەرمەندێك. تونیو دەڵێت: "هیچ مەسەلەیەك، هیچ شتێك لە جیهاندا، هێندەی رەنجی هونەرئاوەر لەسەر بەشەریەت بە ئازار نییە"، تونیو هەست دەکات کە بۆشایی و گرفتێکی گەورە کەوتۆتە بەینی ئەو، وەکو نووسەر و جەماوەری خەڵکەوە، بەلام لە هەمان کاتدا ئاگاداری ئەو درزەی بەینی خۆی و هونەرمەندانی بژاردە بوو کە تەنیا جوانییان داوا دەکرد، چونکە ئەو بە قووڵی ئاشقی خەلکی سادە، شاد و چالاکە، سەرەنجام تونیو پەی دەبات کە پەیامی شاعیر نەك داوای جوانی رووتە، بەڵکو پەیجۆری و تاقیبی جوانی و شادی ژیانی رۆژانە و گواستنەوەیانە بۆ کەسانی دی، و بەجۆرە کێشە و شەڕی دەروونی وی کۆتایی دێت. ئەم رۆمانە وێڕای دیالۆگ و گوتاری درێژی فەلسەفی، لە روانگەی هەندێ رەخنەگرەوە بە هۆی کورتی و چڕییەکەیەوە بە شاکاری توماس مان دەزانرێ.

کێوی جادوو ئامێز- ١٩٢٤:

ئەم رۆمانە گەورە رەمزییە، تۆماس مانی لە ریزی پێشەوەی رۆماننووسانی ئەڵمانیدا دانا. مان، لێرەدا چۆنیەتی دیداری هانس کاستورپ-ی لاو لە کوڕە مامەکەی کە لە ئاسایشگەی سیلدارانی سویسرا لە داوێنی کێوانی ئالپدا (نیشاندەری قەڵەمڕەوی جوانیگەریی خالیسە و بژاردە) کەوتووە دەگێڕێتەوە، هانس کە هەست دەکات لەوەیە نەخۆشییەکە بۆ ئەو سیرایەتی کردبێ، چەند هەفتەیەك لە ئاسایشگەکە دەمێنێ. لەم ماوەیەدا لەگەڵ ستمبرینی (رەنگدانەوەی مرۆڤپەروەری و ئازادیخوازی)، پیپرکورن (رەنگدانەوەی هەوەسبازی و شەهوانییەتی حەیوانی)، و زۆر خەڵکی دیکەدا دەکەوێتە موناقەشە و گەنگەشەی قووڵی فەلسەفی، هانس تەلیسمی کێوەکە دەشکێنێ و هەڵدێ تا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا ببێ بەسەرباز، تەقریبەن وەکو تونیو کروگر فێر دەبێ کە چۆن هاوسەنگییەك لە نێوان ئارەزووە جوانی پەروەرانەکانی و تاکتیکە عەمەلییەکانی خۆیدا بەرقەرار بکات، بە هەر حاڵ، ئەم رۆمانە بە ناقدارترین بەرهەمی مان دەژمێردرێ، و بەڕای گەلەك لە رەخنەگران شاکاری وییە.

بەرهەمەکانی تری:

"ماریۆ و سیحرباز -١٩٣٠" بەرهەمێکی سەرەکی دیکەی مانە، رۆمانۆکێکی مەجازییە دەربارەی کاریگەرییەکانی فاشیزم لە ئیتالیادا، یوسف (١٩٣٣- ١٩٤٣) رۆمانێکی چوار بەشییە کە لەوێدا قارەمانی چیرۆکەکە نموونەی هونەرمەندێکە کە بە رەنجی بریکارانەی خۆی کۆمەڵگە رزگار دەکات، و خۆشەویست دەگەڕێتەوە (ئاوە ئەڵمانییەکەی لوتە لە وایمار- ١٩٤٠ـە)، رۆمانێکی فەلسەفی دیکەیە دەربارەی رۆڵی هونەرمەند، کە دیمانەیەکی خەیاڵی لەگەڵ گوتەدا لە دەمی پیری ئەودا دەگێڕێتەوە.

(لە چیرۆکە ناڤدارەکانی دیکەی مان، دەشێت ناوی مردن لە ڤینیسیا (١٩١١)، و دکتۆر فاستوس (١٩٤٨) ببرێ).

مان شانازی و خەڵاتانی فرەی وەدەست هێناوە کە لە هەموویان گرنگتر خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیاتی ساڵی ١٩٢٩ بوو. بە گەورەترین رۆماننووسی هاوچەرخی ئەڵمان، و لە پاڵ پروست و جویس دا بە یەکێك لە گەورەترین رۆماننووسانی سەدەی بیستەم دەژمێردرێ.

فرانتس ورفل (١٨٩٠- ١٩٤٥):

شاعیر، شانۆنامەنووس و رۆماننووس بوو. لەماڵباتێکی جولەکە لە پراگ هاتە دنیاوە. ئەویش وەکو گەلەك لە نووسەران و هزرڤانانی دیکە، لە قەڵەمڕەوی نازییەکانەوە بۆ فەرەنسا هەڵات و لەوێندەروە بۆ ئەمریکا رۆیی.

ورفل وەکو ریلکە و واسرمان، تەواو ئاگاداری گرنگی بەها مەعنەوییەکان بوو، و باوەڕێکی عارفانەی بە برایەتی مرۆڤان و بە بوونی هەندێ هێزێن زاتی لە هەموو جیهاندا هەبوو. یەکسەر لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم بە توندی کەوتە هێرش بۆ سەر ئەو تێورییانەی کە بووبوونە مایەی جەنگ و رایگەیاند کە تاقە مەرجی رزگاری تیرەی بەشەر برایەتییە.

شیعرەکانی:

هۆزانە لیریکییەکانی ورفل، وەکو هۆزانی دمل، بە رادەیەکی زۆر رەنگدانەوە و نیشانەی پەیوەندی نێوان خودی تاك و جیهانی دەرەوەیە، گرنگترین کتێبانی شیعری ئەو: هاوڕێی جیهان ١٩١١، ئێمە هەین (١٩١٣)، یەکتری (١٩١٥)و رۆژی داوەری (١٩١٩)ن.

رۆمانەکانی:

ورفل زیاتر وەکو رۆماننووس لەلایەن خوێنەوارانییەوە پێشوازییەکی زۆر گەورە کراوە، رۆمانە مێژوویی و پرفرۆشەکەی (چل رۆژی موسادا- ١٩٣٤) پەردە لەسەر ئابلۆقەی ئەرمەنییەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا هەڵدەماڵێ.

(گۆرانی برنادیت ١٩٤٢) ڕۆمانێکی سەرکەوتووی ئەوە کە کرا بە فیلم، ژیانی قەدیسەیەکی فەرەنسی دەگێڕێتەوە. وا باوە کە ورفل لە کاتی هێرشی فەرەنسا لە ساڵی ١٩٤٠دا لە کڵێسای هەمان قەدیسەدا پەنای گرتووە، (ئەستێرەی ئەوانەی کە نەهاتوونەتە دنیاوە- ١٩٤٥)، چیرۆکێکی خەیاڵییە لەمەڕ ئایندەیەکی زۆر دوور کە مەزەندەی نووسەر لەوێدا برایەتی جیهانی بە مانای ڕاستەقینەی وشە دێتە دی و یەهودییەت و کاتولیکی رومی دەبن بە تاقە ئایینی دنیا.

لانگە دەڵێت کە ڕۆمانەکانی ورفل، "ئامانجی ڕاستەقینەی ڕێبازی ئیکسپرسیونیستی ئاشکرا دەکەن: و ئەمە کۆشکێکی بنەڕەتییە بۆ دەربڕینی توانا و ئیحتوباری ئارەزووە دوور و درێژەکان لە جیهانێکدا لە بنچینەدا دژە مەعنەوییەتە، کە قاڵبە بێ تواناکانی مایەی لێکۆڵینەوەی دووبارەن".

شانۆنامەکانی:

ورفل لە شانۆنامەکانی دا هەمان ئەو هزرە ئیکسپرسیونیستییانە دەردەبڕێ کە لە شیعرە لیریکی و ڕۆمانەکانیدا پەنهانن. ئەو لە پێشەکی شانۆنامەی ژنانی تەروادەدا (١٩١٥) -لە شانۆنامەیەکی یوریپیدسەوە بە هەمان ناو وەرگیراوە- لە بەرسڤی ئەم پرسیارەدا کە بۆ دەبێ هیکوبا بمرێت، "مەبەست و ئامانجی دەروونی تراجیدییەکە" دەڵێت: شاعیر مرۆڤ بە مستەحەقی مردن نازانێ. ئەرکی مرۆڤ ژیانە، چونکە ژیانی مرۆڤ ئەرکە. ئەرکی بەرەڤانی لە بەرانبەر جیهانی نامرۆڤانی، لە هەنبەر تەبیعەتدا و، ئیمانە بە ڕۆڵی میانجیگەرانەی تیرەی بەشەر، کە بۆ مانابەخشین بە جیهان دەژی. لە شانۆنامەی مرۆڤی ئاوێنەیی دا (١٩٢٠) مەسەلەی دوو گیان لە یەك بەدەندا جارێکی دی دەخرێتەڕوو. روحی مرۆڤی ئاوێنەیی لە جەستەی دەچێتە دەرێ، ئەزموونانی جۆراوجۆر فێر دەبێ کە پاك و بە هێزی دەکەن و، پاشان دووبارە دێتەوە ناو جەستەکەی. یوارز و ماکز یمیلیان (١٩٢٤)، تراجیدیایەکی مێژووییە، شانۆنامەی پاول لە نێو جولەکاندا (١٩٢٦) باوەڕی بتەوی ورفل بە بایەخ و ئیلتیزامی تاك و هەروەها بە بوونی خوایەکی روحانی نیشان دەدات. (نووسراوە پەخشانییە کورتەکانی ورفل-یش لە کۆبەرهەمێکی سێ بەرگیدا لە ژێر سەرناوی چیرۆکانێك لە دوو جیهانەوە ١٩٤٨ کۆکراونەتەوە).

# ژێدەران:

١- تزار ویلهلم-ی دووەم (١٨٥٩- ١٩٤١):

ئیمپراتۆری ئەڵمان و شای پروس (١٨٨٨- ١٩١٨).

٢- هاوپەیمانان: ئینگلیستان، فەرەنسا، روسیە، ولاتە یەکگرتووەکان، ژاپۆن، بەلجیکا، سربیا، مونتنگرۆ، یونان، پرتوغال.

٣- پەیمانی ڤێرسای: پەیمانی ئاشتی نێوان هاوپەیمانان و یەکگرتووان (ئەڵمان، نەمسا، ئیتاڵیا) بوو کە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی لە ١٩١٩/٦/٢٨ لە کۆشکی ڤێرسای فەرەنسادا بەسترا.

٤- ریچارد شتراوس (١٨٦٤- ١٩٤٩): مۆسیقازانی ئەڵمانییە.

٥- سنتورەکان- Centaur:

تایفەیەکی کۆنی ئاکنجی کۆچارەکانی تسالی بوون کە زۆر هوڤی بوون و یونانییەکان وێنەی ئەوانیان بە شێوەی بوونەوەرانێك کە نیوەی سەرەوەی بەدەنیان ئەسپ و نیوەی خوارەوەی مرۆڤ بوو، بەرجەستە دەکرد.

٦- ماکس برود (١٨٨٤- ١٩٦٨):

رۆماننووس و رەخنەگر و فەیلەسوفێکی نەمساوی- چیکی بوو.

٧- لوبك: شارێکی بەندەری باکووری ئەڵمانە.

# بەشی پێنجەم
# ئەدەبیاتی روسیا
# لە
# سەردەمی زێڕیندا
# ١٨٢٠- ١٨٨٣

سەرەتایەکی مێژوویی:

کۆنترین دانیشتووانی ناسراوی روسیا، سلاڤانی رۆژهەڵاتین کە لقێکن لە نەژادی هیند و ئەوروپایی، و پێدەچێ رۆژێ لە رۆژان لە کەنارەکانی رووباری دانوبدا ژیا بن، لە سەدەی نۆیەمی زایینیدا رێکخراوێکی زاهیری سیاسی هەبووە، و کییف و نوڤگورود بە دوو مەڵبەندی سەرەکی شارستانییەت و کەلتووری هاتوونەتە ژماردن. ئایینی سەرەتایی سلاڤیانی رۆژهەڵاتی پەرستنی روحیانییتی پێشینان و هێزێن سروشت بووە.

وا دیارە لە سەرەتای سەدەی دەیەمدا، مەسیحییەت بەرە بەرە لە ئیمپراتۆرییەتی بنیانسییەوە بۆ روسیا دەچێت.

لە ساڵی ۹۸۸دا ڤلادیمیری[١] یەکەم ئایینی ئەرتەدۆکسی رۆژهەڵاتی هەڵدەبژێرێ و دەیکات بە ئایینی فەرمی سەرانسەری روسیا. بانگەشەکارانی مەزهەبیی بیزانسی کتێبێن جۆراوجۆری ئایینی لەگەڵ خۆدا بۆ کییف دێنن، ئەم کتێبانە بە زمانی سلاڤۆنێکی باشووری

(یاسلاڤۆنێکی کلێسایی کۆن)، و بە ئەلفبای سلاڤۆنیکی باشووریی بوونە، کە بە پێی هەندێ ریوایەتان لە ساڵی ٨٥٥ی ز لەلایەن سیریل "٢"ـەوە لە ئەلفبای عیبری، ئارامی، قیبتی، و چەند پتێکی داهێنانی خۆیەوە دروست دەکرێ. ئەم ئەلفبایە بە یەکەمین ئەلفبای روسی دەژمێردرێ، و زمانی سلاڤۆنێکی باشووری پاش بڕینی هەوراز و نشێوان دەبێ بە زمانی ئەدەبی و قسەکردن.

ڤلادیمیر و جێنشینەکانی پشتیوانی لە زانست، کۆپی کردنی دەستنووسان، و دامەزراندنی قوتابخانا دەکەن. ئامانجی سەرەکی قوتابخانەکان پەروەردە و پێگەیاندنی روحانیان بووە، نوسخە دەستنووسەکانیش بە شێوەیەکی سەرەکی لە ئایینەوە وەرگیراون.

لە ماوەی ساڵانی ١٢٣٨ و ١٢٤٠دا تەتەرەکان (مەغۆلان) تەقریبەن سەرانسەری روسیا دەکەن بە مەیدانی هێرش و پەلاماری خۆ و شارانی گەورە و سەرەکی وێران دەکەن. لەگەڵ وێران بوونی کییف دا چینی خوێنەواران روو لە باکوور، بە تایبەتی مۆسکۆ دەکەن، و ئەم شارە بەرە بەرە دەبێ بە مەڵبەندی سەرەکی شارستانییەت و کەلتووری روسیا.

داگیرکاری تەتەران نزیکەی دوو سەدە و نیو بەردەوام دەبێ. لە ساڵی ١٤٨٠ دا شازادە ئیڤانی "٣" سێیەمی مسکو دوا شوێنەواری دەسەڵاتی تەتەرەکان لە بەین دەبات، و بۆ یەکەمین جار یەکپارچەیی نەتەوەیی رێکدەخات و بتەو دەکات و دەسەڵاتی دیکتاتۆری دەگرێتە دەستی خۆی. ئابووری رژێمی مۆسکۆ لە سەر کاری کۆیلان بتەو دەبێ. روسیا نزیکەی دوو سەد ساڵێك لە هەموو دنیا دادەبڕێ، تا کۆتایی سەدەی حەڤدەیەم نە دەکەوێتە ژێر کاریگەری رێنیسانسەوە و نە بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی.

لە ساڵی ١٦٨٢دا پتری "٤" گەورە دەگاتە دەسەڵات، دەروازان لەڕووی رۆژئاوا دەکاتەوە و، هاتنی مەدەنییەتی رۆژئاوایی، بەتایبەتی مەدەنییەتی ئەڵمانی و فەرەنسی هاندەدات. خوێندکارانی روسی بۆ هەندەران دەچن و، مامۆستایانی بیانی بۆ وڵات بانگهێشت دەکرێن. ئەم سیاسەتی رۆژئاوایی سازییە لە سەردەمی ئیلیزابت "٥" و کاترینی "٦" دووەمیشدا بەردەوام دەبێ.

پتر و جێنشینەکانی وێڕای رێبازی پێشکەوتووانەی رۆشنبیری و کەلتوورییان، بە زوڵم و زۆر حوکمڕانی دەکەن، رووداوە تازە رۆشنبیرییەکان تەنیا کار دەکاتە سەر ژیانی ئەرستوکراتان و چینە باڵاکانی کۆمەڵ، و سەبارەت بە جەماوەری خەڵك، کە لە کۆیلایەتیدا رۆژگار بەسەر دەبەن، پەروەردە و فێرکردن چ مانا و چەمکێکی نییە.

هزرێن ئازادیخوازانە و دیموکراسییانەی سەدەی هەژدەیەمی فەرەنسی بۆ رەسیل —وێڕای هەبوونی سانسۆر- و بۆ چاپەمەنیان رێی خۆی دەکاتەوە. لەم وەزع و حاڵەدا ئالکساندر رادیشچف"٧"، کتێبە بوێرانەکەی خۆی بە ناوی (سەفەرێك لە سانپترسبۆرگەوە بۆ مۆسکۆ- ١٧٩٠) بلاّودەکاتەوە، و لەوێدا راشکاوانە حکوومەتی دیکتاتۆری و رژێمی کۆیلەداری ریسوا دەکات، و لەبەر ئەمە نەفیی سیبریا دەکرێ. رادیشچف بە یەکەمین شەهیدی روسی رێگەی ریفۆرمێن سیاسی و کۆمەلاّیەتی دەژمێردرێ. شکانی ناپلیۆن لە ساڵی ١٨١٢دا کۆمەکی بێداربوونەوەی هۆشیاریی نەتەوەیی و هەروەها پەرەسەندنی هزرێن ئازایخوازانە دەکات.

نارەزایی لە سیاسەتێن زۆرداری بە جۆرێ توند دەبێ کە لە مانگی دیسامبری ١٨٢٥دا ژمارەیەك لە ئەفسەرانی سوپا بە مەبەستی دامەزراندنی حکوومەتی یاسا رادەپەرن.

ئەم یاخی بوون و راپەرینە لە ماوەی هاتنە سەر حوکمی نیکۆلای"٨" یەکەم و مردنی ئەلکساندەری یەکەمدا روو دەدات، شۆڕشگێڕەکان کە بە دیکابرییەکان ناو دەردەکەن، بەلەز سەرکوت دەکرێن، نیکولای یەکەم لە هەمان رۆژدا کە شۆڕش و رابوونەکە دادەمرکێنێتەوە، قۆناغی حوکمی زاڵمانەی خۆی (١٨٢٥- ١٨٥٥) دەست پێدەکات. جێنشینەکەی وی، ئەلکساندەر"٩"ی دووەم، دەست دەداتە زنجیرە ریفۆرمێك، و لە ساڵی ١٨٦١دا ئازادی بە کۆیلان دەبەخشێت.

<u>نۆڕینێکی گشتی:</u>

تاوەکو بەر لە سەدەی نۆزدەیەم بەرهەمێن هاوسەنگی شاکارانی جیهانی و ئەدەبیاتی کە بتوانێ کەلتووری جیهانی دەوڵەمەند بکات لە روسیادا چێ نەبوو، لەبەر ئەمە لێرەدا پەیجۆرییەکی گشتی و خێرایی هەموو چالاکییە ئەدەبییەکانی پێش ساڵی ١٨٠٠ دەکرێ.

یەکەمین کتێبێن روسی بریتی بوو لە نوسخەێن دەستنووس دەربارەی بۆنە و سروشتێن ئایینی، ژیانی قەدیسان، سەفەرنامەی گەشتیاران، و هەندێ چمکێن کتێبی موقەدەس. کۆنترین نوسخەی دەستنووس بە زمانی روسی کە لەبەر دەست دابێ، وەرگێڕانی ئینجیلێکە (دەوروبەری ١٠٥٦- ١٠٥٧) کە کەشیشێك بە ناوی گریگۆری بۆ ئوسترومیر ناوێکی خەلکی نۆڤگرۆدی نووسیوە و لەبەر ئەمە بە ئینجیلی ئوسترومیر ناسراوە. بەهەرحاڵ، نزیکەی پێنج سەد نوسخەی دەستنووس کە بۆ سەدەی یازدەیەم تا سیازدەیەم دەگەڕێنەوە لە ئاسیوی رۆژگار دەرباز بوون. زۆر سروودی ئایینی و گۆرانیانش دەماودەم و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە هاتوون و ماونەتەوە.

لە هەمان قۆناغدا، و وەکو دیارە بەر لەوەش سترانان و بەیتانی نە ئاییینی لە نێو خەلکیدا رەواجی هەبووە و دەماودەمی کردووە. ئەم بەرهەمە نە مەزهەبییانە دەشێت بەسەر سێ دەستەی گەورەدا دابەش بکرێن:

١- *کەلتووری نەتەوەیی، بریتییە لە گۆرانییانی خەرمان هەلگرتن، گۆرانی ئەڤیندارى، سردووێن عەزاباری، جادووگەری، مەتەلان.*

٢- *حیکایەتێن نیمچە مێژوویی، کە لەم حیکایەتانەدا حەقیقەت و ئەفسانان ئاوێتەی یەکدی بوون (و ناڤدارترینیان بەسەرهاتێکە دەدرێتە پال یەکێك لە رەبەنانی کییف بە ناوی نیستور (١٠٥٦- ١١١٥). واریقاتنامەکەی نیستور مێژووی سلاڤەکان لە تۆفانەکەی نوحەوە تا سالی ١١١٠ دەگێرێتەوە).*

٣- *رۆمانسێن پەخشانی ئاهەنگدار، کە لەوەیە لەلایەن شاعیرانی دەرباری یان دەنگبێژانی پیشەییەوە گوترا بن (وەکو شانسون دو ژێشتی فەرەنسی) هەندێ لەم چیرۆکانە رەگ و ریشەی میللیان هەیە، هەندێکیان لاسایی کردنەوەی ئەفسانانی بیزانسی-ن، تاقە بەرهەمێك کە لەم چیرۆکانە مابێتەوە کە بە یەکەمین شاکاری نووسراوی ئەدەبیاتی روسی دەژمێردرێ ((سروودی سوپای ئیگورە)) (لە دەوروبەری ١١٩٠ تا ١٢٠٠ نووسراوە) کە چیرۆکی هێرشی ناکامی سوپای شازادەی نوڤگوردە، ئیگۆر سڤیاتا سلاڤیج بۆ سەر پۆلوڤستانی بێگانە لە سالی ١١٨٥دا دەگێرێتەوە. لەم لەشکرکێشییەدا سوپای شازادە دەشکێ و ئەو بە خۆی یەخسیر دەبێ، لێ لە یەخسیری هەلدێ و بۆ کییف دەگەرێتەوە.*

لە هەولی داگیرکاری مەغولەوە (١٢٤٠) تا دەست پێکردنی دەسەلاتی پتری گەورە (١٦٢٨)، بەرهەمێکی ئەدەبی ئەوتۆ نەهاتە ئاراوە، لەم قۆناغەدا ژمارەیەك دوعای مەزهەبی، کتێبێن فێرکاری ئەخلاقی، ژیانامەی روحانییان، سەربورنامان، و هەندێ نامان نووسرا، بەناوبانگترینی ئەم بەرهەمانە:

١- *شەش نامە کە لە نێوان ئیڤانی چوارەم "١٠" (ترسناك)و شازادە کوربسکی "١١" دا گۆردراونەتەوە (کوربسکی کە زەمانێك جێگەی متمانەی ئیڤان بوو، پاشان پەیوەندی بە پۆلەندییەکانەوە کرد).*

٢- *ئوتوبیوگرافی (١٦٧٢- ١٦٧٣) کەشیشێك بە ناوی ئاڤاکوم، کە لە سالی ١٦٨١دا بە تاوانی بیدعەت لە ئاگردا سووتێنرا (لەم کتێبەدا ئەو تالی و دژوارییە سەیرانەی کە*

*تەحەمولی کردوون و ئەو ئەشکەنجانەی کە لە سیبریا دیتوونی شەرح دەکات. ژیننامەکەی ئەڤاکوم یەکەمین ئوتوبیوگرافییە لە زمانی رووسیدا).*

تاوەکو بەر لە ساڵی ١٦٨٢ لە روسیادا دراما یان چیرۆکێکی پەخشانی رەسەن و تازە دانەهێنراوە، بەڵام هەندێ وەرگێڕان لە هەردوو جۆرەکەدا ئەنجام درا.

لە سەرەتاکانی سەدەی شانزەیەمدا هەندێ دراما لەسەر پایە و بنەمای سروودێن کلێسا هاتنە ئاراوە، بەڵام ئەم دراماییانە تا رادەی شانۆنامەی تەواو گەشەیان نەکرد. درامای دواتری روسی لاسایی کردنەوەیەکی درامای لاتینی (کە لە رێگەی قوتابخانانەوە هاتبوو) و درامای نە مەزهەبی ئەڵمانی (کە لە رێگەی ئەکتەرانی گەڕۆکەوە گەییە روسیا) بوو. لە دەوروبەری ساڵی ١٦٧٧ دا، کۆمەڵە رۆمانسێکی سوارچاکی، کە لە پۆڵەندییەوە وەرگێڕدران، فەسڵێکی گەورەیان لەبەردەم پێشکەوتنی چیرۆکی پەخشانیدا کردەوە، ریفۆرمەکانی پەتری گەورە کاری کردە سەر رێنیسانسی خودی روسیا. زانستی کلاسیکی یونان و روم و ئەو کلاسیکانی فەرەنسی روسەکانی شەیدای لاسایی کردنەوەی وان کرد، و پەیوەندی نزیك لەگەڵ ئەوروپادا بووە مایەی بەکارهێنانی شێوەێن رۆژئاوایی لە ئەدەبی روسیدا. کەم کەمە هەندێ شانۆنامان بە چاولێکەری بەرهەمەکانی کورنی و راسین نووسران، داستان و تراجیدیایان، لاوانەوە و چامان، حیکایەت و هۆزانێن کۆمەلایەتی، و بەرهەمێن تەنزئامێز، بە پێی رێساکانی بوالو، بە رادەیەکی زۆر بلاو بوونەوە. تەنانەت ئەوەی لە ستایشی پەتری گەورەدا دەنووسرا، لاسایی کردنەوەی ئەو بەرهەمانە بوو کە لە ستایشی لویسی چواردەهەمدا نووسرا بوون. بە هەر حاڵ، هیچ یەکێك لەم بەرهەمانە بایەخێکی ئەدەبی ئەوتۆی نەبوو.

مێژووی ئەدەبیاتی تازەی روسی دەگاتە داهێنانی داب و رێسای جێگیری ئەدەبیاتی خەیاڵی نە مەزهەبی لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەمدا. لە ماوەی زۆربەی ساڵانی ئەم سەدەیەدا زۆربەی بەرهەمێن ئەدەبی هێشتا تەقلیدی، دەستکرد و نارێك و پێك بوو. بە هەر حاڵ، ژمارەیەك لە شاعیران و نووسەرانی سەدەی هەژدەیەم شایستەی ئەوەن ناوی خۆ و بەرهەمیان باس بکرێ.

<u>ئانتیوخ دمیتریوفیچ کانتمیر (١٧٠٨- ١٧٤٤):</u>

(ئەم شاعیر و نووسەرە روسییە لە ئەستەمبوڵ لە دایك بوو و لە پاریس کۆچی دوایی کرد. لە شازادەکانی مولداڤی بوو، بە منداڵی لە دەربارێ روسیا پەروەردە بوو). کانتمیر چەند هەجوونامەیەکی دژی پێشداوەری و وابەستەگی کۆن، بەرەڵلایی تازە، و سەردەمی رۆشنگەری

نووسی (گرنگترینیان نۆ هەجۆنامەیە کە لە ساڵی ١٧٤٩ بە زمانی فەرەنسی و لە ساڵی ١٧٦٢دا بە روسی بڵاوبووەوە). کانتمیر لەم هەجوونامانەدا ژیانی روسیا و نەزانی و لووتبەرزی ئەرستۆکراتی زەمانەی وەسف کردووە، کانتمیر بە دامەزرێنەری تەنزی روسی دەژمێردرێ).

ڤاسیلی کیریلوڤیچ تردیاکوفسکی ١٧٠٣- ١٧٦٩:

(کوڕی کەشیشێکی خەلکی حاج تەرخان بوو. لە هەرزەکاریدا لە قوتابخانە هەلات و بۆ هۆلەندا رۆیی و لە وێندەرەوە بە پێیان بەرەو پاریس چوو. پاش گەڕانەوە بۆ روسیا لە ئەکادیمیای زانستانی روسیادا دەست بە کار بوو). هەندێ شیعری لاوازی گوت و تەرجەمەیەکی زۆری بەرهەمێن فەرەنسی کرد، بەلام بە تۆمارکردن و نووسینی بۆچوونی ئەو کلاسیکەکان لەمەڕ شیعر بە زمانی روسی و هەروەها بەو بابەتانەی لە بواری عەروزی روسیدا نووسیونی بەناوبانگە.

میخائیل ڤاسیلیوڤیچ لامانوسوف (١٧١١- ١٧٦٥):

(زانا و شاعیری بەناوبانگی سەدەی هەژدەیەمی روسیا، لە خێزانێکی ماسیگری دەستکورت هاتە دنیا. لە ساڵی ١٧١٤دا بوو بە ئەندامی کۆڕی زانیاری سانپترسبۆرگ. لە لقە زانستییەکانی وەك فیزیا، کیمیا، زەویناسی، ئەستێرەناسی و ئابووریدا کەوتە لێکۆڵینەوە). لامانوسوف دامەزرێنەری راستەقینەی ئەدەبیاتی تازەی روسیایە. گەلێك چامەی شکۆداری لە قاڵبی نەزمی نویدا، لەسەر بنەمای سیلابێن هاوسەدا گوتووە. زمانی کۆنی سلاڤۆنێکی کلێسایی بۆ شێوازی "بەرز" بەکار هێنا و دەربڕینی محاوەرەیی بۆ شێوازی (ئاسایی) بەکار هێنا، و بەمجۆرە زمانی روسیی دەوڵەمەند کرد. (لامانوسوف بە نووسەری یەکەمین کتێبی دەستووری زمانی روسی (١٧٧٥)ش دەزانرێ).

ئەلکساندەر پتروڤیچ سوماروکوف (١٧١٨- ١٧٧٧):

سوماروکوف نووسەری تەنزنامە، ئەفسانان و رەخنەێن ئەدەبییە. لەگەڵ ئەمەشدا شۆرەتی ئەم نووسەرە بە یەکەمین درامای تەواوی روسی، واتە بە تراجیدیای خوریف-ەوە بەندە. سورماروکوف ماوەیەك بەڕێوەبەری یەکەمین شانۆی روسیا (١٧٥٦)، لە سانپترسبورگ (لینینگراد) بوو (یەکەمین گۆڤاری غەیرە دەوڵەتی روسی بە نێوی هەنگی زەحمەتکێش (١٧٥٩) بڵاوکردەوە).

گاڤریل رومانوڤیچ درژاڤین (١٧٤٣- ١٨١٦):

(درژاڤین کوڕی ئەفسەرێکی دەستکوری بە ئەسڵ تاتاری بوو. لە غازاندا کەمێکی خوێند، ماوەیەك سەرباز بوو، پاشان بوو بە حوکمڕانی یەکێك لە شارەکان، و ئەوجا گەییە پۆستی

سکرتارییەتی کاترین-ی دووەم. لە زەمانی ئەلکساندەری یەکەمدا پۆستی وەزارەتی دادی (١٨٠٢) وەرگرت). درژاڤین لە پەیڕەوانی "خواپەرستی" (دیزم)ن، ئەپیکۆری رەفتار، و گەورەترین شاعیری رۆژگاری خۆی بوو. بە غەزەلیات، سروودی مەزهەبی، و چامەکانی بەناوبانگە. درژاڤین شەیدای گەورەیی، شکۆ، بەرزی و شادمانی بوو. زمانی دلگیر و بتەوە، وەك بلێی هەندێك شاش و لە دروستی روالەتی بەدەر.

دنیس ئیڤانوڤیچ فونڤیزین (١٧٤٥- ١٧٩٢):

شاعیر و شانۆنامەنووسی روسییە، بە دوو کۆمیدیا پەخشانییەکەی سەرتیپ (١٧٦٦)و کەمتر (١٧٨٢) بەناوبانگە کە لە قالبی تەنزی کۆمەلایەتی و بە شێوازی کلاسیك نووسراون، فونڤیزین لە داهێنانی گفتوگۆیانی کۆمیدی، و لە کاراکتەرسازیدا، بەتایبەتی کاراکتەرانی رەق و زبر، حەیوان سیفەت، نەخوێنەوار یا کۆلکە خوێنەوار و دوو روو، بالا دەستە.

لە بەرانبەر ئەم نووسەرانەدا کەلایەنگری بزووتنەوەی نەو کلاسیك بوون، سێ نووسەری شەیدای سادەیی و ئیلهامی خۆرسك هەن کە بە پێشەنگانی رۆمانتیزم دەزانرێن. ئەم سێ نووسەرە بریتین لە:

*١- نیکۆلای میخائیلوفیچ کارامزین (١٧٦٦- ١٨٢٦)ـ نووسەری چیرۆکی پەخشانییە، و چیرۆکی کورتی هێنایە ناو ئەدەبیاتی روسییەوە. بەناوبانگترین بەرهەمی وی مێژووی ولاتی روسیایە (١٨١٨- ١٨٢٦)، لە دوانزە بەرگدا.*

*٢- ڤاسیلی ئاندریوفیچ ژوکوفسکی (١٧٨٣- ١٨٥٢) (کە هەندێ چاکسازی لە شیعری روسیدا ئەنجامدا، و روحی رۆمانتیزمی بە بەر ئەدەبیاتی روسیدا کرد). کۆمەلێك بەرهەمی ئولانت، شیلەر، درایدن، تومسن، گرین ساوتی، والتر سکوت، توماس مور، کامپل و بایرونی وەرگێڕایە سەر زمانی روسی.*

*٣- ئیڤان ئاندریوفیچ کریلوف (١٧٦٨- ١٨٤٤)، وەرگێڕی فابیلەکانی لافونتینە، کە بە خۆیشی لە فابیل نووسیدا داهێنەر بوو. (چەند شانۆنامەیەکی وەك کۆمیدیا تەنز ئامێزەکانی: کەلەکبازان ١٧٨٨، و وانەیەك بۆ کیژان ١٨٠٧ی لەبەر دەستدان).*

ئەو قۆناغەی کە لە سالی ١٨٢٠ەوە (مێژووی بلاوبوونەوەی یەکەمین بەرهەمی پوشکین) تا سالی ١٨٨٣ (مێژووی مردنی تورگینف) بەردەوام دەبێ، قۆناغی زێڕینی ئەدەبیاتی روسییە. دوو دەیەی هەوەلی ئەم قۆناغە دەشێت بە قۆناغی رۆمانتیزم دابنرێ، چونکە لەو ماوەیەدا پۆشکین و لیرمانتوف-ی جووتە شاعیری گەورەی رۆمانتیك، شیعری خۆیان گوتووە.

لە دەوروبەری ساڵی ١٨٤٠دا وردە وردە ریالیزم شوێنی رۆمانتیزمی گرتەوە. دیارە کە ژمارەیەك لە دوا بەرهەمێن پوشکین (وەکو بەیتی یوگنی ئونگین، ١٨٨٣) نیشانەی هەندێ تایبەتمەندی ریالیزمیان پێوە بوو. پەیدا بوونی گوگول، بەتایبەتی بڵاوبوونەوەی رۆمانی گیانە مردووەکان لە ساڵی ١٨٤٢دا سەرەتای سەردەمی گەورەی چیرۆکی ریالیزمی روسییە. لەم ساڵەوە تا ساڵی ١٨٨٣، گوگول، تورگینف، دۆستوفسکی و لیف تولستۆی بە شاکارەکانیان "روحی روسییان" بە بەر ئەدەبیاتی جیهانیدا کرد، ئەم روحە لە ئەدەبیاتدا "ئاوێتەیەکی بێ هاوتایە لە ریالیزمی راشکاو و بەهێز لەگەڵ حەساسییەت و هەستیاری ئاناساییدا، ئاگادار بوونە لە دەردێن گیان پروکێنی دڵی مرۆڤانی، و تاسەمەندی بالکردنەوەیە بەرەو لوتکەی باڵاترین ئایدیالان). ئەم هاوسۆزییە لەگەڵ کول و کۆڤانی بەشەریدا، ریالیزم و ناتورالیزمی روسی لە ریالیزم و ناتورالیزمی فەرەنسی کە بێروونگەراتر بوو جیا دەکاتەوە. رەنگە تورگینف لە بابەتگەرایی فەرەنسی زۆر نزیك بووبێتەوە، بەڵام تەنانەت ئەویش هەندێ جار دەربەستی لایەنی ئەخلاقی و فێرکاری خوێنەرە.

رۆمان و شیعرێن لیریکی گەورەترین بەرهەمی ئەدەبی سەردەمی زێرینی روسی پێك دێنن، هەرچەندە ژمارەیەك کورتە چیرۆکان، بیرەوەرییان و شانۆنامانی بەهاداریش بە یادگار ماونەتەوە.

## هۆزان

هۆزانی سەدەی نۆزدەیەمی روسیا، جگە لە شیعرەکانی پوشکین و لیرمانتوف، شیعرێکی مامناوەندییە، نە باشە و نە خراپ، ئالکسی ڤاسیلیوفیچ کولتسف (١٨٠٨- ١٨٤٢) هەندێ شیعری لە هەڤرکی پوشکیندا گوت، بەڵام ناوبانگی وی بە "گۆرانییە میللییە دەستکردەکانیەوەن).

(گۆرانی جووتکار، و پیاوی داس بەدەست لە جوملەی جوانترین بەیتێن کولتسف-ن). فیودور ئیڤانوڤیچ تیوچف (١٨٠٣- ١٨٧٣)، شاعیرێکی لیریکی دیکەی ئەم سەردەمەیە، هەندێ شیعری بە نێوەرۆك فەلسەفی و دەربارەی سروشتی هەیە، لە شیعرەکانیدا رەگەزێن کلاسیك و رۆمانتیك تێکەڵ دەکات.

(خەیاڵ- ١٨٢٩و شەوی پیرۆز ١٨٤٩ لە بەیتەکانی ئەون). ئالکسی کونستا نتینوڤیچ تولستۆی (١٨١٧- ١٨٧٥)، گەورەترین شاعیری شیعری تەنزئامێز و حەنەك ئامێزی

روسیایە. جگە لەمە، هەندێ هۆزانی لیریکی ناسك و جوان، دوو بەیت، چیرۆکێك بە ناوی خوێن مژ، رۆمانێك بە ناوی شازادە سیربریانی- ۱۸٦۳و شانۆنامەیەکی مێژوویی سێ بەشی نوسیوە. تولستۆی لەم شانۆنامەیەدا دیمەنێن رەشی قۆناغی دکتاتۆرییەتی روسیا بەوپەری وەستاییەوە وەسف دەکات. بەشەکانی شانۆنامەی نێوبراو بەم ناوانەن: مەرگی ئیڤانی ترسناك- ۱۸٦٦، تزار تیودور- ۱۸٦۸، و تزار بوریس- ۱۸۷۰ ئافاناسی ئافاناسیوفیچ فیت (۱۸۲۰- ۱۸۹۲)، لە داکۆکیکارە سەرسەختەکانی شیعری ناوازە بوو. شیعرەکانی سەرەتای وی وەکو شیعری پارناسیانی فەرەنسی، و رەنگدانەوەی باوەڕ و بۆچوونی هونەر بۆ هونەر بوون. هەندێ هۆزانی لیریکی دەربارەی تەبیعەت و هەندێ پارچەی هزرمەندانە و فەلسەفیشی لە پاش خۆی بەجێهێشتووە. (یەکەمین کۆمەڵە شیعری "پانتیونی شیعر" لە ساڵی ۱۸٤۰دا بڵاوبووەوە).

نیکۆلای ئالکسیوفیچ نیکراسوف (۱۸۲۱- ۱۸۷۷)، شاعیری گوندییان و گۆرانییانی میللی بوو. لە شیعرەکانی دا ئەوپەڕی هاوسۆزی لەگەڵ گوندییاندا دەردەبڕی و دەکەوتە شەرحی خەم و ئازارەکانیان. لێ، لە وەستایی و زەوقی هونەری بێ بەش بوو (گرنگترین بەرهەمی بەیتێکە بە ناوی: چ کەسێك دەتوانێ لە روسیادا بەختیار بژی ۱۸٦٤- ۱۸۷٦).

<u>ئالکساندر سیرگیوفیچ پوشکین ۱۷۹۹- ۱۸۳۷:</u>

مەنشور بە "بایرۆنی روسیا"، لە بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراتی کۆن لە مۆسکۆ هاتە دنیاوە. باپیرە گەورەی ئەبراهام هانیبال، کوڕی شازادەیەکی حەبەشی و مایەی رێزی پتری گەورە بوو. پوشکین بە منداڵی لەبەر دەستی مامۆستایان و پەروەردەکارانی فەرەنسیدا پەروەردە بووە. لە ساڵی ۱۸۱۱ەوە تا ۱۸۱۷ لە ئامادەیی تزارسکویە"[۱۲]" سلۆی چەند میلی مۆسکۆدا خوێندویەتی. پاش تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی لە سان پترسبورگ و لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە دامەزرا و تا ساڵی ۱۸۲۰ درێژەی بەکاردا. لەم ساڵەدا تزار لەسەر شیعرە توند و (شۆڕشگێڕەکانی) بۆ باشووری روسیای دوور خستەوە. لە هەمان ساڵدا بەیتی ئەڤینداری روسلان و لیودمیلا-ی نووسی. "دوور خستنەوەی" پوشکین (کە زیاتر لە کریمە و قەفقازدا بوری) چوار ساڵی خایاند. لە ساڵی ۱۸۲٤دا ناردیان بۆ مولکەکەی دایکی لە ویلایەتی پسکوف. دوو ساڵانیش لەو گوندەدا بە گۆشەگیری ژیبا، گەلەك ئەفسانانی فۆلکلۆری لە دایەنە پیرەکەیەوە (ئارینا رودیوینوڤا) فێر بوو. پۆشکین لە ماوەی شەش ساڵ دووری لە سانپترسبورگ،گرفتاری چەندین سەربوری ئاشقانە بوو و گەلەك شیعرێن لیریکی و چیرۆکڤانی و شانۆنامەیەکی نووسی. لە ساڵی ۱۸۲٦دا بەر بەخشینی نیکولای یەکەم کەوت و بۆ پایتەخت

گەڕایەوە، و لە مۆسکۆدا هەمان ژیانی بێسەروبەری بەر لە نەفی کردنەکەی دەست پێکردەوە، لە ساڵی ١٨٣١دا لەگەڵ کیژێکی هەژدە ساڵەی جوان، بەڵام بەرەڵلادا بە ناوی ناتالیا گونچاروڤا زەماوەندی کرد، کە عادەتی دەستبلاوی و خۆش رابواردنی وی (رێك وەکو خۆی) بووە باعیسی ئەوەی کە پوشکین تا بینا قاقای لە قەرزا رۆبچێ. ژیانی هاوسەرێتییان تاقەتبەر و ناخۆش دەرچوو، لەلایەکەوە دەمگۆی پەیوەندی ناڕەوای هاوسەرەکەی لەگەڵ مێردی خوشکەکەی خۆیدا کەوتە سەرزاران. سەرەنجام، پۆشکین ناچار بوو لەگەڵ ئەو پیاوەدا دوئیل بکات و کوژرا.

بەرهەمەکانی:

بەیتێن چیرۆکڤانی: پوشکین هەوەڵجار وەکو شاعیری بەیتێن چیرۆکڤانی مەیلەو درێژ ناوبانگی دەرکرد. بەیتی روسلان و لیودمیلا (١٨٢٠) چیرۆکێکی ئەفسانەیی خەیاڵ ئەنگێزە دەربارەی ئەو بوکێك کە لە باهۆز و تۆفاندا گرفتاری جادوو دەبێ. مێردە بەدبەختەکەی لە پاش بەسەرهاتێکی زۆر رزگای دەکات، و سەرلەنوێ دەست بە ژیانێکی خۆش دەکەنەوە. گلینکا"١٣" ئۆپێرایەکی لەسەر ئەم بەیتە داناوە. کاریگەری بایرون بەسەر بەیتە رۆمانتیکییەکانی برایانی رێگر (١٨٢١)، زیندانی قەفقاز (١٨٢٢)و فوارەی باخچەی سیرای (١٨٢٤)دا ئاشکرایە. لەم دوو بەیتەی دواییدا کە کەش و هەوای رۆژهەڵاتیان هەیە، ژنانی چیرۆکەکانی جوان و خەمین، و پیاوان شەهوانی و ناکام وێنە دەگیرێن. ئەم دوو بەیتە (چیرۆکی شیعری) بە بەناوبانگترین بەرهەمی پوشکین دەژمێردرێن. کێوەلییان (١٨٢٧) بەیتێکی پڕمەینەتە دەربارەی پیاوێك کە لە فێڵ و دەهۆ و درۆیانی باوی کۆمەڵگەی بەشەری هەڵدێ. پولتاڤا (١٨٢٩)، بەیتێکی داستانی (مەلحەمی) رۆمانتیکییە کە سەرکەوتنە بەناوبانگەکەی پتری گەورە بەسەر شارلی"١٤" دوازدەیەمی پاشای سویدا لە ساڵی ١٧٠٩دا دەگێڕێتەوە.

بەناوبانگترین بەرهەمی پۆشکین "رۆمانی شیعری" یوگنی ئونگین (١٨٣٣)ـە، کە بەسەرهاتی پیاوێکی لاوە کە پاش مردنی بابی لە دەستی پەستی شار پەنا دەباتە بەر کونجی دێیەك، یوگنی لە گونددا لەگەڵ شاعیری لاو لنسکی دا دەبێ بە دۆست. لنسکی ئەو بە تاتیانا-ی خوشکی ئولگای دەزگیرانی خۆی دەناسێنێ. تاتیانا حەز لە یوگنی دەکات، بەڵام یونگین بە ئەدەبەوە رووی لێ وەردەگێڕێ، یوگنی ژێراوژێر پەیوەندییەك لەگەڵ ئولگادا پەیدا دەکات. لنسکی کە پەی بە رووداوەکە بردووە، داوای دوئیلی لێدەکات، لنسکی لەم دوئیلەدا دەکوژرێ. تاتیانا بۆ شار دەڕوات و لەگەڵ شازادەیەکی دەوڵەمەندا زەماوەند دەکات. چەندین

ساڵ لەوەو دوا یوگنی جارێکی دی دەیبینێ و دڵبەندی خۆی بۆ دەردەبڕێ. تاتیاناش هەندێ قسەی، لەمەڕ ئەشقی خۆی، لەگەڵدا دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا دەرهەق بە مێردەکەی خۆیشی وەفادار دەبێ. بە باوەڕی یەکێك لە رەخنەگرەکان، یوگنی ئونگین "بەرهەمێکی روسی خاڵیسەیە، و باشترین وەسفی ژیانی روسانی، چ لە شارە گەورەکان و چ لە مولکی دەوڵەمەندان لە دەوروبەری شاران، لەخۆ گرتووە، بەرهەمێکە تا ئێستا هەرگیز لە ئەدەبیاتی روسی دا نەنووسرا بوو"، چایکۆفسکی ئەم بەیتەی کردووە بە ئۆپرا.

<u>هۆزانێن لیریکی:</u>

پوشکین هەندێ شیعری لیریکی لەمەڕ لایەنگری لە ئازادی و لیبرالیزم نووسیوە، بەڵام باشترین شیعری دەربارەی ئەڤین و سروشتن. شیعرەکانی سەرەتای (١٨١٦- ١٨١٩)، دڵتەنگێز و شادن. شیعرەکانی ساڵانی ١٨٢٠- ١٨٢٣ی تا رادەیەك شەخسی تر، بە جۆش و خرۆشتر، و لەڕووی پەرداخت و تەکنیکەوە تەقریبەن پوختەترن. شیعرەکانی دوا قۆناغی (١٨٢٤- ١٨٣٧) زۆر جدیترن، "هەموو ئەم شیعرە لیریکییانە لە ئەدەبیاتی روسیدا و لە مێژووی شیعری میللەتانی دیکەدا بێ هاوتان"، و شیعری هیچ شاعیرێك ناگات بە جوانی و جەزبەیان. گەلەك لە هۆزانێن دوا قۆناغی ژیانی پوشکین لە ئەزموونە شەخسییەکانیەوە هەڵدەقوڵێن، بەڵام تۆنێکی گشتییان هەیە. سفتی و سادەیی ئەم شیعرانە و رەچاوکردنی بنەمای شیعری، جوانییەکی کلاسیکیان پێ بەخشیون. هەندێ لە هۆزانە لیریکییە هەرە جوانەکانی پوشکین بریتین لە: "تۆفان"، "ناپلیۆن"، "بەیانی زستان"، "ئێوارەی زستان"، "پەیامبەر" و "وێنەگرتن".

## شانۆنامە

پۆشکین چوار "دراماى بچووك" یا پلۆتی درامی نووسیوە، کە دراماى راستەقینە نین، بەڵکو کەم و زۆر بە چەند کورتە هەڵسەنگاندنێك لەمەڕ کەسایەتی و مەوقیعیەتی دراماتیك دەزانرێن. ئەم درامایانە بریتین لە: موتسارت و سالیری (١٨٣١)، زیافەت لە کاتی بەڵادا (١٨٣١)، دلاوەری تەماعکار (١٨٣٦) و میوانی بەردین یا دۆن جوان (١٨٤٠)، گرنگترین بەرهەمی درامی پوشکین بوریس گودونوف (١٨٣١)ی ناوە کە تراجیدیایەکی مێژووییە لە قاڵبی شیعری ئازادا.

ئەم بەرهەمە یەکەمین هەنگاوە کە لە مەیدانی تراجیدیای رۆمانتیکی روسیدا (لە بەرانبەر تراجیدیای کلاسیکی فەرەنسیدا) نراوە. لەم تراجیدیایەدا پوشکین پتر بایەخ بە گێڕانەوەی

چیرۆك دەدا تا بە کاری دراماتیکی، دەربڕینەکەی بە ئاو و تاوە، شیعرە ئازادەکەی یەکنەوایە، بەڵام کاراکتەرانی شانۆنامەکەی بە هونەرمەندییەکی ئافەرین ئەنگێزەوە وێنە گرتووە، بابەتی شانۆنامەکە دەربارەی گودونوف-ی تزاری روسیایە (١٥٥١- ١٦٠٥) کە درۆزنێك بە کوشتنی میراتگری هەقداری تەخت و تاج ئاوانباری دەکات. خەلکی پشتیوانی لە درۆزنەکە دەکەن، رادەبن و هەموو بنەماڵەی گودونوف قەتڵ و عام دەکەن. موسورگسکی "١٥" ئەم درامایەی کردووە بە ئۆپرا.

هەڵسەنگاندن:

گەورەیی پوشکین نەلە قوڵی یان رەسەنایەتی بیرەکانیدایە و نە لە گەورەیی ئەو شەخسیەتەدایە کە شیعری وی بووە بە ئاوێنەی باڵانمای. ناسکی کاری ئەو لە "جوانی فۆرم، بەکار هێنانی شێوازێن شیرینی دەربڕین، و زاڵی بێ نەزیری بەسەر نەزم و قافیەدا"یە، رەخنەگرێك گەورەترین باشییەکانی بەرهەمی پوشکین بەمجۆرە دەژمێرێ: "هاوئاهەنگی بێ وێنە و تەواو لە نێوان بابەت و فۆرمدا، گونجانی موعجیزە ئامێزی پەیڤ لەگەڵ پێداویستی حاڵدا، کۆکردنەوەی ناسکی و رەقی لە یەك کاتدا و دەرکی تەقریبەن هەڵە هەڵنەگر لەمەڕ کێش"، پوشکین بە بەرەکەتی ئەم هێزی رەوانکارییە زمانی شیعری تازەی رووسیی خوڵقاند. ئەو ئەم زمانەی لە موبالەغەکاری بێ گیان و سفتی درۆینە خەلەساند، و لە زمانی زیندووی جەماوەری خەلکی نزیکتر کردەوە، پاکی و دروستی، ئیحتویار، وەرچەرخان و هێزی پێ بەخشی. زمانی وی لەوپەڕی دەوڵەمەندی و نەرمی و خۆشئاهەنگی دایە.

پۆشکین بە هۆی میانڕەوی و دوورە پەرێزی لە درێژدادڕی لە زۆر شاعیرانی گەورە باڵاترە. ئیڤار سپکتر پێی وایە کە "قەرزارباری زمانی روسی بە پوشکین گەلەك زیاترە لە قەرزارباری زمانی ئینگلیزی بە شەکسپیر".

پوشکین لە بنچینەدا زیاتر شاعیرێکی نەتەوەییە تا جیهانی، و لە روسیادا ناوی پۆشکین لە پێشەوەیە.

میخائیل یوریڤیچ لیرمانتوف (١٨١٤- ١٨٤١):

لیرمانتوف پاشوەچەی کەشتیوانێکی سکۆتلەندی بوو بە ناوی جۆرج لیرمونت کە "لە قسان" رەگی ئەم کەسە دەگەییەوە سەر تۆماس رایمەر "١٦" بابی ئەفسەری سوپا بوو. لە مۆسکۆ لە دایك بوو، لە سێ ساڵیدا دایکی لە دەستدا، و لە ماڵی داپیرە دەوڵەمەندەکەیدا پەروەردە بوو. لیرمانتوف ماوەیەکی لە رۆژئاوی لاویی لە قەفقازدا گوزەراند، و لە ساڵی

١٨٣٠دا چووە زانستگەی مۆسکۆ. دوای دوو ساڵ بە هۆی خەتایەکی بچووکەوە لە زانستگە دەرکرا، و چووە قوتابخانەی سوپایی سان پترسبورگ، و لە ساڵی ١٨٣٤دا بە پلەی ئەفسەری لە یەکێك لە هەنگەکانی گارددا دەست بە کار بوو. لە ساڵی ١٨٣٧دا بە بەیتی توند و ئاگرینی مەرگی شاعیرێك، کە بۆ مەرگی پۆشکینی گوت، زۆر بە توندی هێرشی کردە سەر ئەنجوومەنانی دەرباری لەبەر بەرەوا زانین و چاوپۆشی کردن لە کوشتنەکەی. لە ئەنجامدا بۆ هەنگێك (فەوج) لە قەفقاز دوورخرایەوە. دوای ساڵێك بۆ سانپترسبۆرگ گەڕایەوە، و جارێکی دی بە هۆی دوئیل کردنی لەگەڵ کوڕی سەفیری فەڕەنسادا بۆ هەمان ناوچە دوورخرایەوە (١٨٤٠)، ساڵی دوایی بە خۆیشی لە دوئێلیکدا کە بە هۆی سوکایەتی کردن بە یەکێك لە هاوشانەکانی لەگەڵیا کرد، کوژرا.

لیرمانتوف کە لە ژێر کاریگەری شیلەر، بایرون، و شیلیدایە، شاعیرێکە بە گیانێکی یاخی و دژ بە زۆرداری، دژ بە هەر جۆرە سنووردارییەکی ئازادی تاك، دژ بە ناشیرینی و سووکی و بێهودەیی ژیان، لە شیعری لیرمانتوفدا حاڵ و هەوایەکی تازە دەبینین —حاڵ و هەوای نەفرەت و بێزاری لە هەر شتێك بەو شێوەیەی کە هەیە.

ئیبلیس (لە دەوروبەری ١٨٤٠ تەواو کراوە):

بەیتێکی خەیاڵەنگێزە و ئیلهامەکەی لە (بەهەشتی زەوی) بایرونەوە وەرگیراوە، و بویەری دڵبەندی ئیبلیسێکی (پیاو خراپ) تەنیا و دڵتەنگ، بە راهیبەیەك دەگێڕێتەوە، راهیبەکە لەم ئەڤیندارییەدا گیان دەسپێرێ.

متسیری (١٨٤٠):

دووەمین بەیتی درێژو رۆمانتیکی لیرمانتوفە، شەرحی خەم و ئازاری شازادەیەکی قەفقازییە کە یەخسیری روسەکان دەبێ و لە دێرێکدا پەروەردە دەبێ، ئەو کە لە ئەشقی ئازادیدا دەسووتێ، سەرەنجام لە وێندەر هەڵدێ، بەڵام لە کۆ جاڕاندا رێگە گوم دەکات. پلنگێك زامداری دەکات، و لە حاڵی مردنا بۆ دێرەکەی دەگەڕێننەوە، بەڵام هەر هاواری ئازادی دەکات.

هۆزانە لیریکییەکانی لیرمانتوف رەنگدانەوەی پەیامی شاعیرن، واتە بەرەڤانی لە حەقیقەت، ئازادی، و پایەی مرۆڤانی، گەلەك لەم شیعرانە دڵبەندی بە جوانی سروشت — بەتایبەتی جوانی مەنگ و شاهانەی دیمەنانی قەفقاز- نیشان دەدەن ژمارەیەك لە غەزەلە هەرە باشەکانی بریتین لە: "فریشتە" کە بە عەجیب ترین غەزەلیاتی رۆمانتیك لە زمانی روسیدا دەژمێردرێ، "نوێژکەر"، "پەیمان"، "قاقلە جنۆکە" و "بایەوان".

لیرمانتوف پەخشانە رۆمانێکیشی نووسیوە (کە یەکەمین رۆمانی ریالیستی لەسەر بنەمای سایکۆلۆژییە لە زمانی روسیدا).
ئەم رۆمانە کە تا ئەندازەیەك ژیاننامەی خودی خۆیەتی "قارەمانێکی رۆژگاری مە ١٨٣٩-١٨٤٠"ی ناوە. (پیچورین-ی قارەمانی سەرەکی ئەم رۆمانە، نموونەیەکی چۆنی تاکێکی روسی خۆشەبووی ناو گەندەڵییەکانی سەردەمی خۆی و نوێنەری روح و گیانی خەڵکی ئەو رۆژگارەیە، ئەو کە لە شانازی و بەختیاری و شادمانی ئەشق مەحروم بووە، بووە بە کەسێکی خۆویست و دیکتاتور و ئامادەی ئەوەیە کە تەسلیمی خراپە و شەڕارەت بێ قەفقاز مەیدانی ئەم رۆمانە ناودارەیە) پیچورین-ی بە گومان و نائومێد و دڵشکاو بەڵام زیرەك، کیژۆڵەیەکی قەفقازی دەرفێنێ، لێی بێتاقەت و بێزار دەبێ، چونکە رەقیبەکەی وی کیژۆڵەکە دەکوژێ، پیچورین بە رواڵەت ئاسودە دەبێ، و ئەوسا بەرەورووی سەرکێشییانی دیکە، لەوانە دوئیل دەلەزێ.
لیرمانتوف بە خۆی ئەم رۆمانەی بە وێنە گرتنی گەندەڵییەکانی نەوەی خۆی ناو بردووە.
لەم بەرهەمەدا رەوتی گشتی کاری لیرمانتوف، واتە بازدان بەسەر رۆمانتیزمی سەرەتایی ئەودا بەرەو ریالیزمی تەنزئامێز ئاشکرا دەبێ.
لیرمانتوف زۆر لە پۆشکین قوڵتر و بە گومانتر و زاتی ترە. و ئەگەر پوشکین لەبەر ئەوەی لە بنچینەدا شاعیرێکی نەتەوەییە و لە رێگەی پەیوەندی وی بە وڵات و سەرزەمینی خۆیەوە بایەخی جیهانی پەیدا دەکات، ئەوا لیرمانتوف وەکو دەربڕی ئەو دوودڵی و حاڵەت و دەس ماشان کردنانەی کە بەلای خەڵکی رۆشنبیرەوە ئاساییە، شایستەی بایەخی جیهانییە.

## شانۆنامە

جگە لە پۆشکین و گەورە رۆماننووسانی مینا گوگول، تورگینف، لیف تولستۆی (و دۆستوفسکی) (بڕوانە دێڕەکانی داهاتوو).
ئالکساندەر سیرگی یوفیچ گریبا"١٧"یدوف، چەند شانۆنامەیەکی بەناوبانگی نووسی، باشترین و ناڤدارترین بەرهەمی وی (داخ لە دەست شۆخی ١٨٢٥)یە لەو کۆمێدیایانەیە کە لەسەر شێوازی بەرهەمەکانی مولیر نووسراوە و پڕە لە گاڵتەبازی و کاراکتەرسازی جوان و مایەی سەرنج.
ئالکساندر نیکولا یوفیچ ئاستروفسکی (١٨٢٣- ١٨٨٦)، لە زۆربەی شانۆنامەکانیدا کە دەگاتە چل و هەشت دانە، شێوەی "بڕگەیەك لە ژیان" بە کار دێنێ. ناڤدارترین درامای ئەو

بریتین لە: نابووت (١٨٥٠) (کە حیلە و فر و فێڵی بازرگانانی زەمانە وێنە دەگرێ)، بووکی بێ نەوا -١٨٥٢، نەبوونی شەرم نییە- ١٨٥٤، کاری پڕ دەسکەوت- ١٨٥٧، (کە لەوێدا بەرتیل خۆران و کارمەندانی نادروست و گەندەڵی دەوڵەت ریسوا دەکات)، هەورە تریشقە- ١٨٦٠، (کە لەوێشدا گەوجی و سەرسەختی بازرگانانی زەمانە وێنە دەگرێ)، و جەنگەڵ- ١٨٧١ (کە وێنەیەکی وەرزێرانی کۆیلەی زێرخڕی نیشان دەدات).

## رۆمان

گوگول، تورگینف، دۆستوفسکی و لیف تولستۆی بە گەورەترین رۆماننووسانی سەردەمی زێڕینی روسیا دەزانرێن. بەڵام رۆماننووسانی دیکەش لە ئەدەبیاتی روسیدا ئیحتویسار و گەورەییان بە دەست هێناوە: سێرگی تیمافیوفیچ ئاکساکوف (١٧٩١- ١٨٥٩) رۆمانانی تاڕادەیەك مەنگ و بابەتی ئەفراند (ئاکساکوف لە م رۆمانانەدا، کە لەڕاستیدا رۆمان و بیرەوەرییانی شەخسین، راپۆر و هەواڵێك لەمەڕ ژیانی ئاسوودەیی خانەوادەیی لە روسیای سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم دەگێڕێتەوە)، ناڤدارترین رۆمانی وی، سەربورنامەی خانەوادەیی- ١٨٥٦یە، کە وێنەیەکی پرشنگدار و درەوشاوەی ژیانی موڵکدارانی روسیای رۆژگاری ئەوە. رۆمانێکی دیکەی، ساڵانی منداڵیەتی نەوەی باگروف- )١٨٥٨)ی ناوە.

<u>ئیڤان ئالکساندروفیچ گونچاروف (١٨١٢- ١٨٩١):</u>

بە رۆمانی ئابلوموف (١٨٥٨) بەناوبانگە. لەم رۆمانەدا تەمەڵی و ئیسراحەتخوازی و بێکارەیی و بێهودەیی چینی ئەرستۆکراتی روسیا وەستایانە دەخرێتە بەر موتاڵا و شیکردنەوە. (گونچاروف لێرەدا، گرفتە دێرینەکەی روسیا، واتە بنیادەمانی زیادە و سەربار بە شێوەیەکی تایبەتی وێنە دەگرێ. ئەم خەڵکە زیادە و سەربارانە کە بەقسە و خەو و خەیاڵان رۆژیان دەگوزەراند، لە زۆربەی بەرهەمێن چیرۆکڤانی ئەم سەردەمەدا بە فراوانی دەبینرێن.
(حیکایەتێکی سادە- ١٨٤٧، باسی لاوێکی بەرزەفرە، و هەڵدێر- ١٨٦٩) لە رۆمانەکانی دیکەی ئەم نووسەرەن.

<u>ئالکسی فیوفیلا کتوفیچ پیسمکی (١٨٢٠- ١٨٨١):</u>

هەندێ رۆمانی سەرڕێژ لە بەدگومانی و گومانی فەلسەفەی نووسیوە کە ناڤدارترینیان هەزار روح- ١٨٥٨ی ناوە. (هەزار روح کە ئاماژەیەکە بۆ هەزار زێڕ خڕی لایەنە دزێوەکانی ژیانی روسیای بەر لە ئازادی کۆیلان بە جۆرێکی ریالیستانە و بە تۆنێکی رووت وێنە دەگرێت.

پیسمسکی جگە لە ڕۆمانەکانی، هەندێ دراماشی نووسیوە، کـە یەکـەمینیان چارەنووسـێکی تاڵە- ١٨٦٣، دراماییەکە دەربارەی بەندەیەکی بە پـارە کـردڕاوە کـە چـووە بـۆ پترسـبۆرگ و کەمێك نوێخواز و دەوڵەمەند بووە).

میخائیل یوگرافوڤیچ سالتیکوف (١٨٢٦- ١٨٨٩):

(ناوی خوازراوی وی شچدرینە، بـە سـالتیکوف شـچدرین ناسـراوە)، وەکـو گونـچارۆف و چیخۆف، هەندێ بەرهەمانی دەربارەی هەرەس و داڕووخانی ئەرستوکراتییەتی روسی نووسیوە.

ڕۆمانە تـەنزئامێزە ئاڤدارەکـەی، بنەماڵـەی گولولیـف- ١٨٧٢- ١٨٧٦) (نـەفرەت و بێزاری وی سەبارەت بە کۆمەڵگە و ڕۆژگاری خۆی ئاشکرا دەکات. سـالتیکوف لـە هـەموو بەرهەمەکانیا گشت چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی سەردەم بـەر پـەلامار و هێـرش دەدات، هەوڵـدەدا دزێـوی، تەمــەڵی و زەبـوونی، تاوانکـاری و درۆ و زۆرداریـیـان ئاشـکرا بکـات. حیکایــەتان- ١٨٨٤و مێــژووی شــارێك ١٨٦٩- ١٨٧٠ لــە بەرهەمـــەکانی دیکـــەی سالتیکوف-ە)، سەرەنجام پێویستە ئاماژە بۆ نیکولای سیمنوڤیچ لسکوف (١٨٣١- ١٨٩٥) بکرێ کە ڕۆمانانی کۆنەپەرستانەی دەنووسـی، وەك بـن بەسـت- ١٨٦٤، و تاپـای چـەقۆ- ١٨٧٠- ١٨٧١ (کە لەو ڕۆمانانەدا بە توندی بنەماکانی سوسیالیزمی بەر رەخنەدا)، و رقی لاوانی شۆڕشگێڕی هەستان). شـاکاری لـسکوف (کەشیـشان- ١٨٧٢)ـــە، لـە ئـەدەبیاتی روسیدا یەکەمین وەسفی وردی ژیانی پیس و ئالودەی کەشیشانی دیاری کردووە. (قارەمـانی چیرۆکەکە پیاوێکی دیندارە کە هەمیشە لەگەڵ توڕەیی ڕۆشنبیران و کورتبینی سەرانی خۆیدا لە شەڕدایە و ئاقیبەت دەمرێ).

نیکولای ڤاسیلیوڤیچ گوگول (١٨٠٩- ١٨٥٢):

گوگول لە سورو چینتسی لـە بنەماڵەیـەکی وردە مولکـدارانی ئـوکراینی لـە دایـك بـوو. قۆناغی سەرەتایی، بە گوێرەی باوی ئەو زەمانە لە ماڵەوە خوێندووە و فێـر بـووە، و قۆنـاغی ناوەندی (١٨٢١- ١٨٢٨) لە شاری نژین تەواو کرد. ئەوسا بە دنیایەك حەز و ئـارەزووەوە بـۆ سان پترسبۆرگ چوو. لەم شارەدا بەیتێکی چـیرۆکڤانی درێـژی، کـە لەگـەڵ خۆیـدا بردبـووی، بڵاوکردەوە کە ڕووبەڕووی شکـستی تـەواو بـووەوە. بەپێـچەوانەی حـەزی بـاتینی خـۆی، بـۆ ماوەیەك بوو بە فەرمانبەری دەوڵەت، پاشان لە قوتابخانەیەکی تایبـەتی ئەرسـتۆکراتان کەوتـە دەرس گوتنەوە. کۆمەڵە کورتە چیرۆکە دووبەرگییەکـەی (١٨٣١- ١٨٣٢) کـە باسـی ژیـانی خەڵکی ئۆکراینی دەکرد، بە جۆش و خرۆشـەوە پێـشوازی لێکـرا، پـاش یـەك سـاڵ لـە دەرس

گوتنەوە وەکو مامۆستای مێژوو، کە ناسەرکەوتوو بوو، لێبڕا ئەدەبیات بکات بە پیشە. لە سالّی ١٨٣٥دا چەند چیرۆك و گوتارێکی بلاّوکردەوە. سالّی دواتر شانۆنامەی جەنابی موفەتیش-ی بلاّوبووەوە کە بووە مایەی ستایشی خەلّکی، ئەو خەلّکانەی کە ئامانجی ئەم کۆمیدیایەن بە هێرش بۆ سەر رژێمی حکومەتی خودموختاری بێ کەفائەت دەزانی- ئەو ئامانجەی کە گوگول بیری لێنەکردبووەوە. هەمان ئامانج و هەروەها مەحکومکردنی کۆیلەداری، لە بەرگی یەکەمی روحە مردووەکاندا، کە لە سالّی ١٨٤٢دا، بلاّو بووەوە، ئاشکرایە گوگول لە سالّی ١٨٣٦ بە دواوە زۆربەی کاتی خۆی لە رۆم بردە سەر. لە سالّی ١٨٤٧دا هەلّبژاردەیەکی لە نامەکاری لەگەلّ دۆستاندا بلاّوکردەوە. ئەم کتێبە کۆمەلّێك نامەی خەیالّی رووتی لەخۆ گرتبوو (کە رق و نەفرەتی رۆشنبیرانی هەستاند، چونکە گوگول لەو نامانەدا کەوتبووە داکۆکی کردن لە کۆنەپەرستی و سیاسەتی نیکۆلای یەکەم). گوگول، لەوپەڕی نائومێدیدا بای دایەوە سەر ئایین و، لە حالّەتێکی شێتایەتیدا هەموو نووسخە دەستنووسەکانی گیانە مردووەکانی، جگە لە هەندێ بەشی دووەمین نووسینەوەی بەرگی دووەم، سوتاند. دووبارە و سەرلەنوێ نووسییەوە و جگە لە چەند بەشێکی دیسان سوتاندییەوە، بەرە بەرە نەخۆشییەکەی گرانتر بوو، و ئاقیبەت لە ئەنجامی ریازەتکەری (ریازەتکێشی)دا لە شوباتی ١٨٥٢دا مرد.

<u>شێواز و تەکنیك:</u>

باشترین بەرهەمێن گوگول ئاوێتەیەکی سەیر و عەنتیکەیە لە قولّترین هەستێن هاوسۆزی، ریالیزمی زیندوو، و گالّتە بازییەکی شادی هێنر تەنزی وی تەقریبەن هەمیشە زهنییە، بە گوتەیەکی دیکە، هەدەف و نیشانانی هێرشەکانی وی شتانێکە کە ئەو لە زەینی خۆیدا گەورەی کردوون، رەنگە ئەمە نیشانەی توانای نائاسایی ئەو بێ لەمەدا کە لە سەرێکەوە هاوسۆزی و هاوخەمی لەگەلّ قارەمانانی چیرۆکەکانیدا دەکات، و لە سەرێکی ترەوە پێیان پێدەکەنێ، (بلیمەتی ئەو لەواری بەرجەستەکردنی پەستی و پوچی ژیان، و مایەپوچی ئینسانی ئاسایی دایە).

مکومترین خەسلّەتێن شێوازی گوگول بە بۆچوونی میرسکی، "شکۆ و بتەوی، زمانپاراوی شاعیرانە، ... گالّتەبازییانی غەریب و خەیالّ ئەنگێز... روونی و توانای دەرك و بینینی نائاسایی ئەوە"، هەموو شتێك بە دیدی رۆمانتیك، هەیولا ئاسا یا مەسخ بوو دەبینێ، قارەمانانی رۆمانەکانی، وێڕای واقیعی بوونیان، وەکو داهۆلّ و قەرەقۆزان وێنەگیراون.

گوگول بە یەکەمین رۆماننووسی ریالیستی لە ئەدەبیاتی روسیدا دەزانرێ، لەگەڵ ئەمەشدا، هەمیشە لە سنوورێن ریالیزمی دەردەچێ. بە رواڵەت روسیا وەکو چۆن هەیە وێنە دەگرێ، کەچی لەوێنەگرتنی ئەو شتەی کە عەجیب و غەریبە، یا رۆمانتیکە، یا رەمزییانەیە، رێگەی موبالەغە و زێدەڕۆیی دەگرێتە بەر.

خەیاڵی داهێنەرانەی گوگول موعجیزە ئاسایە، "ئەگەر هێزی داهێنەرانەی پەتی مەحەکی نرخاندن بێ، گوگول گەورەترین نووسەری روسیایە".

گوگول نووسەرێکی رێفۆرمخوازە بەڵام شۆڕشگێڕ نییە. لە دووی هەڵگێڕانەوە و ژێر و ژوور کردنی رژێمی کۆن نەبوو، بەڵکو پێشنیازی مشتوماڵ کردن و پاککردنەوەی دەروونی فەردی دەکرد. بەرهەمەکانی (بەتایبەتی جەنابی موفەتیش و گیانە مردووەکان) هەم هاوعەسرانی ئەوو هەم وەچەکانی دوای ئەو وەکو سکاڵانامەیەك دژی رژێمی دیکتاتۆری و بیروکراتی پێشوازییان لێکردووە.

بەرهەمەکانی:

بەرهەمە سەرەکییەکانی گوگول بریتییە لە: "ئێوارانی، کەناری گوندی دیکانکا (دوو بەرگە، ١٨٣١- ١٨٣٢)، بریتییە لە هەشت کورتە چیرۆك دەربارەی تەبیعەت و خەڵکی نوکراین، میرگورود — ١٨٣٥ کۆمەڵەیەکی دیکەی چوار چیرۆکییە (یەکێکیان چیرۆکی تاراس بولبایە، کە باشترین بەرهەمی گوگولە).

ئارابسك- ١٨٣٥ کۆمەڵێك گوتاری جۆراوجۆر و چیرۆکە ( کەیادداشتەکانی شێتێك یەکێکیانە)، موفەتیش ١٨٣٦، شانۆنامەیەکی کومیدییە، رۆمانی تەواو نەکراوی گیانە مردووەکان- ١٨٤٢، کورتە رۆمانی پاڵتۆ- ١٨٤٢، و کۆمەڵە نامەیەك بە ناوی بژاردەیەکی نامەکاری لەگەڵ دۆستانا- ١٨٤٧).

موفەتیش:

ئەم شانۆنامە کۆمیدییە بە گشتی بە گەورەترین بەرهەمی درامی لە زمانی روسیدا دەزانن. ئەم شانۆنامەیە هێندە پێکەنیناوی و سەرگەرمکەرە کە هەوەڵجار گەییوەتە چاپخانە، پیتچنەکان لە دەمی پیتچنیدا لەبەر پێکەنین نەیان پەرژاوەتە سەر کارەکە، (قارەمانانی شانۆنامەکە دەربڕی گیانی زمانلوسی و ریابازی و ساختەچیاتی سەردەمی خۆ و نموونە و نوێنەری تەواوەتی فەرمانبەرانی بەرتیل خۆری دەوڵەتیی ئەو رۆژگارەن)، شارەوانی گەندەڵ و سەرانی ئیدارەکانی شارەوانی خەبەریان زانیوە کە موفەتیشێك لە سانپترسبۆرگەوە بۆ سەردانی

چاوەنوار نەکراو و کوت و پڕی دایەرەکان کەوتووتـە ڕێ! و چـاوەڕوانن هـەر سـاتێ بگاتـەجێ. موفەتیشی نەناسراو دەگاتە شار! سەرانی دایـەرەکان کـە شـپرزە بـوون، لاوێکـی قومـاربـازی دەستکورت بە موفەتیش دەزانن. ئەمانە بۆ خێر هێنانی وی هێندەی بەرتیل و دیاری دەدەنـێ کە پشتی لە ژێر باریا دەچەمێ، و تەنانەت شـارەوان ئامـادە دەبـێ کیژەکـەی خـۆی بـداتێ. ئەمانە رێك لەو دەمەدا کە هاتنی موفەتیشی راسـتەقینە رادەگەیـەنرێ، پـەی بـە هەڵەکـەی خۆیان دەبەن.

گیانە مردووەکان:

ئەم رۆمانـە بـە شـاکاری ئـەدەبی گوگـول دەژمێـردرێ. وا دیـارە نووسـەر بەتـەما بـووە رۆمانەکەی خۆی وەکو هاوتای کۆمیدیای خوایی دانتی لە سێ بەشدا بنووسێت. بەشـی یەکـەم رەنگدانەوەی نەعلەت، بەشی دووەم پاك بوونەوە، و بەشی سێیەم رزگاری. بـەڵام تـەنیا بەشـی یەکەم و هەندێ بەش لەبەشی دووەم بڵاوبووەوە، قارەمانی چیرۆکەکە، چیچیکوف، نموونەیـەکی بەرجەستەی ئەو خەڵکـە دەغـەڵبـاز و لەخۆرازیبیانەیـە کـە رێگـەی کـورتی دەوڵەمەنـد بـوون دەدۆزنەوە. ئەو (چیچیکوف) "گیانی مردووەکان" (یانی ئـەو زێـرِ خرێیانـەی کـە لـە دوایـین سەرژمێری بە دواوە مردوون، بەڵام هێشتا ناویان لە تۆمارە رەسمـی و دەوڵەتییەکانـدا هەیـە و خاوەنەکانیان ناچار دەبێ سەرانەی هەر یەکێکیان بـدەن) دەکڕێـت، و ئەمانـە لـە بانقێـك دا دەخاتە رەهنەوە، پاشان بەو پارەیەی کە لەم رێگەیەوە بە دەسـتی دێـنێ، کـۆیلانی زینـدوو و مولکێك پێکەوە دەنێ. چیچیکوف سەرکەوتووانە نەخشەکەی دەباتـە پێـشێ، تـا هەنـدێ لـە فرۆشیارەکان (فرۆشیارانی گیانە مردووەکان) ریـسەکەی لـێ دەکەنـەوە بـە خـوری. (دەسـگیر دەکرێ و دەکەوێتە زیندانەوە، بەڵام هەڵدێ و سەرلەنوێ دەست بە ژیان دەکاتەوە، گوگـول لـەم رۆمانەدا خەندەدارترین و تـەنزئامێزترین وێنـان لەمـەڕ ژیـانی روسـیای سـەردەمی تزارەکـان دەگرێت). ناسکی و جوانی ئەم رۆمانە لە وێنەگرتنی هەلومەرجە کۆمـەڵایەتی و ئابوورییەکانی وڵات و هەروەها لە کاراکتەرسازی نموونە و سنفە روسییەکاندایە: دەسـەڵاتداران، کاسـبکاران، بێوەژنان، زۆرداران، رژد و پیسکەکان... هتد.

پالتۆ:

قارەمانی ئەم کورتە رۆمانە، ئاکامی ئاکاکیوڤیچ، فەرمانبەرێکی کەم رووی بە قەناعـەتی دەوڵەتە کە هەموو ژیانی لە نووسینەوەی وشە بە وشەی نووسراوانی دەستنووسیدا دەگـوزەرێ، و لە بەرانبەردا ساڵانە دوو سەد دۆلار دەرامەتی هەیە.

ئاکاکی بە پێویستی دەزانێ کە پاڵتۆیەکی نوێ بکرێ، کە لە مێژە پاشەکەوتی بۆ کردووە. گاڤێ دزان ڕێی پێ دەگرن و پاڵتۆ نازدارەکەی دەدزن، ئاکاکیوڤیچ داوای کۆمەك لە پۆلیس دەکات، بەڵام بەرپرسانی لووتبەرز دەستی پێوە دەنەن.

لە ڕێگەی گەڕانەوەدا بۆ ماڵ، بە هۆی سەرمای توندەوە نەخۆش دەکەوێ و دەمرێ. ڕۆحی لە شوێنێکی شاردا دەوەستێ تا سەرەنجام یەخەی بەرپرسانی لووتبەرز بگرێ و پاڵتۆکەی وەربگرێتەوە، (لەم شانۆنامەیەدا واقیع و خەیاڵ، کۆمیدیا و تراجیدیا، و پێکەنین و گریان وەستایانە ئاوێتەی یەکدی بوونە).

ئیڤان سیرگیوڤیچ تورگینف"١٨" (١٨١٨- ١٨٨٣):

تورگینف لە ئوریل لە دایك بوو. دایکی کەسێکی میراتگر و، بابی سەرهەنگێکی خانەنشین بوو. بنەماڵەکەی لە ساڵی ١٨٢٧دا بۆ مۆسکۆ باریان کرد، ئیڤان لە زانستگەکانی مۆسکۆ، سانپترسبۆرگ، و برلن خوێندی، و لە پایتەختدا بوو بە کارمەندی دەوڵەت (١٨٤٣)، بەڵام دوای دوو ساڵ لە دەزگای دەوڵەتی دوور کەوتەوە تا هەموو کاتی خۆی بۆ ئەدەبیات تەرخان بکات. لەم حاڵ و بارەدا دۆستایەتییەکی قووڵ و ڕاستەقینەی لەگەڵ مەدام ڤیاردوت (پولیت گارسیا)ی دەنگبێژی فەرەنسیدا پەیدا کرد، و لە ساڵی ١٨٤٧دا بە دووی ویدا بۆ هەندەران لەزی. ئیڤان لە ساڵی ١٨٥٠دا کە دایکی مرد بۆ روسیا گەڕایەوە.

لە ماوەی ساڵانی ١٨٤٧- ١٨٥١ (بیرەوەرییەکانی ڕاوچییەك)ی لە بڵاوکراوەی هاوچەرخدا بڵاوبووەوە، و ناوبانگی وەکو نووسەر چەسپی. لە ساڵانی ١٨٥٢وە تا ١٨٥٣، بە هۆی نووسینی وتارێکی ستایش ئەنگێزەوە لەمەڕ مەرگی گوگول، ماوەی هەژدە مانگ لە سانپترسبورگ دوور خرایەوە. لە ساڵی ١٨٥٣ەوە تا ١٨٦١ قەڵەمڕەوی ئەدەبیاتی روسی لە ژێر کاریگەری و ڕکێفی تورگینیفدا بوو. لە ساڵی ١٨٦٢دا شاکاری پڕ دەنگدانەوەی باوکان و کوڕانی بڵاوکردەوە، کە مشتومڕی توندی لە ڕۆژنامەکانی روسیادا نایەوە.

مامەڵەی دوژمنانەی ئازادیخوازان لەگەڵ ئەم کتێبەدا، تۆرگینیف-ی بۆ بیست ساڵی دوایی تەمەنی لە روسیا دوورخستەوە. هەوەڵجار، لە شاری بادن بادن-ی ئەڵمانی، و لە هاوسایەتی مەدام ڤیاردوتدا نیشتەجێ بوو، و پاشان (١٨٧١) بۆ پاریس ڕۆیی، کە هەر لەوێندەریش مرد.

شێواز و تەکنیك:

تورگینف لە چیرۆك و ڕۆمانەکانیدا بە زۆری شەرحی واقیعیانەی (بە مەفهوومی روسی) ژیانی خەڵکی لەگەڵ وەسفی لیریکی تەبیعەتدا ئاوێتە دەکات، جۆری مامەڵەی وی لەگەڵ

قارەمانانی چیرۆکەکانیدا تەقریبەن مەوزوعی و بابەتییە، و بە دەگمەن پەردە لەسەر روحیان لا دەبات. بەڵام بە گوێزانەوەی کرداری قارەمانـانی چـیرۆکەکانی و لـە رێگـەی نیـشاندانی کاریگەری وان بەسەر خەڵکی دیکەوە زیرەکانە و وەستایانە ماهیەت و جەوهەری وان ئاشکرا دەکات. لە خوڵقاندنی قارەمانانی ژنـدا بـەتواناترە تـا لـە ئەفراندنی قارەمانـانی پیـاو، و زۆربەی ئەو پیاوانەی کە بەرجەستەیان دەکات یا خوارتر لە ژنانن یـا وابەسـتەی وانـن. لـە هەوەڵین چیرۆکەکانی دا کۆیلەکان بە خەڵکێکی بتەو و نەگۆڕ و ئاگا بە گەورەیی تایبەتی خۆ دادەنێ، و ئەم کۆیلانە هەمیشە لە بەرانبەر خاوەنـە گـەوج یـا سـتەمکار یـا بودەڵـەکانی خۆیاندا بەرجەستە دەکرێن، تورگینیف لە هەندێ لە دوا بەرهەمەکانیـدا ئومێـد بـە چـینی ناوەڕاست (بۆرژوا) وەکو هێزێکی رزگاری بەخش دەبەستێ. لە چیرۆکە کورتترەکانیدا پەیامی کۆمەڵایەتی عادەتەن لە خودی چیرۆکەکەدا پەنهانە، و نایەتە دەربڕین، لە رۆمانەکاندا ئـەم پەیامە لە رێگەی گفتوگۆیانی دوور و درێژەوە دەربارەی مەسەلەکانی وەخت جەختی لەسـەر دەکرێتەوە، بە زۆری ئەم گفتوگۆیانە ناشیانە و دوور لە شێوەی هونەرمەندانـە و سروشـتی، دەخزێنرێنـە نێـو بـافتی چـیرۆکەکە. تورگینـف لـەڕووی رێبـاز و رەوشـەکانیەوە زۆر لـە دۆستۆفسکی غەریبی ترە.

بەرهەمەکانی:

تورگینف هۆزانان، شانۆنامەیان، چیرۆکانی کورت (یا نۆڤلێتان) و رۆمانانی لە پاش خـۆی بە جێ هێشتووە. زۆربەی شـیعرەکانی لـە مـاوەی سـاڵانی ١٨٤٣- ١٨٤٧دا هۆنراونەتـەوە و گرنگی و بایەخێکی ئەوتۆیان نییە. یەکێك لە دراماکانی (مانگێك لە گونددا- ١٨٥٠)یە کـە شانۆنامەیەکی سایکۆلۆژییە و بەسەرهاتی عاشق بوونی ژنێکی گەنج و ژنێکی بەتەمـەنتر، بـە یەك پیاو وێنە دەگرێ، و درامای (خانمی گوندی- ١٨٥١) کە کۆمێدیایـەکی سـووکەڵەیە، بـە هەر حاڵ شۆرەتی تورگینیف بە چیرۆکە کورت و رۆمانەکانیەوە بەندە.

بیرەوەرییەکانی راوچییەك (١٨٤٧- ١٨٥١):

کۆمەڵە چیرۆك و پلۆتێکە دەربارەی ژیانی گوندیاتی، هەر چیرۆك و پلۆتێکی ئەم کتێبە بـە عەمەلی هەوڵێکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆیلەداری و —لە بانگەشەی ئاشکرا و راستەوخۆ جوانتر و کاریگەرترە، چونکە لە یەکەم نۆڕینەوە وا نایەتە بەر چاو کە بە هیچ جۆرێ پەیوەنـدییان بـە مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە هەبێ، دوو چیرۆکێ ناڤداری ئـەم کتێبـە "دەنگبێـژ" و "چەمەنزاری بژین" یان ناوە.

باوکان و کوڕان (١٨٦٢):

(لەم رۆمانەدا کێشمانەکێشی بێ پایانی نێوان پیران و لاوان، و گۆشەنیگای هەر نەوەیەك شرۆڤە کراوە)، بازاروف-ی قارەمانی رۆمانەکە لاوێکی ناتورالیست و نەهلیستییە، خالی پێچەوانەی باوك و دایك و دۆستانی ئارام و موحافەزەکاری خۆیەتی. باوەڕی بتەوی بە زانستە سروشتییەکان وەکو چارەسەر بۆ هەموو دۆز و مەسەلەکان هەیە. بازارۆف دەبێ بە خەنیم و هەڤرکی ئەشقی ئارکادی برادەری خۆی، و دڵبەندی مەدام ئودینتسوف-ی بێوەژنی گەنج دەبێ، ئارکادی-ش لە جیاتی ئودینتسوف حەز لە خوشکەکەی دەکات، لێ مەدام ئودینتسوف هیچ مەیلێك دەرحەق بە دڵبەندی بازارۆف نانوێنێ، لەم حاڵ و بارەدا، بازارۆف کە مژوڵی توێکاری بەدەنی پیاوێکە کە بە تیفۆس مردووە، بە خۆی تووشی نەخۆشی دەبێ و دەمرێ- دەبێتە قوربانی زانستێك کە بە مایەی رزگاری جنسی بەشەری دەزانی. ئەم رۆمانە یەکەمین دەربڕینی هونەرییە لەمەڕ نیهلیزم.

دوکەڵ- ١٨٦٧:

تورگینیف لەم رۆمانەدا چیرۆکی پیاوێك بە نێوی لیتونیوف دەگێڕێتەوە کە لە نێوان کێشمانەکێشی ئەڤینی ئیرینا-ی خۆویست بەلاّم ترسنۆك و خۆشگوزەران، و تاتیانای کەمتر جوان بەلاّم زۆر نەجیبتر گیری خواردووە. گاڤێ کە ئیرینا لە کنوکۆی تەگبیرێك دایە تا واز لە مێردەکەی بێنێ لیتوینوف (پاش وەستانێکی دوو ساڵە) روو دەکاتە تاتیانا و بە باوەشی گەرمەوە پێشوازی دەکرێ. ناونیشانی کتێبەکە رەمزێکە بۆ بێسەروبەری و ئاشوب و بێهودەیی هەر تشتەك کە ئینسانی، بەتایبەتی روسییە —وەکو لیتونیوف-یش پاش پەیمانشکێنی ئیرینا هەمان ئەنجامگیری هەیە-و وا دیارە دەبێ تورگینیف-یش لە پاریسدا گەییێتە بەرەنجامێکی واهی.

"بەیار- ١٨٧٦":

تورگینیف لەم چیرۆکەدا هەوڵدەدا تەقەلای شۆڕشگێڕانی دەیەی ١٨٧٠ بگێڕێتەوە و لاوازی و بێ توانایی ئایدیالیستان و "رۆشنبیران" لە پراکتیزەکردنی بەرنامەکانیاندا ئاشکرا بکات. نژدانوف-ی قارەمانی چیرۆکەکە، کە لایەنگری ریفۆرمی بنەڕەتییە، دڵبەندی ئەڤینی ماریان، کە ژنێکی شۆڕشگێڕە، دەبێ. ئەم جووتە پێکڤە هەڵدێن و لە ماڵی سولومین-ی بەڕێوەبەری کارخانەیەك کە لایەنگری گۆڕانکاری بەرەبەرەیە، ئاکنجی دەبن. سەرەنجام، گاڤێ کە نژدانوف لەلایەن دام و دەزگای دەوڵەتییەوە دەکەوێتە بەر مەترسی گرتن، تێ دەگات کە هیچ کاتێ

ناتوانێ ئارمانجە ریفۆرمخوازییەکانی پراکتیـزە بکـات و بێنێتـە دی، و ناچـار خـۆی دەکـوژێ. سولومین لەگەڵ ماریاندا رێی هەڵاتن دەگرێتەبەر و پەیوەندی هاوسەری لەگەڵدا دەبەستێ تا لە ریسوایی بخەلەسێ.

رۆمان و چیرۆکانی دی:

لە بەرهەمە گرنگەکانی دیکەی تورگینیف دەشێت ئاماژە بۆ رۆمانـانی رودیـن (١٨٥٦)، لانەی دەولەمەندان (١٨٥٩)، و سێلاوێن بەهاری- (١٨٧٢) بکرێت، دوو نۆڤلێت-یش گۆلاوی ئارام (١٨٥٤)، و یەکەمین ڤیان (١٨٦٠) یان ناوە.

فیودور میخائیلوفیچ دۆستۆفسکی (١٨٢١- ١٨٨١):

دۆستۆفـسکی لـە مۆسـکۆ چـاوی بـە دنیـا هـەڵێناوە. بـابی جەرراح و نەشـتەرگەری خەستەخانەی گەورەی هەمان شار بوو. دۆستۆفسکی خوێندنی سەرەتایی لەلای بابی، دایکی و مامۆستایانی تایبەتی (ماڵان) فێر بوو. ئەو بە خۆیشی کتێبی فرەی دەخوێندەوە -کتێبی موقەدەس، بەرهەمەکانی شیلەر، شەکسپیر، والترسکوت، دیکنز، جورج ساند، هۆگـۆ، پۆشـکین، جوکۆفـسکی"١٩" (١٧٨٣- ١٨٥٢) و زۆری دی. لـە سـاڵی ١٨٣٤دا بـۆ قوتابخانەیەکی شەوانە رۆژی لە شاری زاگەی خۆی نێردرا، و پاشان لـە سـاڵی ١٨٣٧دا، کـە دایکی مرد، چـووە قوتابخانـەی ئەنـدازەیی سـوپایی سـان پترسـبورگ. لـە سـاڵی ١٨٤١دا دەرەجەی ئەندازەیی سوپای وەرگرت، لێ سێ ساڵی دیکە لەوێندەر مایـەوە، سـاڵێك وەکـو خوێندکار و دوو ساڵ وەکو ئەفسەری دایەرەی ئەندازیاری. لە ساڵی ١٨٤٤دا بابی بە دەستی زێرخرییەکانی خۆی کوژرا، و دۆستۆفسکی وازی لە خزمەتی سوپا هێنا تـا هـەموو وەختـی خۆی وەقفی ئەدەبیات بکات. یەکەمین چیرۆکی بـە نـاوی هـەژاران (١٨٤٦)، رەخنـەگرانی بەلای خۆیدا راکێشا و بووە مایەی ستایشیان، بەڵام بەرهەمـەکانی دواتـری سـەرکەوتنێکی ئەوتۆیان بە دەست نەهێنا، دۆستۆفسکی لە ساڵی ١٨٤٩دا لەگـەڵ چـەند پیـاوێکی گـەنجی دیکـەدا بـە تـاوانی ئەنجامـدانی کۆبوونـەوەی نهـێنی بـە مەبەسـتی باسکردنی ریفـۆرم و سوسیالیزم دەستگیر کرا، و حوکمی ئیعدام درا.

دۆستۆفسکی لەگەڵ مەحکومەکانی دیکەدا لە بەردەم جۆقەی تیرەندازاندا راگـیرا، لـێ بـە فەرمانی تزار سزایەکەی وی بۆ چوار ساڵ حەپس لەگەڵ کاری قورسا لە سیبریا و خزمەتی هەتا هەتایی لە سوپادا کەم کرایەوە. دۆستۆفسکی مـاوەی چـوار سـاڵی لـە ئۆردوگـادا بـە کـاری قورسەوە لە سیبریا بردە سەر، و پاشان شەش دانە ساڵ لە یەك فەوجی سوپاییدا خزمەتی کرد.

لە ساڵی ١٨٥٧دا لەگەڵ بێوەژنێکدا بە ناوی ماریا ئیسایڤا زەماوەندی کرد. لە ساڵی ١٨٥٩دا ڕێگەدرا بۆ سان پترسبۆرگ بگەڕێتەوە. چەند ساڵێکی لەم شارەدا بە بڵاوکردنەوەی بلاڤۆکان و چیرۆکنووسی قەتاند. لە ساڵی ١٨٦٤دا هاوسەرەکەی و براکەی مردن، دووەمین گۆڤاری وی بە ناوی سەردەم ڕووبەڕووی ئاستەنگی دارایی بووەوە. دۆستۆفسکی ئیفلاسی کرد، ئەوجاش دەبوایە بژێوی ماڵباتی براکەیشی دابین بکات. ناچار، لە ساڵی ١٨٦٦ مافی دانانی هەموو بەرهەمەکانی بە بڕی ١٥٠٠ هەزار و پێنج سەد دۆلار فرۆشت، ساڵی دواتر وەزع و حاڵی دارایی باشتر بوو. لەگەڵ کیژێکی لە زنووسدا بەناوی ئانا گریگوریڤنا، زەماوەندی کرد کە لەوەدوا بوو بە یارمەتی دەری شایستە و وەفاداری. دۆستۆفسکی لە ساڵی ١٨٦٢دا جارێك و لە ساڵی ١٨٦٧دا بۆ جاری دووەم سەفەری ئەورووپای ڕۆژئاوای کرد، سەفەری دووەم کە ماوەی چوار ساڵی خایاند، پتر بۆ هەڵاتن لە دەستی خاوەن قەرزان بوو. تا ساڵی ١٨٧١ هەندێ لە قەرزەکانی دایەوە و بۆ ڕوسیا گەڕایەوە. دە ساڵی کۆتایی تەمەنی ئەگەر لێهاتن و دەستکورتی لێ دەربکەی، کە لە هەموو تەمەنیا هەر گیرۆدەی بوو. تاڕادەیەك بە خۆشی و کامەرانی بوری.

بەرهەمەکانی:

بەرهەمەکانی دۆستۆفسکی دەکرێن بە سێ قۆناغەوە. نووسینەکانی قۆناغی یەکەمی (١٨٤٦- ١٨٤٩) بە باشی کاریگەریی گوگول نیشان دەدەن. دۆستۆفسکی، وەکو گوگول، لە ئاوێتە کردنی هەستی هاوسۆزی و هاوخەمی دەگەڵ ناتورالیزمدا بە توانایە، لێ هەستی کۆمیدیانە و گاڵتەبازی گوگولی نییە.

هەژاران (١٨٤٦) ڕەنگدانەوەی هاودەردی و هاوخەمی قوولی وییە دەرهەق بە مرۆڤانی ستەمدیدەی، تەقریبەن خاڵی بووە لە ئینسانییەت، پێکەنیناوی، بەڵام هێشتا ئادەمیزاد و نەجیب. ئەم ڕۆمانە کورتە، چیرۆکی ڤیانی کاتبێکی دەستکورت بە ناوی ماکاردیوڤشکین دەرهەق بە باربارادو بروسیلوڤا، کیژۆڵەی خەیاتێکی هەژار دەگێڕێتەوە. ئەم دڵدارییە هەرچەندە دوو لایەنە، بەڵام کەمی دەرامەتی ماکار کیژە سەبارەت بە ژیانێکی ئاسوودە لە ئایندەدا نائومێد دەکات و مل بۆ زەماوەند لەگەڵ بویکوف-ی دەوڵەمەنددا دەدات.

چیرۆکی هاوزاد (جن) (١٨٤٦) چیرۆکی خەمناکی فەرمانبەرێکە کە لە ئاکامی ئەم خۆرەزەینییەوە کە فەرمانبەرێکی دیکە "هەویەت و ناسنامەی وی غەسب کردووە" تووشی شێتی دەبێ. ئاغای پروخارچین (١٨٤٧)، چیرۆکی پیاوێکی پیسکەیە کە سەروەت و

سامانێکی پێکەوە ناوە بەڵام تەمەنی خۆی لە رۆژەڕەشیدا بەسەر بردووە. ژنی میوانخانەدار (١٨٤٨) و نیتوچکا نزڤانوڤا (١٨٤٩) دوو چیرۆکی دیکەی ئەم قۆناغەن.

رۆمانانی قۆناغی ناوەڕاست (١٨٥٧- ١٨٦٣)ی دۆستۆفسکی وەکو بەرهەمەکانی قۆناغی یەکەمیەتی، لێ کاریگەری گوگول زۆر کەمتر بووە. لە چیرۆکە سەرەکییەکانی قۆناغی ناوەڕاستی وی: مسولکی ستیپانچیکوف و دانیشتووانی (١٨٤٩) ئەوە دەگێڕێتەوە چۆن بنیادەمێکی مشەخۆر بە نێوی فوما ئوپیسکن هەڕەشە لە خانەوادەی خانەخوێیەکەی دەکات و بە سووکیان دەژمێرێ.

سووکایەتی پێکراوان و ئازار دراوان (١٨٦١) کە کاریگەری دیکنز دەنوێنێ رۆمانێکی کەمبایەخە دەربارەی لاوێکی گێل کە لە یەك کاتدا حەز لە دوو کیژ دەکات. بیرەوەری ماڵی مردووان (١٨٦١- ١٨٦٢)، لەسەر بناغەی ئەزموونی نووسەر لە زیندانی سیبری هاتۆتە نووسین و سەربوری غەمنەنگێزی حوکمدراوان بە شێوەیەکی دلگیر دەگێڕێتەوە. (بە وردی تەبیعەتی زیندانییان تاوتوێ دەکات).

رۆمانەکانی دوا قۆناغی (١٨٦٣- ١٨٨١) دۆستۆفسکی لەلایەنی سایکۆلۆژی و لە ئاستی عاتیفییەوە لە رۆمانەکانی پێشووتری ئەو قوڵتر و بەهێزترن. لەڕاستیدا، بەرهەمێن گەورەی دۆستۆفسکی زیاتر لە ساڵانی دوایی تەمەنیداو لە پاش ساڵی ١٨٦٣ەوە دێنە ئەفراندن، لە ناو بەرهەمەکانی دوا قۆناغیدا، رۆمانی بیرەوەرییانی ژێرزەمینی (١٨٦٤)، ریزپەڕە، و یەکێکە لە لاوازترین چیرۆکەکانی. ئەم رۆمانە باسی رووبەڕووبوونەوەی بابایەکی "روسی سست رەچەڵەك" لەگەڵ تاوانباران دا دەکات، بە هەر حاڵ ئەم رۆمانە بەڵگەنامەیەکی بەهادارە، و کەم و زۆر رەنگدانەوەی ژیانی خودی دۆستۆفسکییە، قومارباز (١٨٦٦) شیکردنەوە و شرۆڤەی تاسەمەندی شێتانەی خودی دۆستۆفسکییە بۆ قومار، و رەخنەیە لەو تاو تامەزرۆیەی قومار، کە ئەو لە ماوەی ئاکنجی بوونیا لە ئەورووپای رۆژئاوایی پێوەی موفتەلا بووە.

<u>تاوان و سزا (١٨٦٦):</u>

ئەم رۆمانە، وێڕای دوور و درێژیی و ناسازی زۆر، یەکێکە لە رۆمانە هەرە بەهێزەکانی دۆستۆفسکی، (لە وەسفی قارەمانانی چیرۆکەکە و توژێنەوەی هەست و هزریاندا ئەوپەڕی شکۆ و گەورەیی هونەری بەدەست هێناوە. رۆمانەکە بە دەوری ئەم هزرەدا دەسوڕێتەوە کە تاوان خەتا نییە بەڵکو بەدبەختییە).

راسکولنیکوف-ی قارەمانی چیرۆکەکە، خوێندکارێکی دەستکورتە کە هەق بە خۆی دەدات ژنێکی پیری سووخۆر لەبەر پارەکەی بکوژێت، بۆ رێگرتن لە کەشفبوون و ئاشکرابوونی مەسەلەکە، ناچاری قەتڵێکی دیکە دەبێ. لێ دووچاری عەزابێکی ترسناکی ویژدان دەبێ، و لەم حاڵ و بارەدا دڵبەندی ڤیانی پاکی سونیا، کیژێکە کە بۆ رزگاری خانەوادەکەی لە برسییەتی کەوتۆتە لەشفرۆشی، دەبێ. (راسکولنیکوف کە لە میهرەبانی و دڵسۆزی کیژە دڵنیا دەبێ، ئیعتراف بە تاوانەکانی خۆی دەکات). گاڤێ بە حەوت ساڵ زیندانی لە سیبریا، حوکم دەدرێ، سونیا لەگەڵیا بۆ سیبریا دەچێ، و ئەو جووتە بە تاسەوە چاوەنۆڕی گەڕانەوە بۆ روسیا و دەست پێکردنی ژیانێکی تازە دەکەن.

گێلە ١٨٦٩:

چیرۆکێکە دەربارەی شازادە میشکین، کە لە راستیدا هەرگیز گێل نییە، لێ دۆستەکانی بەهۆی نەجابەت، فیداکاری و دڵسۆزی و میهرەبانی مناڵانەیەوە بە گێلی دەزانن.

ئاگیلا-ی کیژی جەنەڕاڵێك و، ناشتازیا-ی کۆنە ماشوقەی بازرگانێکی دەوڵەمەند هەردووکیان ئاشقی میشکین دەبن.

میشکین لەڕووی بەزەییەوە ناستازیا هەڵدەبژێرێ، بەڵام ئەم ژنە ناچێتە ژێر باری فیداکاری ئەو و شوو بە رۆگۆژین دەکات. رۆگۆژین کە دەزانێ ناستازیا هێشتا شازادەی خۆشدەوێ، دەیکوژێت و بۆ سیبریا نەفی دەکرێت. ئاگیلا شوو بە پیاوێکی تاوانبار دەکات، و پیاوە پاش ماوەیەك بەرەڵڵای دەکات. میشکین، کە پێشتر تووشی فێداری بووە، بە حاڵی بێ حاڵی و دەروونی پەشێوەوە بۆ وڵاتی سویسرا دەڕوات.

دەست لێوەشاوان ١٨٧١:

دۆستۆفسکی لەم رۆمانەدا وێنەی پرشنگداری لەمەڕ قارەمانانی سەرەکی کتێبەکە گرتسووە: ستاگروڤین، "قارەمانێکە" نە هیچی هەیە و نە ویژدان، کیریلوف [٢٠]، خوانەناسێکی شێتە کە لە رێگەی ئامانجەکانی شۆڕشدا ژیانی خۆی فیدا دەکات، و ڤیرخۆڤینسکی، پیلانگێڕ، زمانلووس، مولحید و پیاوکوژە. ستاگروڤین دار و دەستە نەهلیستەکەی خۆی بەرەو تاوانانی زۆر، لەوانە قەتڵ و ئاگربەردان دەبات، کیریلوف گوناهی یەکێك لە پیاوکوژییەکان بە خۆیەوە دەبەستێ و لە پێناوی ئارمانجەکانی شۆڕشدا خۆی دەکوژێ، ڤیرخوڤینسکی لە وڵات هەڵدێ و ستاگروڤین، کە دەزانێ لە ژیاندا شکستی هێناوە، خۆی دەکوژێت.

براياني كارامازوف (١٨٧٩- ١٨٨٠):

باشترين رۆمانی دۆستوفسكييە (و لە ريزی شاكاری بێ چەند و چوونی ئەدەبياتی روسييە. دۆستۆفسكی لەم كتێبەدا بەدبەختی، ناكامی، دزێوی، پەستی و سووكييەكانی، بەتايبەتی نەخۆشييە روحييەكانی بنيادەمانی بە بالاّ دەستييەكی عەنتيكەوە شرۆڤە كردووە و پەردەی لەسەر شاراوەترين ديمەن و روالّەت و دياردەكانی روحی مرۆڤانی لابردووە. ئەمە جگە لەوەی كە زانيارييەكی بەهاداری لەمەڕ ژيانی ئەخلاقی، كەلتووری و كۆمەلاّيەتی روسيای ئەو رۆژگارە پيشان داوە. ئەو لەم رۆمانەدا هەولّيداوە باوەڕی خۆی دەربڕێ كە گەندەلّی ئەخلاقی دەرمان و چارەيەكيشی هەيە و ئەويش ملدانە بۆ سزا).

چيرۆكەكە بە دەوری تەوەری ژيانی فيودوركارامازوف، سێ كوڕەكەی، ديميتری، ئيڤان و ئاليوشا و كوڕە ناشەرعييەكەيدا سمردياكوف دەسوڕێتەوە... فيودور پياوێكی ستەمكار، زبر و رەق، شەهوەتباز و خۆپەرستە، كە سەروەت و سامانی هاوسەرە مردووەكەی لە پێناوی بادە و ژندا بە باداوە، ديميتری، وەكو بابی توند و پڕ جۆشە، بەلاّم بەپێچەوانەی ئەوەوە خۆشەويستە (دەچێتە دلّەوە). ئيڤان بە گومان و هۆشيارە ئاليوشا كەشيش رەفتار و دروستكار و وەكو منالاّن نەرم و بێگەردە. سمردياكوف كەسێكی گێل و جينگن و شەڕاشو و پەركەمدارە. ديميتری لەسەر ژن و پارە لەگەلّ بابيدا تێدەگيرێ و هەڕەشەی كوشتنی لێدەكات. لەم حالّ و بارەدا سمردياكوف پيرەمێردە دەكوژێ، لێ تاوانەكەی بەملی ديميتری دا دێت، كە حوكم دەدرێ و بۆ سيبريا دوور دەخرێتەوە. ئيڤان، برای دووەم، كە هەست دەكات بە فەلسەفە نائوميّدانەكەی سمردياكوفی نائاگايانە بۆ كوشتنی بابيان هانداوە، لە فرە پەشيمانی دا تووشی شێتی دەبێ، سمردياكوف-يش خۆی بە دارا هەلّدەواسێ.

رەخنە:

خەتاكانی دۆستۆفسكی كەم و زۆر روون و ئاشكران. بەلای گەلەك لە خوێنەرانەوە، رۆمانەكانی لە رادەبەدەر نەخۆشانە، سەرڕێژ لە ئازار، رەنج، تاوانكاری، شێتی و كاری نائاسايی و پێچەوانەی داب و نەريت. نيكولاّی ميخايلوسكی ديارترين تايبەتمەندی رۆمانەكانی دۆستوفسكی بە دلّڕەقی و شەقاوەت دەزانێ. ناڕەوانييەكی فرە لە شێوازی ويدا بە دی دەكرێ، "عەيبی گشتی و فرەلايەنی وی زۆرويژی بێ پايان و دابڕان و ناڕەوانی و ناتەباييە". رۆمانەكانی پڕن لە بويەرانی تەواو نەگونجاوو ناپەيوەست و، تەقريبەن بێ فۆرم و شێوەن.

ئیجابییەتەکانی رۆمانەکانی دۆستۆفسکی، عەیبەکانیان لە چاو دەشارێتەوە. هاوخەمی دڵسۆزانە لەگەڵ رەنجاوان و چەوساواندا، هزرێن قوڵ، خۆشەویستی دەرهەق بە هەموو زیندووان، دڵبەندی راستەقینە بە ئایین، بە تەنگەوە هاتنی ئازادی مرۆڤ و سەلماندن و پاکانە بۆ خوا و نەزمی جیهانی، بەخشین دۆستی پتر لە مەحکوم کردن- هەموو ئەم لایەنە باشانە رۆمانەکانی ئەویان خستووەتە ریزی قەواڵە گەورەکانی مرۆڤایەتی و مەسیحییەتەوە. لەوەیە تا ئێستا هیچ مرۆڤێك بە دڵێکی گەورە یان گەرمی وەکو دۆستۆفسکی لە دایك نەبووبێ. لە (رووی کارامەیی لەشیکردنەوەی دەروونی و روحی قارەمانانی چیرۆك، دەروونبینی قول، گفتوگۆی زیندوو و جوان، قووڵبوونەوەی فراوان لە سروشتی مرۆڤانی و ئەنگێزەکان، و بەهرە و توانای دیاریکردنی ئەخۆشی سەردەم) کەوتۆتە پێشی گەلێك لە رۆماننووسەکانەوە. لە ناو هەموو مامۆستایانی چیرۆکنووسی روسیا و جیهاندا، دۆستوفسکی، پڕ بە مانای واقیعی وشە، روحانی ترینیانە.

لیف نیکولایوفیچ تولستۆی (١٨٢٨- ١٩١٠):

تۆلستۆی لە گوندی یاسنا یا پولیانا (لە باشووری شاری تولا) لە مولکە خانەوادەییەکەی خۆیاندا لە دایك بووە، بابی کۆنت بوو، و دایکی شازادەخانم.

تۆلستۆی دوو ساڵە بوو کە دایکی مرد، و دوای حەوت ساڵی دی بابیشی لە دنیا دەرچوو. لە ساڵی ١٨٤٣دا چووە زانستگەی غازان، و زمانانی رۆژهەڵاتی و مافی خوێند، لە ساڵی ١٨٤٧دا بە نیوە چڵی زانستگەی بەجێهێشت، و کەوتە بەڕێوەبردنی مولکە زۆر و بەرینەکەی خۆی لە سامارا. لێ پاش چوار ساڵان، هیلاك و نائومێد، چوو بۆ قەفقاز، بۆ لای برایەکەی، داخڵی سوپا بوو. چەند ساڵێك، بە شێوەی باوی سەربازانی ئەو زەمانە، کەوتە رابواردن، بادەنۆشی، و قومار. لە چەند شەڕێکی سنووریدا بەشداریی کرد، و لە بەرەڤانی لە سیڤاستو پول (١٨٥٤- ١٨٥٥) لە جەنگی کریمەدا بەشدار بوو. و لەو بەینەدا بەرهەمی (منداڵیتی- ١٨٥٢)، کە کتێبێکی ژیاننامە ئاسایە، نووسی کە لە گۆڤاری سەردەمدا بڵاوی کردەوە و تاڕادەیەك بووە مایەی نێوبانگی. تۆلستۆی لە ماوەی ساڵانی ١٨٥٧- ١٨٦١دا سێ جار سەفەری ئەورووپای رۆژئاوایی- ئەڵمان، ئینگلیستان، ئیتاڵیا و سویسرای کرد تا شێوەکانی پەروەردە و فێر کردن بخاتە بەر موتالا و توێژینەوە، و لە گەڕانەوەیدا بۆ سەر مولکەکەی قوتابخانەیەکی بۆ منداڵانی دێهاتی دامەزراند. لە ساڵی ١٨٦٢ لەگەڵ سوفیا ئاندریونا بیرسدا زەماوەندی کرد. هاوسەر و دایك و یاوەرێکی نموونە بوو بۆ تۆلستۆی. سیانزە منداڵی بوو، و

جگە لە ماڵداری و ماڵ بەڕێوەبردن، یارمەتی تۆلستۆی لە داهێنانی بەرهەمەکانیا دەدا (بە جۆرێ کە حەوت جاران دەستنووسی کتێبی جەنگ و ئاشتیی بە دەست نووسیوەتەوە).
تۆلستۆی تەقریبەن بەبێ وەستان درێژەی بە نووسین دەدا. لە ساڵی ١٨٧٩دا گۆڕانێکی مەعنەویێ بەسەرداهات، لە کلێسای ئەرتەدۆکسی روسی دوور کەوتەوە و مەحکومی کرد و "مەسیحییەتی بەدەر لە مەرامەکانی کلێسا"ی هەڵبژارد. واتە هەموو جەزمیات و دەستوورە پەرستکارییەکانی تەرك کرد و کەوتە لایەنگری لە پرەنسیپە ئەخلاقی و سەرمەشقەکانی مەسیح. هونەر و ئەدەبیاتی کفرئامێز و دنیایی رەفز دەکرد (و هەوڵیدەدا ئایینێك لەسەر بنەمای ئەڤینی مەسیحی و پرەنسیپی بەرەنگار نەبوونەوەی شەڕ و خراپە "تۆلستویزم" بێنێتە ئاراوە) تۆلستۆی لە ناو مولکەکەی خۆیدا و لە پاڵ جووتیاراندا کەوتەکار و فەزیلەت و پرەنسیپە سادەکانی مەسیحییەتی کرد بە سەرمەشقی خۆی تا مەرامە ئەخلاقییەکانی خۆی پراکتیزە بکات و بەدی بێنێ. بەمجۆرە مورپدانێکی زۆر دڵیاندایە ئامۆژگارییەکانی وی و تولستویزمیان هەڵبژارد، لە ئەنجامدا، لە ساڵی ١٩٠١دا کلێسا تۆلستۆی تەکفیر کرد، و ئەو هەر درێژەی بە نووسینی وتارە جەدەلی و پەیامەکانی خۆی لەمەڕ خوداناسی و ئەخلاقپەروەری دا. چەند ساڵێکی کۆتایی تەمەنی تۆلستۆی لە ئەنجامی ناکۆکی و نامۆیی هاوسەرەکەی لەگەڵ تولستویزمدا بەناخۆشی و تاڵی بەسەر چوو. پیرەمێرد بە جۆرێ تەنگەتاو بوو کە لە هەشتا و دوو ساڵیدا لە نیوە شەوێکی سارددا بێ پرس لە ماڵ وەدەرکەوت و بە قیتار بەرەو باشوور چوو تا باقی تەمەنی لە کونجێك دا بەسەر بەرێ. لە کاتی سەفەرەکەیدا برك و سینەپاڵۆی گرت. ناچار لە وێستگەی ئاستاپۆڤۆ دایانگرت، و دوای دە رۆژ هەر لەوێندەر کۆچی دوایی کرد.

بیرەکانی:

تۆلستۆی هەمیشە ویژدانێکی فرە زیندوو چالاکی هەبوو. تەنانەت وا دێتە بەرچاو کە خۆشگوزەرانی و رابواردنی سەردەمی لاوی ئەو زادەی ماندووبوون و پەیجۆری شەیدایانە بەڵام بێهودەی ئەو بووە بۆ پەی بردن بە چەمك و مانای ژیان. پاش جەنگی کریمە، پەروەردە و فێرکردنی جووتیاران بوو بە خەمی بەرودوای تۆلستۆی و کەوتە کار کردن بۆ وەدیهێنانی ئەو خولیایە. وەکو ئەشرافێکی دەوڵەمەند هەمیشە هەستی "ئەرکی ئەشراف)ی لەلابوو، و وەکو موریدێکی رۆسۆ باوەڕی بتەوی بە چاکی مرۆڤی ئاسایی، بەتایبەتی وەرزێری دێهاتی هەبوو. دژی پوچەڵی و ریابازی شارستانییەتی تازە، بوو. مەدەنییەتی رۆژئاوا بە گشتی، و لایەنی ماددەگەراییەکەی بەتایبەتی، بە دزێو و ناشیرین دەژمارد. لە کاملیدا، "ئەقڵ"ی لەگەڵ

خوا و زانستدا بەیەك شت دەزانی، بەڵام ئەو ئەقڵەی ئەو باسی دەکرد زیاتر لە دڵەوە هەڵدەقوڵا تا لە مێشکەوە".

لە روانگەی ئەوەوە ئاوەز تەقریبەن هاوسەنگ و هاوواتای ویژدان بوو. وەکو فیلپس ئاماژە دەکات، هزر و بیرەکانی تولستۆی لە ئاخر و ئۆخری تەمەنیدا ئەو پوختەییەی نییە کە بیر و باوەڕەکانی سەرەتای هەیانبووە، بە پێی ئامۆژگارییەکانی تۆلستویزم جگە لە قانوونی ئەخلاقی ناخ و ناوەوەی ئینسان چ خودایەك بوونی نییە، و ئەم قانونە ئەخلاقییە لە جیاتی لە ئەنگێزە و هۆکارە دەرەکییەکانەوە هەڵبقوڵێ، لە خۆڕسکی دەروونییەوە هەڵدەقوڵێ. ژیانی دەروونی بنەمای جیهانە. ئارمانج و مەبەستی حەرەکەت و بزاڤی دەروونی ئاسوودەیی روحی (شادی)یە.

<u>شێواز و تەکنیك:</u>

رۆمان و چیرۆکەکانی (و هەروەها ژیان)ی تۆلستۆی لە گەلەك لایەنەوە لە بەرهەمەکانی دۆستۆفسکی جودان. تولستۆی بەرهەمەکانی بە وردی و دیقەتێکی فرەوە نووسیوە و، ئەزیەتی بەرەچاوکردنی خاڵە دەستوورییەکانەوە کێشاوە. تۆنێکی تواناداراانەی هەیە، زیاتر پێی باشە دەربارەی ئەشراف و جووتیاران بنووسێت تا دەربارەی چینی بۆرژوازی بێ رەگ و ریشە، و قارەمانانی چیرۆکەکانی عادەتەن خەڵکانی ئاسایی و سادەن. "شێوازی وی زۆر دوور و درێژ و تاقەتبەرە —لە هەر جۆرە جەوهەرو کرۆکێکی شیعری یان هونەر و سنعەتێکی ئەدەبی بەدەرە- پەخشانێکی لەڕادەبەدەر سادە و بێ زۆر لەخۆ کردن... و پەیڤی عامیانەی ناوازەی تێکەڵ بە بونیادێکی رێزمانی ئاڵۆز کردووە و هەر ئەمەش ئەو تاکەمەندییە سەیرەی زمانی تۆلستۆی دێنێتە ئارا".

شێوازی تۆلستۆی بریتییە لە هەڵدانەوە و پشکنینی روحی ئینسانی و توێکاری پەرەسەندنی جیهانە سایکۆلۆژییەکان.

"لەبەر ئەمە ئەو پاژانەی کە باسیان دەکات رووداوی ئاڵۆزی کەلتووری و مەدەنی نین، بەڵکو، دەڵێی کۆمەڵە گەردیلەیەکن کە خورد دەبنەوە، گەردیلەی نەبینراو، کە راستەوخۆ لە ئیدراکی حسییەوە هەوێن و بەرجەستە دەبن". بەڵام تۆلستۆی زۆر خەریکی ئەم پاژکاری و وردەکارییانە دەبێ، و هەر یەکێك لەم وردەکارییانەش زادەی دیتن و باری سەرنج و دیدی مرۆڤانی خۆیەتی، بۆیە واقیعیەتی قارەمان یان شتی وەسفکراو زۆر بە جوانی و دڵگری خوێنەر رادەکێشێت. لە حاڵێکا کە تورگینیف بیروونگەرایە، تۆلستۆی دەروونگەرایە و خوێنەر پێ بە پێی گۆڕانە سۆزداری و روحییەکانی ژنان و پیاوانی ناو چیرۆکەکانی دەباتە پێشێ.

بەرهەمەکانی:

تۆلستۆی نووسەرێکی پڕ بەرهەم بوو. چاپی بەرهەمەکانی بە ئینگلیزی بە بۆنەی یەکەم سەد ساڵەی لە دایکبوونییەوە (١٩٢٩- ١٩٣٧) دەگاتە بیست و یەك بەرگ. ئەم بەرهەمانە بەسەر سێ قۆناغی دیاردا دابەش دەبن: یەکەم، لە ساڵی ١٨٥٢- ١٨٦٢ (ساڵی ژنهێنانی)، دووەم: لە ساڵی ١٨٦٢- ١٨٧٩ (ساڵی نوێ دینی ئەو)، و سێیەم: لە ساڵی ١٨٧٩- ١٩١٠. تۆلستۆی لە ساڵی ١٨٩٩ بە دواوە ئیدی بەرهەمێن گرینگی ئەوتۆی نەنووسی.

قۆناغی یەکەم:

"منداڵی، نۆلاوی، لاوی" (١٨٥٢- ١٨٥٦):

یەکەمین بەرهەمی تۆلستۆی، و ژیاننامەیەکی سێ بەشی خۆیەتی. بە شێوەیەکی گشتی بەرهەمێکی سایکولۆژییە، کە لە دوو بەشی دواییدا بەرەبەرە شێوازی شیکارییانەی بەرهەمەکانی دواتری نووسەر دەردەکەوێ.

سیڤاستوپول (١٨٥٥):

بریتییە لە سێ چیرۆك سیڤاستوپول لە دیسامبەردا، سیڤاستوپول لە مایسدا، سیڤاستوپول لە ئابدا، کە لەبەر رۆشنایی جەنگی کریمە هاتۆتە نووسین. تۆلستۆی لەم چیرۆکانەدا مەینەتییە گیانپروکێنەکانی مەیدانی جەنگ نیشان دەدات و مەدەنییەت وەکو فاکتەری شەڕ مەحکوم دەکات. ئەو رەشیدی و بوێری سەربازانی سادە و پاك لە هی ئەفسەرانی گەورە بە زیاتر دەزانێ، و نەك هەر پیاوانی گیان فیدای روسی، بەڵکو دوژمنیش ستایش دەکات.

قۆزاقان (١٨٦٢):

چیرۆکێکی فەلسەفییە کە ژیانی سادەی قوزاقان لە باوەشی سروشتدا بەرەوانی وێنە دەگرێت. قارەمانی چیرۆکەکە ئولنین-ی ناوە، گیرۆدەی هەمان پەریشانی و کێشمانەکێشە دەروونییەکانی خودی تولستۆیە. ئەو کە لە لاوانی مۆدپەروەری مۆسکۆییە، لە ژیانی گەندەڵی شار بێزار و بێتاقەت بووە و لە ژیانی سادەی قوزاقاندا بۆ چەمك و مانای ژیان دەگەڕێ. ئولنین بەندیواری ڤیانی ماریانا-ی کیژە قۆزاقی دەبێ. ماریانا کە حەز لیکردەی لاوێکی ولاتی خۆشیەتی، دەکەوێتە سەر دووریانێك. سەرەنجام لاوە قۆزاقەکە بریندار دەبێ و ماریانا دەچێ پەرستاریی دەکات. ئولنین دەزانێ کە ئەم ئەشقە بێ سوودە، بەکەسەر و نامرادییەوە بۆ مۆسکۆ دەگەڕێتەوە.

قۆناغی دووەم:
جەنگ و ئاشتی (١٨٦٥- ١٨٦٩):

"داستانی نەتەوەیی روسیایە"، رۆمانێکی چوار بەرگی جوان و مەزنی لیریکی سەرسامکەرە لە مەڕ ژیانی روسان لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا.

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم رۆمانە، هەم دەبێ تیۆری و بۆچوونی تۆلستۆی دەربارەی مێژوو بزانرێ و بدۆزرێتەوە و هەم پەی بە ئەنگێزە و نیازی وی لە داهێنانی ئەم شاکارەدا ببرێ. رۆژانە نووسینەکانی وی لە سالآنی ١٨٤٠و هەندێ لە گوتەکانی وی لە سالآنی ١٨٦٠دا ئەوە نیشان دەدەن کە لە روانگە و روانینی تۆلستۆییەوە مێژوو زانستێکی نمرە دووە- کە شیکردنەوەی دەشێت ئەنجامی فەلسەفی یا ئەخلاقی لێ بکەوێتەوە. لە راستیدا، تۆلستۆی نکولی لە بوونی شتێك بە نێوی "فەلسەفەی مێژوو" دەکات، و بە "مانای" واقیعی بۆ مێژوو قاییل نییە، تیۆری و نۆڕینی ئەو دەربارەی مێژوو، وەکو چون لە بەشی دووەمی کۆتایی قسەی جەنگ و ئاشتیدا دەربڕاوە، تەقریبەن جەبرییە: ویستی مرۆڤ و تێکۆشینی مرۆڤ تەقریبەن هیچ جۆرە کاریگەرییەکی بەسەر مێژووەوە نییە، و ئەم کارە دەربارەی ویست و کۆششی بەناو مێژووسازان —فەرماندانی مەزن، ئیمپراتۆران، و کەسانی هاوتای ئەوان- دروست دەردەچێ. مێژوو ئاوێتەیەکە لە هێزێن تەواو ماددی و عونسری و (تەنی سادەی لە دابەشبوون نەهاتگ) ویستی خوایی، رێکەوت بایەخی زۆری تیادا هەیە، لە روانگەی تۆلستۆییەوە "دوو واقیعیەتی راستەقینە" بریتییە لە ژیانی روحی و ژیانی رۆژانەی مرۆڤان و پەرەسەندنی دەورییان لە رێگەی لە دایك بوون، ژیان، زایاندنی هاوشێوە و مردن-ەوە.

تۆلستۆی بەم جۆرە روانینەوە بۆ مێژوو و بویەرەکانی ژیان، بە سوود وەرگرتن لە زەمینەیەکی وەکو رووداوە مێژووییەکانی سەردەمی ناپلیۆن، بە مەبەستی داهێنانی رۆمانێکی "خانەوادەیی"، دەست بە نووسینی جەنگ و ئاشتی دەکات. مامەڵەی وی لەگەڵ جەنگدا وەکو شێوەی ویلیام تاکرییە لە رۆمانی (یاوە بازاڕ)دا. لەگەڵ پێشڤەچوون و پەرەسەندنی چیرۆکەکەدا، بایەخی جەنگ کەم دەبێتەوە، و تۆلستۆی تێدەکۆشێت تا بابەتی "جەنگ" لەگەڵ "ئاشتی"دا ئاوێتە بکات، و سوود لە تیۆرییەکانی خۆی دەربارەی رووداوانی مێژوویی بۆ پێکڤە گرێدانی ئەم دوو بابەتە وەربگرێ. چیرۆکی جەنگ و ئاشتی بە دەوری تەوەری چوار خانەوادەدا، ڤولکونسکی، روستوف، کوراگین و بیزوخۆف، دەسووڕێتەوە. تولستۆی لە

هەوەڵەوە حاڵ و ئەحواڵی یەك خانـەوادە دەگێڕێتـەوە و پاشـان دەچێتە سـۆراخی خانـەوادەی دوایی، و وەستایانە ئەم چوار خانەوادەیە هاوپەیوەست لەگەڵ یەکدیدا وێنەدەگرێ.

چیرۆکەکە:

پییربزوخۆف، کە لە چاو قارەمانانی دیکەی رۆمانەکـەوە، قارەمـانی سـەرەکییە، لاوێکـە تەبیعەت بەرز و ئایدیالیست. لێ بێ نموودی رواڵەتییە، هەندێ جار کاری پێـچەوانە و خـیلافی دابی کۆمەڵایەتی دەکات و زۆر تورە دەبێ... لـە سـەرەتای چیرۆکەکەوە وەکـو بنیـادەمێکی بەرەڵلا و قوماریاز وێنە دەگیرێت، کە زۆربەی دەستە و توێـژەکانی کۆمەڵگـە بـە مـوزعیجی دەزانن و لێی هەڵدێن. گاڤێ کە بابی دەمرێت و سەرباری لەقەب و نازنـاوی بـابی سـامانێکی فرەی پێ دەبڕێ. لەلای هەمووان خۆشەویست دەبێ و، شەخسیەتێکی دیار و بە نمـوود و دڵگـر پەیدا دەکات.

لەم رۆمانەدا شازادە کوراگین بە نێرەنگ پییر والێدەکات تا لەگەڵ ئیلین-ی کیـژی ویـدا زەماوەند بکات. ئیلین فرە جوانە، بەڵام کەمترین نیشانەی ئابڕوومەنـدی پێـوە نییـە، هـیچ جۆرە قەدەغەیەکی ئەخلاقی بۆ خۆی دانانێ. ژیـانی پـییر و ئـیلین ماوەیـەك بـە ناگـەواری دەگوزەرێ، و سەرەنجام پەی دەبات هاوسەرەکەی لەگـەڵ پیـاوێکی دیکـەدا دەسـتی تێکـەڵ کردووە لێی جیا دەبێتەوە.

دوای ماوەیەك، پییر بەوپەڕی گەورەیی و لیبوردەیی لەگەڵیا ئاشت دەبێتەوە. لێ ئەمجارەش ژیانیان تاڵ و بە خەمە، و سەرەنجام مردنـی ئـیلین (لـە ئـاخر و ئـۆخری چـیرۆکەکەدا)، وەکـو رزگاریی تەواوەتی پییرە.

لەم سەرو بەندەدا رووداوێن گرینگ لە ژیانی دوو ماڵباتەکەی دیکـەدا روویـداوە. شـازادە ئاندرێ ڤۆلکۆنسکی، دۆستی پییر. لە جەنگی دژی ناپلیۆندا، پەیوەندیی بە سـوپاوە کـردووە. ئاندرێ لاوێکی ئەرستۆکراتی، جامێر، زیرەك، جوانخاس، بەڵام بەدگومانە. لە پیناوی چاودێری لە ماریای خوشکی و بابە پیرەکەی، واز لە لیزا-ی هاوسەری دێنێ، لیزا لە غیابی ئاندرێـدا ، بەسەر منالەوە دەمرێ.

پییر، دۆستی خانەوادەی دەولەمەند و دلۆڤانی ر وستوف-یشە کە ئەندامانی ئەو خێزانە لە روانگە و روانینی تۆلستۆییەوە نموونەی کەمینەی ئەرستۆکراتی روسـی ئـەو رۆژگـارەن. بـابی خێزانەکە پیاوێکی دلاوا و تا رادەی حەماقەت دەست بڵاو و دەست بادە و بەرە بەرە بەشـێکی زۆر مولکی بنەماڵەکە بە نرخێکی هەرزان دەفرۆشـێت تـا بـە ئەنـدازەی پێویـست پـارەی بـۆ

پێشوازی دۆستەکانی و جێبەجێ کردنی هەموو پێویستییەکانی ژن و منداڵەکانی پێ بێ.
نیکۆلای کوڕە گەورەی، لاوێکی بێ پەروایە کە لەبەر شکۆ و سەرکێشی ژیانی سەربازی بۆ جەنگ دەڕوات. ناتاشای خوشکی نیکولای، کیژێکی لاوی چەلەنگ و دلگر و جوانە. سونیا-ی کیژە مامی روستوفەکان، کە لەگەڵ واندا دەژێ، دلبەندی ڤیانی نیکولای دەبێ، و نیکولای-ش دەرهەق بەو بێ مەیل نییە.

ئاندرێ فولکونسکی (کە هاوسەرەکەی مردووە) لە دیدارێکا کە لەگەڵ کونت روستوفدا بەمەبەستی ئەنجامدانی کاری کارگێڕی هەیەتی، ناتاشا دەبینێ. ئەم دووە، حەزلێکدی دەکەن و دەبنە دەزگیران. ئاندرێ بۆ مەیدانی شەڕ دەگەڕێتەوە. ناتاشا لە پشت ئەوەوە لەگەڵ ئاناتول کوراگیندا (کوڕی شازادە)دا، کە لاوێکی زیتەڵی دیار، بێ ئوسوڵ و بێ چاو و رووە دیدار دەکات. ئاناتول کە پێشتر ژنی هێناوە، مەوزوعەکە لە ناتاشا دەشارێتەوە، و هانی دەدا لەگەڵیا بڕەڤێ، لێ سونیا و دایکی ناتاشا رێگەی هەڵاتنیان لێ دەگرن، ناتاشا زەلیل و دڵشکاو، لە باری بەدەنی و روحییەوە دەچروسێتەوە. نامەیەك بۆ ئاندرێ دەنووسێت و لە هەموو ئیلتیزاماتەکانی سەبارەت بە خۆی ئازادی دەکات. دوای ماوەیەك ئاندرێ کە برینداربووە بە رێکەوت بۆ ماڵی روستوف لە گوندا، دەهێنرێ، لێرەدا ناتاشا دەکەوێتە پەرستاری وی و دەری دەخات کە هێشتاش ئاشقی ئەوە. ئاندرێ گیان دەسپێرێ.

لەم حاڵ و بارەدا، نیکۆلای روستوف ئاشقی ماریای خوشکی، نە ئەوەندە جوان بەڵام دلڤانی ئاندرێ بووە.

کونت پییر جەزرەبە و ئاسیوی زۆری بە دەست ناهەموارییەکانەوە دیتووە. بەم خەیاڵەی کە ملدان بۆ ئارمانجێن ماسۆنیەکان مانا بە ژیانی دەبەخشێت، پەیوەندییان پێوە دەکات، لێ تەنیا نائومێدی پێ براوە. پاشان هەوڵیداوە کە ناپلیۆن بکوژێت، لێ بەدەستی فەرەنسییەکان دیل بووە و لە کاتی پاشەکشەی وان لە مۆسکۆ ئەسیریان بووە. سەرەنجام لە هێرشێکی روسەکاندا بۆ سەر فەرەنسییانی لە حاڵی هەڵاتنا ئازاد بووە.

پاش جەنگ پییر لەگەڵ ناتاشادا زەماوەند دەکات، و نیکۆلای لەگەڵ ماریا. ئەم ژن و مێردانە ژیانێکی خێزانداری هێمن و ئاسوودە دەست پێدەکەن.

تۆلستۆی لەو بەشانەی رۆمانەکەدا کە پەیوەندی بە جەنگەوە هەیە، راپۆر و هەواڵێکی تێر و تەسەل و روون لەمەڕ چەندین شەڕ، لەوانە شەڕی بورودینو، نیشان دەدات. داگیرکردنی روسیا بە دەستی فەرەنسییەکان و پاشەکشەی کارەسات ئامێزیان لە روسیا-ش باس و وەسپ

دەکات. تۆلستۆی وێنەیەکی تەنزاوی ئەفسەرانی فەرماندەیی گشتی، بە تایبەتی ئەفسەرانی ئەڵمانی لایەنگری روسیا دەخاتەڕوو. ناپلیۆن وەکو بوکەڵەیەکی پوچ و لاواز بەر تەوس و توانجیان دەدات —و بەمجۆرە تیۆری خۆی دەربارەی مێژوو روون دەکاتەوە. کوتوزوف-ی فەرماندەی رووسی، وەکو قارەمانێکی چیرۆکڤانی لە بەرانبەر ناپلیۆندا بەرجەستە دەکات. کابرایەکە پیر، سست، بێ تاقەت و ماندوو، بەڵام زانا و دروستکارە،. فەند و سیاسەتی جەنگی کوتوزوف بوو، کە فەرەنساییەکان تا قوڵایی روسیا رادەکێشێت، ئەوسا چاوەڕوان دەکات تا چارەنووس- و درێژی خەتەلوجستییەکان- ناپلیۆن بێنێتە سەر چۆك. تۆلستۆی هەمیشە میهرەبانانە لەگەڵ سەربازان و دەرەجەداراندا مامەڵە دەکات. لە روانگەی ئەوەوە سەربازان دلێر و بەشەهامەت، و ژمارەیەکیان ئاگا و بە هۆشن، بەڵام کەمتر دەزانن بۆ دەجەنگن. ئەو وەرزێر و جووتیاران (بەتایبەتی لە بەرگی سەربازانی پیادەدا) بە بەرجەستەکاری هەر شتێکی روسی و هەر شتێکی باش، دەزانێ.

جەنگ و ئاشتی ئاسۆیەکی بەرینی هەیە و داستانییە، ئەم رۆمانە نەك هەر روسیای ساڵانی ١٨٠٥- ١٨١٢، بەڵکو ماهیەتی مرۆڤایەتی لە هەر وڵات و لە میانەی هەر رووداوێکی گەورەدا وێنە دەکێشێت و دەنوێنێ.

ئاننا کارنینا (١٨٧٥- ١٨٧٧):

فلپس دەڵێت کە ئاننا کارنینا "بێگومان بەهێزترین رۆمانە کە نووسەرێك لە رۆژگاری ئێمەدا ئەفراندنوویەتی، و زەحمەتە بتوانرێ رۆمانێکی دیکە ناو ببرێ کە لە ئاستی بەهێزی و مکومیدا بە پایەیدا بگات".

نێوەڕۆکی چیرۆکەکە (کە نیشانەی گۆڕانی تۆلستۆییە لە ئازادییەوە بە مانا و چەمکە رۆسۆییەکەی بۆ تۆلستۆیزم) کۆمەڵە بەڵا و مسیبەتێکە کە ژنێك بە هۆی شوێن کەوتنی هەست و سۆزەکانی خۆیەوە و نەك هۆکارە ئەخلاقییەکانەوە، بەسەر خۆی و کەسانی دیدا دێنێ، ئاننا (قارەمانی سەرەکی چیرۆکەکە، کیژێکی ئەرستۆکراتی، خشکۆك، خوێن گەرم و پڕ جۆشە کە بووە بە هاوسەری پیاوێکی وشك و بێ سۆز بە نێوی کارنین) مێردە گرژ و مۆنەکەی لە پێناوی ڤیانی ڤرۆنسکیدا، کە ئەفسەرێکی دڵگرە و دەزگیرانی کیتیی دۆستیەتی، بەجێدێڵێ. بێ ئەوەی ببێ بە هاوسەری ڤرۆنسکی لەگەڵیا دەژی. لەم حاڵ و بارەدا، کیتی لەگەڵ لیڤین"[٢١]"دا، کە پیاوێکی دەوڵەمەند و شایستە و لایەنگری پێشکەوتنی سیستەمی کۆمەڵایەتییە، زەماوەند دەکات. لەلایەکی دیکەوە، دۆستانی ئاننا لێی دوور دەکەونەوە، ئەو

لە ژیانی ئاوێتە بە هەرزەیی و زیناکاری بێزار و پەشیمان دەبێ، داوای تەڵاق لە کارنین-ی مێردی دەکات. کارنین مل بۆ تەڵاقدانی کە لە حوکمی رازیبوونە بە شووکردنی وی بە ڤرونسکی، نادات، ڤرۆنسکی-ش بەرە بەرە لەگەڵ ژنانی دیدا خەریك دەبێ، و ئاننا خۆی دەخاتە ژێر پێچکەی قیتارەوە و خۆی بە مەرگ دەسپێرێ.

لە ئاننا کارنینادا رووداوەکان چڕتر و پلۆتی چیرۆکەکە روونترە وەك لە جەنگ و ئاشتیدا. ئەگەرچی لە جەنگ و ئاشتیدا بەلای کەمەوە سەد و هەفتا و پێنج قارەمان وێنەگیراون، لێ زۆربەیان کەم بایەخن و تەنیا لە چیرۆکە لاوەکییەکاندا دەردەکەون. ئاننا کارنینا لە چاو جەنگ و ئاشتیدا، زیاتر چیرۆکێکی دراماتیکی و خەمنەنگیزە تا داستانی و وەسفی بێ. تەوەجوهی ئەنجامگیری ئەخلاقی-ش لە ئاننا کارنینادا —بەزەرەری هونەری خالیسە- یەجگار بەهێزترە. ئەم رەوت و رێبازە بە لایەنی فێرکارییانە و ئامۆژگاریکارییانەی سەرەتای قۆناغی سێیەمی چالاکی ئەدەبی تۆلستۆی دەژمێردرێ، لەڕاستیدا، دوایی هاتنی ئاننا کارنینا بە دەستپێکی ژیانی تازەی تۆلستۆی دادەنرێ و دەخوێنرێتەوە.

**قۆناغی سێیەم:**

**مەرگی ئیڤان ئیلیچ (١٨٨٦):**

رۆمانۆکێکی بە سوێ و ئازاردەرە دەربارەی پیاوێك کە لە ئەنجامی زاماری زادەی بەربوونەوە لە پەیژە بەمەرگێکی تولانی و گیان پڕوکێن دەمرێت. ئەم بەرهەمە بینین و وەسفێکی ریالیزمییە دەربارەی حاڵ و بار و ختورەی دەروونیی بنیادەم لە ئاستانەی مردندا. ئەو کەسێکی خۆویست و بەناڵە ناڵە، و هاوسەرەکەی بێهودە تێدەکۆشێت تا هاوخەمی وی بێ. سەرەنجام گافێ کە دەمرێ خۆی، ژنەکەی و خوێنەر هەرسێکیان ئیسراحەت دەکەن.

**ژیانەوە (١٨٩٩- ١٩٠٠):**

پاشماوە —یا تەواوکەر-ی تاوان و سزا-ی دۆستۆفسکییە. ناوەڕۆکی رواڵەتی و دیاری کتێبەکە ژیانەوە و لەدایکبوونەوەیەکی تازەی ئەشرافزادەی شەهلی رابواردن و خۆشگوزەران، شازادە نخلودۆفە، کە کیژێکی کارەکەری گەنج و بێ گوناحی بە ناوی کاتیوشا تەفرەداوە و خستویەتی سەر رێگەی فاحیشەکاری.

پاشان شازادە کیژێ لە زینداندا لە حاڵێکا دەبینێ کە لەسەر قەتڵێك کە نەیکردووە تاوانباریان کردووە. کاتیوشا لە ئەنجامی هەڵەی دادگادا حوکم دەدرێ. نخلودوف لێدەبڕێ کە داراییەکانی لە نێو جووتیارەکاندا دابەش بکات، لەگەڵ کاتیوشادا بۆ سیبریا بڕوات، و

زەماوەندی لەگەڵدا بکات. بەڵام کاتیوشا هەست دەکات کە هۆی ئەم کارەی نخلودوف زیاتر بەزەییە تا ئەڤین، وەدەری دەنێ و شوو بە زیندانییەکی دیکە دەکات. شازادەش واقیعەکە قەبوول دەکات و لێدەبڕێ کە "ژیانەوەیەك" لە ژیانی خۆیدا بەرپا بکات و ژیانێکی نوێ بە گوێرەی ئامۆژگارییەکانی عیسا دەست پێ بکات"[٢٢].

بەرهەمێن دی:

(جگە لە وانەی بورین، چیرۆکان، شانۆنامان و نووسینی بەهاداری دیکەش لە دوای تۆلستۆی ماون کە گرینگترینیان بریتییە لە: بەیانی مولکدارێك (١٨٥٢) چیرۆکێکە دەربارەی ناکۆکی و کێشمانەکێشی نێوان خودان مولکان و جووتیاران، ئەوەی باوەڕم پێیەتی (١٨٨٢) نامەیەکە دەربارەی جیهانبینی تۆلستۆی، نێروی تاریکی (١٨٨٦) تراجیدیایەکی جوان و دڵگرە کە ناوەڕۆکە گشتییەکەی بریتییە لە داننان بە هەڵە و رازی بوون بە سزا، بەرووبوومی رۆشنبیریی (١٨٩٠)، کە کومیدیایەکی تەنز ئامێزە، سوناتەی کرویتزر"[٢٣] (١٨٨٩) چیرۆکێکە دەربارەی ئەوەی کە مەسەلە سێکسییەکان تاوانیان لێدەکەوێتەوە، کرێکار و خاوەن کار (١٨٩٥) چیرۆکێکە دەربارەی بێهودەیی سەروەت و سامان، حاجی مراد (١٨٩٦-١٩٠٤) چیرۆکی چیا نشینێکی دلێری خەلکی قەفقازە کە لە پێناوی ئازادی و خۆیبوونی وڵاتەکەیدا قوربانی دەدات، و هونەرچییە (١٨٩٨)، کە لەوێدا پرەنسیپ و دیسپلین و مەحەك و پێوەرە هونەرییەکان بە دیدێکی ورد پیشاندەدرێ، و نۆڕین و جیهانبینی نووسەر لە مەیدانی هونەریدا کە نۆڕینێکی نەتەوەیی و گشتی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و لە سەر بناغەی مرۆڤدۆستییە دێتە نیشاندان و دەربڕین).

هەڵسەنگاندن و نرخاندن:

بێ دوودڵی تۆلستۆی یەکێکە لە دوو گەورەترین چیرۆکنووسی روسیا ، ئەو و دۆستۆفسکی درەوشاوەترین سیمای ئەدەبیاتی روسین کە ئابروو و ئیحتویارێکی گەورە و مکوم و بەردەوامیان هەیە، ئەگەرچی هەندێ لە رەخنەگران ئیرادیان لە سیستەمی ئەخلاقی و مەزهەبی تۆلستۆی گرتووە، توانای تۆلستۆی وەکو پشکنەرو شیکەرەوەی ژیان و دەردە کۆمەڵایەتییەکان باس و خواس و حاشا هەڵنەگرە. هیچ نووسەرێك لە رۆسۆ بە دواوە نەیتوانیوە وەکو تۆلستۆی ویژدانی بەشەری وەئاگا بێنێتەوە. "ئەو بە تواناترین (نە باشترین، و نە رەنگە گەورە ترین، بەڵکو لەڕووی ئەخلاقییەوە بەرجەستە ترین) ئینسانێکە کە وڵاتی روسیا لە دەورانی ژیانی چەند وەچەی رابردوودا لە هەمێزی خۆی پەروەردەی

کردووە، گەورەترین مرۆڤە، ئەگەر بالاترین هونەرمەند نەبێ، لەسەرانسەری میژووی ئەدەبیاتی روسیدا".

# زێدەران:

١- فلادیمیری یەکەم (٩٥٦؟- ١٠١٥ی ز):

ناسراوە بە فلادیمیری گەورە، یەکەمین فەرمانڕەوای مەسیحی رووسییە (٩٨٠- ١٠١٥).

٢- سیریل (٨٢٧- ٨٦٩ی ز):

قەدیس سیریل ناسراو بە پەیامبەری سلاڤەکان، بانگەشەکاری مەسیحی یۆنانی، کە زێدەباری داهێنانی ئەلفبای سیریلی، ئینجیلەکانیشی بۆ سەر زمانی سلاڤی وەرگێڕا.

٣- شازادە ئیڤانی سێیەم (١٤٤٠- ١٥٠٥):

ئیڤانی گەورە، گەورە دۆکی روسیا (١٤٦٢- ١٥٠٥).

٤- پتری گەورە (١٦٧٣- ١٧٢٥):

تزاری گەورەی روسیا (١٦٨٢- ١٧٢٥).

٥- ئیلیزابت پتروڤینا (١٧٠٩- ١٧٦١):

ئیمپراتریسی روسیا (١٧٤١- ١٧٦١).

٦- کاترینی دووەم (١٧٢٩- ١٧٩٦):

ئیمپراتریسی گەورەی روسیا (١٧٦٢- ١٧٩٦).

٧- ئالکساندر رادیشچف (١٧٤٩- ١٨٠٢):

شاعیر و نووسەری شۆڕشگێڕی روسیا.

٨- نیکولای یەکەم (١٧٩٦- ١٨٥٥):

تزاری روسیا (١٨٢٥- ١٨٥٥).

٩- ئەلکساندەری دووەم (١٨١٨- ١٨٨١):

تزاری روسیا (١٨٥٥- ١٨٨١).

١٠- ئیڤانی چوارەم (ترسناك) (١٥٣٠- ١٥٨٤):

گەورە دۆکی مۆسکۆ و یەکەمین فەرمانڕەوای روسیا کە لەقەبی تزاری وەرگرت.

١١- کوربسکی (١٥٣٨- ١٥٨٨):

شازادەی یاروسلاڤل، کە کتێبێکی تێر و تەسەلیشی لەمەڕ مێژووی دەسەڵاتی ئیڤانی ترسناك نووسیوە.

١٢- تزار سکویە سلۆ: شارێکی باشووری لینینگرادە، لە زەمانی پتری گەورە بەناوی تزارسکویە سلۆ دامەزرێنرا، پاش شۆڕش ناوی گۆڕدرا بۆ دتسکوسلۆ (شاری منداڵان)و لەساڵی ١٩٣٧دا گۆڕدرا بۆ پۆشکین.

١٣- گلینکا (١٨٠٣- ١٨٥٧):

ئاهەنگسازی روسییە.

١٤- شارلسی دوازدەیەم (١٦٨٢- ١٧١٨):

پاشای سوێد (١٦٩٧- ١٧١٨).

١٥- موسورگسکی (١٨٣٥- ١٨٨١):

ئاهەنگسازی رووسییە.

١٦- توماس رایمر: کە ناوێکی تری تۆماس ئاف ئێرسلدونە (١٢٢٠- ١٢٩٧) شاعیر و پێشبینی گوزی سکوتلەندییە کە ناوبانگی لە مەیدانی شاعیریدا بە بەیتی رۆمانسی چیرۆکی تریسترام و ئیسولد دەرکردووە کە رەنگە لەسەرچاوەێن فەرەنسییەوە وەرگیرابێ. لە مەیدانی پێشکۆیشدا بە پێشبینی مەرگی ئەلکساندەری سێیەم و هەروەها شەڕی بانوکبورن بەناوبانگە (لەگەڵ توماس رایمر ١٦٤١- ١٧١٣ی مێژوونووس و رەخنەگری ئینگلیزیدا تێکەڵ نەبێ).

١٧- گریبایدوف (١٧٩٥- ١٨٢٩):

ئەم شاعیر و شانۆنامەنووسە رووسییە نوێنەر و سەفیری تزار بوو لە دەرباری ئێراندا کە لە تارانی سەردەمی فەتح عەلیشادا لە ئاشووب و پەشێوییەکی گشتیدا کوژرا.

١٨- تورگینیف غەربی ترە... تورگینف وەکو نوێنەری غەربگەرایان لە بەرانبەر دۆستۆفسکی دابوو وەکو نوێنەری سلاڤ دۆستان.

١٩- جوکوفسکی (١٧٨٣- ١٨٥٢): شاعیری روسییە.

٢٠- کیریلوف: لە چیرۆکەکەدا، کیریلوف بە ئاسانی و شێنەیی بە دەمانچە خۆی دەکوژێت تا بیسەلمێنێ خودا نییە.

٢١- لیڤین- Levin:

زۆربەی شرۆڤەکارانی بەرهەمێن تۆلستۆی پێیان وایە کە لیڤین وێنەیەکە لە خودی تۆلستۆی.

٢٢- غلۆدوف- سپکتور پێی وایە کە غلودوف لە حەقیقەتدا لـە دایـك بوونـەوە و ژیانـەوەی بـە دەسـت نەهێناوە و هەموو فیداکاریـیـەکانی لەبەر خۆپەرستییە، و مەبەستی ئەمەیە کە ویژدانی خۆی ئاسوودە بکات.

٢٣- سوناتەی کرویتزر: ناوی بەرهەمێکی بتهۆڤنە.

# ئەدەبیاتی روسیا
# لە
# قۆناغی سستی و لاوازیدا
# ١٨٨٣- ١٩١٧

سەرەتایەکی مێژوویی:

لە سەرەتاکانی دەیەی ١٨٤٠دا کەلێنی هێزی نێوان سلاڤدۆستان (باوەڕیارانی موحافەزەکاری، پابەندی مەزهەبی، و ناسیونالیزم) و غەربگەرایان (باوەڕیان بە لیبرالیزم، لابردن و دووره دینی، و نزیکی زیاتر لەگەڵ کەلتووری بێگانە بوو) بەرە بەرە قوڵتر بوو. هەندێ لە لاوانی ئەرستۆکراتی لایەنگری ریفۆرمی ریشەیی کەوتنە دامەزراندن و پێکەوەنانی گرووپانێك بە مەبەستی پەرەپێدانی شۆڕشی کۆمەڵایەتی و، هەندێکی دیکەش کەتنە لایەنگری لە نەخشە و بۆچوونی سوسیالستی. سەرەنجام یەکێك لە ئەندامانی رێکخراوێکی توندڕەو بە ناوی (ویستی گەل) ، لە ساڵی ١٨٨١دا ئەلکساندەری دووەمی کوشت.

قۆناغی پاشایەتی ئەلکساندەری سێیەم (١٨٨١- ١٨٩٤) تاڕادەیەك ئارام بوو، بەڵام لە کۆتاییەکانی سەدەدا، هەندێ بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی نوێ ئەوەیان دەگەیاند کە نارەزاییەکی تەواو بەربڵاو هەیە. لەم حاڵ و بارەدا، کرێکارانی کارخانەکان لەگەڵ ئایدیالیستاندا حکوومەتی دیکتاتۆرییان بەر پەلامار دا و لە هەموو لایەکەوە قریوەی شۆڕشیان لێدا، کە ئەنجام بە بەرقەراری و دامەزرانی سیستەمی سوسیالیستی شکایەوە.

نۆڕینێکی گشتی:

لە ماوەی ساڵانی ١٨٨٣- ١٩١٧دا دوو ڕێباز و شێوەی ئەدەبی لە روسیادا برەو دەسەنێ:

یەکێکیان کە ئارمەکەی بەرپرسیارییەتی (و رەخنە)ی کۆمەڵایەتییە و درێژە بە ڕێباز و شێوازێن ریالیزمی و ناتورالیزمی رۆماننووسان و شانۆنامەکارانی سەردەمی زێرین دەدا، گەورەترین ڕێبوارانی ئەم ڕێگەیە چیخۆف، گورکی، و کورولنکو-ن.

ڕێبازی دووەم: کە بە "نوێخوازی" بەناو بانگە، و بە ڕێگەی جوانیناسی و رەمزییەتدا دەڕوات، یاخی بوونێکە دژی ریالیزم و فێرکاری. چەند شاعیرێکی کەم بایەخ نوێنەری سەرەکی ئەم شێوەیەن.

فلادیمیر گالاکتیونوفیچ کورولنکۆ (١٨٥٣- ١٩٢١)، نووسەر و رۆژنامەنووسێکی ئازادیخوازی روسییە، بە چیرۆکە کورتەکانی کە رەنگدانەوەی هاوخەمی و هاوسۆزی وییە لەگەڵ چەوساوان و زۆر لێکراواندا، بەناوبانگە. گرنگترین کورتە چیرۆکی کورولنکو "یومکیپور"، دەربارەی جولەکەیەکی چەوساوەیە، و "خەونەکەی ماکار"' (١٨٨٥) کە ژیانی جووتیارێکی هەژاری خەڵکی سیبریا وێنە دەگرێت. رۆمانۆکەی "نەواژەنی نابینا (١٨٨٦)شی هەیە (کە لەوێدا نەواژەنەکە تێدەکۆشێت بە دەنگی ساز، ئەوەی خەڵکان دەیبینن، بەرجەستەی بکات).

لە سیما هەرە دیارەکانی "بوژانەوەی شیعر"ی رووسیدا دەشێت ئاماژە بۆ ئەم ناوانە بکرێ: ڤیاسلاڤ ئیڤانوفیچ ئیڤانوف (١٨٨٦- ١٩٤٥)، (کە لە رابەرانی قوتابخانەی سیمبولیزمی روسیا بوو) ئیڤان ئالسکی یوفیچ بونین (١٨٧٠- ١٩٥٣) (لە رابەرانی نووسەرانی روسی دوورە وڵاتە، کە بە چیرۆکی "جەنتڵمانی خەڵکی سانفرانسیسکو- ١٨١٥) بەناوبانگە. بونین لە ساڵی ١٩٣٣دا خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیاتی وەرگرت). ڤالیری یاکوڤولیڤیچ بریوسوڤ ١٨٧٣- ١٩٢٤ (شاعیر و رەخنەگر، و رۆماننووسێکی سیمبولیستە). ماکزیملیان ئالکساندەروڤیچ ڤولڤوشین ١٨٧٧- ١٩٣٢ (کە لە سەرەتای شاعیری دا ئیمپریسیونیست و لایەنگری شۆڕش بوو، بەڵام چونکە بۆچوون و روانگەی عیرفانی دواتری ئەو لەگەڵ بویەرە توندەکانی شۆڕشگێڕی دا سازگار نەبوو، دەستی لە شیعر گوتن کێشایەوە). ئالکساندر ئالکساندروڤیچ بلوك (١٨٨٠- ١٩٢١)، (گەورەترین شاعیری سیمبولیستی روسییە. خانمی جوان (١٩٠٤)، و بەیتی داستانی دوانزە کەس (١٩١٨) کە دەربارەی لایەنگری. لە شۆڕشی روسیایە، لە بەرهەمە بەناوبانگەکانین). و سێرگی یەسەنین (١٨٩٥- ١٩٢٥).

بە هەر حاڵ، دیارترین نووسەرانی قۆناغی سستی، چیخۆف و گۆرکی کە لە مەیدانی رۆمان، شانۆنامە و کورتە چیرۆکاندا بە مامۆستایانی باڵادەست دەژمێردرێن.

## چیخۆف

ئانتۆن پاڤلوڤیچ چیخۆف (١٨٦٠- ١٩٠٤):

چیخۆف کە فەرزەنی کۆیلەیەکی ئازادبوو بوو، لە شاری تاگانرۆگ لە دایك بوو. لە ساڵی ١٨٧٩دا قۆناغی ئامادەیی تەواو کرد و لە هەمان ساڵدا چووە زانستگەی مۆسکۆ تا دکتۆری بخوێنێ. لە ساڵی ١٨٨٤دا قۆناغی کۆلیژی پزیشکی تەواو کرد. لە ساڵی ١٨٨٠دا یەکەمین چیرۆکی بڵاوبووەوە. ماوەیەك کەوتە دکتۆری و، پاشان ئەم پیشەیەی تەرك کرد و نووسینی کرد بە خەمی یەکجارەکی خۆی. لە ساڵی ١٨٩٠دا سەفەرێکی بۆ ساخالین (کە لەو زەمانەدا یەکێك بوو لە تاراوگەکانی حکومەتی تزاری)کرد تا وەزع و حاڵی زیندانیان بخاتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە، یادگاری ئەم سەفەرە زنجیرە چیرۆکێك بوو کە بە ناونیشانی ساخالین (١٨٩٣) بڵاوبووەوە، (و جەزرەبەیەکی توندی بە دەزگای بێدادی تزاران گەیاند، بەناوبانگترین چیرۆکی ساخالین "نۆدەی ژمارە شەش"ە، یەکێکە لە ترسناکترین چیرۆکانی روسی). چیخۆف لە ساڵی ١٨٩١دا سەفەری نەمسا، ئیتالیا و فەرەنسای کرد. لە ساڵی ١٩٠١دا لەگەڵ خانولگا کنیپەری ئەکتەردا زەماوەندی کرد. سەرەنجام، نەخۆشی دەردە باریکە کە لە بیست ساڵییەوە دابویە گیانی باری گرانتر کرد. چیخۆف چەند ساڵێك لە شاری بەندەریی یالتا ژیا، و پاشان بۆ چارەسەری بۆ ئەورووپای رۆژئاوایی چوو. لە حەسانگەی (ئاسایشگاە) سیلداران لە بادەن وایلەر-ی ئەڵمانی خەوت و ئاقیبەت لەوێندەر مرد.

بەرهەمەکانی:

چیخۆف، وەکو گوگول، هەستێکی گاڵتەبازی سەیری هەیە کە تێگەیشتنی قووڵی مسیبەتەکانی ژیانی لەگەڵدایە. یەکەمین چیرۆکەکانی لە راستیدا هەندێ پلۆت و سکێچی شاد و پێکەنین هێنن، بەڵام هەر ئەم چیرۆکانە توانای ئیدارکی حسی وی بە باشی نیشان دەدەن. هەندێ لە رەخنەگرانی رۆژگاری چیخۆف لەم روانگەیەوە "خەفەت دەخۆن کە بۆچی دەبێ ئەم بەهرە و توانا لاوە هەموو وەختی خۆی سەرفی پێکەناندنی خەڵکی بکات". رەنگە هەر ئەم تامۆژگارییەی دوایی، و پوختەیی و خەمڵین و نەخۆشی، بۆچوونی چیخۆفی گۆڕی بێ، و زۆربەی ئەو چیرۆك و شانۆنامانەی کە لە نێوان ساڵانی ١٨٨٨- ١٩٠٠ی نووسیونی خەمناك و بە

ئازار و سوێن. ئەوسا دەستی کرد بەمەی کە ئەو تروسکە هیوایەی کە سەبارەت بە گۆڕانی باردۆخی بەزەیی ئەنگێزی وڵاتەکەی لە دڵاندا درەوشابووەوە، لە بەرهەمەکانیا عەکس بکاتەوە و بنوێنێتەوە، ڕێگەی دەرمانکردنێکی دیار پێشنیاز ناکات، بەڵام دەرد و نەخۆشییەکانی بە وردی دەناسێت، و چاو دەبڕێتە شۆڕشی ئاینده.

چیرۆکە کورتەکان:

کورتە چیرۆکەکانی چیخۆف ڕەنگە پتر وەسفی بن تا نەقڵی. لە کۆی شەش سەد کورتە چیرۆکی چیخۆف، زۆربەیان وەسفی مەوقیعیەتەکانە، و هیچ جۆرە نەخشە و پلۆتێکی واقیعیان نییە. چیخۆف لە بنەڕەتدا میتۆدێکی گۆشەگیرخوازی و ناشەخسیی هەیە، و دەربەستی فێرکردن و فێرکاری و ڕێ نیشاندان نییە. چیرۆکەکانی، وەکو هەموو چیرۆکنووسانی روسیا، لێوان لێون لە جوزئیاتی واقیعیانە. هیچ کاتێ هەڵناچێ و بە دەگمەن دەستەمۆی سۆز و گودازانی توند دەبێ، و چیرۆکەکانی پتر لە نەقڵەوە دەرسکێن تا لە هەست و سۆز. لە کورتە چیرۆکی "ئۆدەی ژمارە شەش" (١٨٩٢)دا، بەزەیی و دڵسۆزی دکتۆرێك دەرهەق بە نەخۆشەکانی خۆی، وا لە هاوکارەکانی دەکات بە شێتی بزانن. لە ژوورێکی ناخۆشدا زیندانی دەکەن، و لە زەرفی چەند سەعاتێکدا دەمرێت.

لە کورتە چیرۆکەکانی دیکەی چیخۆف "ڤانکا"، "سیرین"، "کالیسکە"، "دڵڕفێن"، "خەوالّوو"، "دوئێل" و "جووتیاران"، کەم و زۆر ناوبانگیان دەرکردووە.

یەکەمین کورتە چیرۆکی چیخۆف، "نامەیەك بۆ هاوڕێیەکی زانا- ١٨٨٠"، لە گۆڤارێکی فوکاهیدا (لە سانپترسبورگ) بڵاوبووەوە.

بەرگی یەکەمی چیرۆکەکانی بە ناونیشانی "چیرۆکەکانی ملپامنی- ١٨٨٤) بریتی بوو لە شەش چیرۆکی (پلۆت) کورت. یەکەمین کۆ کورتە چیرۆکی گرنگی، چیرۆکێن ڕەنگاوڕەنگی (١٨٨٦) ناو بوو کە چیرۆکانی مینا "نەشتەرگەری"، و "خەم"ی لەخۆ گرتبوو، دوو کۆچیرۆکی دواتری چیخۆف بە ناوی لە بەرەبەیاندا- ١٨٨٧و چیرۆکان- ١٨٨٨ بڵاوبوونەوە. کۆمەڵەی (چیرۆکان) چیرۆکی وەسفی بەناوبانگ "دەشت"، و چیرۆکانی "رامووسان". و "شادی" لەخۆ گرتووە، قسانی بێ زەرەر- ١٨٨٧و کاشتانکا- ١٨٨٧ دوو کۆ چیرۆکی دیکەی چیخۆف-ن.

شانۆنامەکان:

هەموو تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی چیخۆف لە دراماکانیدا دەردەکەوێ، (هەوڵێن بەرهەمێن درامی چیخۆف کۆمیدیا تاکپەردەییەکانیەتی لەوانە: "لە شارێدا- ١٨٨٥"،

"ئـاوازی قـو- ١٨٨٨"، "ورچ- ١٨٨٨"، "خـوازبێنیێ- ١٨٨٩"، "زەماوەنـد- ١٨٩٠"، "شەوی پێش دادگایی- ١٨٩١"و "سالوەگەڕ- ١٨٩١".

شانۆنامەکانی تەواو بێ فۆرم و ناپەیوەستن، لێ رەنگە هەر ئـەم ناپەیوەسـتی و شـپرزەییە رەمز و هێمایەك بێ بۆ ئەو کۆمەڵگایەی کە چیخۆف تیایدا دەژییا.

نیڤانۆڤ- ١٨٨٧:

(یەکەمین شانۆنامەی درێژی چیخۆفە، کە رێچکە و رێگەی دارودەستەی رۆشنبیرانی روسی وێنـە دەگرێـت، و ئـارەزوو کەلکەڵـە خاوەکـانی ئـەوان نیـشان دەدات). لـەم شـانۆنامەیەدا تراجیدیای یەکێك لە "رۆشنبیران" بە ناوی ئیڤانۆف دەگێڕێتەوە. شاشا، کیژێکی گەنجـە، کـە ئارەزوو و خۆزیا بەرزەکانی ئیڤانۆڤ بەگەن دەکات، حەزی لێکردووە، لێ ئیڤـانۆڤ کـە هـەموو جۆش و خرۆشێکی خۆی لەمەڕ ژیان لە دەست داوە دەزانێ کە ئارەزووەکانی پێـشووی هـەموو مردوون. کە هیچ رێگەیەکی رزگاری نابینێ رێك بەرلە دەست پێکردنی ئاهەنگی زەماوەند بـە گولله خۆی دەکوژێت.

باغی ئالوبالو- ١٩٠٤:

لـە هـەموو شـانۆنامەکانی چـیخۆف پـتر رەنگدانـەوەی تایبەتمەنییـەکانی ئـەوە. ئـەم بەرهەمە تراجیدیای بێ چارەیی و فەوتان و نـەمانی چینی ئەرسـتوکراتی روسـیایە، ئـەو چینەی ئاگایان لە نەمانی نزیکی ژیانی هەرەس بردووی بێ کـەڵکی خۆیانـە، بـەڵام هـیچ کارێکیشیان لە دەست نایەت —خەڵکانێکی تەواو ناشایستە و دەسەوسان و بـێ چـارە کـە هیچ کارێکیان بۆ چـاککردنی وەزعـی خـۆ لـە دەسـت نایـەت. ئـەم درامایـە شـاکارێکی تەسویرییە، ئەرستۆکرات و "رۆشـنبیران" لە بەرانبـەر کۆیلەیـەکی ئـازادبووی زبـر و تـوڕە بەڵام چالاك و پیاوی کار، کە نیشانەی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی تازەیە، وێنـە دەگیرێـن، مەدام رانفسکایا، ژنێکـی هەسـتۆك و دەسـت بـڵاو، کـە تـا ئاقرگـەی لـە ژێـر قەرزایـە رووبەرووی لە دەست چوونی مولکەکەی خۆیەتی.

لوپاهین، کۆیلەیەکی ئازادبووە کە ئێستا بازرگـانێکی دەوڵەمەنـدە، بـیر لـەوە دەکاتـەوە چارەیەکی بۆ بکات. بە گوێرەی پێشنیازی وی دەبێ مەدام رانفسکایا دار ئالوبالوەکـانی باخـە بەرینەکەی ببڕێتەوە و زەوییـەکەی بکات بە قەتعە و بە هاوینگەسازانی بفرۆشێت. بە هەر حـاڵ باخەکە رەمزی هەموو شتیکی عازیزە لەلای مەدام رانفـسکایا، یـانی سیـستەمی کـۆن، لـە پێشنیازەکەی لۆپاهین دەترسێت، و رەتی دەکاتەوە، بەڵام تەواو روونە کـە باخەکـە لـە دەسـت

دەچێت. هەموو مولکەکە دەچێتە حەراج و، کڕیار خودی لوپاهین-ە، شانۆنامەکە بە دەنگی داهاتنەوەی تەوران بۆ سەر دار ئالۆبالۆکان کۆتایی دێت.

(شاکارە درامییە درێژەکانی چیخۆف، جگە لە باخی ئالۆبالۆ، بریتین لە: مەلی دەریایی-١٨٩٦، کە کێشمانەکێشی نێوان نەوەی پیر و لاو دەخاتە بەرباس و لالـو ڤانیا- ١٨٧٩، کە رەنج و ناکامی خەلکی رەش و رووت تاوتوێ دەکات، و سێ خوشك- ١٩٠١، کە ژمارەیەك لە رەخنەگران بە شاکاری چیخۆف-یان داناوە، ئاوێنەی نەمانی سیستەمی کۆمەلایەتی کۆنە. بە شێوەیەکی گشتی نێوەرۆکی سەرەکی ئەم درامایانە خەونە بە ژیانێکی تازەوە).

کورتەیەکی رەخنەکان:

چیخۆف هەرچەندە "توانای عەجیبی تۆلستۆی، پوختەیی و کەمالی تورگینێف، و هەستی هاوسۆزی جیهانگیری دۆستۆفسکی مەزنی نییە"، بەلام شرۆڤەکار و لێکدەرەوەی دیار و بەرجەستەی رۆژگار و ولاتی خۆیەتی و، شانۆنامە و چیرۆکە ورد و کاریگەر، بابەتی، و ناهەستۆکییەکانی وی لە ولاتانی ئینگلیزی زماندا یەجگار بەناوبانگن (بە هەر حال، ئەم مامۆستای سەراحەت و کورتبڕییە، نوێنەری بەرز و دیاری قوتابخانەی ریالیزمی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمی روسیایە. زێدەباری ئەمە، توانای تەنز خولقێنی و هەستی حەنەکبازی چیخۆف، ئەوی خستووەتە ریزی گەورە تەنزپەروەران و حەنەکبێژانی مێژووی ئەدەبیاتی جیهانەوە).

## گۆرکی

ماکسیم گۆرکی ١٨٦٨- ١٩٣٦ (ناوی خوازراوی ئالکسی ماکسیموفیچ پیشکوف-ە)، رۆماننوس و شانۆنامەنووسی بەناوبانگی روسییە، لە نیژنی نۆڤگۆرۆدا (شاری گۆرکی ئێستا) لە دایك بوو. چوار سالان بوو کە بابە پەردە فرۆشەکەی مرد، و لە دەسالیدا دایکیشی لە دەستدا. گۆرکی چەند سالێك چووە قوتابخانە، پاشان ناچار بوو بۆ وەدەست هێنانی بژێوی دەرس و خوێندن تەرك بکات. لە هەموو دەرگایەکیدا هەموو کارێکی وەکو شاگرد پینەدۆزی، کرد. لە دوازدە سالیدا لە مال هەلات، و لە یەکێك لە کەشتییەکانی رووباری ڤۆلگادا بوو بە قاپشۆری ئاشپەزخانە. ئاشچی کەشتییەکە کە جانتایەکی تەژی کتێبی هەبوو، هانی کتێب خوێندنەوەی دا. پاش ئەوە کەوتە کارێن وەکو نیگارکێشی پورترێت، ئەکتەری، نانەوایی، کرێکاری بارئەندازی کەشتی، و میوە فرۆشی. لە سالی ١٨٩١دا پەیوەندی بە چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانەوە کرد، و

تێکرا سێ جاران گیرا. یەکەمین چیرۆکی لە ساڵی ١٨٩٢دا بڵاو بووەوە کە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بەڵام ئەو بەردەوام بوو بە جۆرێ کە لە ساڵی ١٩٠١بە دواوە خوێنەرێکی زۆر بۆ بەرهەمەکانی پەیدا بوون و چەندین جار چاپکرانەوە. گۆرکی لە ساڵی ١٩٠٦دا سەفەرێکی بۆ ئەمریکا کرد تا پیتاك بۆ بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کۆ بکاتەوە. لەوێندەر بە گەرمی پێشوازی لێکرا، بەڵام گافێ کە سەفارەتی تزار زانی ئەو ژنەی لەگەڵیایە هاوسەری خۆی نییە، سەرزەنشی کرد. گۆرکی بۆ دورگەی کاپری لە ئیتاڵیا رۆیی و ماوەی حەوت ساڵانی وەکو دوور خراوەیەکی سیاسی لەوێندەر بەسەر برد. لەم دورگەیەدا قوتابخانەیەکی بۆ منداڵانی شۆڕشگێڕان و بۆ نارازییانی سیاسی پێکەوە نا و بەڕێوەبرد. یەکێك لە قوتابیانی قوتابخانەکەی ئەو یوسیف ستالین بوو. لە ساڵی ١٩١٣دا رێگەدرا بۆ روسیا بگەڕێتەوە. لە شۆڕشی ١٩١٧دا هەموەڵجار لەگەڵ موخالیفان دابوو، بەڵام پاشان هاتە سەر رای حیزبی بولشوفیك. لە ساڵی ١٩٢١ بە هۆی ناکۆکییەکەوە لەگەڵ لینیندا، ناچار وڵاتی بەجێهێشت. گۆرکی تا ساڵی ١٩٢٨ی لە ئەڵمان بەسەر برد، و ئەوسا داوای لێکرا بۆ وڵاتی خۆی بزڤرێتەوە. سەرەنجام لە گۆرکی"[١]دا (شارێکی نزیکی مۆسکۆیە کە بەناوی ئەوەوەیە) چاوی لێك نا.

پەیامی گۆرکی:

بەشی گۆرکی لە ئەدەبیاتی روسیدا ئەمەیە کە "دنیایەکی تازەی لە جیهانی خەڵکی هەژار و دەرکراوانی کۆمەڵایەتی (خانەبەکۆڵان و کرێکاران، لۆمپەنان، دزان و بەرەڵڵایان، سۆزانی و دەڵاڵان، بادەنۆش و ئالودان) کەشف کرد. پەیامی ناراستەوخۆی گۆرکی لەم بارەیەوە ئاشکرایە- ئاوارە و بەرەڵڵایانی سووك و سەلیم بەو روحە جوانەوە کە هەیانە، نابێ لە یادی بەشەریەت دا فەرامۆش بکرێن، چونکە ئەم ماڵبەکۆڵانە قوربانیانی سیستەمی کۆمەڵایەتی ستەمکارن"، لەڕاستیدا بابەت و نێوەڕۆکی هەمیشەیی گۆرکی "چیرۆکی روحێکی لاڵە کە هەوڵدەدات بێتە زمان، چیرۆکی بنیادەمانێکی بە سروشت ساغن کە لە کۆمەڵگەی سەرەتاییدا بەرەڵڵا بوونە و بەرەو رووناکی لەپە کوتێ دەکەن".

بەرهەمەکانی:

گۆرکی گەلەك کورتە چیرۆکانی نووسی. (یەکەمین کۆچیرۆکی کورتی بە نێوی سکێچ و چیرۆکان لە ساڵی ١٨٩٨دا بڵاوبووەوە، ناویان خستە سەرزاران)، "کونوڤالوڤ- ١٨٩٦"، "ئورلوف و ژنەکەی- ١٨٩٧"، "بیست و شەش پیاو و کیژێك- ١٨٩٩"، و "لەدایکبوونی مرۆڤێك ١٩١٢" لە باشترین کورتە چیرۆکی ئەون.

لە رۆمانە هەرە زیندووەکانی گۆرکی دەشێت ناوی فوما گوردیف- ١٨٩٩، سێ هاورێ- ١٩٠٠، و دایک- ١٩٠٧ ببرێ. گۆرکی رۆمانێکی داستانی تەواو نەبووی چواربەرگیشی هەیە کە ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئەدەبی روسیا لە ماوەی چل ساڵی بەر لە شۆڕشی ١٩١٧ دەگێڕێتەوە. ئەم رۆمانە گەورەیە کە ژیانی کلیم سامگین-ی ناوە بریتییە لە چوار رۆمانی جیا، تەماشاڤان ١٩٣٠، موگناتیس(١٩٣١)، ئاگرێن دیکە (١٩٣٨)، و خەیاڵ (١٩٣٨). جگە لەمە باشترین بەرهەمێن نە چیرۆکڤانی گۆرکی ژیاننامە سێ بەشییەکەیەتی کە سەردەمی منداڵی – ١٩١٣، لە نێو خەڵکیدا – ١٩١٥، رۆژانی زانکۆم- ١٩٢٣ لەخۆ دەگرێت.

لە نێو بەرهەمە درامییەکانی گۆرکیدا، شانۆنامانی بۆرژوازی- ١٩٠٠، ژێرەوە- ١٩٠٢، مناڵانی هەتاو- ١٩٠٥ و دواهەمین- ١٩٠٨ لە هەموویان بەناوبانگترن.

(لە بەرهەمەکانی گۆرکی کە لە دەربەدەری و رۆژڕەشی لاوی ئەوەوە، لە باوەڕ بە هێزی گەل و گەشبینی سەبارەت بە ئایندە و لە ڤیانی ژیانەوە ئیلهامی وەردەگرت، و لە هەمان حاڵدا ناوێتەی گیانی شۆڕشگێڕیی رۆمانتیك بوو، خستیانە ناو جەرگەی ژیانی ئەدەبی و رۆشنبیریی رۆژگاری خۆیەوە. نووسینەکانی خستە خزمەت ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیەوە، و رێچکە و رێبازی ناسراو بە ریالیزمی سوسیالیزمی لە ئەدەبیاتدا دامەزراند)، بە هەر حاڵ چاوخشانێکی خێرا بە دوو بەرهەمی گۆرکیدا، پەیام و شێوازی ئەو دەردەخات.

"لە ژێر ژێرەوە"- Lower Depth:

درامایەکە دەربارەی چەند بنیادەمێکی بەدبەخت و دەربەدەر کە لە میوانخانەیەکی هەرزانباییدا لە دەوری یەکدی خڕ بوونەتەوە. لە ناو ئەمانەدا، نەفەرێکیان دزێکە بە نێوی پیل، کە لەگەڵ ڤاسیلیسا-ی هاوسەری موڵکدارێك دا پەیوەندی ئاشقێنی پەیدا دەکات، بەڵام لێی بێ تاقەت دەبێ و حەز لە ناتاشای خوشکی ئەو دەکات. ڤاسیلیسا کە لەم بابەتە زۆر توڕە بووە، بەرەبەرە ئۆقرە دەگرێ، و داوا لە پیل دەکات مێردەکەی بکوژێت تا ئەویش پێویستی و فاکتەرەکانی زەماوەندی ئەم لەگەڵ ناتاشادا فەراهەم بکات. پیل پێشنیازەکەی ڤاسیلیسا رەفز دەکات، و ئەو هەرا و هەنگامەیەك دەنێتەوە. پیل-یش مێردەکەی دەکوژێت. ڤاسیلیسا، پیل بە تاوان تۆمەتبار دەکات، لێ ناتاشاش تێکەڵ دەبێ، و پیل و ڤاسیلیسا دەکەونە زیندانەوە. لەم کۆمەڵەدا یەکێکیانیش بە نەخۆشی دەردە باریکە دەمرێت، و نەفەرێکی دیکە کە ئەکتەرێکی بادە ئالودەیە، خۆی هەڵدەواسێ.

دایك:

ئەم رۆمانە لەسەر تەوەری کەسایەتی دایکێك و کوڕە مەیخورەکەیەتی کە (پاش گۆڕانی حاڵی) دەبێ بە ناوك و ناوەڕۆکی سەرەکی شانەیەکی سوسیالیستی لە کارخانەیەکدا کوڕە، کە پاڤیل-ی ناوە، بە تاوانی هاندانی کرێکاران بۆ مانگرتن و رابەرایەتیکردنی رێپێوانی رۆژی یەکی ئایار (رۆژی جیهانی کرێکار) دەگیرێت و حوکمی دوور خستنەوە بۆ سیبریا دەدرێ. دایکەکە وەکو ئەرکی دایکایەتی، دەکەوێتە دابەشکردنی بەیاننامە شۆڕشگێڕییەکانی کوڕەکەی. مامورانی تزار بە بەیاننامەکانەوە دەیگرن، بێدەنگی دەکەن و شلکوتی مەرگی دەکەن.

کورتەیەکی رەخنەکان:

هەر چەندە چیرۆکەکانی گۆرکی هەژێنەر و گورچکبڕن، بەڵام زۆر دوور دێتە بەرچاو کە بەرهەمی نەمرین. چ گومانێك نییە کە گۆرکی پەیامێکی هەبوو، بەڵام ئەم پەیامە سنووردار و پەیوەست بوو بەزەمانی خۆیەوە، و ئاشکرایە کە بەهرە و بلیمەتیشی هەبوو، بەڵام لە پایەی هونەرمەندی دا زۆر شتی کەم بوو. بەرهەمەکانی کاوێژکردنەوەی یەکترن. وێنەکانی ریالیستییانە نین، بەڵکو ئایدیالی یا موبالەغە ئامێزن.

بنیادەمە ئاوارە و چەورە و شەلاتییەکانی لە رادەبەدەر زیرەك و هوشیارن، بۆ نموونە دایکەکە (قارەمانی سەرەکی رۆمانێکە بە هەمان ناو کە پێشتر باس کرا) ژنێکی واقیعی وەکو خەڵکی نییە، بەڵکو حەز و کەماڵخوازی گۆرکی لەمەڕ دایکێك دەنوێنێ کە لە نێو رەنجبەرانەوە هەستابێ. گۆرکی لە شێوەی پەرداخ و تەکنیکدا "گیرۆدەی ئارەوانی و بێسەروبەرییەکەی دۆستۆفسکییە، بێ ئەوەی گەرم و گوڕی ڤیانی برایانەی ئەوی هەبێ".

رەنگە فلپس ناحەقی نەبێ کە دەڵێت: "گۆرکی بە خێرایی موشەك دەردەچوو، بەڵام شێوەی هاتنە خوارەوەی ئاسایی بوو".

# ژێدەران:

١- لە گۆرکی: هەمان نیژنی نوڤگورود-ی جارانە، واتە زاگەی گۆرکی، کە پاش شۆرشی گەورە وەکو رێزنان لە کۆششی وی لە رێگەی شۆرشی روسیادا ناونرا گۆرکی. وا دیارە نووسەری کتێبەکە ئەم دووانەی بە جیاواز زانیوە.

# ئەدەبیاتی سۆڤیەتی

سەرەتایەکی مێژوویی:

شۆڕشی سالّی ١٩٠٥ی روسیا تەواو ناکام بوو. شۆڕشی دووەم بە رابەرایەتی حیزبی بۆلشەفیک (پاشان ناونرا حیزبی کۆمۆنیست) لەسالّی ١٩١٧دا حکوومەتی نیکولاّی دووەمی"[١] هەلّگێڕایەوە. لە دوای ئەوە شەڕی ناوخۆ هەلّگیرسا. ئەوسا لە سالّی ١٩٢١دا سیستەمی نیمچە کۆمۆنیستی ناسراو بەسیاسەتی نوێی ئابووری داڕێژرا. سالّی دواتر، یەکێتیی کۆماریی سۆڤیەتی سوسیالیست، کە بریتی بوو لە شانزە ویلایەتی خودموختار، دامەزرا و دەستووری بنچینەییەکەی پەسندکرا (١٩٢٣). پاش مردنی لینین-ی بۆلشەفیک (١٩٢٤)، یوسیف ستالین(١٨٧٩- ١٩٥٣)، هەرچی مقاوەمە هەبوو تێکی شکاند و ، بەلەز کۆلّەکە و پایەکانی حکوومەتە دیکتاتۆرییەکەی خۆی، بە پاکسازی کردنی رابەرانی دیکەی سۆڤیەتی، قایم و مکوم کرد. لە سالّی ١٩٢٨دا سیاسەتی نوێی ئابووریی هەلّوەشاندەوە و دەستپێکی بەرنامەیەکی پێنج سالّەی گەلەك سوسیالیستی تری راگەیاند.

لەبەر رۆشنایی ئەم بەرنامە پێنج سالّیانەدا، کە تا ئەو چەند قۆناغێکیان لێ ئەنجام دراوە، یەکێتیی کۆماریی سۆڤیەتی سوسیالیستی پێشکەوتنی مەزنی پیشەسازی و سوپایی بەدەست هێناوە. ئەم ولاّتە دوای جەنگێکی کورت لەگەلّ فنلاندا (١٩٣٩- ١٩٤٠)، بە هۆی هێرشی ئەلّمانەوە بۆ سەر قەلّەمڕەوی ئەو لە سالّی ١٩٤١دا، گیرۆدەی جەنگی جیهانی دووەم بوو. یەکێتیی سۆڤیەت لە سالّی ١٩٤٦دا "(جەنگی سارد)ی دژی میللەتانی سەرمایەداری سەرانسەری جیهان دەست پێکرد.

تێڕوانینێکی گشتی:

ئەدەبیاتی سۆڤیەتی زیاتر تایبەتە بە ستایشی رژێمی تازە، شرۆڤەی چیرۆکانی شۆڕش، وەسفی تێکۆشین و خەباتی جەماوەر، و دەربڕینی هێڤی و ئومێدان بە ئاینده. لە سالّی ١٩١٧

بە دواوە رۆمان، کورتەچیرۆك و، هۆزان لەسایەی سانسۆری ورددا بووە و بە شێوەیەکی گشتی شێوەی پرۆپاگەندەیی و فێرکاری و ئامۆژگاری هەبووە. بێگومان، ئەم فێرکارییە پتر کۆمەڵایەتییە تا فەردی، و بە زۆری رەنگدانەوەی یەك رووداو یان لایەنگرییە لە سیاسەتی فەرمی رۆژ.

لە دوای شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ەوە، بەرهەمی درامی کەم، بەڵام شیعر، رۆمان، کورتە چیرۆك، و نووسینی تەنزئامێزی فرە نووسراون.

بە شێوەیەکی گشتی، ئەدەبیاتی سۆڤیەتی لە دوا ئەنجاما لەرووی مێژووییەوە و وەکو تۆماری قۆناغێکی تایبەتی مایەی سەرنج و بایەخە، بەڵام ئەوەی کە لەرووی خودییەوە ئەوەندە گەورە بێ کە جێگەیەکی ئەمر لە ئەدەبیاتی جیهانی بە دەست بێنێ، جێگەی گومانە.

## هۆزان

هەر لە سەرەتای سەرکەوتنی شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ەوە، جیهان بۆ سۆڤیەتییەکان و بەلای وانەوە بوو بە وڵات و سەرزەمینی ئومێدو تاسە و گەرم و گوڕی، و هەست و سۆز و تاسە و ئارەزوو بەرز بووەوە. لە ئەنجامدا شیعر و شاعیری لەم قۆناغەدا برەوی پەیدا کرد. شیعری هەوەڵین ساڵەکانی شۆڕش سێ ناوەرۆك و تیمەی سەرەکی هەبوو: ژیانی چینی کرێکار، ئەزموون و بیرەوەرە گوندییەکان، و تاسە و ئارەزووی دابڕان لە رابردوو و پایەداربوونی سیستەمی نوێ.

ئالکسی گاستیف (١٨٨٢- ...) سیمایەکی دیاری نێو شاعیرانی شیعری رەنجبەرانە، سیرگی یەسەنین (١٨٩٥- ١٩٢٥)، شاعیری گوندەکانە، و فلادیمیر مایاکوفسکی (١٨٩٣- ١٩٣٠) کە بەتایبەتی ئەدەبیاتی وەکو چەکێکی کۆمەڵایەتی بەکار دەهێنا. (رێسا باوە زمانەوانەییەکانی تێك شکاند، وشە و دەستەواژەی میللی و باوی رۆژی لە هۆزانی روسیدا بەکار هێنا، و بەمجۆرە شیعری خیاوانی و جەماوەری ئەو جیلوەگەی زەوق و سەلیقەی عەوامی خەڵك بوو).

لەو شاعیرانەی کە قەڵەمی خۆیان نەخستە خزمەتی بەرژەوەندی رژێمەوە، دەبێ ئاماژە بۆ بوریس پاسترناك (١٨٩٠- ١٩٦٠) و ئاننا ئاخماتوڤا (١٨٨٩- ...) بکرێ، (پاسترناك، *زێدەباری شیعرەکانی، هەندێ چیرۆکیشی نووسین کە ناودارترینیان دکتۆر ژیڤاگو (١٩٥٥)یە، پاسترناك لە ساڵی ١٩٥٨دا خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیاتی درایێ، بەڵام وەری نەگرت).*

شاعیرانی دواتر ڕێگەی ڕوونکردنەوە و گشتاندنی ئامانجەکانی سۆڤیەتیان گرتۆتە بەر و هەوڵیانداوە کە نەمری و زیندوویەتی بە خەباتی سۆڤیەتییەکان، بەتایبەتی مەینەتی و سەرکەوتنەکانی جەنگی جیهانی دووەم ببەخشن.

شاعیرانی دیاری دیکە بریتین لە: ئالکساندەر بزیمنسکی (١٨٨٩- ...)، میخائیل ماتوسوفسکی (١٩١٥-...)و یوگنی دولماتوفسکی (١ژ٩١٥-....).

## پەخشانە چیرۆك

بەشێوەیەکی گشتی، ڕۆمان و کورتە چیرۆك بە هەمان کاروانە ڕێ و ڕێبازاندا ڕۆیشتوون کە هۆزان بڕیویەتی، لە نێو نووسەرانی ڕۆمان و کورتە چیرۆکدا، چوار دانەیان شۆرەت و سەنگی زیاتریان پەیدا کرووەە:

*١- یەڤگینی زامیاتین (١٨٨٤ - ١٩٣٧): خاوەنی کورتە چیرۆکی "شکەفت"ە کە دژواری و سەختییەکانی سان پترسبورگ لە زستانی ساڵی ١٩١٨ دا وێنە دەگرێت، ئێمە (١٩٢٤) چیرۆکێکی خەیاڵی تەنزئامێز دیکەیەتی کە دەربارەی سەدەی بیست و شەشەمە.*

*٢- ئیزاك ئیمانوئیلوفیچ بابیل(١٨٩٤ - ١٩٤١)، نووسەرێکی وردبین و بە سەرنجی جولەکەیە، کە کۆچیرۆکی لەشکری سوری سوارە (١٩٢٦)ی لەسەر بنەمای ئەزموونی خۆی لە مەڕ یەکەمین سوپای سوارە نووسیوە. لەم چیرۆکانەدا شەڕ و قارەمانییەتییەکانی بودیونی"٢" لە جەنگی سۆڤیەت -پۆلاندەدا (١٩٢٠) دەگێڕێتەوە، بابیل کە بە نووسەرێکی ڕۆمانتیکی دەژمێردرێ و دەناسرێ، کۆچیرۆکێکیشی بە ناوی چیرۆکێن ئۆدیساوە دەربارەی جولەکانی ئۆدیسا هەیە.*

*٣- ئالکسی نیکولا یوفیچ تولستۆی (١٨٨٢ - ١٩٤٥)(پیری دێری ئەدەبیاتی روسی): بەچیرۆکی ڕێگای جەلجەتا (یا ڕێگەیەك بە ناو دۆزەخدا، تەواو کراو ١٩٤١) بەناو بانگە. لەم چیرۆکەدا ژیانی ڕۆسیای ساڵانی ١٩١٣- ١٩١٨ وێنە دەکێشێت. تۆلستۆی چیرۆکێکی ئوتوبیوگرافییانەی جوانیشی بە نێوی منداڵیەتی نیکیتا (١٩٢١) لە پاش بەجێماوە.*

*٤- میخائیل ئالکساندروفیچ شولوخوف (١٩٠٥ - ١٩٨٤)، "پێشەنگی نووسەرانی هاوچەرخی سۆڤیەتی"یە، کە بە هۆی ڕۆمانە زیندووەکەیەوە دۆنی ئارام (١٩١٢) ناوی دەرکردووە. ئەم ڕۆمانە واریقات و بەسەرهاتی ژیانی قۆزاقەکان لە ساڵانی ١٩١٣- ١٩٢٢١دا دەگێڕێتەوە. ڕەخنەگرێك ناوی ناوە "شەڕ و ئاشتی قۆزاقەکان"، سپکتر گوتویەتی کە دۆنی ئارام "بەرهەمێکی ڕەسەنە لە ئەدەبیاتی کلاسیکی روسیدا". شولوخوف لە ماوەی جەنگی*

*جیهانی دووەمدا و بە ئیلهام و سەرۆی جەنگ کۆمەڵێك چیرۆکانی نووسیوە کە یەکێك لەوانە زانستی نەفرەتە (١٩٤٢)، "ئەوانەی لە پێناوی نیشتیماندا جەنگین" رۆمانێکی دیکەی ئەوە لەواری جەنگدا، کە هەندێ بەشی بڵاوبووەتەوە، شولوخوف خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیاتی ساڵی ١٩٦٤شی وەرگرتووە.*

رۆماننووسانی دیکەی بەرجەستەی سۆڤیەتی بریتین لە: پانتلیمون رومانوف (١٨٨٤- ١٩٣٨)، ڤالنتین کاتایف (١٨٩٧- ١٩٨٦)، لیونید لیونوف (١٨٩٩-...)، یوری ئولشا (١٨٩٩- ١٩٦٠) و ڤنیامین کاڤرین (١٩٠٢- ...).

## تەنز و نوکتەبازی

ئەگەرچی بەرهەمێکی زۆری تەنزئامێز لە ئەدەبیاتی سۆڤیەتیدا پەیدا نەبووە، بەڵام هەندێ پارچەی شاد و خەندەدار هەیە کە ئەمانەش لایەنی فێرکاری و ئامۆژگارییان هەیە.

ئیلیائیلف (ناوی خوازراوی ئیلیا ئارنلدوفیچ فاینزیلبرگە، ١٨٩٧- ١٩٣٧) کۆمیدی نووسێکی بە قەریحە و بەهرەدارە، بە هاوکاری لەگەڵ یەڤگینی پتروفیچ پتروف (ناوی خوازراوی یەڤگینی کاتایفە، ١٩٠٢- ١٩٤٤) رۆمانی درێژ لێ شاد و تەنزئامێزی دوانزە کورسی (١٩٢٨)ی نووسی. قارەمانی کتێبەکە بەندەر-ی ناوە، بنیادەمێکی چەورەو هەرچی و پەرچییە، کە لە دووی هەندێ ئاڵماسان دەگەڕێ کە بەر لە شۆڕش لە کورسییەکدا کراون. هەر چەندە بەندەر لە کۆتایی رۆمانەکەدا دەمرێت، بەڵام جووتە نووسەر لە رۆمانی گوێرەکەی زێڕینی بچووکدا (١٩٣١) جارێکی دیکە گیانی بە بەردا دەکەنەوە. ئەم رۆمانەیان هێرشە بۆ سەر پاشماوەی سەرمایەداری لە کۆمەڵگەی سۆڤیەتیدا. رۆمانەکانی دیکەی ئەم جووتە نووسەرە بەناوی تۆنیا (١٩٣٥) و ئەمریکای بچووکی زێڕینە (١٩٣٦) کە یادگاری سەفەری ئەوانە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هێرشە بۆ سەر ئەم وڵاتە.

گەورەترین کۆمیدی و تەنزنووسی یەکێتیی سۆڤیەت میخائیل میخائیلوفیچ زوشچنکۆیە (١٨٩٥- ١٩٥٨) کە بە چیرۆك و کورتە سکێچەکانی تانە و تەشەر لە گەندەڵی کۆمۆنیستی تەشریفات و رواڵەتبازی کارگێڕی، زانست، رەخنە و ئەو جۆرە شتانە دەدات. بەرهەمێکی بە ناوی گەڕانەوەی لاوی (١٩٣٣) بە مەبەستی رۆمان نووسراوە، لێ لەڕاستیدا کۆمەڵەیەکە لە کەش و هەوای کورتەچیرۆك و سکێچاندا. کتێبی شینی بچووك (١٩٣٤) کۆچیرۆکێکی دیکەی سەرانسەر هەجوو، کینایە و تانەیە لە لاوازییەکانی مرۆڤ -بەتایبەتی مرۆڤی کۆمۆنیست-.

دوایەمین بەرهەمی زوشچنکو بەر لە رۆژهەلات-ی ناوە (کە لە سالی ١٩٤٣دا بەشێوەی دراماى چیرۆکڤانی دەستی پێکرا، بەڵام تەواو نەکرا) و بریتییە لە شرۆڤەیەکی ژیانی رابردووی خودی خۆی، بێ ئەوەی کە تەنزێکی تیا بێ- تەنیا لە هەندێ پەرەگرافاندا نەبێ کە دەربارەی ستایشی زانای رووسی بافلوفە"[٣]"، لە کەش و هەوای درگە و کینایەدا نووسراوە. بلاوبوونەوەی ئەم کتێبە لەبەر هەندێ هۆ وەستا و، سەیر لەمەدایە کە بەرهەمەکانی زوشچنکو لە چاپەمەنییانی کۆمۆنیستیدا بەر هێرش دران و بە خۆیشی لە سالی ١٩٤٦دا لە ئەدەبیاتی سۆڤیەتدا "پاکسازی" کرا.

# ژێدەران:

١- نیکۆلای دووەم (١٨٦٨- ١٩١٨): تزاری روسیا (١٨٩٤- ١٩١٧).

٢- بودیونی (١٨٨٣- ....) مارشالی روسی و فەرماندەی یەکەمین لەشکری سوارەی سوپایی.

٣- بافلوف (١٨٤٩- ١٩٣٦): زانای روسی لە مەیدانی فیزیولۆژی و سایکولۆژی ئەزموونگەریدا.

## حەمە کەریم عارف

- کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) ڕۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٧٣ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ١٩٧٦ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور، نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢٠٠، گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.
- جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و ڕێکخراوێکی سیاسی نەبووە، لە ساڵی ١٩٧٤ — ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی، پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کورددا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.

• زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانە لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاو بوونەتەوە، لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩.

٢- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم ١٩٨٨.

٣- بەیداخ، چیرۆك، ١٩٨٨.

٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك چاپی دووەم ٢٠٠٥.

٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك، چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان.

٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێران چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ.

٧- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٢.

٨- نامۆ، رۆمان، ئەلبێر کامۆ، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٣ دەزگای ئاراس.

٩- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، یەك چاپ (شاخ) .

١٠- شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راە کارگر) .

١١- هاوماڵەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٠ گوڵان.

١٢- بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، ٣ چاپ شاخ، شار ٢٠٠٣.

١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق.

١٤- دوورە وڵات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گوڵان.

١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران.

١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر.

١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥.

١٨- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی، چاپی شاخ.

١٩- مەسەلەی کورد لە عێراقدا، عزیز شەریف.

٢٠- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا، یەك چاپ.

٢١- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە، چاپی شاخ.

٢٢- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤ دەزگای ئاراس.

٢٣- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان.

٢٤- گوزارشتی مۆسیقا، د. فؤاد زەکەریا.
٢٥- دەربارەی شیعر و شاعیری، رەزا بەراهەنی.
٢٦- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر.
٢٧- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢) .
٢٨- جولەکەکەی مالتا، شانۆنامە، مالرۆ.
٢٩- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٣٠-بەد حالی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٣١- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولام حوسەینی ساعیدی) .
٣٢- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.
٣٣- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوللائەلبوسێری.
٣٤- کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا، چاپی یەکەم ١٩٩٨ وەزارەتی رۆشنبیری.
٣٥- هونەر و ژیانی کۆمەلایەتی، پلیخانۆڤ، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ دەزگای موکریانی.
٣٦- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت، ئیڤلین رێید.
٣٧- لێکدانەوەیەك لە مەرِ نامۆ، لویس ریی.
٣٨- مندالە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ مندالان.
٣٩- فاشیزم چیی؟ کۆمەلە چیرۆك بۆ مندالان، یەلماز گونای.
٤٠- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینییە بۆ مندالان.
٤١- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالان).
٤٢- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە.
٤٣- کۆمەلێك ئەفسانەی جیهانی (٢٣ ئەفسانە).
٤٤- زیندە خەون کۆمەلە چیرۆکی چیخوف، چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای موکریانی.
٤٥- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر.
٤٦- جیّ پیّ، کۆمەلێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان: (سادقی هیدایەت، جەلال ئال ئەحمەد، بوزرگی عەلەوی، سادقی چوبەك، مەنسوری یاقوتی).
٤٧- چیرۆکستان، کۆمەلێك دەق و رەخنە، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ نووسەرانی کەرکوك.
٤٨- چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چاپی یەکەم (٢٠٠٠) حەمە کەریم عارف.
٤٩- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی- کوردی) حەمە کەریم عارف.

٥٠- پەلکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) وەزارەتی رۆشنبیری.
٥١- کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە.
٥٢- چزیشفسکی، فەیلەسووف و زانای گەورەی میللەتی روس.
٥٣- چایکۆفسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٤- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- گوگول، نووسەری ریالیست.
٥٧- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی.
٥٨- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی.
٥٩- خاتو فروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی.
٦٠- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
٦١- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) دەزگای سپیرێز.
٦٢- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان.
٦٣- راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف
٦٤- دیدار و دەق و رەخنە.
٦٥- دیداری چیرۆکڤانی.
٦٦- قوتابخانە ئەدەبییەکان، رەزا سەید حوسەینی.
٦٧- ئاوادارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف.
٦٨- هەزار تۆپی شیعری نوێخوازی و چەند باسێکی دی، حەمە کەریم عارف.
٦٩- کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستدا، کریس کۆچرا، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران.

* لە راپەرینەوە تا ئەوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات و [بەر]هەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گرووپ و [لای]ەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، ئامادەیە بە خۆڕایی پێشکەشیان بکات و...

٧٠- میژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).
٧١- میژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).

٧٢- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکا و ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).

* لە راپەرینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە.

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گرووپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاوکردنەوەی هەبن، دەتوانێ پرس بە نووسەر بکات.